تصوير ابو عبد الرحمن الكردي



منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

# فەرهەنگی زانستی سیاسی








(فەرهەنگی زاراوە و قوتابخانە سیاسیەکان)

کوردی - فارسی - ئینگلیزی

ئەحمەد شەبانی

٢٠١٠

PDF 4 KURD

# فەرهەنگی زانستی سیاسی

(فەرهەنگی زاراوە و قوتابخانە سیاسییەکان)

## کوردی ـ فارسی ـ ئینگلیزی



**ئەحمەد شەبانی**



دانشگاه کردستان

٢٠١٠

PDF 4 KURD




سرشناسه : شبانی، احمد، ۱۳۵۰

عنوان و نام پدیدآور : زاراوەی سیاسی هاوچەرخ، فەرهەنگی شیكاری زاراوە و قوتابخانە سیاسییەكان كوردی - فارسی - ئینگلیزی/ئەحمەد شەبانی

مشخصات نشر : سنندج، دانشگاه كردستان، ۱۳۸۸.

مشخصات ظاهری : [۳۸۵] ص

شابک : ۹-۲۱-۲۷۹۷-۹۶۴-۹۷۸

وضعیت فهرست نویسی : فیپا

یادداشت : واژەنامه

موضوع : علوم سیاسی، اصطلاح‌ها و تعبیرها

ردەبندی کنگره : A ۶۴/ک۴ش ۲ ۱۳۸۸

ردەبندی دیویی : ۳۲۰/۰۳

شماره : ۰۲۰۴۶۹۱

کتابشناسی ملی


# فەرهەنگی زانستی ـ سیاسی

(فەرهەنگی زاراوە و قوتابخانە سیاسییەكان)


كوردی ـ فارسی ـ ئینگلیزی

ئەحمەد شەبانی

پیت‌چن: ئەحمەد شەبانی

رازاندنەوە: سەیران پەرویزی

وێنەی بەرگ: گەلاوێژ كەریمی

سەرپەرشتی چاپ: شوانە تاهێری

جار و سالی چاپ: یەكەم/ ۱۳۸۹

ئەژمار: ۱۵۰۰ دانە/ روقعی

ناوەندی پەخش: سنە، پاساژ عیزەتی، كتێبی كانی ۲۲۲۵۲۵۹ ۰۸۷۱


PDF 4 KURD

# پێشەکی

**خوێنەری هێژا!**

وەك خەمخۆرێکی زمانی کوردی گوتوویە: "زمانی کوردی قەت دەرفەتی نەبووە لە مەیدانی زانست و بیرەوانیدا هێندێك چاوی بکاتەوە و خۆی لە تاقی بوونەوە بدات".[1] رەنگە هۆکاری ئەم بێدەرفەتی و رانەگەیشتنە، بە تەواوی روون نەکرابێتەوە بەڵام بێگومان، یەکێك لەم هۆکارانە یەخەی رووناکبیر و نووسەر و توێژەری کورد دەگرێت و لە سۆنگەی بەرپرسارییەتی مێژوویی و ئەخلاقییەوە دەست لەو یەخە نابێتەوە. ئەم گوزارە، وا ئاکات لە دانەری ئەم کتێبە خۆی بە رێبواری رێگایەك بزانێ کە کەسی دیکە رێڕەوی نەبێت و ئەم کارەی بەردەستان، بە موڵکی تایبەتی خۆی دابنێ.

ئەگەر ئاورێك بدەینە کتێبخانەی کوردی– سەد حەیف و مەخابن– دەبینین لە بەستێنی زانستە جۆراوجۆرەکاندا گەلێك هەژارە و پڕیەتی لە بۆشایی و کەلێنی گەورە گەورە. پڕ کردنەوەی ئەم کەلێنانە بە دەستەوسانی و گرتنە باوەشی ئەژنۆی تەنیایی و بێکەسی و خوێندنەوەی ئایەتی ناهومێدی و کوتاندنی تەپڵی دەستەنگی نایەتەدی، بەڵکوو پێویستی بە پیاچوونەوە و نوقم بوون و بووردن و فراژووتنە.

جیا کردنەوەی زمانی شێعر و ئەدەب ـ کە تا ئێستا کتێبخانەی کوردی پێ ئاخێندراوە ـــ لە زمانی زانستی، کارێك نییە کە چاو لێی بتۆقێ و هزر نەتوانێ بەرەو پیری بچێت. گەلانی جیرانیش، دەمێك ساڵ نییە کە بەرەوپیری ئەم بیرۆکەوە چوون. داریووش ئاشووری بلیمەتی بوواری فەرهەنگ نووسی فارس دەڵێت:

هەژموونی زمانی شێعر و هەستی شاعیرانە بە سەر زمانی فارسیدا بە هۆی لاوازی و بێ ناوەرۆکی زمانی فارسی نییە، بەڵکوو ئەگەڕێتەوە بۆ دوور بوونی ئێمە لە تێڕوانینی زانستی و فەلسەفی نوێ.[2]

ئەگەر چاوێك بخشێنین بە مێژووی نووسین و چاپەمەنی ئەو وڵاتانەی کە گەلی کوردیان لە خۆ گرتووە، لێمان روون ئەبێتەوە کە ئەوانیش رابردوویەکی هاوشێوەی ئێمەیان بووە و هەندێ جاریش بگرە لە ئێمە

---

[1] – ماجید مەردوخ روحانی/ فرهنگ فارسی کردی دانشگاه کردستان(پێشەکی) سنه: دانشگاه کردستان. ١٣٨٥، ل٢٠.

[2]- داریووش ئاشووری/ فرهنگ علوم انسانی. تهران: نشر مرکز، ١٣٨١، ص ١٢.



PDF 4 KURD

هەژارتر و لاوازتر بوون. بەڵام بە دامەزرانی دەوڵەتی مۆدێرن لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم و داکۆکی کردنیان لە زمانی نەتەوەیی ـ لە گوێن زمانی رەسمی وڵاتەکانیان ـ ئینجا بە هەرەومز بەم زمانانە راگەیشتوون و بە دامەزرانی بنکە و مەکۆی فەرهەنگی، گەشە و نەشەیان داوە بە زمانێ خۆ و چییان لە دەست هاتبێ درێخییان نەکردووە و بگرە تەخشان و پەخشانیان بۆ کردووە ئینجا شاباشی خۆیان داوە و قنج هەڵپەریون!

باش دەزانم دانانی فەرهەنگ، کارێکی ئاسایی و سانا نییە و هەستان بەم ئەرکە، خۆ خستنە بەر *شمشێرەکەی دامۆکلێسە*. واتە دڵ دەرهێنانە بە دەستی خۆت. هەژاری زمان پاراوی کوردی خۆشی کوردی دۆست وتەنی: دارژتن و خاڵ و میل رشتنی فەرهەنگ بە تەکوزی، دروێنە نییە شنەشن، ئارد پێژانە و گیان کێشانە. ناو لە دووی ناو، پیت لە شوێن پیت، بە شوێن یەکدا جەلە کردن، هەر وشەیەك لە شوێن خۆیدا هاوردن، . . . کاری یەکێك و دوان نییە، گەرەك زۆر و زەبەند پیاوی دەمپاراوی پسپۆر لە زمانەوانیدا و ئاگا لە زۆر شێوەی جۆرجۆر، لە مەڕ ئامراز و کەرەستە تەیار و ساز، ژوانگەیەکیان بۆ دابندرێ و رۆژبەرۆژ لێك کۆ ببنەوە و جگە لە فەرهەنگ دارشتن هیچ کارێکی تریان نەبێ.[٣]

لێرەدا لە بەر نەبوون یان لاوازیی و کزی و کرچ و کاڵی خزمەتگوزاری بە زمانی زگماگی، هەروەها لە بەر پارچە پارچە بوونی ماڵی زمانی کوردی و بێ هەواڵی نووسەران و قەڵەم بەدەستان لە یەکدی، هەرکەس لە رووی خەمخۆری و دڵسووتانی خۆیەوە، هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی کارێکی لەم چەشنە. بە گوتەی بلیمەتی کورد مامۆستا مەسعود محەمەد، سۆز و عاتیفە وا دەکات لێرە و لەوێ میرخاسێکی کورد بە ئەرکی ماددی و بە رادەی لێهاتوویی خۆی خەریکی گرتنی بەشێکی ئەو کەلێنە زلەی زاراوەی کوردی بێت.[٤]

خوێنەری وشیار دەزانێ، یەکێك لە پێودانگەکانی پێشڤەچوونی کۆمەڵگاکان، رێژەی دەوڵەمەندی وئاستی بەرزی جێماوە نووسراوەکانییەتی کە ئەمەش پەیوەستە بە دەوڵەمەندی کتێبخانەی ئەو کۆمەڵگاوە. ئەگەر دەگوترێ هەژمۆنی زمانە بان ـ نەتەوەییەکان کارێکی وا دەکات کە زمانی بێخاوەن و بێدەوڵەت هێدی ـ هێدی لە ناو بات و ئەنگاوتە لێداوی ئەکات، ئەوا بەپێز کردنی زمانی کوردی لە رێی رازاندنەوەی کتێبخانەی کوردییەوە، دەتوانێ رەچەیەك بێت بۆ هەرمان و بەرخۆدان و دەربازبوون لە مەترسی فەوتان و قەیرانی هەرەسهێنان.

***

گەلی کورد لە سەر سیاسەت، تاڵی و سوێری بێژومار و کوێرەوەری لە رادە بەدەری دیوە. خۆ ئەگەر ئاوڕێك بدەینە مێژووی کۆمەڵیی و خەباتە رامیارییەکەی، دەبینین گەلەك نەهامەتی رووی تێکردووە و مانگی بەختی هەر لێڵ بووە و لە پشت هەورا ماوەتەوە. سیاسەت لە هەموو سووچ و قوژبنێکی ژیانی کۆمەڵیدا جێی خۆی کردوەتەوە و بۆ تێگەیشتن لێی، دەبێ پێچەڵپووچی و ئاڵۆزییەکانی ناخی پێوەندییە سیاسییەکان

٣- هەژار موکریانی/ پێشەکی هەمبانە بۆرینە. تاران: سروش، ١٣٦٨، ل٢٧.

٤- مەسعود محەمەد/ زاراوە سازی پێوانە. بەغداد: ئەمینداریەتی گشتی لاوانی کوردستان، ١٩٨٨، ل٨.



PDF 4 KURD

لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا سادە بکرێتەوە و لێك بدرێتەوە.

نوخبەی سیاسی کورد، چ ئەو نوخبەی کە لەم چەن ساڵەی دواییدا چێژی لە دەسەڵات بینیوە و چ ئەو نوخبەش کە هێشتا هەر دۆژ داماوی فانتازیای دەسەڵاتە، پێویستە بە باوەشێکی ئاوەڵا و رۆحیانەتێکی بەرزەوە سەیری ئەندێشەی سیاسی و چەمك و واتای نوێ بکات. سیاسەت ئەو مەیدانە نییە کە بە شێوەی خۆماکی و رەمەکی خۆ بهاوێژینە ناوی، کە ئەگەر وابێت، سەر ئەشکێنێ و شەرمیش لە کەس ناکات. لەم سەردەمەدا هزرڤانی و دەروونپاکی دوو ماکی سەرەکین بۆ هاتنە مەیدانی سیاسەتەوە چونکا ئەم بەستێنە هەلێکە بۆ رێبەرایەتی کردن و بەدەستەوە گرتنی سەرجەنەی ژین و نەپساندنی شیرازەی کۆمەڵگا.

مەبەستی زاراوەسازی سیاسی، بەدەستەوەدانی زانست و تیۆریی و کەرەستەی پێویستە بۆ شرۆڤەی هەموو رەهەندەکانی ژیانی سیاسی لە سەرجەم خەبات و قۆناغە سیاسییەکاندا. مەسەلەی سەرەکی بۆ لێکدانەوەی تافێکی سیاسی، چۆنییەتی سەرهەڵدان و بەردەوامی و وەرچەرخان و لەناوچوونیەتی. زاراوەی سیاسی، وەك قەبارەیەکی زانستی، جیهانێکە، داتاکانی لە دەوروبەری خۆی دەگرێ و لە پرۆسەی پێکهاتە سیاسییەکاندا دەیخەملێنێ و ئینجا لە قەوارەی ئاکار و کردارە سیاسییەکان ئەیداتەوە بە کۆمەڵگا.

فاماندن و دەرك پێکردن بە سیاسەت ناگاتە ئەنجام مەگەر ئەوەیکە چەمك و زاراوە سیاسییەکان بە وردی شرۆڤە بکرێن تاکوو سیاسەتڤان و خوێندکاری سیاسی کورد چیدی لە قافڵەی رامیاری جیهانی و ناوچەکە دوا نەکەوێت و ئیتر لەم بۆچوونە ساکارە کە سیاسەت بە "درۆ" لە قەڵەم ئەدات، خۆ دوور بگرێ و وەك پێویستیی دانشگایی بۆی بروانێ. لێرەدا پەلکێش کردنی ئەخلاق بۆ گۆڕەپانی سیاسەت و خۆ تەیارکردن بە زانستی سیاسی، دوو باڵی پێویستن بۆ گەیشتن بە ئایدیای ***فەیلەسوف ـ پاشایی*** لە پرۆسەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا.

بەم روانگەوە، دانەری ئەم فەرهەنگە دەستی داوەتە ئەم کارە و قەت بانگەشەی ئەوەش ناکات لەم چەشنە کارە نەکرابێت بەڵام رووسوورە کە ئەم شێوازە تا ئێستا بەر ئەزموون نەکەوتووە و بۆ دانانی فەرهەنگ لە بوارێکی زانستی(سیاسی) بەم چەشنە بەرەوپیری نەچوون. لێرەدا بە پێویستی دەزانم لە چەن خاڵێکدا سەرنجی خوێنەر بۆ تایبەتمەندیەکانی ئەم وشەدانە راکێشم:

١– رەوتی گۆڕانکارییە سیاسییەکانی جیهان تا رادەیەك بەلەز و خێرایە کە لە ماوەی زیاتر لە ٢ ساڵ تەقەلا بۆ نووسینی ئەم فەرهەنگە، دەیان زاراوە و چەمکی سیاسی نوێ هاتۆتە ئاراوە یان پیاچوونەوەیان بە سەردا کراوە. ئەگەرچی نزیکەی ٢ ساڵیش پاش ئامادەبوونی کتێبەکە بۆ چاپ، چاوەڕوانی ئیجازەی چاپ و دەزگای چاپ و پەخش مابۆوە بەڵام هەوڵی داوە بە پێی گرینگایەتی باباتەکە خۆی لەم تازەگەرییە خافڵ نەکات. بەم حاڵەش، دیسانەوە بانگەشەی ئەوە ناکات کە بەرهەمەکە کەموکووڕی نەبێت بەڵکوو ئەم کارە وەك پرۆژەیەك دەبینێ کە ئەبێ دەرگای لێ ئاوەڵا بێ و بەردەوام لە چاپەکانی دیکەدا نۆژەن بکرێتەوە.

٢– ئەمە شتێکی باوە کە بۆ نووسینی فەرهەنگی سیاسی لە هەر وڵاتێکدا دەروویەکی تایبەت دەکرێتەوە بۆ پێشهات و رووداوە گرنگە سیاسییەکانی ئەو وڵاتە. ئەم فەرهەنگەش هەوڵی داوە تا رادەیەك ئەم دەرو...



PDF 4 KURD

بە رووی پێشهاتە سیاسییەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا بکاتەوە و تا بۆی گونجابێت، بە ئەنجامی گەیاندووە تاکوو کتێبەکە ماکێکی خۆماڵیشی هەبێت و بەو پێیە خوێنەر تا رادەیەك لەم زاراوانە بەهرەوەر بێت. ئەگەرچی رەنگە هەندێك پێیان وابێت کە ئەم زاراوگەلە پتر لەوەیکە سیاسی بن، مێژوویی و حیزبین بەڵام نکوڵی لێ ناکرێ کە کەلتووری سیاسی ئێمە بێ رەچاو خستنی حیزب و مێژوو، ناخوێندرێتەوە.

٣- خوێنەری ئەم زاراوەنامە پێی وا نەبێت سەرجەمی زاراوە و چەمکە سیاسییەکانی زانستی سیاسی لەم فەرهەنگەدا جێی کرابێتەوە. دانەر هەوڵی داوە، زیاتر ئەو زاراوە و چەمکانە بەرجەستە بکاتەوە کە لە سەردەمی هاوچەرخدا زۆرترین رێژەی بەکارهێنانیان هەیە. هەمدیس، خوێنەر چاوەروانی ئەوە نەکات هەر دەروویەك کرابێتەوە، بە تەواوەتی راڤە کرابێت چونکا بۆ فەرهەنگێکی زانستی هەر ئەوەندەی گچکە زانیارییەك دەرەخسێ کە خوێنەر تا رادەیەکی دیاریکراو لە گەڵ زاراوەیەکدا ئاشنا بکات. دیارە بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر لەمەڕ چەمکێك پێویستە خوێنەر کتێب و سەرچاوەی تایبەت بپشکنێ.

٤- دانەر هەوڵی داوە زمانی شەرح و شیکاری زاراوەکان، سادە و ساکار بێت واتە شێوازێکی نووسینی هاسانی بۆ ئەم مەبەستە هەڵبژاردووە تاکوو خوێنەری ئاساییش بتوانێ کاکڵی وتارەکان دەرکێشێ و بە قەدەر ئاوەزی خۆی زانیاری لێ هەڵێنجێت. بەڵام ئەمەش ناخاتە پشت گوێ کە رەنگە زمانی هەندێك لە زاراوەکان قورس بێت ئەمەش لە بەر ناواخنی فەلسەفی ئەو زاراوانەیە.

٤- دانەر هەوڵی داوە بەرهەمەکە دوور بێ لە هەڵە بەڵام کارەکە بێ عەیب نازانێ. بەم بۆنەوە خۆی بە منەتباری ئەو کەسانە دەزانێ کە بە ناردنی رەخنە یارمەتیدەری چاکسازی کتێبەکە دەبن لە چاپەکانی دواییدا.

٥- لە سەر هەندێك لە زاراوەکان، گوڵە ئەستێرەیەکی بچووك (*) دانراوە کە ئەمە بە واتای ئەوەیە کە ئەو زاراوە لە ناو فەرهەنگەکەدا دەرووی تایبەتی بۆ کراوەتەوە و لە شوێنی خۆیدا بە جیاواز شرۆڤە کراوە. خوێنەر دەتوانێ پاش دۆزینەوەی زاراوەکە، زانیاری زیاتر لەو بارەوە بە دەست بهێنێت. بۆ نموونە بڕوانە پەراگرافی دووهەمی زاراوەی "هێز" کە تێیدا لە سەر زاراوەی دەسەڵات، نیشانەی گوڵە ئەستێرە دانراوە. واتە زاراوەی دەسەڵاتیش بە جیاواز شەرح کراوە.

٦- ئەم فەرهەنگە بە سێ زمانی کوردی و فارسی و ئینگلیزی ئامادە کراوە، بەم بۆنەوە بە پێویستم زانی لە کۆتایی کتێبەکەدا دوو ئەندکس(پێرستی زاراوەکان) بە زمانی فارسی و ئینگلیزی دابنێم بۆ ئەوەی ئەگەر خوێنەرێك زاراوەیەکی بە یەکێك لەو زمانانە دەناسی بەڵام ئاگای لە هاوواتا کوردییەکەی نەبوو، بتوانێ بە خێرایی بیدۆزێتەوە و کەڵکی لێ وەرگرێت.

لە کۆتاییدا بە پێویستی دەزانم سەری نەوازش و سپاس و پێزانینی خۆم بۆ ئەو کەسانە دانەوێنم کە هەرکامیان بە جۆرێك یارمەتیدەری من بوون بۆ ئەوەی ئەم فەرهەنگە بێتە بەرهەم، بە چەشنێك کە ئەگەر یارمەتی و هاوڕایەتی ئەوان نەبووایە، ئەم ئەرکە بە ئەنجام نەدەگەیشت.



PDF 4 KURD

لە پێشدا سپاسی فراوانی هەڤاڵی شاعیرم، مامۆستای زمانی ئینگلیزی، بەکر پیروزی (بەرهەم) دەکەم کە جگە لەوەی پاڵنەرێك بوو بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە، زاراوە کوردییەکانی لە گەڵ زاراوە ئینگلیزییەکان بەرامبەر کردووە و لە ساغکرنەوەی هەندێك لەو زاراوانەدا یارمەتی داوم. ڕێز دادەنێم بۆ برای بەڕێزم شاعیر و نووسەر، ڕەزا عەلی پوور کە ئەویش چاوێکی خشاندووە بە زاراوەکان و لە شوێنی خۆیدا راوێژی پێداوم. هەروەها سپاسی ناسر بەهرام بەیگی ئەکەم کە ئەرکی خوێندنەوەی دووبارەی بەشێك لە کتێبەکەی لە ئەستۆ گرت و هەندێ لە هەڵەکانی بۆ ڕاست کردمەوە. بە پێویستی دەزانم دەستخۆشانە و سپاسی خۆم لە خوشکە گەلاوێژ کەریمی لەمەڕ ئەو ئەرك و ماندووبوونە کە بۆ کێشانەوەی نەخشەی ڕووبەرگی کتێبەکە بە ئەنجامی گەیاند، ئاراستە بکەم. ماندووبوونی هونەرمەند تەها کەریمی و پشتگەرمی هەڤاڵان حامید فەرازی و ڕزگار ئەحمەدی لە یاد ناکەم.

ڕێز و سپاسی تایبەتی خۆم پێشکەشی دوکتۆر بەختیار سەجادی مامۆستای زانستگەی کوردستان (سنە) کە لە دوایین ڕۆژانی پێش بە چاپ سپاردنی کتێبەکەدا چاوێکی بیرمەندانە و دڵسۆزانەی خشاند بە پێرستی زاراوەکاندا و لە ساغکردنەوەی هەندێك لە هاوواتاکاندا یارمەتی بەنرخی داوم.

سپاسی بەسۆز بۆ هاوسەری ژینم، دایکی ڕاژین، شەهرزاد حەیدەریان کە وێڕای سەبر و تاقەتێکی زۆر کە بۆ ئەنجامی ئەم کارە لە خۆی نیشان دا، لە وەرگێڕانی هەندێك لەو سەرچاوە ئینگلیزییانەشدا یارمەتی داوم.

لە کۆتاییدا دەسخۆشی دەکەم لە پرۆفیسۆر عەبدوڵلا سەلیمی بریکاری زانکۆی کوردستان(سنە) و دوکتور نەجمەدین جەباری، بەرپرسی ناوەندی کوردستان ناسی زانکۆی کوردستان و دوکتور عەبدوڵلا ڕەسووڵ نەژاد چونکا ئەگەر پشتگیری و یارمەتی ئەوان نەبوایە ئەم کتێبە بە چاپ نەدەگەیشت و ڕێگەی کتێبخانەی کوردی نەئەدۆزییەوە. هەر بژین

hermankurd@gmail. com

ئە. شەبانی، بانە

٢٨ی ١ی ٢٠١٠

٨ی ١١ی ١٣٨٨



PDF 4 KURD

# ئا

**ئابووری سیاسی** اقتصـاد سیاسـی Political economy

زاراوەی ئـابووری سیاسـی چـەمکێکی نوێبـاوە کـە کێشـە و ئاریشـەی زانسـتەکانی سیاسـەت و ئـابوور لێك ئەداتـەوە. بـە واتایـەکیتـر ئـابووری سیاسـی لـە شـوێن دۆزینـەوەی پێوەنـدی دوولایەنـەی وزە سیاسـی و ئابوورییـەکان و کاردانـەوەی ئـەم هێزانەیـە بەسـەر پێکهاتـەکانی سیاسـەتی ئابووریـدا. هـەروەها کاردانـەوەی بارودۆخی ئابووری بەسەر حوکمەتە هەڵبژاردە خەڵکیەکانیش لێك ئەداتەوە. سەرکەوتنی حوکمەت لـە بـواری سیاسەتە ئابوورییەکان، شەرعییەت و ئەگەریی دووبارە هەڵبژاردنەوەی ئەو حوکمەتە زیاد ئەکات. لە گوتاری پۆزیتـــۆڤیزمدا شـــەرعییەت و خـــۆشویســـتنی حوکمەتـــە هەڵبـــژێردراوەکان، ئەگەڕێتـــەوە بـــۆ پێودانگـــە ئابوورییەکانی هەڵامسان، رادەی بێکاری و هاوتەرازنەبوونی خەرج وبەرج و...

یـەکێکیتـر لـەو مەسـەلە گرنگانـە، ئەوەیـە کـە تـاچ رادەیـەك بـارودۆخی ئـابووری وڵاتـەکان دەرەنجـامی سیاسەتەکانی دەوڵەتە و تا چ رادەیەکیش بەرهەمی هۆکارگەلێکی بێ کۆنترۆڵ وەك بازاڕی جیهانییە؟

سەنگی هۆکارگەلی سیاسی لە پێکهاتنی سیاسەتە ئابوورییەکان گرانە و ئەم هۆکارانە ئەکەونە ناوەندی سەرنجی ئەم زانستەوە. بۆ وێنـە ئەگوترێ کـە دەوڵـەتان لـە پێش هەڵبژاردنەکان و بـە مەبەسـتی خۆ شیرین کردن لە بەر چاوی رەشەگەلدا دەست ئەدەنە بووژاندنـەوەی ئابووری و تەنانەت تـاکوو چەن مـانگێکیش ئـەو شـتانەی کـە بـەرعوەدەی بـوون بـە ئـەنجامی ئەگـەیێنن، بـەڵام دوای گەیشـتن بـە دەسـەڵات، لـەم رێبـازە دوور ئەکەونەوە.

پێوەندی ئایدیۆلۆجی حیزبی لە گەڵ مەسەلە ئابوورییەکانیش، بۆتە بابـەتێك لـە توێژینـەوەکانی ئـابووری سیاسی. ئەغڵەب حیزبە چەپییەکان هەوڵ ئەدەن گرفتی بێکاری چارەسـەر بکـەن، کەچی حیزبە راستییەکان هەوڵئەدەن پلەی هەڵامسان دابەزێنن. کەواتە پێوەندی ئایدیۆلۆژی سیاسی و ئـابووری سیاسـی مەسـەلەیەکی گـرنگ لـە ئـەژمار دێـت. ئـابووری سیاسـی بـەم واتایـە، لەگـەڵ ئـابووری سیاسـی بـە واتـا کۆنەکـەی کـە بـە روانگەیەکی مارکسیەوە ئەیڕوانییە سیاسەت، خۆبەخۆ جیاوازی هەیە.

**ئابووری خوازی** اقتصاد باوری Economism

بەهەنـد گرتنی ئـابووری و بژێویی بە سـەر سیاسـەت و خـەباتی سیاسـیدا. لـە کۆتـایی سـەدەی نۆزدە و سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم، لـە حیزبـی سۆسـیال دیمـوکراتی سۆڤیەت، لاگیرییـەك بـۆ بەسـتنەوەی خـەبات بـە

PDF 4 KURD

خەباتی ئابووری(باشتر کردنی هەلومەرجی ئیش و کار و زیادکردنی مووچە و ...)هاتە ئاراوە. ئەم لاگیرییە بە حیزب و رۆڵی شۆڕشگێڕانە بەو چەشنەی کە لێنین بیری لێ ئەکردەوە نەبوو. لینین لە کتێبی«ئەبێ چ بکەین؟»(١٩٠٢)، بەدژی ئەم فیکرە راوەستا.

**ئاپاترید** آپاترید Apatride

بە کەسێك دەگوترێ کە رەگەزنامە*ی هیچ ولاتێکی نەبێت ئەم حاڵەتەش لەم هەلومەرجانەی خوارەوەدا روو ئەدات:

١ـ کۆچکردن.

٢ـ بە پێی یاسای نەتەوایەتی هەندێ لە ولاتان.

**ئاریستۆکراسی/ئاغەواتی** آریستوکراسی Aristocracy

بە زمانی یۆنانی بە مانای باشترین حوکمەت یان حوکمەتی پیاوماقووڵانە. بەلام لە زاراوەدا جگە لەوەیکە هەڵگری پاساوێکی ئەخلاقییە، حوکمەتی کەسانی لێهاتووە کە بە پێی میرات و شەرەف و خوێن بە سەروەری گەیشتوون. کەواتە ئەکرێ بە حوکمەتی رەگەز مەزنایەتی ناوبردە بکرێ.

لە فەلسەفەی سیاسی یۆناندا ئاریستۆکراسی بەو دەسەلاتدارانە دەگوترا کە لەباری ئینسانییەوە بە تەواوی هەڵیان دابێ و گەشەیان کردبێ. ئەرەستۆ(لە کتێبی سیاسەت) و پلاتۆ (لە کتێبی کۆماری)دا هەوڵێکی زۆریان داوە لەمەڕ دیاریکردنی پێودانگێك بۆ دۆزینەوەی ئەم جورە کەسانە. ئەرەستۆ، باشترین جۆری حوکمەتەکان بە پادشایی و ئاریستۆکراسی و حوکمەتی قانوون ناوبردە ئەکا و لە نێوان ئاریستۆکراسی و ئۆلیگارکی*دا ئەم جیاوازییە قاییلە: " ئۆلیگارکی گەیشتن بە دەسەلاتە بە پێی دارایی و ئاریستۆکراسی بە پێی بلیمەتی". بەلام هەر لە زووەوە ئەم دو زاراوە بە یەك مانا بە کار براون. بۆ وێنە کارتاژ و وینیز ئاریستۆکراتی گەورەی دارایی بوون.

ئاریستۆکراتیك بە عام، بە حوکمەتێك دەوگوترێ کە تێیدا دەسەلاتی دەوڵەت رەها بێ و حوکمەت بە دەس تاقمێکی مومتازەوە بێت. ئەم تاقمەش لە رێی میرات و پلەی چینایەتییەوە بەم شوێنە گەیشتبێ و رێگەی چینەکانی‌تر بۆ ئەم شوێنە یاساغ بێت. نمونەی ئەم سیستەمە سیاسییە لە ئێرانی پێش ئیسلام و ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاست ئەبینرێت. ئیمڕۆ نمونەی ئەم جۆرە حوکمەتە لە کەم شوێنی جیهاندا پەیدا ئەبێت و جێی خۆی داوە بە دیکتاتۆری ئۆلیگاریشی نوێ.

**ئازادی** آزادی Freedom

بە گشتی، ئازادی دۆخێکە کە تێیدا هیچ شتێك پابەند و دەربەستی شتی‌تر نەبێ و بتوانێ لە گەردوندا جێبەجێ بکرێت. لە پێوەند لە گەڵ مرۆڤدا، ئازادی، دۆخێکە کە تێیدا هیچ شتێك رێگر نەبێت لە بەردەم

PDF 4 KURD

ئیرادەی تاك بۆگەیشتن بە ئامانجەکانی. بەڵام ئەم پێناسە زۆر گشتی و رەهایە چونکا ئازادی بە مانای رەها بۆ هیچ بوونەوەرێك لە جیهان نایەتە بەرهەم کەواتە هەرکاتێك لە سەر ئازادی باس ئەکەین، ئەبێ رێژەیەك لەم چەمکە لە بەرچاوبگرین. لە پێوەندی مرۆڤەوە، ئازادی ئەبێ لە دوو سۆنگەوە شی بکرێتەوە: یەکەم، هۆی ئازادی(واتە ئازادبوون لە چی؟)دووهەم، لایەنی ئازادی(واتە ئازادی بۆ چی؟). یەکێك لە تایبەتمەندییە دەروونییەکانی ئازادی، دابڕان لە دۆخێك یان جۆرە پەیوەندییەکە کە حەزی پێ ناکەین. بەڵام ئەو کۆت و بەندانەی کە بە رەزا و رەحمەتی خۆمان قبووڵی ئەکەین، دژی ئازادی لە ئەژمار نایەت. ئەو کەسەی کە لە بەندیخانە رزگار ئەبێت، بە "ئازاد" بوونی خۆی خۆشحاڵە بەڵام رەنگە هیچ عاشقێك حەز نەکا لە کۆت و داوی عەشقەکەی رزگار بێت یان هیچ دایکێك لە باوەشی منداڵەکەی. کەواتە ئازادی هەمیشە لە پێوەندی لەگەڵ شتێك یان دۆخێك پێناسە ئەکرێت کە بە زۆرەملی داسەپابێت یان بۆ تاك ناخۆش بێت. چونکا ئەو کەسەی کە ئەرکێك بە حەزی خۆی ئەنجام ئەدات نەك لە بەر ترسی سزادان، لە باری کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە ئازادە. بۆ وێنە ئەوەیکە نەهێڵێت کەسانێك ئازار بگەیێنن بە کەسانیتر، شتێکی بەرپۆجێیە. هەروا کە بە یاسایەکی پەسندکراو هیچکەس لە گەڵ بەربەستە قانوونییەکان دژایەتی ناکا و لەناوچوونی یاسا، ئازادی لە ئەژمار نایەت بەڵکوو ئاژاوە و بشێوی بەدواوە ئەبێت.

باسی ئازادییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان ماوەیەکی زۆر نییە لە کۆمەڵگای مرۆڤ هاتۆتە ئاراوە و زیاتر ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکارییە فیکرییەکانی ئەم چەن سەدەی دوایی ئەورووپا و بە گشتی سەردەمی ئەندێشەی مۆدێرنە لەم ناوچەدا. لەمەوبەر، لە باسە فەلسەفییەکان (چ ئیسلام چ خاچپەرستەکان)، باسکردن لە جەبر و ئیختیار، وەك ململانێی ئیرادەی خواوەند و ئیرادەی مرۆڤ و نیسبەتی ئەم دووانە لە گەڵ یەکتر لە پێوەندی لە گەڵ کێشەی خێر و شەڕ دەهاتە ئاراوە. بەڵام ئەندێشەی نوێی ئەورووپا لە جیاتی لێکدانەوەی رێژە و پێوەندیی مرۆڤ و خوا، زیاتر خۆی بە پێوەندی مرۆڤ لە گەل مرۆڤ، واتە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سەرقاڵ کردووە و کێشەی ئازادی تاك لە بەرامبەر کۆمەڵ ئەهێنێتە ئاراوە و روبەروبوونەوەی تاك لە گەڵ دەوڵەت و پێوەندییەکانیان یەکێك لە دۆزە فیکرییەکانی ئەم ٣-٢ سەدەی دوایی بووە. لە ئەورووپا، پاش راپەڕینی ئەندێشەی سیاسی رێنیسانس، پێناسەگەلی جۆراوجۆر بۆ ئازادی کراوە. بۆ وێنە "ئازادی" بە زەمینە و دەرفەتێك زانراوە کە بۆ پەرەسەندنی توانایییەکانی تاك رێز دادەنێت. لایەنگرانی رژێمە توتالیتارییەکان کە لە گەڵ چەمکە زیندووەکانی ئازادی لە هەناوی دیموکراسییەکاندا دژایەتی دەکەن، خۆیان لە پشتی ئەم پێناسەوە حەشار داوە و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە رەهەندێك زیاتر لە رەهەندی سیاسی بۆ ئازادی قایل دەبن. بەڵام بیرمەندانێك وەك تامس هابس و جۆن ئوستوارتمیل ئازادی‌یان بە مانا ناسراوەکەی پێناسە کردووە. هابس دەڵێ: مرۆڤی ئازاد ئەو کەسەیە کە ئەگەر ویستی کارێك بکا و هێزی بەو کارە بشکێ هیچ شتێك لەبەردەمیا رێگر نەبێت. (کتێبی لیڤیاتان). لە لایەکی ترەوە ترادیسیۆنی فیکریی رۆژئاوا، ئازادی بە شێوازی ژینی هاوکووف لە گەڵ عەقڵ و یاسای ئەخلاقی لە قەڵەم ئەدات. ئیپیکتۆس، فەیلەسوفی رەواقی رۆما

PDF 4 KURD

دەڵێ: هیچ مرۆڤێکی بەدکار ئازاد نییە. کارلایل، فەیلەسوفی ئینگلیزی دەڵێ: ئازادی راستەقینەی مرۆڤ، دۆزینەوەی رێگەی راستە و هەنگاونان لەو رێگەدایە.

بە گشتی لەم چاخەدا ئازادی سیاسی، ئەستوونی دیموکراسی لەژمار دێت و پێشێلکردنی ئەو ئازادییە سەرەکییانەی کە لە یاسا بنچینەییەکان بە تەرزێکی ئاشکرا بە خەڵک دراوە، پێشێلکردنی بنەڕەتی سەروەری گەلە و تاوانێك بەدژی سەروەری یاسا لەئەژمار دێت. بەڵام ئەو ئازادییانەی کە لە قانوندا ناوبردە کراوە، هەمیشە سنوری ئازادی هەرکەسێك ئەبەستێتەوە بە سنوری ئازادی کەسانی ترەوە. بەم پێیە، ئەگەرچی وشەی ئازادی هەمیشە بە حەز و تاو بە زاردا دێت، خۆبەخۆ شتێکی پەسند نییە بەڵکوو دەبێ هەمیشە لە بیرمان بێ کە "ئازادی بۆ چی؟ و ئازادبوون لە چی؟" داوا ئەکرێ.

## ئازادی چاپەمەنی آزادی مطبوعات Freedom of the Press

بە پێی ئەم بنەمایە، هەرکەسێك مافی بڵاوکردنەوەی بیروڕا و بۆچوون و هەواڵەکانی هەیە لە رێگای نووسراوە یا چاپەمەنییەکانەوە بێئەوەی بۆ بڵاوکردنەوەیان پێویستی بە ئیجازە بێت یان ناچار بە سانسۆڕ*کردن بێت.

## ئازادیخوازی/ لیبرالیزم لیبرالیسم/آزادیخواهی liberalism

بە کۆمەڵێك مێتۆد و سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا دەگوترێ کە ئامانجیان بەرهەمهێنانی هەرچی زیاتری ئازادییە بۆ تاکەکەس. بە لایەنگرانی وەها مەرامێك دەڵێن ئازادیخواز(لیبراڵ). ئازادیخوازی لە سەرەتادا لەگەڵ ناوی هەندێ حیزبی ئەوروپایی ئاوێتە بوو بەڵام ئەمڕۆکە ئەم زاراوە مانایەکی بەربڵاوتری لەخۆ گرتووە و زیاتر نیشاندەری لایەنێك یا سۆنگەیەکی فیکرییە کە خاوەنی ئەم چەن پرەنسیپانەیە:

١) بەهەند گرتنی دەربڕینی ئازادانەی فیکری تاك، ٢) بڕواهێنان بەوەیکە دەربڕینی ئازادنەی فیکر بۆ تاك و کۆمەڵ بەسوودە. ٣) پشتیوانی کردن لەو دامودەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسیانەی کە رێگا بۆ دەربڕینی ئازادانەی فیکر خۆش ئەکەن.

ئازادیخوازی وەك سیستەمێکی تێکچنراو کە پڕ بووە لە ئامانج و ئایدیالی کردەیی، لە سەدەکانی ١٧و١٨ لە بەریتانیا سەری هەڵدا. پاشان لە وڵاتانی دیکەش، حیزب و تیۆریگەلی ئازادیخواز هاتنە کایەوە کە ئەمانیش یان بۆ خۆیان گەشەیان کرد یا لاساییکەرەوەی نمونەکەی بەریتانیابوون.

ئەندێشە و ئاکاری ئازادیخوازانە لە پێشدا لە سەر دوو زەمینە جەخت ئەکات: یەکەم، وەڕەزبوون لە دەسەڵاتی ملهوڕانە و هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی شێوازیتری بە کارهێنانی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی. دووهەم، دەربڕینی ئازادانەی ئەندێشەی تاك.

هەوڵی تیۆری و سیاسەتی ئازادیخوازەکان ئەمە بووە کە ئەم دوو بنەڕەتە پێکەوە سازگاربکەن. هەوڵی لیبرالیزم لە پێشدا ئەوە بوو کە لە گەمارۆی دەسەڵاتی ئیستبدادی رزگار بین و یەکێك لە ئامانجە

PDF 4 KURD

سەرەکییەکانیشی، ئازادی و چاوپۆشی ئایینی بووە. ئازایخوازە ئەورووپییەکان لە باری ئایینییەوە یا بێباوەر بوون یا گوماندار یان دژ بە ئایین. هەموو ڕێبەرانی گەورەی جووڵانەوەی ڕۆشنبیری نوێ لەم تاقمە بوون و لە بەرامبەر دەسەڵاتی ملهوڕانەی قەشەکان ڕاوەستاون و لایەنگرییان لە"حوکمەتی عەقڵ" کردووە.

لیبراڵەکان، لایەنگری چاودێری کردنی دەسەڵاتی گشتین بە سەر کاروباری سیاسی و کۆمەڵایەتیدا واتە لە بەستێنی سیاسەت و کاروباری مەدەنی خوازیاری حوکمەتی قانون و لە بەستێنی ئابووریشدا لە بازاری ئازادی ئابووری لایەنگری دەکەن. ئازادیخوازان، خوازیاری زامن کردنی ماف و ئازادییەکانی تاك و بڵاوکردنەوەی دەسەڵات بە سەر ناوەندەکانی دەسەڵاتن و پشتیوانی خۆیان لە ئازادییە ناوچەیی و گرووپییەکان دەرئەبڕن.

یەکێك لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی لیبرالیزم، لایەنگری کردن لە ئازادی چالاکانەیە واتە ئەوەیکە تاك، دەرفەتی پەروەردەکردنی توانایی و دەربڕینی ئازادانەی بیر و بڕواکانی خۆی بۆ بڕەخسێ و لەم ڕێگاوە قازانج بگەیێنێ بە کۆمەڵگا. بۆیە لیبراڵەکان لە سەر یەکسانی ماف و ئازادییەکان و نەمانی پاوانخوازی و ئیمتیازاتی سەرمایەداران ئەدوێن و لایەنگری لە چەسپاندنی یاسا بە سەر هەموو بنەمایەکی عەقڵیدا دەکەن. بەم پێیە ئازادیخوازان، بە گشتی پێشکەوتنخواز لە ئەژمار دێن چونکا لایەنگری پێشکەوتە کۆمەڵایەتی و ئابووری و زانستی و پیشەسازییەکان بوون.

لیبرالیزم، چ لە باری تیۆری و چ وەك بەرنامەیەکی سیاسی، لە بەرایی" شۆڕشیمەزن"ی بەریتانیا لە ساڵی ١٦٨٨ بە دژی جەیمزی دووهەم، تا ساڵی ١٨٦٧ کە ڕیفۆرمە کۆمەڵایەتییەکان بوون بە قانون، بە تەواوەتی گەشەی کرد. ئەم ڕێبازە، لە سەرەتادا لە گوێن جووڵانەوەیەکی دژ بە ئیستبداد، تەنیا بۆ مسۆگەر کردنی یاسا و ئازادییەکانی تاك خەباتی ئەکرد. پاش ئەم قۆناغە، کەمتاکورتێك، ئەبێتە تیۆرییەکی ڕێك و پێکی ئابووری و سیاسی. ئازادیخوازی، هاوکات لە ئەورووپا ــ بێجگە لە بەریتانیا ــ و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بیچمی گرت. بەڵام زاراوەی لیبرالیزمی کلاسیك تەنیا بۆ لیبرالیزمی بەریتانی بە کار دەبرێت.

لیبرالیزمی بەریتانی لە پێشدا ڕووکاری ئازادیخوازی و چاوپۆشی ئایینی و چەسپاندنی یاسا و مافە سیاسییەکانی لە خۆ گرتبوو. شۆڕشی ١٦٨٨ کە یەکەم شۆڕشی لیبرالی مێژووە، ئەو ئازادییانەی کە لەماوەی یەك سەدە بە دەس هاتبوون، مسۆگەری کرد و ڕواڵەتێکی قانوونی پێ بەخشی. ئەو لیبرالیزمەی کە لە ١٦٨٩ بانگەشەی بۆ ئەکرا، لە بنەڕەتدا لایەنێکی ڕەخنەگرانە و سەلبی هەبووەو لە ئازادییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەمبەر دەستێوەردانی دەوڵەت و بە تایبەت پاشا، پشتیوانی دەکرد. زۆرترین ئامانجیشی سیاسی بووە وەك لەوەی ئابووری بێت. لەم میانەدا گرینگترین ئامانجە سیاسییەکانی بریتی بوو لە: ئازادی بیر و بڕوا و مافی نەیاریی و چەسپاندنی حوکمەتی یاسا و *جیاکردنەوەی هێزەکان**. هەر لەم ساڵانەدا هەندێ ئازادی مەدەنی وەك تەبایی ئایینی و ئازادی ڕۆژنامەکان دەستەبەر کراوە. کتێبی دووهەمی جۆن لاك بە ناوی" *دەربارەی حوکمەت*" و ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەمەریکا، گەورەترین یادگارییەکانی ...

PDF 4 KURD

قۆناغەی لیبرالیزمن.

*لیبرالیزمی ئابووری*: پاش قۆناغی یەکەم کە قۆناغی بە سەمەر گەیشتنی ئازادییە سیاسییەکان بوو، قۆناغێکی نوێ دەست پێئەکا کە تێیدا تیۆری لیبرالیزمی ئابووری وەك تەواوکەری لیبرالیزمی سیاسی ناوبردە ئەکرێ. ئابووری ناسانی لیبرالیزمی بەریتانی، بە ڕێبەرایەتی ئادام سمیت، بە تواناترین گرووپێك بوون کە تیۆری (لیبرالیزمی ئابووری)یان هێنایە ئاراوە. بە باوەڕی ئەمانە، میکانیزمی خۆبەخۆی بازاڕی ئابووری، کە پەیڕەوی قانونی خوازە و روخستنە(عرضە و تقاضا)، باشترین گەرەنتییە بۆپێشکەوتنی کاری ئابووری و هیچ لایەنێك، چ پاوانخوازانی ئازاد و چ دەوڵەت، نابێ دەستێوەردانی تیا بکا. بەڕای ئەوان، هاوبەشێتی دڵخوازانەی کەسەکان و هاوکاری نێوانیان بە پێی‌میکانیزمی بازاڕی ئازاد، کارێك ئەکات کە سوود بە هەموان بگات. ئەم تیۆرییە بووە هۆی ئەوە کە لیبڕالیزمی سیاسی بەهێز ببێ و وەك تیۆرییەکی هەمەلایەن و بەرێوجێی ئابووری برازێتەوە. تیۆری ئادام سمیت، سیستەمێکی ئازاد و غەیرە شەخسی نەبوو بەڵکوو سیستەمێك بوو کە مرۆڤی هان ئەدا، هێز و داراییەکانی بە قازانجی خۆی و کەسانی تر بخاتە گەڕ.

*لیبرالیزمی نوێ*: بەلاّم بازاڕی ئازادی ئابووری و سوودپەرەستی لە ڕادە بەدەری خەڵك نەوەك ئاواتەکانی ڕێبەرانی جووڵانەوەی ئازادیخوازی بەدی نەهێنا، بەڵکوو هاوکات لە گەڵ ئاکامەکانی شۆڕشی پیشەسازی لە باری بێعەداڵەتی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە شوێنەوارێکی دزێوی لە دوا خۆی بەجێهێشت کە گرینگترینیان لە دایکبوونی کۆمەڵێکی زۆر لە کرێکارانی هەژار لە کارخانەکان بوو(بڕوانە سۆشیالیزم).

ئینجا تەوژمی هێزە کۆمەڵایەتییە تازە پێگەیشتووەکان وایکرد لە لیبڕاڵەکان کە بە لیبڕاڵیزمی توندرەودا بچنەوە و سنوورێکیش بۆ چاودێری و کۆنتڕۆڵی دەوڵەت لە مەڕ دابینکردنی بەرژەوەندی هەموان، دیاری بکەن. چڵەپۆپەی جووڵانەوەی لیبرالیزمی ئابووری، ناوەڕاستی سەدەی ١٩ بوو کاتێك کە تەنانەت لیبراڵەکان لە گەڵ دارشتنی یاسای ئیش و کاریشدا دژایەتییان دەکرد. بەلاّم لەمەودوا زۆربەی ڕێسا کۆنتڕۆڵکەرەکانی دەوڵەت، وەك قەرارە تەندرۆستییەکان و بیمە و یەکیەتی کرێکارانیان بۆ قازانجی گشتی پەسندکرد. لیبرالیزم سەرەتا لە هەناوی کۆمەڵگاکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ڕاپەڕینێك بوو بە دژی کلێسە و ئیستبداد بەلاّم ئیستا بەشێك لە ترادیسیۆنی فیکری *کۆنەپارێزی** ڕۆژاوایی لە ئەژمار دێت و دوو حیزبی گەورەی ئەمریکای خستۆتە ژێر کاریگەرییەوە. لە هەمانکاتدا لە سەر جووڵانەوەی سۆسیال دیموکراتیش کاریگەریی داناوە.

لە بەر ئەوەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، حیزبێکی بەهێزی چەپی لە مەیدان دا نییە، لیبڕاڵ بە سیاسەتمەدارێك دەگوترێ کە خاوەنی فیکرەیەکی نزیك بە چەپییەکان و لایەنگری ریفۆرمی کۆمەڵایەتی ئابووری بێت.

**ئازادی سیاسی** آزادی سیاسی Political Freedom

بریتییە لە ماڤ هاتنە مەیدان و هاوبەشێتی تاکی کۆمەڵگا بۆ ئیدارەی وڵات، چ بە شێوەی ڕاستەوخۆ

PDF 4 KURD

لە ڕێی هەڵبژاردنی نوێنەران. ئازادی سیاسی یەکێك لە مەرجەکانی سیستەمی *دیموکراسی** لە ئەژمار دێت. بە باوەڕی مۆنتسکیو، ئازادی سیاسی بریتییەلە ئەرخەیانی فیکری هەر کەسێك بە نیسبەت سەلامەتی دەروونی خۆی. بۆ گەیشتن بەم ئازادییەش پێویست ئەکات بە جۆرێك حوکمەت دابمەزرێت کە هیچ کەس لە کەسێکی دیکە ترسی نەبێت.

**ئازادییە مەدەنییەکان** آزادیهای مدنی Civil liberties

بەو ئازادییە کەسەکی و کۆمەڵایەتییانە دەگوترێ کە دەستی بە سەر پێوەندییە مەدەنییەکانی تاکدا گرتووە و یاساش لەبەرامبەر هەرچەشنە دەستێوەردانێکیان ڕادەوەستێ، مەگەر ئەوەیکە لە گەڵ بەرژەوەندی گشتیدا ناکۆك بێت. ئازادییە مەدەنییەکان لە زاراوەی یاساییدا پێی دەگوترێ"مافەکانیتاك".

ئازادی مەدەنی، یەکێك لە چەمکە سەرەکییەکانی ئەندێشەی سیاسی دیموکراتیکی نوێیە و لە مانایێکی بەربڵاودا بریتییە لە: ئازادی تاك بۆ ئەنجامی هەر کردەیێکی شەخسی و هەبوونی ماڵ و دارایی و سوود لێوەرگرتنیان و ئازادی بڕوای ئایینی و پەرەستشی ئازاد و ئازادی بیر و باوەڕ. لە سیستەمێکی یاسامەندا قانوون لە بەرامبەر دەسدرێژ کردنی دەوڵەت یا هەرکەسێکیتر بۆ سەر ئەم ئازادییانە دەوەستێ و پشگیریان لێ ئەکات. هەندێ لە پێناسەکان، مانای ئازادی تاك تەنیا بە پاراستنی تاك و بڕوا و داراییەکانی لە بەرامبەر دەسکاری خۆخوازانەی حوکمەت دەبەستنەوە.

هەندێ جار ئازادییە مەدەنییەکان بە بڕاردە ناوبردە دەکەن، وەك ئازادی ڕادەربڕین و نووسین و بڵاوکردنەوە و سازدانی ڕێکخراوە و کۆبوونەوە بێ مەترسی یان سزادانی دەوڵەت. کاتێك ئەم ئازادییانە بە بڕاردن بێتە ئاراوە، ڕیزکردنییان بە پێی کۆمەڵگاکان جیاواز دەردێ و ناکرێ لیستێکی هاوشێوە بۆ هەموو کۆمەڵگاکان تۆمار بکرێت. بەڵام لە باری سیاسییەوە، ئازادی بیروڕا و مەرام و کۆمەڵ و ڕادەربڕین، لە جوملەی ئەو ئازادییە سەرەکییەکانەن کە تەواوی دەستوورە دیموکراتیەکان لەسەری کۆکن.

**ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی** آژانس بین المللی انرژی اتمی
International Atomic Energy Agency(IAEA)

بیرۆکەی دروسبوونی ڕێکخراوەیەکی وەها بۆ سوود وەرگرتنی ئاشتی خوازانە لە وزەی ئەتۆمی، ئەگەڕێتەوە بۆ ١٩٥٠ بە دواوە. لە ساڵی ١٩٥٣ لە سەر پێشنیازی ئایزێنهاوەر سەرکۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا، بە کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، بڕیار درا سەرچاوەیەك بۆ ئەم مەبەستە دابمەزرێت. لە ساڵی ١٩٥٤، کۆمەڵی گشتی بڕیارنامەی "ئەتۆم بۆ ئاشتی" مۆر کرد و سەرەنجام لە ٢٩ی ژووەنی ١٩٥٦ ڕەشنووسی بڕیارنامەی ئاژانس لە کۆنگرەی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمیدا پەسندکرا. ئاژانس وەك ڕێکخراوەیەکی نێونەتەوەیی سەربەخۆ، بەرپرسیاریەتی سوود وەرگرتن لە وزەی ئەتۆمی بۆ خزمەت بە ئاسایشی زیاتر بەرعۆدە گرتووە.

PDF 4 KURD

بەگشتی ئامانجەکانی ئاژانس لە دوو تەوەردا کورت ئەکرێتەوە: یەکەم، کەڵك وەرگرتنی ئاشتی‌خوازانە لە وزەی ئەتۆمی و رەونەق بەخشین و پەرەپێدانی بۆ خزمەت بە ئاشتی و تەندروستی و پێشکەوتن و بەهرەداری لە تەواوی جیهان. دووهەم، بێخەم بوون لەوەیکە ئەو هاریکاری و زانیارییانەی کە لە لایەن ئاژانسەوە ئاراستە ئەکرێ، بۆ ئامانجی سەربازی و جەنگی بە کار نابرێت.

ئەرکێکی‌تر کە بە ئاژانس سپێردراوە، ئەوەیە کە رێ خۆش‌بکات بۆ پاراستن و پیادەکردنی پەیمانی بەربەست کردنی چەکی ناوەکی (Non Proliferation Treaty (NPT. تا ئێستا بنکەی ناوەکی زۆربەی وڵاتان کەوتونەتە ژێر چاوەدێری ئاژانسەوە، ئەم چاودێریە، ٩٥٪ پێگە ناوەکییەکانی جیهان بێجگە لەو پێنج وڵاتەی کە خاوەنی چەکی ئەتۆمین ئەگرێتەوە. ئاژانس پێکهاتووە لە ٣٥ ئەندام و ناوەندەکەشی لە شاری ڤیەنای لە وڵاتی نەمسایە.

## ئاژاوەگەرێتی    غوغاسالاری    Mobocracy

فەرمانڕەوایی رووتە و پووتە و بۆرەپیاوانی سەرکێش و لاسار. ئاژاوەگەرێتی(مۆبۆکراسی) بریتییە لە حکومەتی کەسانێکی نەزان و نەفام کە لە کاتی قەیران و شۆڕش و کۆدەتا*و گۆڕانکارییەکاندا بە شێوەیەکی کاتی دەسەڵاتی وڵاتێك بەدەستەوە بگرن. لەم حکومەتەدا دەسەڵات دەکەوێتە دەست خەڵکانێکی بێ پرەنسیپ و ئاژاوەگێڕ، خەڵکێك کە بە رێگای عەقڵیاندا ناڕۆن بەڵکوو ملکەچی هەستیان بن و بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەست ئەکەن بە شەڕنانەوە و ئاژاوەگێڕی. ئاژاوەگەرێتی رووکارە گەندەڵەکەی دیموکراسی لەئەژمار دێت. لەم بارەوە هێرۆدۆت، مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی دەڵێ: هەرچەندە دیموکراسی هەموو کەس لە بەرامبەر یاسادا بە یەکسان دەزانێ بەڵام عەیبەکەشی ئەوەیە کە بە ئاسانی دەبێتە مۆبۆکراسی یا حکومەتی کەسانی نەفام و نەزان.

## ئاژاوەگێڕی    آشوبگری    Sedition

ئەم زاراوە لە زۆربەی لقەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بەکار براوە و لە هەمووشیان بەم واتایە شرۆڤە کراوە: هەر باس و کۆڵینەوەیەك چ بە نووسراوە و چ سەرزارەکی یان هەر کردەوەیەکی ناسپاسانە، بێجگە لە خەیانەت، کە ببێتە هۆی بێ متمانەیی و هاندان بۆ نافەرمانی بە دژی دەسەڵاتی دەوڵەت ئاژاوەگێڕی لە قەڵەم ئەدرێت. ئاژاوەگێڕی، جیاواز لەو جەوهەرە پەنامەکییەی کە لە گەڵ رۆحێکی سپڵە و ناسپاس ئاوێتە بووە ماهییەتی گەندەڵی ئەم ئاکارەش زیاتر ئەکات.

رەنگە ئەم واتایە کە هەندێ جار ناواخنێکی تاوانبارانە لە خۆ دەگرێ، لە هەر کام لە وڵاتان بە جۆرێك پێناسە بکرێت بۆ وێنە لە بەریتانیا، تەواوی ئەو کردارە ئاژاوەگێڕانەی کە تەشەنە ئەدەن بە نارەزایەتی لە حوکمەت و دەسەڵاتداران و دەلالەت ئەکەن بە سەر وەرچەرخاندا بە ئاژاوەگێڕی ناوبردە دەکرێ. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئاژاوەگێڕی، بە پێی یاسای فیدراڵی یارمەتی گەیاندن بە رووخان یا رماند

PDF 4 KURD

حوکمەت پێناسە دەکەن.

لەم وڵاتەدا هەوڵ دراوە ئاژاوەگێڕی لە کاتی شەڕ و ئاشتی لێك جیا بکەنەوە. ئاژاوەگێڕی لە کاتی شەڕدا بریتییەلە تێکدانی ئاسایشی کۆمەڵایەتی بە نووسین یا بە کردەوە بەڵام لە کاتی ئارامی و ئاشتیدا رەنگە زۆربەی ئەم کارانە ئاژاوەگێڕی لە قەڵەم نەدرێ.

**ئاژیتاسیۆن: بڕوانە هاندان.**

**ئاسایش** امنیت Security

١ـ زامنکردنی هێمنایەتی و ئۆقرەیی لە رێگەی بەڵێنە سیاسیەکان بۆ کەمکردنەوەی مەترسی سەرهەڵدانی شەڕ. ٢. خۆ پاراستن لە مەترسی دەسدرێژی کردن بۆ ئازادی و مافە رەواکان. ٣ـ ئەرخەیانی و هەبوونی متمانە لە مەڕ ئاسایشی جەستە و گیان و ماڵ و شەرەف و نامووس. لە زاراوەی سیاسی و مافەکاندا بەم شێوازانەی خوارەوە بە کار براوە:

ئاسایشی تاك، ئاسایشی کۆمەڵایەتی، ئاسایشی نەتەوەیی و ئاسایشی نێونەتەوەیی.

**ئاسایشی تاك** امنیت فردی Individual security

حاڵەتێکە تاك تێیدا لەوە ناترسێ گیان و ماڵ و ئابرووی لە دەس بات، بە جۆرێك کە نەتوانێ بژی.

**ئاسایشی کۆمەڵایەتی** امنیت اجتماعی Social security

کاتێك کۆمەڵ ئەرخەیان بێت لە هەڕەشەیەك کە دەرەنجامی کردەوەیەکی نایاسایی دەوڵەت یان دەزگا یان تاکێك دەرحەق بە تەواوی کۆمەڵگا بێت. لە سیستەمی مافەکانی نوێدا، مەفرووزە کە یاسا، بە پەسندکردنی قانوون و بە رەسمییەت ناسینی مافەکانی تاك و سزادانی تاوانباران، ئاسایشی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی دەپارێزێ(بڕوانە ئازادییەمەدەنییەکان). دادگا و پۆلیسیش بەڕێوەبەری یاسایە و تاك و کۆمەڵگا لە بەرامبەر فەشەل هێنان بە یاسا و بێ قانوونی دەپارێزن.

**ئاسایشی گشتی** امنیت جمعی Collective security

بنەڕەتی پاراستنی ئاشتی نێونەتەوەیی یە کە هەوڵ و دەوڵی هاوتەریبی وڵاتان بە تایبەت هەوڵی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان و لە سەرووی هەموویانەوە نەتەوە یەکگرتووەکان، زامنیەتی.

**ئاسایشی نەتەوەیی** امنیت ملی National security

حاڵەتێکە کە نەتەوەیەك، لەوە ناترسێ بەشێك لە حەشیمەت یان دارایی یان خاکی وڵاتەکەی لە دەست

PDF 4 KURD

بچێ. یاسا نێونەتەوەییەکان ئیمڕۆکە کارێکی وایان کردووە کە سنووری ماف و ئازادی دەوڵەتەکان دیاری بکرێ و نەهێڵێ وڵاتەکان دەسدرێژی بکەن بۆ سەر یەکتر. بەڵام دەزگایەك کە بتوانێ وەك یاسای ناوخۆیی زامنکەری بە حەقدار گەیشتنی مافەکان بێت، لە ئارادا نییە. ئێستا، کەم و زۆر لە هەموو وڵاتەکان جۆرێك پۆلیسی سیاسی یان ئاسایش لە کاردایە کە ئامانجیان بەرگری کردنە لە دزەکردنی سیخوڕ و کەسانی مەترسیدار بۆ ناو وڵات.

جا هەرچی ڕژێمەکە زیاتر توتالیتەر بێت، ئەوا دەسەڵاتی پۆلیسی سیاسی و ڕادەی زەبر و زەنگ زیاتر دەبێت. ئەم جۆرە ڕژێمانە چونکا دەرفەتی نەیاریکردنی ئاشکرا و یاسایی بە کەس نادەن، نەیاران یا دوژمنانی خۆیان بە بیانووی «دوژمنانی ئاسایشی نەتەوەیی» سەرکوت ئەکەن.

**ئاسایشی نێونەتەوەیی** امنیت بین المللی International security

حاڵەتێکە کە تێیدا هاوکێشە لە نێوان دەسەڵاتەکان بەرقەرارە و کەس دەستدرێژی ناکا بۆ هەرێمی ئەویتر. هەرکاتێك یەکێك لە دەوڵەتەکان ئەم کارەی کرد، لە ڕوانگەی دەسەڵاتی نەیارەوە«ئاسایشی نێونەتەوەیی کەوتۆتە مەترسییەوە» هەرکاتێکیش ئەم شتە ڕووی دا، مانای وایە مەترسی هەڵگیرسانی شەڕ هەیە.

**ئاشتی** صلح Peace

١ـ حاڵەتی ئارامی و ئاسایشی گشتی لە وڵاتێك و پێوەندی ئاسایی لە گەڵ وڵاتانی دیکە. ٢ـ نەبوونی شەڕ و نەبوونی سیستەمی هەڕەشە. نەبوونی شەڕ واتە پەرەپێدان بە هاریکاری و پێوەندی نێونەتەوەیی. تەنیا ئاشتی دەتوانێ ڕێز لە مافی مرۆڤ بگرێ، ڕادەی ئەو ڕێبەرانەی کە دەم لە ئاشتییەوە دەدەن، گەلێك زۆرن بەڵام بە هۆی ترس لە چەك داماڵین*ی یەکلایەنە، گفتوگۆ لەمەڕ ئاشتی هەمیشە سەرکەوتوو نەبووە، چونکا لایەنی بەرامبەر متمانەی بە ئەویدی نەبووە. لەمڕووەوە بەرنامەی بەرهەمهێنان و پرچەککردنی خۆیان درێژە پێدەدەن، ئەمەش پاڵنەرێکە بۆ شەڕ و هەڕەشە لە ئاشتی دەکات.

**ئاشتی پرچەك** صلح مسلح Armed Peace

لە ساڵی ١٨٧١ کە ئەڵمانیا بەسەر فەرەنسادا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، تا ساڵی ١٩١٤ کە شەڕی جیهانی یەکەم هەڵگیرسا لە نێوان دەوڵەتانی ئەورووپی هیچ شەڕێك ڕووی نەدا بەڵام لە ماوەی ئەم ٤٣ ساڵەدا ئەم وڵاتانە بە گەرمی سەرقاڵی پرچەککردن و پشتئەستوورکردنی خۆیان بوون کە ئەم زەمەنە بە قۆناغی ئاشتی پرچەك ناوی دەرکردووە.

**ئاشتیخوازی** صلح‌خواهی /صلح‌طلبی Pacifism

حەزکردن بە ئاشتی و بێزار بوون لە بەکار هێنانی هێزی سەربازی بە تایبەت لە نێوان نەتەوەکا

PDF 4 KURD

سەرەتادا بە کەسانێکیان دەگوت ئاشتی خواز کە پێیان وابوو ئەکرێ لەبری شەڕ و ئاژاوە کاری دیکە (ناوبژیوانی و دادوەری) ئەنجام بدرێ.

ویلسۆن، (١٨٥٦ـ ١٩١٩) سەرۆك کۆماری ئەمریکا و لایەنگرانی دیکەی دامەزراندنی کۆمەڵی نەتەوەکان(١٩١٦ـ ١٩١٩) بە ئاشتیخواز ناویان دەرکرد چونکا ئەمانە شەڕیان نەك هەر بە بێ ئەخلاقی دەزانی بەڵکوو بە خاپوورکەری شارستانییەتیان لە قەڵەم ئەدا. بەم حاڵەش ئەم کەسانە، سڵیان نەکرد لە بەکارهێنانی هێز و زەبر و زەنگ بەدژی ئەو وڵاتانەی کە شەڕخواز بوون. ئامانجیان ئەوە بوو کە هێزی وڵاتانی دیکە بخەنە گەڕ بۆ خزمەت کۆمەڵگایەکی نێونەتەوەیی. بەم پێیە ئەکرێ لە بری ئاشتیخواز بە«ئەنتەرناسیۆنالیست»* لە قەڵەم بدرێن.

واتایەکی تری ئاشتیخوازی، ئەگەڕێتەوە بۆ ئاکاری ئەو کەسانەی کە حازر نابن لە هیچ هەلومەرجێکدا بچنە خزمەت هێزی سەربازی بۆ ئەوەی بە دژی نەتەوەیەکیتر، شەڕ بکەن. بەم جۆرە ئاشتی خوازییە ئەڵێن ئاشتی خوازی شەخسی یان ئەخلاقی کە لە ئاخێزگەیەکی ئایینییەوە سەری هەڵ داوە(وەك مۆژگارییەکانی ساتیا گراها، بە ڕێبەرایەتی گاندی لە هیندوستان کە بۆ چەند ساڵێك، بوو بە بنەمای سیاسەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە).

واتایەکی تری ئەم زاراوە ئەگەڕێتەوە بۆ کەسانێك کە لەبەر هۆکاری ئەقڵی، شەڕ بە ناڕەوا دەزانن. ئەمانە پێیان وایە کە شەڕ، دوو لایەنەکە ئەخاتە دۆخێکی ئاستەنگ و دوژمنکارانەوە و لە سەر ئەم بڕوایەن کە بۆ گۆڕینی ئیرادەی دوژمن ئەبێ سەبر وئارام بگرن و چالاکانە هەوڵ بدرێ ئەم دژبەرەکییە لەناو بچێت. ئەم جۆرە ئاشتیخوازییە، بە ئاشتیخوازی سیاسی یان ئەقڵی پێناسە کراوە. هەندێ لە نووسەرانی سەردەمی شەڕی جیهانی دووهەم، لایەنگری ئەم جۆرە ئاشتیخوازییە بوون.

تا ئێستا هیچ دەوڵەتێك ئاشتیخوازی وەك سیاسەتی رەسمی و هەمیشەیی خۆی دەستنیشان نەکردووە. بەڵام ئەم بیرۆکە لە مابەینی دوو شەڕەکە لە ئەورووپا لایەنگرانێکی زۆری بە خۆوە دی و هەندێکی زۆری بە دژایەتی لە گەڵ کۆکردنەوەی چەك و تەقەمەنی هاندا. کەچی بە هەڵگیرسانی شەڕی دووهەم، لە رادەی ئەم لایەنگرانە کەم بۆوە و بە رادەی لایەنگرانی سەربازیگەری زیاد بوو. پاش داهێنانی بۆمبی ناوەکی لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم و دروسکردنی جبەخانەی ئەتۆمی، ئاشتیخوازی بوو بە بزاوتێکی بەهێز دژ بە چەکی ناوەکی و گەلێك لە زانایانی بەناوبانگی جیهانیشی بەم خەباتەوە گلاندووە. تەنانەت ئەو کەسانەش کە لە گەڵ شەڕی ئاسایی دژایەتییەکیان نەبوو، بەم کارەوە هەستاون.

**ئاگربەس**   آتش بس   cease-fire

کۆتایی هێنان بە شەڕی چەکداری بە پێی بنەڕەتەکانی(دەست کێشانەوە لە شەڕ). بە زمانی دیپلۆماسی هاوچەرخ، ئەم زاراوە کاتێك بە کار دەهێنن کە لە گفتوگۆکاندا دو لایەنی شەر نەتوانن بڕیاری رەسمی دەست هەڵگرتن لە شەڕ مۆربکەن.

PDF 4 KURD

**ئاڵا** پرچم **Flag**

ئاڵا باڵانوێنی دیاریکراوی ڕەسمی نەتەوەیەکە. ئەم هێمایە کە تەواوی نەتەوەکانی کۆمەڵگەی جیهانی بە دەستیان هێناوە، زانیارییەکی گرینگ دەربارەی مێژوو، خەون و ئاوات، حەز و ئامانجەکانی نەتەوەیەك ئەخاتە بەردەم ئینسان. ئاڵا نیشاندەری سروشتی دەروونی و زەینی نەتەوەیە و شوناسی ئەو نەتەوە پێناسە ئەکات. ئاڵای نەتەوەیەك وێنای دەرهەستی(ئەبستراك) ئینسان بۆ نەتەوە، لەبار و گونجاو دەکات. ئاڵای نەتەوەیی لە مێژووی هێماییی نەتەوەکاندا قۆناغێکی نوێ دێنێتە ئاراوە.

گەلێك پێش سەرهەڵدانی نەتەوەکان هۆز و عەشیرە سەرەتاییەکان بە شوێن نیشانە و هێمای جیاوازەوە بوون بۆ ئەوەی ئەوان لە هۆز و عەشیرەکانی دیکە جیا بکاتەوە. بنەماڵە شانشینەکانی سەردەمی کۆن و مێژینەش، خۆیان بە هێمایین کردنی شتەکان سەرقاڵ ئەکرد. بەیداخ و پێوانەکانی سەردەمانی دوای قوناغی سەرەتایی، ئەم غیرەتەی ئەخستە بەر دەسەڵاتداران کە شوناسی خۆیان بە سەر چینی ژێردەست داسەپێنن بۆ وێنە فیرعەونەکانی میسر، هەمیشە لە خەڵکی ژێردەستی خۆیان دەویست کە نیشانەی فیرعەون بە خۆیانەوە هەڵواسن. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەیداخ، هێندە پەیوەست بوو بە ڕەوابوون و شەرعییەتی دەسەڵاتدارەوە کە گرتنەوەی بەیداخی ئەرتەش یان بنەماڵەیەکی پاشایی بە مانای بێدەست مانەوە و لووت شۆڕبوونەوەی فەرمانڕەوای وڵاتێك لە قەڵەم ئەدرا.

لە سەردەمی ناسیۆنالیزمدا (سەدەی هەژدە) هەر دەوڵەتێك کۆمەڵێك هێمای بۆ خۆی دیاریکرد کە لەو ناوەدا ئاڵای نەتەوەیی لە هەمووان بەرجەستەتر بوو. بۆ ماوەیەکی زۆر ئاڵای نەتەوەیی تەنیا پێوەندی بە ڕێبەرانی نەتەوەیەك بوو بەڵام بەگشتی چ ئێستا و چ ڕابردوو، هێمایەك بووە بۆ ئایدیال و ئاواتەکانی نەتەوەیەك وەك لەوەیکە بەیداخی بنەماڵەیەکی پاشایی بووبێت. هەندێ لە توێژەران پێیان وایە کە ئاڵای وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕاستیدا بووە هۆی گەڕانەوەی ئاڵا ئەتنیکییەکانی خەڵکی ئەمریکا بە خۆیان چونکا ئاڵای نەتەوەیی ئەم وڵاتە زیاتر لەوەیکە پێناسەکەری فەرمانڕەوا یان حاکمێك بێت، وەها بە تەرزێکی زیرەکانە نەخشاوە کە دەرخەری پلانێکی نوێی سیاسی بێت. ئەم ئاڵایە کە لە شۆڕشی ئەمریکادا (١٧٧٥-١٧٨٣ ) لە دایك بوو، ستراکتووری نوێی ئەم دەوڵەتە نیشان ئەدات، ئەو هێڵ و ئەستێرانە بە مانای یەکگرتوویی ویلایەتەکانە بە چەشنێك کە هەموو هاووڵاتیانی ئەمریکا حەزیان دەکرد ئاڵاکە وەشەکێنن. ئەم ستراتیژییە سیمبولێکی زیندووی جڤاتی لە بەرامبەر دەسەڵاتداران بەدیهێنا.

بۆ بێخەم بوون لەوەیکە ئاڵای نەتەوەیی هێمایەکی وەرەبزوێن و زیندوو بمێنێتەوە، ڕێبەرە نەتەوەییەکان کارێك ئەکەن کە هەمیشە ئاڵاکە لە بەر چاوی جەماوەر بێت. دەوڵەتەکان بە شێوەیەکی فەرمی دامودەزگا ڕەسمی و ئیدارییەکان بە ئاڵا دەنەخشێنن. قوتابییەکان پێمل ئەکرێن کە هەر لە سەرەتاییەوە تاکوو دواناوەندی سوێند بە ئاڵا بخۆن.

توێژینەوە پێمان دەڵێ کە نەتەوە دەوڵەمەند و بەهێزەکان، حەز بەوە ئەکەن کە تەرح و تۆماری ئاڵاکەیان شتێکی سادە و ساکار بێت و ئاڵ و واڵا نەبێت کەچی ئەو نەتەوانەی کە لە ناوەندەکانی دەسەڵات

PDF 4 KURD

نێونەتەوەیی بەدوورن، حەز بە ئالآیێکی ئالۆز و پێچەڵپووچ ئەکەن.

**ئانتی سمیتیزم:** بڕوانە جوولەکە قڕان.

**ئایدیۆلۆجی** ایدئولوژی Ideology

لە زمانی فەرەنسەدا بریتیە لە idee بە مانای وێنا (تصور) و ئەندێشە logie بە مانای ناسین. لە زاراوەی سیاسیدا بریتیە لە فەلسەفەیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە تێیدا کردە و بیر بە یەك ئەندازە گرنگایەتییان هەیە. ئایدیۆلۆجی سیستەمێکی ئەندێشەیە کە هەم دەخوازێ جیهان شەرح بکات و هەم ئاڵوگۆڕی تیا بەدی بێنێت. بە واتایەکی‌تر هەر ئایدیۆلۆجیایەك شێوازێکی خەیاڵی لە کۆمەڵگا ئەدا بەدەستەوە و لە لایەنگرانی خۆی چاوەڕوانی ئەوە ئەکات ئەو شێوازە تۆمار بکەن.

ئەم زاراوە یەکەم جار لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسە و لە لایەن دێستوت دوتراسی (١٧٥٤-١٨٣٦) بیرمەندی فەرەنسی، لە ساڵەکانی ١٧٩٦ و ٩٨ بەکار برا. بۆ ئەم زاراوە چوار مەبەست ناوبردە کراوە: یەکەم، مەبەستی تراسی بوو کە بە مانای«ئەندێشە ناسی» یان «زانستی ئەندێشەکان» شرۆڤەی کردبوو. دووهەم، شێوازێکی پابەندی بە کۆماری‌خوازی لیبراڵ. سێهەم، مانایەکی سووکایەتی‌ئامێز بە مانای ئیفلیجیی فیکری و ڕەفتاری و هەروەها جۆرێك لە رادیکالیزمی ترسناك و سەرەنجام، مەبەستێکی کەم بایەخ یا ڕەنگە ڕازاوە، ئەویش بە مانای «دوکتۆرینی سیاسی».

تراسی، وەك زۆربەی فەیلەسوفانی فەرەنسی چاخی ڕۆشنگەری پێی وابوو کە ئەبێ لە گەڵ هەموو ئەزموونە مرۆییەکان ـ کە زۆربەیان پێشتر لە بەستێنی زانستی خواناسی و یەزدان پەرستیدا شرۆڤە ئەکران ـ بە شێوەیەکی عەقڵانی هەڵسوکەوت بکرێت. بیرۆکە گەردونییەکان ڕەت بکرێنەوە و هەموویان بکرێن بە «هەست». بەڕای تراسی، ئایدیۆلۆجی، تیۆری تیۆرییەکان بوو.

هەندێ مێژوونووسی فەلسەفە، سەدەی نۆزدەیان بە «سەردەمی ئایدیۆلۆجی» ناوبردە کردووە. هۆی ئەم ناولێنانەش پەرێشانی ئەندێشەگەلێکن کە دەکرێ بە «ئایدیۆلۆجیك» پێناسە بکرێن چونکا لە ناویاندا جەخت کردن لە سەر کردە بەهێزتر بووە لە یاری کردن بە تیۆری فەلسەفی.

ئایدیۆلۆجی، جاری واهەیە مانایەکی پوختە لە خۆ دەگرێ و هەندێ جاریش مانایەکی ناپوختی هەیە. بە واتا ناپوختەکەی، بریتییە لە هەر جۆرە تیۆرییەك کە لە سەر کردە چەق ئەبەستێ یان هەر تەقەلایەك بۆ نزیك کەوتنەوە لە کێشە سیاسییەکان لە ژێر تیشکی دەزگایەکی ئایدیۆلۆجیدا. بەڵام مانا پوختەکەی هەمان شرۆڤەی تراسی‌یە کە پێنج تایبەتمەندی لە خۆ دەگرێ: (١) ئایدیۆلۆجی، تیۆرییەکی تۆخە لە بارەی مرۆڤ و کۆمەڵگا و جیهانی دەرەوە. (٢) بۆ ڕێکخراوەی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی، تیۆری و پرۆگرامێکی گشتی ئاراستە ئەکات. (٣) گەیشتن بەم پرۆگرامە هەڵگری خەباتێکی تایبەتە. (٤) بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، نەوەك خەڵك هانئەدات، بەڵکوو بە شوێن خڕکردنەوەی لایەنگری وەفادارە و حەزیش بە «سەرسپوردە»ئەکات. (٥)

PDF 4 KURD

زیاتر بە شوێن ڕەشەگەلەوەیە بەڵام لە ڕێبەرایەتی کردنی ڕۆشنبیرانیشدا ڕۆڵێکی تایبەت دەگێڕێت.

بە پێی ئەم پێودانگانە ئەکرێ سیستەمگەلی جۆراوجۆری فیکری بە ئایدیۆلۆجی لە قەڵەم بدرێ. لە «زانستی ئەندێشەکان»ی تراسی‌یەوە بگرە تا پۆزیتۆڤیزمی فەیلەسوفی فەرەنسی، ئۆگۆست کۆنت و کۆمۆنیزم و جۆرەکانی سۆشیالیزم و فاشیزم و نازیسم و هەندێ لە ڕێبازەکانی ناسیۆنالیزم. ئەوەیکە تەواوی ئەم سیستەمە فیکرییانە، ئەگەڕێنەوە بۆ سەدەی نۆزدە و بیست، مانای وایە کە هیچکامیان کۆنتر لە خودی وشەی ئایدیۆلۆجی نین و هی سەردەمانێکن کە ئیمانی سەرزەمینی، چۆتە جێی ئیمانی ئایینی و ئاسمانی و کرداری کۆمەڵایەتی و سیاسیش چۆتە جێی بیرۆکەی فەلسەفی.

مارکس لە هەندێ لە وتارەکانی تاڤ لاوییدا بە تایبەت لە کتێبی *ئایدیۆلۆجی ئەڵمانی*، ئایدیۆلۆجی بە واتایەکی دزێو و جنێو ئامێز بە کار ئەبات. مارکس لەم کتێبەدا ئایدیۆلۆجی بە مانای "زرە وشیاری" یان «وشیاری درۆ» لێك ئەداتەوە. بەم پێیە ئایدیۆلۆجی، کۆپلە مەرامێکە کە خەڵك خۆیانی پێ فریو ئەدەن و وێنایەکی ناڕاستی جیهان دەئاخنێتە مێشکیانەوە. بە باوەڕی مارکس ئایدیۆلۆجی، ڕوانگەیەکە کە خەڵك بەو پێیە جیهان مانا دەکەنەوە ئەگەرچی پێوەندییەکیشی بە واقیعەکانەوە نەبێت. هەر ئایدیۆلۆجیایەك، جیهانبینیەك ناونووس ئەکرێت کە تەنیا بەرژەوەندی و خواستەکانی چینێکی کۆمەڵایەتی دەستەبەر ئەکات، لە بەر ئەوە، پێوەندی لە گەڵ واقیعی جیهان و ڕەوتی هەقیقی مێژوو ڕێژەیی‌یە و پابەندە بەو قۆناغە کۆمەڵایەتی - مێژووییەی کە ئایدیۆلۆجی تیا لە دایك ئەبێت. کەواتە هەر چینێکی کۆمەڵایەتی لە هەر قۆناغێکی مێژووی‌دا هەڵگری ئایدیۆلۆجی یان«جیهان‌بینی»* تایبەتی خۆیەتی. هەڵبەت مارکس وانەبووە کە هەمیشە ئایدیۆلۆجی بە مانا دزێوەکەی لێك بداتەوە جاری واش بووە جۆرێك شرۆڤەی کردووە کە بتوانێ هەڵگری هەقیقەتیش بێت.

مارکسییەکانی سەدەی بیستەم کە مانا دزێوەکەی ئایدیۆلۆجیان پشت گوێ خستووە، بۆ مارکسیزم وەك ئایدیۆلۆجی ئەڕوانن و بە «ئایدیۆلۆژی چینی کرێکار»ناوبردەی ئەکەن کە بە باوەڕی ئەوان هەڵگری هەقیقەتە ئەزەلی و ئەبەدییەکانی مرۆڤ و جیهان و مێژوون.

لە هەندێ لە وڵاتانی کۆمۆنیستی‌دا «ئەنستیتۆی ئایدیۆلۆجییایی» بەرپاکراون و بە فەیلەسوفە حیزبییەکانیش ئەڵێن«ئایدیۆلۆگ»*. مارکسیزم ـ لینینیزم نموونەیەکی تۆخی ئایدیۆلۆجییە.

کاتێك هەنگاو دەنێینە سەدەی بیستەوە جەمسەری ئایدیۆلۆجی لە قوتابخانەی مارکسیزم ئاڵۆزتر ئەبێت. بە هاتنە مەیدانی بیرمەندانێکی وەك لۆکاچ، مەتریالیزمی دایەلیکتیك لە گوێن ئایدیۆلۆجییایەك پەسند ئەکرێ. لۆکاچ پێی وایە، ئایدیۆلۆجی زۆر زیاتر و قووڵتر لەو شتەی کە لینین بیری لێئەکردەوە، لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ڕیشەی داکوتاوە. گرامشی، وردبینانەتر لە گەڵ چەمکی ئایدیۆلۆجی ڕووبەڕوو ئەبێتەوە. بە باوەڕی ئەو هەژمۆنی* سەرمایەداری تەنیا لە سەر زۆر و ستەم ڕانەوەستاوە بەڵکوو بە شێوەیەکی هونەرمەندانە لە سەر ڕێبەرایەتی کردنی ئەندێشەکان لەنگەری گرتووە. ئایدیۆلۆجیای چینی دەسەڵاتدار، لە مێشکی شارۆمەندی مامناوەندیدا ئەبێتە شتێکی ڕەشۆکییانە و پەسند

PDF 4 KURD

ئەكرێت. دەسەلات تەنیا یاسایەكی وشك و تۆسن یان ستەمكاریی نییە بەڵكوو حاكمییەتی زمان و ئەخلاق و كەلتوور و عەقڵی گشتی و عەقڵی سەلیمە. رەشەگەل بە دەروونی كردنی هەژمۆنی* ئایدیالەكان، سەركوت ئەكرێن.

مانهایم، یەكێكی تر لەو بیرمەندانەیە كە لە ساڵەكانی كۆتایی شەڕی جیهانی دووهەم(١٩٤٥)، لە سەر ئایدیۆلۆجی تێفكرینی بووە و لە راستیدا رێگای بۆ قۆناغێكی تری ئەم چەمكە خۆش كرد كە دواتر بە ناوی «كۆتایی ئایدیۆلۆجی» لە قەڵەم درا. كۆتایی پێهاتنی ئایدیۆلۆجی بریتی بوو لە تێكەڵبوونی بە كاوەخۆی ئایدیۆلۆجی و چالاكی سیاسی لە لقە ئەكادمییەكانی كۆمەڵناسی. قوتابخانەی «كۆتایی ئایدیۆلۆجی» بەرهەمی "شەڕی سارد"* بوو كە لە هەشتاكانەوە وەك زریانێك هەڵوەشانەوەی كۆمۆنیزم لە ئەورووپای رۆژهەلات و گەڕانەوە بۆ ئابووری بازاڕی ئازاد ی بە دوا خۆیدا هێنابوو. كۆتایی ئایدیۆلۆجی هاوكات بوو لە گەڵ بە قارەمان بوونی«كۆمەڵناسی» بە تایبەت كۆمەڵناسی ئەمەریكی چوونكە جیهانی بەوە دڵخۆش كردبوو كە سەردەمی خورافە بە سەر چووە و ئەبێ زانست بایەخدار بێت. ئەم تەعبیرە گەڕانەوەیەك بوو بۆ ئەندێشەكانی تراسی. چونكا ئەویش پێی وابوو كە ئایدیۆلۆجی زانستی سڕینەوەی خۆرافاتە. كەچی لە كۆمەڵناسی ١٩٥٠ بەملاوە ئایدیۆلۆجی خۆرافەیەك بوو كە پێویستی بە سڕینەوە نەبوو.

لە لایەكی ترەوە لایەنگرانی تیۆری كۆتایی ئایدیۆلۆجی، نەیانتوانیبوو بە جێی ئایدیۆلۆجی، ئەڵتەرناتیڤێك پێشنیاز بكەن. بەم بۆنەوە مەك ئینتایەر، بە هۆشمەندییەوە وتی: لە راستیدا كۆتایی ئایدیۆلۆجی، بێئەوەی كە بە هەقیقەت كۆتایی هاتن بە ئایدیۆلۆجی بێت، خۆی ئایدیۆلۆجییا و تەشكێك لە لیبرالیزمی پراگماتیكی لە ئەژمار ئەهات.

ئەمێستا گولۆڵەی ئایدیۆلۆجی زۆر ئاڵۆزە و كەوتۆتە لێژییەوە. یەكێك لەو جەمسەرانەی كە ئێستاش نەكراوەیە، دژایەتی نێوان هەقیقەت و ئایدیۆلۆجییە. كاری ئایدیۆلۆجیا بە بەڵگاندن سەر ناگرێ بەڵكوو زیاتر كاری داكۆكی كردن و جەخت كردن و ئەرەمانی(تجوین)یە.

**ئایدیۆلۆگ** ایدئولوگ Ideologue

بە مانای كەسێك كە لە ئایدیۆلۆجیایەك سەردەرچوو بێت و لەم بارەوە بۆ خەڵكانیتر سەرچاوە بێت.

**ئۆپۆزیسیۆن/بەرهەڵستكار** اپوزیسیون Opposition

بە زمانی فەرەنسی بە واتای «نەیاری» یان «نەیاران» بەلام بەگشتی بریتییە لە هەوڵ و تەقەلای ئەنجومەن، حیزب، گروپ و جەماوەر یان كەسانێك بۆ گەیشتن بە ئامانجگەلێك بۆ نەیاری كردن لە گەڵ ئامانجی دەسەلاتدارانی سیاسی و ئابووری و كۆمەلایەتی، جا چ لە رێی پەرلەمانەوە بێت چ بە شێوازەكانیتر. بە واتایێكی سادە « ئۆپۆزیسیۆن» ناوێكە بۆ گروپێك كە لە سیستەمێكی پەرلەمانیدا بە پێی دەستوری بنچینەیی بوونی بە رەسمییەت ناسراوە و لە پەرلەماندا گروپێك بۆخۆی دائەمەزرێنێ بەلام

PDF 4 KURD

سەروپێوەنی بە حوکمەتەوە نییە و پشتیوانی لێ ناکا کەچی هەردوولا خۆیان بە وەفاداری دەستورێکی بنچینەیی دەزانن. ئۆپۆزیسیۆنی پەرلەمانی بە بەشداریکردن لە گفتوگۆکان و راوێژی نێو پەرلەمان بە پێی ئەو مەرجانەی کە دەستوری بنچینەیی دیاری کردووە، بەسەر کاروباری حوکمەتدا چاودێری راستەوخۆی هەیە و رای گشتیش لە ئەنجامی کارەکان ئاگادار ئەکاتەوە.

گرینگترین ئەرکی ئۆپۆزیسیۆن ئەمەیە کە دەرفەتی چەشنێکی دیکەی هەڵبژاردن ئەخاتە بەردەمی دەنگدەران بۆ ئەوەی بەم بۆنەوە هەڵبژاردنێکی لەبارتر بەرێوە بچێت. ئۆپۆزیسیۆن هێمایێکە بۆ حوکمەتی داهاتوو. بەم پێیە ئۆپۆزیسیۆن بەشێکی تەواوکەری سیستەمە پەرلەمانییەکانی وڵاتانێکی لیبراڵی کۆنباو وەك بەریتانیا و فەرەنسە و سویدە کە بەزۆری دوو حیزبی سەرەکی بە نۆبە، رۆڵی دەسەڵاتدار و ئۆپۆزیسیۆنی تێدا ئەگێرن. لە سیستەمە تاك حیزبییەکاندا ئۆپۆزیسیۆن بە شێوەی رەسمی و یاسایی هەبوونی نییە. لەم سیستەمانەدا هەر چەشنە نەیارییەك لە گەڵ حیزب و دەوڵەتی دەسەڵاتدار بە واتای نەیاریکردن لەگەڵ نەزمی گشتی و دەستوری بنچینەیی لە ئەژماردێت.

لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا بە هۆی هەبوونی سیستەمی سەرکۆماریی، پێویست ناکا لە پەرلەمان زۆرینەیەکی یەکدەنگ هەبێت چونکا لامەرکەزی بوونی حیزبەکان رێگا لە دامەزرانی فراکسیۆنی یەکدەنگ ئەگرێت، هەربۆیە لەم وڵاتەدا ئۆپۆزیسیۆن وەك دەزگایەکی پەیوەست بە دەستوری بنچینەیی بەدی ناکرێ و لەبەرئەوەی هاوچەشنیەکی فراکسیۆنی لە ئارادا نییە، بۆ مەسەلە بنچینەییەکان ناکرێ ئەم بابەتە بەرتەسکە بێتە ئاراوە.

سیستەمی سەرکۆماریی (بروانە سەرۆك کۆمار) دەرفەتی ئەوە ئەدات کە زۆرینەی پەرلەمان سەر بە حیزبێك بێت و سەرۆك کۆماریش سەر بە حیزبەکەی تر، ئەم دووانەش هاریکاری یەکتر دەکەن و ئەم دۆخەش لە مێژە لە و وڵاتەدا هاتۆتە کایەوە.

یەکەم ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی لە سەدەی ١٨ی زایینی لە بەریتانیا لە نێوان دو گروپی (ویگ و توری) پێك هات کە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبووە و زۆرجاریش هاودەنگ بوون. شەڕی زۆرینە و کەمینە و جێبەجێ بونی حیزبی دەسەڵاتدار و حیزبی نەیاریش لەباری سیاسیەوە زیاتر روکارێکی شەخسی بووە تاکو گشتگیر.

لە سیستەمی پەرلەمانیدا ئۆپۆزیسیون دەورێکی وادەگێرێ کە لە تیۆری کلاسیکی جیاکردنەوەی هێزەکان *(تفکیك قوا)دا ئەم دەورە بۆ پەرلەمان لەبەر چاو گیراوە. چونکا لەو کاتەوە سیستەمی پەرلەمانی هاتۆتە کایەوە، بەزۆری سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی پەرلەمان یا یەکێك بون یا یەکگرتوو کە ئەم یەکبوونە وایکردووە ئەرکی پەرلەمان کە چاودێری کردنە بە سەر دەستوور و یاساداناندا بگۆڕێ و بەم بۆنەوە ئۆپۆزیسیۆن بتوانێ بە سەر دەوڵەتدا چاودێری بکا.

**ئۆپورتونیسم:** بروانە هەلپەرەستی.

PDF 4 KURD

ئۆپێك: بڕوانە ڕێكخراوەی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت.

**ئۆتۆكراسی** یكە سالاری Autocracy

دەسەڵاتێك بەم تایبەتمەندیانەی خوارەوە:

١) فەرمانكردنی ڕاستەوخۆی كەسێك بەسەر باڵاترین پلەی ئیداری وڵاتێك. ٢)نەبونی یاسا و نەریتێك بۆ چاودێری كردن بەسەر كردارەكانی فەرمانڕەوادا.

٣) دەسەڵاتی فەرمانڕەوا لە هەركارێكدا بێ سنوور و بێ جڵەوە.

ئۆتۆكراسی ڕەنگە بە پێی وەفاداری دەرونی فەرمانبەر بە فەرمانڕەوا بێت یان لە ڕوی ترس و خۆفەوە بێت. ئۆتۆكرات، ڕەنگە دەسەڵاتی خۆی لە ڕێی داب و نەریتی كۆمەڵایەتی(میرات و جێماوە) یان بە زۆرەملی بە دەستی هێنابێ. كە لە شێوازی یەكەمدا ئۆتۆكراسی ڕەوایە و لە شێوازی دوهەمدا دیكتاتوریەتە. حوكمەتە ئیستبدادییەكان(بڕوانە ئیستبداد) لە چەشنی ئۆتۆكرات لە ئەژمار دێن.

**ئۆتۆنۆمی** خودگردانی Autonomy

ماف بڕیاردان بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆیی و سیاسی و ئابووری و كولتوری ناوچەیەك یا هەرێمێك یا خود گروپێكی ئەتنیكی لە ناو وڵاتێكدا. ئۆتۆنۆمی لە ئەنجامدا ئەگاتەوە بە سەربەخۆیی. لە وڵاتانی فیدراڵیدا (بڕوانە فیدرالیزم) بە پێی دەستوری بنچینەیی وڵاتەكە، دەوڵەتی ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆیی هەرێمێكی جوگراف یان ئەتنیكی وڵاتەكە ئەسپێرێتە خۆیان و ئەم هەرێمەش تا شوێنێك كە لە گەڵ دەستووری بنچینەیی فیدڕاڵدا بگونجێ١٢٥٥٨

+ بۆ خۆیان یاسا دائەنێن. لە وڵاتانێكی فیدراڵی وەك ئەمەریكا و هیند و ...هەرێمە ئۆتۆنۆمیەكان خاوەنی سیستەمێكی تۆخی سیاسی و یاسادانان بەڵام بۆ سیاسەتی دەرەوە و هێزی چەكداری و پلاندانانی ئابووری لە ژێر ركێفی دەوڵەتی ناوەندیدان. دەوڵەتە كۆڵۆنیەكان جارجار پێش بەخشینی سەربەخۆیی یەكجاری یان خودموختاری بە ژێردەستەكانیان، ماف ئۆتۆنۆمییان پێدەدان.

**ئۆرگان** ارگان Organ

میدیایەك كە بڵاوكەرەوەی ئەندێشە و سیاسەتی حیزب، ڕێكخراوە یان گرووپێك بێت. ئەم زاراوە هەروەها بە واتای ڕێكخراوە و دەزگای تەشكیلاتی بە كار براوە.

**ئولیگاركی** اولیگارشی/گروه سالاری Oligarchy

لە زمانی یۆنانیدا بە مانای حوكمەتی گرووپێكی بچووكە. بە واتایەكی تر، دەسەڵاتدارێتی گرووپێكی بچووكە بە سەر دەوڵەت بێ ئەوەی زۆرینەی خەڵك، بەسەریا چاودێری بكات. ئەم زاراوە زۆرتر بۆ



کەمینەیەکی دەسەڵاتدار بە کار ئەبرێت کە دەسەڵاتی دەوڵەت ئەخەنە خزمەت بەرژەوەندی و قازانجی خۆیان و زۆرینەی نەیارانیش سەرکوت ئەکەن.

فەرمانکردنی گرووپێکی بچووك بە سەر ڕێکخراوە و دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی تر وەك ڕێکخراوە ئایینی و کرێکاری و حیزبییەکانیش، پێی ئەوتریٚ ئولیگارکی. لە سەردەمی پلاتۆوە، ئولیگارکی لە بەرامبەر ئۆتۆکراسی*و دیموکراسی، راوەستاوە. بە ڕای پلاتۆ، ئولیگارکی جۆرە حوکمەتێکی گەندەڵە کە لە ئاریستۆکراسییەوە سەرچاوە ئەگریٚ بە هەمان شێوە کە ستەمکاری، پاشایەتی گەندەڵ ئەکات، هەرکی بە هەرکیش، دیمکراسی بەرەو گەندەڵی دەبات.

بیرمەندانی هاوچەرخ، سەرنجێکی زۆریان داوەتە ئولیگارکی و هەندێکیان بە ئاچار زۆربەی حوکمەتەکان بە ئولیگارکی لە قەلەم ئەدەن. ئەمانە پێیان وایە کە ناکریٚ حوکمەتەکان بە دوو جۆری تاکەکەسی و کۆمەڵەکی دابەش بکرێت چونکا کۆمەڵ یان خەڵك هەرگیز حوکمەت بە دەستەوە ناگرن و کرداری راستەقینەی حوکمەت، هەمیشە بە دەست گرووپێکی بچووکەوەیە و تەنیا جۆری پێوەندی ئەم گرووپە لە گەڵ کۆمەڵگا و سنووری بەرپرسیارییەتی چیٚ دەکریٚ.

**ئەپارتهایت:** بڕوانە جیاوازی ڕەگەزایەتی.

**ئەخلاقی نێونەتەوەیی** اخلاق بین المللی International Morality

بریتییە لەو بەڵێن و پەیمانە ئەخلاقییانەی کە وڵاتانی جیهان لە پێوەندی ناوخۆیان جێبەجێی دەکەن. قانوونی ئەخلاقی، وڵاتەکان پێملدەکات کە لە بەرامبەر یەکتردا بە دەروون پاکی و ڕاستگۆیانە هەڵسوکەوت بکەن و لە کاتی شەڕدا دلڕەشی و ڕق و کین بۆ نزمترین ئاستی خۆی دابەزێنن و لە کاتی ئاشتی، پتر دڵپاك و خێرخواز بن و لە قەدەر توانای خۆیان یارمەتی یەکتر بدەن.

**ئەشکەنجە** شکنجه Torture

بە پێی بەندی یەکەمی کۆنڤانسیۆنی قەدەغەکردنی ئەشکەنجە، ڕێکەوتی ١٠ی دیسەمبەری ١٩٨٤ ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەشکەنجە بریتییەلە: هەر چەشنە کردەوەیەك کە بەو پێیە کەسێك ئازار و جەزرەبەیەکی توند(جەستەیی یان دەروونی) بدرێت. ئەم ئازارە بەو مەبەستەیە کە لەو کەسە یان کەسێکی سێهەم، زانیاری دەربکێشرێت یان بە زۆر پێملی بکەن کە دان بە شتێکدا بنێت، تاکوو بەو پێیە ئەو کەسانە سزا بدرێن یان بیانتۆقێنن و بیانخەنە ژێر فشارەوە.

بە پێی مادەی دووهەمی کۆنڤانسیۆنەکە: (بەندی ١) پێویست دەکات دەوڵەتانی ئەندام، ئاسانکاری یاسایی، ئیداری و دادوەری بۆ نەهێشتنی ئەشکەنجە لە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیان بە ئەنجام بگەیەنن. (بەندی ٢) هیچ هەلومەرجێکی نائاسایی، بۆ وێنە شەڕ یا نائارامی سیاسی ناوخۆیی نابیٚ پاساوەرە

PDF 4 KURD

ئەشکەنجە بێت. (بەندی ٣) هیچ مەقامێکی باڵا یان هێزێکی دەوڵەتی، ناتوانێ بڕیاری ئەشکەنجە دەربکات.

### ئەلقاعیدە القاعده Al-Qaida(the Base)

تۆڕی ئەلقاعیدە بریتییە لە کۆمەڵە گرووپێکی سیاسی ئیسلام خواز کە لە ساڵی ١٩٨٨ دامەزراوە. ئەم تۆڕە بە ڕێبەرایەتی«ئوسامە بین لادەن»، سەر بە موسوڵمانانی سوننە پێك هاتووە کە خوێندنەوەیەکی وشك و دەمارگرژانەیان لە ئیسلام هەیە و تێکڕا، ئەمریکا و ئیسڕاییل بە دوژمنی هاوبەشی هەموو موسوڵمانان دەزانن. ئەلقاعیدە، خوازیاری ڕاونانی ئەمریکایە لە وڵاتانی ئیسلامی و مەحف کردنەوەی ئیسڕاییل لە جیهاندا. ئەم تۆڕە، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی بە گشتی ڕووی کردۆتە خەباتی چەکداری و تیرۆر(بڕوانە تیرۆریزم).

ئەلقاعیدە، تۆڕێکی بان ـ نەتەوەیی‌یە کە تێیدا لە هەموو ڕەگەز و نەتەوەیەك بەر چاو ئەکەوێت. لە ڕوانگەی ئەم ڕێکخراوەوە تەواوی ئەو دەوڵەتانەی کە بە سەر وڵاتە ئیسلامییەکاندا حوکمەت ئەکەن، ناڕەوا و گەندەڵن کە دەبێ هەموویان وەلانرێن. مۆدێلی ئەلقاعیدە بۆ حوکمەتکردن هەمان مۆدێلی «خەلافەت»ی قۆناغی سەرەتای ئیسلامە.

بین‌لادەن سەرۆکی ئەلقاعیدە، لە ماوەی ١٠ ساڵدا ڕۆڵێکی باڵای بووە لە ڕێکخستنی ئەو گرووپە پڕژ و بڵاوانەی کە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا ئامادە بوون بۆ ئەم جۆرە خەباتە. بۆیە لە ساڵ ١٩٩٨ ڕێکخستنی بەرەیەکی نێونەتەوەیی دژ بە ئەمریکا ڕادەگەیەنێ و بە ئاشکرا کردارە تیرۆریستییەکان لە ئەستۆ دەگرێ. بۆ نموونە ئەکرێ ئاماژە بدەین بەم چەن کردارەی خوارەوە: هێرش بۆ پایۆڕێکی ئەمریکایی لە مۆگادیشۆ (١٩٩٣ کوشتنی ١٨ سەربازی ئەمریکی)، تەقاندنەوەی ئۆتۆمۆبیلێکی مین ڕێژکراو لە ڕیاز(١٩٩٥ کوشتنی ٥ سەربازی ئەمریکایی)، تەقاندنەوەی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە نایرۆبیا و داروسەلام (١٩٩٨ کوشتنی ٢٢٤ کەس)، هێرش بۆ پایۆڕێکیتر لە یەمەن(٢٠٠٠ کوشتنی ١٧ کەس)، تەقاندنەوەی تاوەرە ئەفسانەییەکانی ڕێکخراوەی بازرگانی جیهانی و چەن بنکەی سیاسی و ئەمنی ئەمریکا(٢٠٠١ کوشتنی زیاتر لە ٣هەزار کەس)، تەقاندنەوەکەی جێژنی قوربانی هەولێر، (٢٠٠٤ کوشتن و برینداربوونی ٢٥٠ کەس).

### ئەکتیویزم/چالاکیی سیاسی فعالیت سیاسی/کوشندگی Activism

ئەم زاراوە بە دوو مانا لێکدراوەتەوە، یەکەم بە مانایەکی ئەڵمانی کە زیاتر لە بەستێنی ئەدەبی و ڕۆشنبیریدا گونجاوە. دووهەم بە واتایەکی بەربڵاو کە بە مانای تێهەڵچوونێکی گەرم وگوڕە لە کردەوە و چالاکی سیاسی. ئەم واتایە دەلالەت ئەکات لە سەر ڕۆڵی گرینگی چالاکوانان وەك کاکڵی ئازای حیزبە سیاسییەکان. هەروەها لە جووڵانەوە شۆڕشگێڕییەکان بە تایبەت لە سیاسەتی حیزبی بونیادگەرادا گرنگییەکی زۆری پێ ئەدرێ. لە شێوازە توندڕەوەکەیدا بۆ پاساودانی تێهەڵچوونی ڕاستەوخۆ یان بۆ لە دۆخ دانی زەبر و زەنگ بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی بە کار هاتووە. لە سیاسەتی باڵی چەپدا جاری وا

PDF 4 KURD

کە خەباتکار بە مانای چالاك بە کار دبرێت بەڵام مەبەست، رادەی بونیادگەرێتی ئەوکەسەیە لە سیاسەتدا. ئەم خاڵە بە تایبەت لە بارەی حیزبە کۆمۆنیستییەکان پێش گەیشتن بە دەسەلات، زۆر بەرچاوە.

### ئەنجومەنی ئاسایش    شورای امنیت    Security Council

ئەنجومەنی ئاسایش، یەکێکە لە شەش پوکنی سەرەکی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەرکی سەرەکی ئەنجومەن پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەییە. ئەم ئەنجومەنە ۱۵ ئەندامی هەیە کە پێنج لەم ئەندامانە(ئەمریکا، بریتانیا، رووسیا، فەرەنسا و چین) وەك ئەندامی هەمیشەیی لە ئەژمار دێن. ۱۰ ئەندامی کاتی ئەنجومەن، لە لایەن کۆمەڵی گشتی رێکخراوە بۆ ماوەی ۲ ساڵ هەڵئەبژێردرێن. بە پێی جارنامەی گەردوونی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەندامانی رێکخراوەکە هاودەنگن لەسەر جێبەجێ کردنی بریارەکانی ئەنجومەنی ئاسایش.

ئەنجومەنی ئاسایش دەسەلاتێکی بەرفراوانی هەیە و سەرپەرشتی هێزی چەکداریی نەتەوەیەکرتووەکان دەکات و پاش دەرکردنی بریارەکان جێبەجێیان دەکات و دەوڵەتانی ئەندامیش ناچار بە جێبەجێ کردنیان دەکات. ئەگەر کێشەیەکی گرنگ بخرێتە بەردەستی ئەنجومەنی ئاسایش، بۆ جێبەجێکردنی پێویستە ۹ وڵات لە پانزە وڵاتی ئەندام، دەنگی پێ بدەن بەو مەرجەی کە هیچکام لە پێنج ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەن، ڤیتۆ*ی نەکات یا دەنگی نەرێنی لەسەر نەدابێت.

### ئەنجومەنی باکووری(نۆردیك)    شورای شمالی(نوردیک)    Nordiic Council

ئەنجومەنی باکووری یان ئەنجومەنی سکاندیناڤی، کۆمەڵێکە پێکهاتووە لە نوێنەرانی وڵاتانی دانیمارك، سوید، ئیسلەند، فەنلاند و نەرویج کە بە مەبەستی پەرەپێدان بە هاوکاری لە بواری جۆراوجۆر لە نێوان وڵاتانی سکاندیناڤی دامەزراوە. ئەم ئەنجومەنە ئەندامانی خۆی هان ئەدا کە بۆ رێکخستنی بازارێکی هاوبەش بۆ بەرهەمەکانی خۆیان، چالاکییەکانیان رێك بخەن تاکوو بەرەو یەکیەتییەکی گومرگی هەنگاو بنێن. بەڵام ئەم جووڵانەوە، لەدوای دامەزرانی«یەکیەتی بازرگانی ئازادی ئەورووپا»لە ساڵی ۱۹۵۹ و بە ئەندامبوونی دانیمارك و نەرویج و سوید لەو یەکیەتییەدا کۆتایی پێ هات.

### ئەنجومەنی پیران/سینات    مجلس سنا    Senate

وشەی senate کە بە لاتینی دەبێتە senatus بە واتای پیر و بەساڵاچوو هاتووە. مەبەست لەم زاراوە ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکایە کە لە کۆنگرێسی ئەو وڵاتەدایە و لە ئەنجومەنی نوێنەران بچووکترە. بۆ هەڵبژاردنی سیناتۆرە ئەمریکییەکان، رێژەی دانیشتووانی ویلایەتەکان لە بەرچاو ناگیردرێ و هەر ویلایەتێك ۲ سیناتۆری هەیە و ئەنجومەنی پیران، سەرجەم ۱۰۰ ئەندامی هەیە و نابێ تەمەنی هیچ سیناتۆرێك لە ۳۰ ساڵ کەمتر بێت و ماوەی نیشتەجێ بوونی هەر سیناتۆرێك لەو ویلایەتەی کە خۆی بۆ دەپاڵێوێت، نابێ لە ۹

PDF 4 KURD

ساڵ کەمتر بێت. هەر خولێکی ئەنجومەنی پیران، چوار ساڵە و هەر دوو ساڵ جارێك ١/٣ ئەندامەکان دەمێننەوە و لە جیاتی ئەوانی دیکە بە شێوەیەکی کاتی کەسانێك لە لایەن فەرمانداری ویلایەتەکان دادەنرێت. ئەندامانی سینات، لە لایەن خەڵکی ویلایەتەکانەوە هەڵدەبژێردرێن. هەر پەیمانێك کە دەوڵەتی ئەمریکا لە گەڵ وڵاتانی دیکەدا دەیبەستێ، دەبێ لانیکەم لە لایەن ٢/٣ سیناتۆرەکانەوە پەسند بکرێت. دەسەڵاتی ئەنجومەنی پیران بە هەندێك جیاوازی هەروەك ئەنجومەنی نوێنەرانە و رۆڵێکی بەرچاوی لە دانانی یاساکاندا هەیە. ئەنجومەنی پیران چوونکە هاوکارییەکی زۆری لە گەڵ سەرکۆماردا هەیە، لەچاو ئەنجومەنی نوێنەران لە بواری سیاسەتی دەرەکیدا دەسەڵاتێکی زیاتری هەیە.

**ئەنجومەنی جیهانی کلێسەکان** شورای جهانی کلیساها World Council Churches

ئەم ئەنجومەنە پێکهاتووە لە کلێسەکانی پرۆتیستان و ئۆرتۆدۆکس کە لە ساڵی ١٩٤٨ دامەزراوە و دوای دامەزرانی ئەنجومەنی ڤاتیکانی٢ (١٩٦٩)، ئەندامانی کلێسەی کاتۆلیکی رۆماش هاتنە ناو ریزی ئەم ئەنجومەنەوە. ئەنجومەن لە بوارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایینیەکان دەکۆڵێتەوە و سەرنجێکی تایبەتیش دەداتە کێشەی وڵاتانی جیهانی سێهەم. ئەم پێکهاتە بە دژی سیاسەتی رەگەزپەرستانەی ئاپارتایدە.

**ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی فارس** شورای همکاری خلیج فارس

Persian Gulf Cooperative Council

ئەم ئەنجومەنە لە ١٩٨١/٥/٢٥ بە ئەندامەتی وڵاتانی کوەیت، بەحرەین، قەتەر، ویلایەتی میرنشینی عەرەبی، عەممان و عەرەبستان لە ئەبوزەبی دامەزرا. ئامانجی پێکهێنانی ئەم ئەنجومەنە، پاراستنی بەرژەوەندییە سیاسی و ئابووری و سەربازییەکانی ئەندامەکانیەتی. نووسینگەی ئەنجومەن لە ریاز، پێتەختی عەرەبستانە. ئەنجومەنی هاریکاری کەنداوی فارس لە ساڵی ١٩٩٤ بریاری دەرکرد کە گەمارۆی ئابووری لەسەر ئیسراییل لابچێت. ئەم گەمارۆیە کە ئیجازەی مامەڵە و دانوستانی لە گەڵ کۆمپانییەکانی سەربەم وڵاتە، نەئەدا لە ساڵی ١٩٤٧ لە لایەن یەکیەتی عەرەب دەرکرابوو.

**ئەنفال** انفال Anfal

ئەنفال، لە زمانی عەرەبی(قورئان)دا بە واتای تاڵانیی دوژمنان و دەسکەوتی جەنگییە. ئەم زاراوە لە لایەن سەددام حسەین (١٩٣٧ـ ٢٠٠٧) دیکتاتۆری رژێمی پێشووی عێراق و دەستوپێوەندەکەی بۆ لەناوبردن و ژینۆساید*ی گەلی کورد بەکار هێنراوە. ئەنفال، کۆمەڵێ عەمەلیاتی ئەو رژێمە بوو بۆ سەر دێهاتەکانی کوردستانی باشوور کە لە ساڵی ١٩٨٨ بە مەبەستی رەشەکوژی و کوشتن و برینی گەلی کورد بە ئەنجام

PDF 4 KURD

گەیشت. لە ئەنفالەکاندا زیاتر لە ١٨٢ هەزار کەس خەڵکی ئەم ناوچە لە کوردستان، بەکۆمەڵ زیندە بەچاڵ کران و دێهات و گوندەکانیش لە گەڵ خاکدا یەکسان کران.

رەنگە سەدام بە ناولێنانی ئەم کاولکاری و رەشەکوژییانە بە ناوی ئەنفالەوە، ویستبێتی وەك عەرەبێکی موسوڵمانی سوننە، خۆی لەگوێن پەیرەوێکی بەرفەرمانی قورئان بناسێنێت کە بە ئەمری ئەو، لەناوبردنی کورد وەك دەسکەوت و تالانییەکی جەنگی سەیر بکات. لەم سۆنگەوە سەدام، کوردی بە پلەی یەکەم بە دوژمنی خودا و بە پلەی دووهەمیش بە دوژمنی خۆی لە قەڵەم داوە بۆیە بۆ لەناوبردنی مرۆڤی کورد وەك تالانییەك سەیر ئەکات کە لە شەڕێکدا بەدەستی هێنابێت.

«ناسینی ئەنفال، رەنگە ئەرکێکی ئەخلاقی بێت، ئەمە نەك بە تەنها لەبەر ئەوەیە ئەنفال دیاردەیەکی کارەسات ئامێزی سەر بە ساتەوەختێکی تایبەتی مێژووی میلەتێکە و دەبێت باس بکرێت بەڵکوو ئەمە بەو مانایەشە کە باسکردن و وەبیر هێنانەوەی ئەم دیاردە دەشێت رێگر بێت لە دووبارەبوونەوەی، نە تەنها لە کوردستان بەڵکوو لە زۆر شوێنی دیکەی دنیادا کە هاوکێشەی زۆرینە* و کەمینە*، هاوکێشەی دەوڵەتی تۆتالیتەر و گرووپی ئەتنی جیاواز، هاوکێشەی کولتووری جیاجیا و ناسیۆنالیزمێکی راسترەوی تێدا بەرقەرارە. لەم رووەوە، خوێندنەوەی ئەنفال و شیکردنەوەی رەهەندە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەخلاقییەکانی، دەشێت هەڵگری چەندان دەلالەت بێت کە سنووری مێژووی کوردی تێپەڕێنێ و وەك کێشەیەکی ئینسانی گەورە و بەشێك لە مێژووی هاوچەرخی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان تەماشا بکرێت. راستە کوردبوون، سیفەتێکی تایبەتی بە ئەنفال داوە بەوەی لە پشتییەوە، هاوکێشەیەکی نایەکسانی هێز و تەنیاییەکی سیاسی کوشندە ئامادەیە، بەڵام ئەنفال و ئەزموونی ئەنفالیانە رووداوێکە سنووری مێژووی کورد و مێژووی عێراق و مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست تێدەپەڕێنێت. ئەنفال رووداوێکە، بێ گەورەکردن دەشێت لە سیاقی مێژووی هۆلۆکۆست* و هەموو رەشەکوژییەکانی کۆمەڵگای مۆدێرندا تەماشای بکەین».

### ئەویدی     دیگری     The Other

ئاخێزگەی چەمکی «ئەویدی»، لە ئەندێشەکانی هێگل دا سۆراغ دەکرێت. کاتێك کە ئەلێکساندر کۆژۆ (١٩٤٧) خوێندنەوەیەکی بەپێزی لە ***دیاریەناسی رۆح*** بە ئەنجام گەیاند. بەڵام زاراوەکە لە کەشێکی مژاوی لە دەروونشیکاری ژاك لاکاندا (١٩٦٠) بوو بە جەمسەرێکی دایەلیکتیکی لە نێوان سوژە و ئۆبژەدا. بابەتی ئەویدی یا ئەوانیدی، یەکێك لە پرسیارە سەرەکییەکانی ماهییەتی«شوناس»*ی بەرهەم هێناوە. پرسیار ئەوەیە: بۆچی ئینسانەکان، خۆیان بە«خۆمانە»لە قەڵەم ئەدەن و غەوارەش بە «ئەوانیدی»؟ یان جیاوازی نێوان کەسێك لە گەڵ ئەویدی، بۆ چ شتێك ئەگەڕێتەوە؟ هەندێ کەس هۆکەی دەگەڕێننەوە بۆ جیاوازی کەلتووری، زمان، ئایین، شارستانییەت، هەلومەرجی فراژوتن و پەروەستاندن و هەروەها جیاوازی رەگەزی، ئەتنیکی، نەتەوەیی، جینایەتی، ئایدیۆلۆجی و زایەند(سێکس).

PDF 4 KURD

**ئیخوانولموسلمین** اخوان المسلمین Moslem Brotherhood

بزووتنەوەی ئیخوانولموسلمین لە ساڵی ١٩٢٩ لە لایەن(حسن البنا) لە میسر دامەزرا بە مەبەستی گەڕانەوە بۆ یاسا و بنەماکانی سەرەتای ئیسلام. ئەم بزاڤە توانی تەلی سوز و عاتیفەی موسڵمانان ببزوێنێ و بەرەو لای خۆی ڕاکێشیان بکات بە چەشنێك کە لە کۆتاییەکانی جەنگی جیهانی دووهەم، ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتە ٢ ملیۆن کەس و توانی لە وڵاتە عەرەبییەکان بە تایبەت میسر، پێگەیەکی باش بەدەست بهێنێ. پاش ئەوەیکە ئەنوەر سادات، سەرۆك وەزیری میسر لە ساڵی ١٩٤٨ ئەم بزاوتەی بە نایاسایی و یاساغ ناوبردە کرد، لایەنگرانی ئیخوانولموسلمین سەرۆك وەزیریان تیرۆر* کرد و پاش ماوەیەکیش (حسن البنا) کوژرا. لە ساڵی ١٩٥٤ ئیخوانولموسلمین، هەوڵی دا سەرۆك کۆمار، عەبدولناسر تیرۆر بکات بەڵام نەیتوانی. ئەویش بزاوتەکەی پێچایەوە و ئەمەش بوو بە هۆی ئەوە کە بنکەی ئیخوانولموسلمین لە قاهیرەوە بگوێزرێتەوە بۆ دیمەشق و ببێتە ڕێکخراوەیەکی شاراوە و ژێرزەمینی.

ئیخوانولموسلمین ئەمڕۆکە لە میسر و چەندین وڵاتی ئیسلامی دیکەدا چالاکی ئاشکرای هەیە. بۆ وێنە لە سوودان لە حەفتاکاندا لایەنگری زۆری بەدەست هێنا و توانی لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٨٦ بە ناوی «بەرەی نەتەوەیی ئیسلامی» بەشداری بکات و ٥١ کورسی پەرلەمان بەدەست بهێنێت. ئەم ڕێکخراوە لە وڵاتی میسر وەك حیزبێکی نایاسایی و بە شێوەیەکی شاراوە درێژە بە چالاکی ئەدا تەنانەت دەگوترێ لە ناو پەرلەمانی ئەم وڵاتەدا لایەنگری بەرچاوی هەیە.

**ئیرادەی گشتی** ارادەی عمومی/خواست همگانی General will

تیۆرییەك لە بارەی پێوەندی تاك و دەوڵەت و بنەماکانی دەوڵەت لە بەرامبەر تیۆری کۆن کە سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت وەك «مافێکی خواوەندی» لەئەژمار ئێنێت. بە پێی ئەم تیۆرییە سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت ئیرادەی گشتیی خەڵکە و لە هەر سیستەمێکی سیاسیدا دەبێ خواستی هەموو شارۆمەندان لە بنیاتنانی ئەو سیستەمەدا لە بەرچاو بگیرێت. ئیرادەی هەموان، گشتێکی تێك تەنراوە کە بڕیارەکانی ئاوەزمەند و ڕاست و ڕەوایە و بە پێی بەرژەوەندی هەموان و لە سەرووی خواستی تاکەکەسەوەیە.

ئەم تیۆرییە لە جیهانی ئیمڕۆدا گرینگیەکی زۆری پێدراوە. چونکا زۆربەی سیستەمە سیاسیەکان خۆیان بە نوێنەر و فەرمانبەری ئیرادەی گشتی دەزانن و ئەم چەمکەش لە ژێر سەردێڕی «ئیرادەی نەتەوە» و ئیرادەی گەل و ... ناوبردە ئەکەن.

ئەم تیۆرییە لە لایەن فەیلەسوفی فەرەنسی جان جاك ڕۆسۆ، لە کتێبی پەیماننامەی کۆمەڵایەتیدا بە تێر و تەسەلی باس کراوە. ڕۆسۆ ئەم کتێبە بە پرسێك لە کێشەی دەوڵەت دەسپێدەکات کە: چۆن دەوڵەت بنیات ئەنرێ و کێ بنیاتی دەنێ؟ هەر خۆشی لە وەڵامدا ئەڵێ: دەوڵەت دەرئەنجامی کۆبوونەوەی کەسانێکە کە بە خواستی خۆیان دەس لە دۆخی ئازادی«سروشتی» بەرئەدەن و پێمل ئەبن بە کۆت و بەندی ڕێسایەکی سیاسی و یاساکانی. چونکا پاش ئەوەی مرۆڤ ژیانی سروشتی و کێویی خۆی بەجێ هێشت و پێی نا

PDF 4 KURD

ژیانێکی کۆمەڵایەتیەوە، گۆڕانێکی گەورەی بە سەرا دێت. ئینجا زۆر و ستەم و هەڵشاخانی غەریزی جێی خۆی ئەدا بە عەدالەت و داد و بە پێچەوانەی رابردوو لە بەرامبەر یاسا ئەخلاقییەکاندا چۆک دائەدات. کەواتە بنیاتنەری دەوڵەت، ئیرادەی گشتییە و هەر ئەم خواستەیە کە باڵادەست و یاسادانەرە. بەم بۆنەوە ملکەچ کردن بۆ یاسا شتێکی حاشاهەڵنەگرە چونکا یاسا ئازادی بۆ هەمووان دەستەبەر ئەکا و ئەگەر کەسێك بێ قانونی بکات، ئەبێ بە زۆرەملی لە بەرامبەر یاسادا چۆکی پێدابدرێ. بە حوکمی ئەم گوشارەیە کە ئازادییەکەی پێ ئەبەخشرێتەوە. تاك لە ناو کۆمەڵگای سیاسی و بە فەرمانی قانونە کە شوناسی ئەخلاقی بە دەست ئەهێنێ. چونکا لە بێ سەرەوبەرەیی رزگار ئەبێ و پابەندی رێسای ئەخلاق و ماف دەبێ و کڵاوی خۆی ئەکاتە قازی کردەوەکانی خۆی. چەندە رێسای سیاسی لە گەڵ ئیرادەی گشتی هاوتەریب بێت، ئەوەندەش تاك هەلومەرجی گەشەی ئازاد و راستەقینە و رێگەی بەرەو فراژووتنی خۆی باشتر ئەدۆزێتەوە. بەم پێیە لە روانگەی رۆسۆوە کۆمەڵگای سیاسی، خاوەنی ئیرادەیەکی رەها و بێ هەڵە و بێ بەدیلە.

پاش رۆسۆ چەمکی ئیرادەی گشتی، بۆتە بابەتی سەرەکی چەند فەلسەفەی سیاسی بەڵام ئەم فەلسەفانە لایەنگری دیموکراسی و دەسەڵاتی گشتی نەبوون. بۆ وێنە هێگل، فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی لە کتێبی «فەلسەفەی حەق»، ستایشی رۆسۆ ئەکات کاتێك، «ئیرادە بە بنەڕەتی دەوڵەت» لە قەلەم ئەدا بەڵام لە لایەکی ترەوە لۆمەی ئەکات کاتێك، بە «خواستی گشتی» ناوبردەی ئەکات چونکا زمانی حاڵی خۆی لە کۆنگرەی گشتیدا ئەدۆزێتەوە. هێگل دەڵێ: رەنگە گومانیان وایە کە ئەو شتەی دەوڵەت رائەگرێ، «زۆر» بێت بەڵام لە راستیدا راگری دەوڵەت هەمان هەستی تەکوزییە کە هەموان لێی بەهرەوەرن. دەوڵەتی هێگل، رۆح یان خواستێکی باڵاترە لە رۆح و خواستی شارۆمەندان و دەزگاکانی دەوڵەت کە درێژە ئەدات بە ژیانی شارۆمەندان. ئەو شتەی کە شارۆمەندان بەرەو دەوڵەت رائەکێشێ رەگەزی عەقڵە لە ئیرادەکانی ئەواندا.

بەم جۆرە ئیرادەی گشتی کە لە لایەن رۆسۆوە چەمکێکی رەها و بێ نیاز لە تاك سەیر کراوە ئەگا بە هێگل کە دەوڵەت وەك بوونێکی پابەند بە رەوتی جووڵەی مێژوویی«رۆحی رەها» سەیر ئەکرێت. ئەم تیۆرییە بەدەر لە ئاوەزی مرۆڤ سەرەنجام لە سەدەکانی ١٨ و ١٩ ئەبێتە ژێرخانی تیۆرییە دیموکراسیەکان و لە سەدەی بیستەمدا ئەبێتە هۆی بەدیهاتنی رژێمە توتالیتەرەکان.

رۆسۆ، کۆمەڵگا سیاسیە ئایدیالیەکەی خۆی بە کۆمەڵگەیەکی بچوك دەزانی کە تێیدا هەموو خەڵك بە بەشداریکردنی راستەوخۆ، ئیرادەی خۆیان بە کار دەهێنا. بەڵام لە شۆڕشی مەزنی فەرەنسەدا ـ کە رۆسۆ لە باری فیکرییەوە کاریگەریی لە سەر رێبەرەکانی دانابوو ـ پیادەکردنی ئیرادەی گشتی شێوەی پەرلەمانی بە خۆوە گرت و هێدی هێدی لەبری ئەم چەمکە «خواستی نەتەوە» یان «خواستی نەتەوەیی» بەکار هێنرا. پاشان بە گەشەسەندنی ناسیۆنالیزم و سوسیالیزمی نوێ، ئیرادەی گشتی بە ناوی «خواستی نەتەوەیی» یان «خواستی کۆمەڵ» پیرۆز کرا، تا ئەوشوێنەی کە ئێستا لە هەموو جیهاندا دەسەڵاتی دەوڵەتەکان بەم ناوە دەرکراوە و زۆربەی شەڕ و کێشە سیاسیەکان بەم ناوە پاساو ئەدرێت.

PDF 4 KURD

**ئیستبداد/ڕەهاگەرایی** استبداد Absolutism

**سیستەمێکی سیاسییە کە ئەم تایبەتمەندیانەی لە خۆ گرتبێت:**

**١) دەسەڵاتێکی دەوڵەتی کە هیچ سنوورێکی یاسایی یان نەریتی بۆ حوکمەت کردن نەبێت.**

**٢) فراوانبوونی بەستێنی حاکمییەتی ملهوڕانە(هەڵبەت ئەم دۆخە پێویستی بە دامودەزگایەکی ناوەندگەرا هەیە.)**

**ئیستبداد، ئۆتۆکراسی و دێسپۆتیزم* سێ چەمکی هاوواتان بەڵام بە تەواوەتی یەك ناگرنەوە، وەك چۆن توتالیتاریزم جۆرێکە لە ئیستبداد بەڵام هەموو ئیستبدادێك تۆتالیتەر نییە.**

**حوکمەتی شارستانییەتە کۆنەکانی ئاشوور و بابل و میسر و ئێران و... سەرجەم ئیستبدادی بوون. تەنیا یۆنان و ڕۆم نەبێت کە دیکتاتۆری کاتییان هەبووە. (بڕوانە دیکتاتۆری)**

**لە سەدەی ١٦ بەدواوە ئیستبداد لە ئەورووپا ڕووکارێکی تازەی لە خۆگرت. ئەویش لە کاتێکدا بوو کە دەوڵەتە نەتەوەییەکان و پادشاکان لە بەرامبەر دەسەڵاتی پاپا قوت بوونەوە و ئیستبدادی پاتشایی (لە سەر بنیاتێکی ڕەهای دەسەڵات بۆ پاشا) وەکوو ئاواتێکی سیاسی لێهات و ئەم دەوڵەتانەی بە شێوەیەکی نوێ ڕێكخست. بۆ وێنە ئەم گوزارەی لوویی چواردەهەم کە گوتی:«من دەوڵەتم»نموونەیەکە لە ئیستبدادی پاشایی کلاسیك.**

**ئیستبداد لە سەدەکانی ١٧و١٨ لە باری تیۆرییەوە، لە سەر بنیاتی دەسەڵاتی بێسنوری پاشا، گەشەی کردووە و هیچ شتێك تەنانەت «ماف سروشتی»* خەڵکیش ئەم سنورەی نەبەزاندووە. لە سەدەی هەژدەیەم، شۆڕشەکانی ئەمریکا و فەڕەنسە بە دژی ئیستبداد ڕاپەڕین و ئەم خەباتە لە ماوەی سەدەکانی ١٩و٢٠ بوو بە هۆی سەرهەڵدانی چەن دەوڵەتێکی یاسایی لە سەرانسەری جیهاندا. هەمان کات (سەدەی بیستەم) جۆرە ئیستبدادێکی تازە سەری هەڵدا کە پێی ئەوترێ، توتالیتاریزم. سیستەمە ئیستبدادییەکان لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات، لە چەشنی حوکمەتێکی لاسار بووە. (بڕوانە دێسپۆتیزم)**

**ئیستبدادی زۆرینە** استبداد اکثریت Tyranny of the majority

**ئەم زاراوە لە لایەن جان ئوستوارت میل، لە وتارێکدا بە ناوی *دەربارەی ئازادی* هاتۆتە ئاراوە، بەڵام ڕەنگدانەوەیەك بوو لەمەڕ نیگەرانییەکی گشتگیری هەندێك لە بیرمەندانی سیاسی و ئازادیخوازی سەدەی نۆزدە. ئەم نیگەرانییە، بە تایبەت لە بەرهەمەکانی دۆتۆکویل(١٨٠٥-١٨٥٩) زیاتر بەرچاو دەکەوێت. باسەکە ئەمەیە کە بەهاکانی ئازادیخوازی بە تایبەت بەهاکانی ئازادی بیر و ڕا و هەڵبژاردنی شێوازێکی تایبەتی ژیان، ئەگەرچی نامۆش بن، بەو مەرجە زیان بە کەس نەگەیێنێت لەو دیموکراسییانەی پابەندە بە ئازادی زۆرینەدا ئەکەوێتە مەترسییەوە. بەڕای میل، زۆرینەیەك کە بریتی بێت لە چینی کرێکاری نەخوێندەوار، چونکا لە بەرانبەر مەرام و ڕەفتاری جیاوازی کەسانیتر تووشی کەمتاقەتی دەبێت ڕەنگە، بە شێوەیەکی نارەسمی دەس بداتە ئازاردانی هەرکەسێك کە لە خۆی نەچێت.**

PDF 4 KURD

دۆتۆکویل، بڕوای بە دیموکراسی سنووردار بوو بەڵام بەو رادە بۆ بەربەستکردنی ماف دەوڵەت لە چاودێری کردنی ئازادی تاك، رازی نەبوو. ئەو دەڵێ: بۆ ئەوەیکە بە گشتی مرۆڤێکی ئاسایی و مامناوەندی دروست ببێت، لە رێگەی عەدالەت خوازی و دیموکراسی زۆرینە، گوشاری زۆر دێتە سەر کۆمەڵگا. جگە لەوەش، رەشەگەلی نەخوێندەوار و بێ پەروەردە ئامادەی چەوساندنەوەن و خەڵکانی چەواشەکار و گەندەڵ، دەستیان ئەکەن بە زاخاودا و چەواشەیان ئەکەن.

دۆتۆکویل لەم بابەتەوە تەنیا نەبوو، چونکا رۆژنامەنوسانی لایەنگری حوکمەتی فیدراڵ و پلان دانەرانی دەستووری بنچینەیی ئەمریکا گوتبوویان کە دەبێ ئاستی هەڵبژاردنەکان جیاواز بێت تاکوو سەرۆك کۆمار و سێنات نەکەوێتە ژێر کاریگەریی رەشەگەلەوە.

کۆرێن هازر، لە کتێبی سیستەمی سیاسی کۆمەڵگای رەشۆکی دا دەڵێ: دیکتاتۆرییەتێکی وەیشووم وەك نازیسم* ئیتر نابێ سەرهەڵبدات، مەگەر ئەوەیکە ستراکتوری کۆمەڵایەتی نەهێڵێت دەستی نوخبە سیاسییەکان بگاتە هەست و سۆزی رەشەگەل. لە زۆر لایەنەوە ئیستبدادی زۆرینە رێگرێکە لە بەردەم دیموکراسی ئازاد لە رۆژاوادا.

## ئیستیعماری نوێ　　　　استعمار نو　　　　Neo-colonialism

گەشەسەندنی ئابووری «سەرمایەداری»*و هەناردنی سەرمایە بۆ سوودوەرگرتن لە سەرچاوەکانی وڵاتانی تر، پێوەندی ئابووری وڵاتە پیشەسازیە ئیستیعمارییەکانی لە گەڵ وڵاتە بچوکەکانی ناردە ناو قۆناغێکی تازەوە. بەم مانایە کە وڵاتە پیشەسازییەکان بە ناردنی سەرمایە و میکانیزمی جیهانی نرخ و دانوستانی کەرەسەی خاو و کاڵای دروسکراو و گوشاری سیاسی و ئابووری، وڵاتانی دواکەوتوو ئەچەوسێننەوە. بەم دۆخە دەگوترێ ئیستیعماری نوێ کە زۆرێك لە وڵاتانی بچووك و تازە ئازاد کراوی بە دژی ئەم پێوەندییە سیاسی و ئابوورییە راست کردۆتەوە.

ئەم شێوازە داگیرکارییە وایکردووە کە وڵاتانی بێ دەسەڵات، ئەگەرچی بە حەقیقەت یان بە رواڵەت بە سەربەخۆیی سیاسی گەیشتبن بەڵام هەروا لە بەرایی گەشەسەندندا بمێننەوە یان تەنانەت بگەڕێنەوە بۆ دوواوە و لە لایەکی تریشەوە وڵاتانی پێشکەوتوو بە چەوساندنەوەیان سوودی زیاتر بکەن.

باو بوونی ئەم زاراوە ئەگەڕێتەوە بۆ «کۆنفرانسی باندۆنگ»(١٩٥٥). لەم کۆنفرانسەدا سۆکارنۆ، سەرکۆماری ئەندونیزیا بە جۆرێك لە ئیستیعمار ئاماژەی کرد کە بە جلوبەرگێکی نوێوە لە لایەن کۆتلەیەکی خەڵك، بە کۆنترۆڵ کردن و زاڵبوون بە سەر ئابوور و کەلتووردا هەمان ئامانجەکانی ئیستیعماری کۆن دەپێکن.

## ئیمپراتۆری　　　　امپراتوری　　　　Empire

بە وڵاتێك ئەگوترێ کە ئەم تایبەتمەندیانەی هەبێت:

PDF 4 KURD

(١) بەرفراوانی خاك، زۆربونی حەشیمەت و لەخۆگرتنی چەن نەتەوە یان رەچەڵەك یان کەلتووری جیاواز.

(٢) دەسەڵات و هێزی ئەم وڵاتە بە هۆی هەژمۆنی* نەتەوەیەك بە سەر ئەوانی دیکەدایە و وێککەوتنیش ئەگەر ببێت، بە هۆی دەسەڵاتی چەکدارییەوەیە.

(٣) پێکهاتەی سیاسی لەم سیستەمەدا دەسەڵات ئەبەخشێ بە یەك کەس(ئیمپراتۆر)و تەواوی دەسەڵاتە ناوچەییەکان، دەبنە فەرمانبەری ئەو.

(٤) هەبوونی بنیاتێکی ئەخلاقی یان سیاسی لە ژێر چەتری ئایین، ئایدیۆلۆجیا یان دەستوورێك بۆ دابین کردنی ئاشتی لە نێوان خەڵکی وڵاتدا.

لە رواڵەتدا ئیمپراتۆرییەتی، هاوشێوەی رێکخراوە نێونەتەوەییەکانە بەڵام لە ناوەرۆکدا بە هۆی نەبوونی عەدالەت و خودموختاری و خواستی پێکەوە ژیانی ئارەزومەندانەی نەتەوەکان، شتێکی جیاوازە.

ئیمپراتۆرییەتەکان، سەردەمانێك لە مێژوودا سەریان هەڵدا کە نەتەوەیەکی جەنگاوەر بەنیازی جیهانگیری، بازنەی دەسەڵاتی خۆی بەربڵاو کرد و بە سەر نەتەوەکانی دیکەدا سەرکەوتن. ئینجا هاندەرێکی ئایدیۆلۆجیایی (کە زیاتر جەهادی ئایینی بوو) پێوە لکاوە. بۆ وێنە ئیمپراتۆرییەتەکانی میسر و ئێران و عوسمانی و هێند و چین و ژاپۆن و یۆنان و رۆم و...)

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئیمپراتۆرییەکانی عەرەب و تورك و مەغول، موسوڵمان بوون و ئیمپراتۆری فرانك و جێرمەنیاش خاچپەرست. لەم رووەوە، ئایین هەوێنی یەککرتوویی ئەوان بووە. ئەم ئیمپراتۆرییانە هەڵگری ئەندێشەی حوکمەتێکی جیهانی بوون کە بە ئایدیۆلۆجی* ئایین، بانگەشەی ئاشتی مرۆڤایەتییان دەکرد. ئیمپراتۆری نوێ بە دوو شێواز پیادە ئەکرێت: دەریایی و زەمینی. ئیمپراتۆرییەکانی پورتوگال و ئیسپانیا و هۆڵەندا و فەرەنسا و بەریتانیا و ئیمپراتۆرییە تازە پێگەیشتووەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا و بەلجیکا و ئەمەریکا و ژاپۆن بە داگیرکاریی و ئیستعماری وڵاتە بانبەحرییەکانەوە، بەدیهاتن. تایبەتمەندی ئەم ئیمپراتۆرییانە، رەنگامەیی رەگەزی و کەلتووری بوو. هەندێ لەمانە هەوڵیان داوە بە بڵاوکردنەوەی کەلتوور و یاسا و ئابوور، دەسەڵاتی ناوەندی بۆ سەرانسەری ئیمپراتۆری، چێ بکەن بەو شێوە کە رۆمییەکان کردیان. هەندێکی تر لەم ئیمپراتۆرییانە بە شەرعییەت بەخشین بە خودموختاری سیاسی و ئابووری و کەلتووری، هەوڵیان دا خەڵکان یەککرتوو بکەن. ئەم رەوتە کاتێك ئاشکرا بوو کە دەوڵەتی ناوەندی ئیمپراتۆرییەتەکان لاواز ببوون، لێرەوە هەستی ناسیۆنالیستی لە نێو ئیمپراتۆری دا وزەی گرت.

## ئیمپریالیزم　　　　امپریالیسم　　　　Imperialism

بەگشتی واتاییکە بۆ دەوڵەتێك کە لە دەرەوەی بەستێنی حوکمەتەکەی خۆی، دەست درێژ ئەکا بۆ وڵاتانی دیکە و خەڵکی ئەم وڵاتانە ئەکێشێتە ژێر رکێفی خۆیەوە و سەرچاوە ئابووری و ئینسانییەکانیشی ئەرووتێنێتەوە. ئیمپریالیزم بە مانای ئیمپراتۆری* هەر لە سەرەتای مێژووەوە بووە.

لە زاراوەدا، ئەم وشە ئەگەڕێتەوە بۆ ئیمپراتۆری کە لە ١٨٩٠ بەملاوە لە لایەن لایەنگرانی ژوزێف

PDF 4 KURD

چیمبەرلێن، سیاسەتمەداری ئیستعمار خوازی بەریتانیا، هاتە ئاراوە. ئەم کابرا، دەیەویست پەرە بدا بە ئیمپراتۆریەتی بەریتانیا.

زاراوەی ئیمپریالیزم، خێرا چووە ناو زمانەکانی تریشەوە. ئەم وشە بوو بە بیانوویەك بۆ خاڵی کردنەوەی رق و کێشمەکێشی نێوان دەوڵەتە ئەوروپییەکانی ئەو سەردەمە. ئەم کێشمەکێشانە لە ١٨٨٠ تا ١٩١٤، وەها بە سەر سیاسەتی نێونەتەوەییدا باڵی کێشا، کە ئەم قۆناغە بە «چاخی ئیمپریالیزم» ناوبردە کرا. لەم ناوەدا بەریتانیا و ئیمپریالیستە ئەوروپییەکانیش، بە ناوی پەرەسەندنی شارستانیەت و بەشکردنی دەسکەوتەکانیان بە سەر خەڵکانی رەگەز ــ ناپاك، درێژەیان بەم ئاکارە دا. دوای شەڕی جیهانی یەکەم، ئایدیۆلۆجیای ئیمپریالیزم لە قەبارەی فاشیزم و نازیسم دا گەیشتە لووتکەی خۆی.

یەکەمین رەخنەی تیۆریك لە ئیمپریالیزمی نوێ، لە لایەن ج. ا. هابسۆن، ئابووریناسی بەریتانی، لە کتێبێك بە ناوی ئیمپریالیزم(١٩٠٢) بڵاو کرایەوە. لەم کتێبەدا بۆ یەکەم جار، بە روانگەیەکی ئابوورییەوە سەیری ئەم دیاردە کرا. لێنین، لەم روانگەوە کتێبی ***ئیمپریالیزم، دواقۆناغی سەرمایەداری*** (١٩١٥) بڵاو کردەوە. دواتر ئەم رێبازە بە ناوی تیۆری ئابووری دەربارەی ئیمپریالیزم، ناوبانگی دەرکرد. تیۆری لێنین جگە لەوەیکە ماهییەتی ئیمپریالیزم شیئەکاتەوە، تیۆرییەکە لە بارەی سەرچاوەی شەڕ ــ شەڕی ئیمپریالیستی ـ کە بەرهەمی سیستەمی سەرمایەدارییە. (بڕوانە لێنینیزم)

**ئیمپریالیزمی کەلتووری** امپریالیسم فرهنگی Cultural imperialism

بەکار هێنانی دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری بۆ بڵاوکردنەوەی نەریت و بەهاکانی ئەو دەسەڵاتە لە نێوان خەڵکانێکی تر کە بە زیانیان بێت. ئیمپریالیزمی کەلتووری دەتوانێ یاریدەری ئیمپریالیزمی سیاسی و ئابووری بێت. بۆ وێنە فیلمی ئەمریکایی دەتوانێ بێتە خزمەت بەرهەمەکانی ئەو وڵاتە و بازاڕی فرۆشی بۆ زیاد بکات.

**ئینترپۆل** (رێکخراوی نێودەوڵەتی پۆلیسی تاوانباران) سازمان بین المللی پلیس جنایی (اینترپل)
International Criminal Police Organization (Interpol)

ئەم رێکخراوە لە ساڵی ١٩٢٣ بە مەبەستی بەرگریکردن لە تاوان و سووکەتاوانی یاسای گشتی و سزادان و رادەستی تاوانباران لە شاری ڤییەنا(نەمسا) دامەزراوە و ئێستا پتر لە ١٧٦ وڵات بوونەتە ئەندامی رێکخراو. بە گشتی ئامانجی ئەم رێکخراوە بریتییەلە: پتەوکردنی پێوەندی راستەوخۆی مەقاماتی پۆلیسی وڵاتانی جیهان بەیەکتر، کۆجێکردنی زانیاری پێوەندیدار بە تاوانبارانی نێودەوڵەتی و هەنگاونانی تەکنیکی لەمەڕ تاوانەکانی یاسای گشتی، جگە لەو بابەتانەی کە لایەنی سیاسی یان ئایینی یان رەگەزییان هەبێت. ناوەندی رێکخراوی نێودەوڵەتی پۆلیسی تاوانباران، لە ساڵی ١٩٨٩ لە شاری پاریسەوە گواستراوەتەوە بۆ شاری لیێۆن لە فەرەنسا.

PDF 4 KURD

**ئینتەرناسیۆنال** بين الملل / انترناسيونال International

ئەم زاراوە لە رەوتێکی مێژوویی‌دا بە چوار هاوپەیمانییەتی ئەگوترێ کە لە نێوان حیزب و رێکخراوە سوسیالیستییە کرێکارییەکاندا بە مەبەستی گەیشتن بە یەکدەنگییەکی جیهانی و پێشخستنی بزاڤی کرێکاری بەسراوە. ئەم چوار هاوپەیمانییە بریتیەلە:

ئینتەرناسیۆنالی یەکەم، یان یەکیەتی نێونەتەوەیی کرێکاران کە لە ساڵی ١٨٦٤ بە هەوڵ و تێکۆشانی کارۆل مارکس لە لەندەن دامەزرا. لە ١٨٧٢ دوو لقی لێ جیا بۆوە کە بە لایەنگرانی مارکس و گرووپی سەر بە ئانارشیزمی میکاییل باکۆنین، ناویان دەرکرد کەچی لە ساڵی ١٨٧٦، لە بەر ململانێی ئایدیۆلۆژیك کۆتاییی پێ هات.

ئینتەرناسیۆنالی دووهەم: لە ساڵی ١٨٨٩ لە پاریس دامەزرا بەڵام نەیتوانی خۆی لە قەیرانی حیزبی سۆسیالیست و نەتەوەخواز بۆ بەرگری کردن لە هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی، دەرباز بکات. ئەم هاوپەیمانییەتیە لە ١٩٢٣ لە نەبوونی کۆمۆنیستەکان (کە ئەودەم ئینتەرناسیۆنالی سێهەمیان دامەزراندبوو)دیسانەوە پێکهاتەوە و دواتر ئینتەرناسیۆنال سۆسیالیست*یان پێکهانی.

ئینتەرناسیۆنالی سێهەم: لە ساڵی ١٩١٩ لە مۆسکۆ دامەزرا بەڵام هەر خێرا ئاشکرابوو کە دەرگاکانی تەنیا بەرەو رووی حیزبە کۆمۆنیستەکانی سۆڤیەت ئاوەڵایە. ئینجا ناوی کۆمینتێرن* و پاشان کۆمینفۆرم*ی بەخۆوە گرت.

ئینتەرناسیۆنالی چوارەم: لە ساڵی ١٩٣٨ لە لایەن داورودەستەی ترۆتسکی دامەزرا کە ئێستاش چالاکی هەیە.

**ئینتەرناسیۆنال سۆسیالیست** بين الملل سوسياليست International socialist

لە ساڵی ١٩٢٣ لە پاشماوەی حیزبە سوسیال دیموکراتەکانی ئەندامی ئینتەرناسیۆنالی دووهەم، سەر لە نوێ دامەزرایەوە کەچی پاش گەیشتن بە دەسەڵات لە ئەورووپادا ئەمانیش دەستیان لە کار کێشایەوە. ئینجا ئینتەرناسیۆنال سۆسیالیست لە ساڵی ١٩٥١ لە فرانکفۆرت دامەزرا بەڵام ناوەندەکەی لەندەن بوو کە نزیکەی پەنجا حیزبی سۆشیالیستی نەرمڕەو و لایەنگری پەرلەمان و ریفۆرمخواز و دیموکراسیخواز تێیدا بوون بە ئەندام.

**ئینتەرناسیۆنالیزم** انترناسيوناليسم Internationalism

ئەم زاراوە مانایەکی مژاوی هەیە و لە زۆر شوێندا بەکار هاتووە. بەڵام مانا گشتییەکەی ئەو بڕوا و سیاسەتانە لە خۆ ئەگرێ کە جەخت ئەکا لە سەر بەرژەوەندی هاوبەشی نەتەوەکان و لە گەڵ ناسیۆنالیزمی شەڕەنگێزدا دژایەتی ئەکات. ئینتەرناسیۆنالیستەکان دەخوازن ئەگەر نێوان دەوڵەتەکان هاوکاری ئاشتی خوازانە لە ئارادا نەبێت، لانیکەم لە نێوان نەتەوەکاندا ببێت.

PDF 4 KURD

بەم پێیە ئینتەرناسیۆنالیزم، بریتییە لەوەیکە هەر تاکێك گرێدراوی کۆمەڵگەیەکی جیهانییە و ئەو نەتەوەش کە ئاخێزگەی لە ئەژمار دێت، دەبێ بە رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی جیهانییەوە پەیوەست بێت... ئەم رێبازە لە گەڵ «جیهان‌نیشتمانی»دا یەك ناگرێتەوە چونکا ئینتەرناسیۆنالیزم ناخوازێ تاك لە نەتەوە یان دەوڵەتەکەی خۆی دابڕێ بەڵکوو دەخوازێ پێوەندییەکی زۆرتر لە نێوان تاك و نەتەوەکانی دیکەی جیهاندا بکرێتەوە.

ناسیۆنالیزمی نەرمڕەو لە گەڵ ئینتەرناسیۆنالیزمدا وانییە هەڵنەکەن بەڵام ناسیۆنالیزمی توندڕەو دژییەتی. بۆ وێنە نازیسم و فاشیزم بە رێبازی نەژادپەرستی و خۆبەزلزانی بە سەر نەتەوەکانی دیکەدا بوونە دوژمنانی سەرسەختی ئینتەرناسیۆنالیزم.

مارکسیزم بۆچوونێکی تایبەتی لە ئینتەرناسیۆنالیزم بڵاو کردۆتەوە. بەرای مارکس، بۆرژوازی بە یارمەتی مەکینە و دانوستانی جیهانی ئازاد، سنووره نەتەوەییەکانی بەزاندووە و سیستەمێکی ئابووری جیهانی پێك هێناوە کە لە نێو چینی هەژاران بە تایبەت پرۆلتاریای وڵاتان، یەکگرتووییەکی جیهانی ساز کردووە کە لە زاراوەدا پێی دەگوترێ «ئینتەرناسیۆنالیزمی پرۆلتاری». ئەم رەوتە شۆڕشێکی سەرانسەری لە جیهاندا بەدژی بورژوازی پێك دێنێت کە سەرەنجام کۆمەڵگایەکی سوسیالیستی جیهانی دائەمەزرێنێ. بۆیە مارکسیەکان بڕوایان هەیە بە یەکگرتنی هەژارانی جیهان و دروشمە بەناوبانگەکەشیان ئەمەیە: «زەحمەت کێشانی جیهان، یەك بگرن! یەك بگرن!»

دوای پێکهاتنی یەکیەتی سۆڤییەت، بە تایبەت لە سەردەمی ستالیندا ئەم وڵاتە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ناوەندی ئینتەرناسیۆنالیزمی پرۆلتارییە. ستالین، لە شرۆڤەیەکی ئینتەرناسیۆنالیزمی پرۆلتارییدا ئەم رێبازە بە هەڵقوڵاوی یەکیەتی سۆڤیەت دەزانی(بڕوانە ستالین خوازی).

**ئینتەرناسیۆنالیزمی پرۆلتاریی:** بڕوانە ئینتەرناسیۆنالیزم.

**ئینتیفازە** انتفاضە Intifada

وشەکە عەرەبییە و لە ریشەی «نفض»بە واتای لەرینەوە وەرگیراوە بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە راپەرینی گشتی خەڵکی فەلەستین کە لە دیسەمبەری ١٩٨٧ دەستی پێکردووە و بە شۆڕشی «بەردە ـ وردکە»ش ناوی دەرکردووە. رۆژی ٨ دێسەمبەر ١٩٨٧، چوار کەس لە کرێکارە فەلەستینییەکان لە شاری غەززە کەوتنە بەر هێرشی زرێپۆشەکانی ئیسرائیل و گیانییان لەدەست دا. ئەم رووداوە بووە هۆی ئەوە کە جەماوەری ئەم شارە، مان بگرن و مانگرتنەکەش ناوچەکانی دیکەشی تەنییەوە. ئینتیفازە چەند رەهەندی جۆراوجۆری هەیە کە بریتین‌لە:

١ـ هەموو چین و توێژەکانی خەڵکی گرتوەتەوە و رەهەندی ئیسلامی بوونەکەشی بەرجەستەیە. ٢ـ چەکی دەستی خەڵك، «بەرد» ە کە لە فەلەستینی داگیرکراودا بەزۆری دەست ئەکەوێت. ٣ـ هێشتنەوەی ئینتیفازە

PDF 4 KURD

(چونکو جەماوەری فەلەستین بەو قەناعەتە گەیشتوون کە نە رێبەری وڵاتانی عەرەبی و نە کەسی دیکە ناتوانن کێشەی ئەوان چارەسەر بکەن، بەڵکوو دەبێ هەر خۆیان هەوڵ بدەن و نەسرەون تا سەردەکەون. )٤- سەربەخۆیی و بێ نیازی ئینتیفازە لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی و رۆژاوا و رۆژهەڵات. ٥- ئەم راپەرینە جووڵانەوەیەکی وشیارانەیە کە لە لایەن لاوانی خەباتکار و شۆڕشگێڕی فەلەستینی دەستی پێکرد. ٦- دەوری رێکخراوەگەلێکی وەك حەماس*، ئیخوانولموسلمین* و جەهاد لەباری چەکدارییەوە زۆر گرنگە.

PDF 4 KURD

# ب

**بابۆفیزم** بابوفیسم Babeufism

بزاڤێکی شۆڕشگێڕی فەرەنسی لە سەدەی هەژدە بە مەبەستی دامەزرانی «کۆماری یەکسانی». ئەم جووڵانەوە ناوەکەی لە ڕێبەری خۆی بە ناوی فرانسوا نوێل بابۆف(١٧٦٥-٩٧) وەرگرتووە. بابۆف و هاوڕێیانی لە ١٧٩٦«نەخشەی یەکسانی» یان بۆ ڕووخانی حوکمەت، داڕشت کە ئەمە چڵەپۆپەی بزاڤەکە بوو. بەڵام پیلانەکە سڕی ئاشکرا بوو، لە ١٧٩٧ سەری بابۆفیان بە گیوتێن لێك جودا کردەوە. لایەنگرانی بابۆف، بوونە میراتگری ئایدیۆلۆجیای مەتریالیزمی سەدەی هەژدەی فەرەنسە و ئەندێشە شۆڕشگێڕییەکانی ئەو سەردەمە و نوێنەری توندڕەوترین ڕێبازەکانی شۆڕشی فەرەنسە.

بابۆفیزم یەکەمین تەقەلا بۆ کردنی سۆشیالیزم بە تیۆری جووڵانەوەی شۆڕشگێڕی بوو. بابۆفییەکان بۆ«کۆماری یەکسانی»خۆیان، سیستەمێکی تێر وتۆخی یاسا و ڕێسا یان بۆ باشتر کردنی وەزعی هەژاران و زاڵبوون بە سەر ململانێی هێزەکانی دژە شۆڕش، پێشبینی کردبوو. ئەندێشەی پیادەکردنی«دیکتاتۆری ڕەنجدەران»(بڕوانە دیکتاتۆری پرۆلتاریا) دوای سەرکەوتنی شۆڕش، هەر لە لایەن ئەم گرووپەوە ئاراستە کرا.

**باکوور و باشوور** شمال و جنوب North and South

باکوور بریتییە لە: وڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی سەرمایەداری، واتە وڵاتانی ئەورووپی، ئەمریکای باکووری، ژاپۆن و ئوستڕالیا کە بەزۆری لە نیوەی باکووری گۆی زەویدا جێگیر بوون. باشوور بریتیە لە: وڵاتانی دواکەوتووی هەژار، واتە وڵاتانی ئەفریقایی و ئەمریکای باشووری و ئاسیایی کە زۆربەیان لە نیوەی باشووری گۆی زەوی جێگیر بوون. لە میدیاکانی ڕۆژاوا، ئەغڵەب ئاماژە دەدرێتە فورمولی باکووری دارا و باشووری نەدار. کەواتە لەم ڕوانگەوە جیهانی هاوچەرخ دابەش کراوە بە کۆمەڵێ نەتەوەی پارەدار و کۆمەڵێکی دەستەنگ و بێ پارە. فری بیتۆ، قەشەی ئازادیخوازی برازیلی، بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی سەرزەوی دوو ڕێچارە پێشنیاز دەکات: یەکەم، پاوەجێکردنی ئاشتی لە جیهان. دووهەم، کەمکردنەوەی جیاوازی و لەمپەری نێوان باکوور و باشوور.

**باڵادەستیی قانوون** حاکمیت قانون sovereignty of law

سەرەکی ترین بنەڕەتی ماف ئیداری وڵاتەکان، باڵادەستیی قانوونە کە بەو پێیە ئەبێ بەڕێوەبردنی کاروباری

PDF 4 KURD

گشتی و دەرکردنی فەرمانی کاربەدەستانی ئیداری دەوڵەت، لە گەڵ یاسادا بگونجێ.

باڵادەستیی قانوون سێ دەرەنجامی لێئەبێتەوە:

١ـ یاسا ئەبێ پیادە بکرێت.

٢ـ دیاریکردنی کاروباری گشتی ئەبێ بە پێی یاسا بێت.

٣ـ هەڵسوکەوتی ئیداری ئەبێ لە گەڵ یاسادا بگونجێ.

باڵادەستیی قانوون لە پێوەند لە گەڵ خەڵکدا بەسراوەتەوە بەم مەرجانەی خوارەوە:

١ـ خەڵك گوێڕایەڵی یاسا بن.

٢ـ ملدان بە دەستوورەکانی یاسا.

## باڵیۆز　　　سفیر　　　Ambassador

باڵاترین نوێنەری نێردراوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکیتر. لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە شێوەی کاتی باڵیۆز نێردراوە بەڵام لە سەدەی پازدەوە بوو کە داریکردنی باڵیۆزی نیشتەجێ لە وڵاتێکیتر برەوی پێدرا. یەکەم وڵاتانێك کە باڵیۆزیان ناردە وڵاتانیدیکە، دەوڵەت ـ شارە بچکۆلەکانی ئیتاڵیای ئەو سەردەمانە بوو. هەڵبژاردنی باڵیۆز لە لایەن سەرۆکی وڵاتەوە دیاری ئەکرێت بەڵام ئەبێ ئەو کەسەی کە دەستنیشان کراوە لە لایەن سەرۆکی وڵاتی وەرگری باڵیۆز پەسند بکرێت ئینجا داوای بکرێت. باڵیۆز دەبێ لە وڵاتەکەی خۆی بەڵگەنامەیەك کە پێی دەوترێ «بڕوانامە ـ credential letter» بە واژۆی سەرۆکی وڵاتەکەی وەربگرێ و پێشکەش بە سەرۆکی وڵاتی وەرگری بکات. لە دوای پێشکەش کردنی ئەم بڕوانامە، باڵیۆز بە شێوەیەکی رەسمی دەست بەکار دەبێت.

## باڵیۆزخانە　　　سفارت　　　Embassy

نوێنەرایەتی باڵای سیاسی وڵاتێك لە ناو وڵاتێکی دیکە کە شوێنی گوزەرانی رەسمی و نووسینگەی باڵیۆزی ئەو وڵاتە لە ئەژمار دێت. باڵیۆزخانە لە دوای کۆنسوڵخانە پێك هات. چۆنیەتی دروستبوونی ئەم شوێنە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەیکە پاش کۆتایی هاتنی هەر شەڕێك، وڵاتانی دوژمن چەن کەسێکیان بۆ گفتوگۆ رادەسپارد. ئەم راسپاردانە بە شوێن دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بوون تاکوو شەڕ هەڵنەگیرسێتەوە. بۆ ئەوەی ئەم راسپاردانە بتوانن ئەرکەکانی خۆیان بێ مەترسی و لە ئاسایشدا بەڕێوە ببەن، مەسەلەی چۆنیەتی«پاراستن»یان هاتە ئاراوە.

بەندی یەکەمی رێککەوتننامەی لاهاوان کە لە ٢٠ ی فێوریەی ١٩٢٨ مۆرکراوە، ماف باڵیۆزخانە بەم شێوە دیاری ئەکات: «دەوڵەتەکان ماف ئەوەیان هەیە نوێنەرانی سیاسی بۆ وڵاتانی یەکدی بنێرن». هەر کات دەوڵەتێك، بێئەوەی لە گەڵ وڵاتێکی تر لە حاڵەتی شەڕدا بێت یان بێئەوەی پێوەندی سیاسی خۆی لەگەڵ دابڕیبێت، نوێنەری سیاسی ئەو وڵاتە وەرنەگرێت، لە روانگەی ماف نێونەتەوەییەوە ماف ئەو دەوڵەتەی

PDF 4 KURD

پێشێل کردووە.

یەکەم باڵیۆزخانەی هەمیشەیی لە لایەن ریشیلیۆ راوێژکاری لوویی سێزدەهەمی فرەنسا دامەزرا و دەوڵەتانی دیکەش بە پێی ئەم رێسایە هەنگاویان نا. کەواتە دەکرێ بڵێین باڵیۆزخانەی هەمیشەیی لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٧ لە دنیادا بەدیهات.

**باڵیۆزی ئاکریدیتێ** سفیر آکریدیته Accredited Ambassador

هەر کاتێك دوو وڵات لە گەڵ یەکدی پێوەندی سیاسییان هەبێت بەڵام پێکەوە باڵیۆزیان ئاڵوگۆڕ نەکردبێت، لەم حاڵەتەدا ئەغلەب باڵیۆزی خۆیان لە وڵاتێکی دراوسێی ئەو وڵاتە وەك «باڵیۆزی ئاکریدیتێ» بە وڵاتەکەیتر دەناسێنن. ئەم باڵیۆزە لە راستیدا ئەبێتە راسپاردەی وڵاتێك لە دوو وڵاتی دیکە.

**بزاڤی ئاشتی** جنبش صلح Peace Movement

بزاڤێکە کە حەز بە چەسپاندنی ئاشتی نێونەتەوەیی(یا نەتەوەیی) بکات و بەرگری دەکات لە بەرپابوونی شەڕ لە داهاتوودا. ئەم بزاڤە پێی وایە کە بە هەرەوەزی ئینسانی لە هەموو جیهان، دەکرێ دەوڵەتەکان بخرێنە ژێر فشار و بە سازدانی پێوەندی نێونەتەوەیی، کێشەکان کەم بکرێنەوە و کۆمەڵگاکان لە یەکدی نزیك ببنەوە.

**بزووتنەوەی بێلایەن** جنبش عدم تعهد Non-alignment movement

بریتیە لەو وڵاتانەی کە نەبوونە ئەندامی دوو پەیمانی سەربازی ناتۆ و وارشەو و لە پەیمانە ناوچەییەکانی وەك سیتۆ و سێنتۆ بەشدارییان نەکردووە و لە سیاسەتی دەرەکیدا لە سیاسەتی بێلایەن(سیاسەتی سەربەخۆ لە دوو بلۆکەکە)پێڕەوی دەکەن. زۆربەی ئەم وڵاتانە کە هەموویان سەر بە جیهانی سێهەمن، لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆجییەوە لە گەڵ دوو بلۆکی رۆژهەڵات*و بلۆکی رۆژاوا* جیاوازییان هەیە و هەرکامیان بانگەشەی مێتۆد و ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەت دەکەن. لە راستیدا ئەو شتەی کە ئەم وڵاتانە لە یەك نزیك دەخاتەوە، بە پێچەوانەی دوو بلۆکی رۆژاوا و رۆژهەڵات، یەکیەتی سیاسی و ئابووری و سەربازی نییە بەڵکوو راوەستان و خۆڕاگرتنە لە بەرامبەر دەسەڵاتی ئەو زلهێزانەی کە بوونەتە مەترسییەك بۆ سەربەخۆیی سیاسی ئەوان. بە واتایەکیتر هۆکاری کۆبوونەوەیان لە دەوری یەکتر، بە پێی هاوسانی و یەکگرتوویی نییە بەڵکوو لە سەر بنەمای «نە» گوتنە بە وڵاتانی دەسەڵاتخواز کە بۆ ئەوان جێگای مەترسی و هەڕەشەن.

بزووتنەوەی بێلایەن لە پاش شەڕی جیهانی دووهەم و دوای تەشەنەی شەڕی سارد* سەری هەڵدا. پێشەنگاوی ئەم بزاڤە، هێندستان و یۆگسلاڤیا بوون. پاشان میسر و ئەندونیسیا و سەرەنجام زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە تازە سەربەخۆییان بە دەست هێنابوو هاتنە ریزی بزاڤەکەوە. سەرۆکی ئەم وڵاتانە لە دوو

PDF 4 KURD

کۆنگرەی گەورە واتە «کۆنفرانسی باندۆنگ ١٩٥٥ و کۆنفرانسی بلگراد ١٩٦١» کۆبوونەوە و ئامانجەکانی خۆیان بەم شێوە دیاری کرد:

- هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی کرژیی سیاسی و کێشمەکێش لە پێوەندی نێودەوڵەتیدا.
- هاندان بۆ بەکاربردنی شێوازی ئاشتیخوازانە بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێونەتەوەییەکان.
- جێگیر کردنی پێوەندی نێونەتەوەیی لە سەر بنەمای یەکسانی مافی نەتەوەکان و ڕێزدانان بۆ یەکپارچەیی و حاکمییەتی نەتەوەیی.
- بەرفراوانکردنی هاریکاریی نێودەوڵەتی.
- دژایەتی لە گەڵ داگیرکاریی و پاکتاوی ڕەگەزی.
- لایەنگری لە ئاشتی و پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە.
- داکۆکی کردن لە جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و بنەمای مافە نێونەتەوەییەکان.
- دەستدرێژی نەکردن و خۆ تێهەڵنەقورتاندن لە کاروباری ناوەکی وڵاتێکیتر.
- بەشداری نەکردن لە یەکیەتی نێونەتەوەیی سەربازی.

ئەم گرووپە لە ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بارستاییەکی فراوانیان هەیە بەڵام دواکەوتوویی و لاوازی ئابووری و سەربازی ئەم وڵاتانە، بۆتە هۆی ئاستەنگی لە بەرامبەر زلهێزەکاندا. بەم بۆنەوە زۆربەیان لە نێوان دوو بلۆکەکەدا کەوتبوونە هەلاجان.

لە کۆنفرانسی ١٩٧٩ لە بێلگراد ٨٥ وڵات وەك ئەندامی سەرەکی و ١٠ وڵات وەك چاودێر و ٨ وڵاتیش وەك میوان بەشدارییان تێدا کرد. ژمارەی ئەندامانی ئەم بزاوتە لە کۆنفرانسی ٢٠٠٦/٩/١١ لە هاڤانا، پایتەختی کووبا گەیشتە ١١٨ وڵات.

## بشێوی خوازی — آنارشیسم/ سروری‌ستیزی — Anarchism

لە زمانی یۆنانیدا بە واتای بێ سەرەوەرییە. بەڵام لە زاراوەی سیاسی بە ڕێبازێك ئەگوترێ کە حەز بە دارمانی دەوڵەت ئەکا و جێگیر کردنی ئەنجومەنی ئازاد و هاوکاریی ئارەزوومەندانەی تاك و گرووپەکانە لە جێی دەوڵەت.

بن بونیادی بشێوی خوازی، لە سەر دوژمنی کردن لە گەڵ دەوڵەت پابەندە و هەر چەشنە دەسەڵاتێکی ڕێکخراوەیی ئایینی و کۆمەڵایەتیش بە ناڕەوا دەزانێ. ئەم ڕێبازە، یاسا دەوڵەتییەکان بە سەرچاوەی داگیرکاریی و وەیشوومیی کۆمەڵایەتی دەزانێ و بەم بۆنەوە خوازیاری لە ناوچوونی تەواوی دەوڵەتەکانە. کەواتە ئەکرێ بڵێین لایەنگرانی ئەم فیکرە بە چەشنێك، لە شوێن سڕینەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگادان.

بشێوەخوازان، بە پێچەوانەی ئەوەیکە تا ئێستە دەنگی داوەتەوە، ئاژاوەگێڕ یان هەرکیبەهەرکیخواز نین و ناخوازن کۆمەڵگە، بێ سەرەوبەرە و پاشاگەردانی بێت بەڵکوو بیر لە سیستەمێك دەکەنەوە کە بەرەنجامی هاوکاری ئارەزوومەندانە بێت کە باشترین شێوازەکەی دامەزرانی گرووپی ئۆتۆنۆمییە. چونکا زاتی ئینسان

PDF 4 KURD

بە کۆمەڵکی دەزانن. ئێلیزا ریکۆلز(١٨٣٠- ١٩٠٥)، ئانارشیستی فەرەنسی دەڵێ: «ئامانجی ئێمە، ژیانی بێ دەوڵەت و بێ قانوونە». بشێوی خوازەکان پێیان وایە گەڕیانی سیستەمی ئابووری، لە کۆمەڵگایەکی ئازاد و ئارەزومەندانەدا باشتر دەگونجێ چونکا ئەو شتەی کە ئیمڕۆ دەوڵەت بە زەبر و زەنگ ئەنجامی ئەدا، خەڵکانی ئارەزوومەند باشتر بەڕێوەی دەبەن و پێویست بە بەرتەسک کردنەوەی هەرێمی تاکەکەس ناکات. چونکوو مرۆڤ لە زاتی خۆیدا بە حەزێکی ئازادانە رێز بۆ ماف تاک قایلە.

بشێوی خوازەکان بە هەر رێبازێکیانەوە(ریفۆرمیست، کۆمۆنیست یان تاکپەرست) هەموویان لە سەر رووخاندنی هەرچەشنە دەوڵەتێك هاودەنگن و دیموکراسیش بە ئیستبدادی زۆرینە دەزانن کە بە دەگمەن لە ئیستبدادی سوڵتانی بێ قرەترە. پرۆدۆن دەڵێ: «دەوڵەتەکان شەللاقی خواکانن».

کۆنگرەی نێونەتەوەیی ئانارشیستەکانی جیهان، لە ساڵانی ١٨٧٧و ١٩٠٧ پێکهات بەڵام هیچ کاتێك نەیانتوانی رێکخراوەیەکی هەمیشەیی دامەزرێنن. سەندیکالیزم کە یەکێك لە لقەکانی ئانارشیزمە لە هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپی و ئەمەریکای لاتین تەشەنەی سەندووە. لقێکی تر لە جووڵانەوەی ئانارشیستی لە سۆڤیەت بە ناوی نیهیلیزم*چالاکی بووە.

**بلانکیزم** بلانکیسم Blanquism

رێبازی سیاسی و بۆچوونەکانی لویی ئاگۆست بلانکی(٨١-١٨٠٥)، بیرمەند و خەباتکار و شۆڕشگێری فەرەنسی. بلانکی لە شۆڕشەکانی ١٨٣٠و١٨٤٨ و لە دامەزراندنی «کۆمۆنی پاریس» (١٨٧١) بەشداریی کردووە و نیوەی تەمەنی خۆی لە بەندیخانەدا بووە. بۆچوونە شۆڕشگێرییەکانی بلانکی لە ژێر کاریگەری بابۆفیزم* بیچمی گرت و دزەی کردە نێو مارکسیزمەوە. ئەو هەندێ زاراوەی مارکسی وەك دیکتاتۆری پرۆلتاری، داهێناوە. بەرهەمی بەناوبانگی بلانکی، کتێبی ***رەخنەی کۆمەڵایەتی*** یە(١٨٦٩).

بلانکی، ماتریالیست و راسیۆنال (عەقڵ خوان)بووە و بڕوای بە پێشکەوتنی بێ کوتایی مێژوو بووە. بەڕای ئەو مێژوو لە قۆناغی تاکییەتی رەهاوە کە هی سەردەمی مرۆڤی وەحشییە، بەرەو کۆمۆنیزم - کۆمەڵگای داهاتوو کە تاجی سەری شارستانییەتە ـ لە جووڵەدایە. بلانکی بە سەختی لە گەڵ دژبەرە کۆمەڵایەتیەکانی سیستەمی سەرمایەداری دەستەو یەخە دەبێ و بۆ رووخانی ئەم سیستەمە پیلان و شێوازی ئانارشیستی پێشنیاز ئەکات. بلانکیزم، دزەی کردە ناو شۆڕشی وڵاتانی دیکە، وەك سۆڤیەت و مارکس و لینین، ستایشی خەباتەکەیان کردوە.

**بلۆکی رۆژاوا** بلوك غرب West(ern) Bloc

سەرجەمی وڵاتانی ئەورووپای رۆژاوا و ئەمەریکای باکووری کە بریتین لە پێشکەوتووترین وڵاتانی سەرمایەداری جیهان، بە بلۆکی رۆژاوا ناوبردە کراوە. بە مانایەکیتر بلۆکی رۆژاوا بە وڵاتانی ئەورووپای رۆژاوا(سوید و نەمسای لێدەرچێ) لە گەڵ ئەمەریکای باکوور دەوترێ کە ئەندامی رێکخراوەی ئەتلانتیک

PDF 4 KURD

باکووری (ناتۆ)*بن و لە بەرەیەکی سیاسی و سەربازی دژ بە بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا یەکیان گرتووە. بەڵام ئەم زاراوە وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتووی وەك ئوستورالیا و زیلاندی نوێ و ئەفریقای باشووریش لە خۆ دەگرێ. کەواتە وشەی ڕۆژاوا، لایەنێکی جوگراف ڕووت نییە بەڵکوو ئەویش وەك بلۆکی ڕۆژهەڵات زیاتر هەڵگری بارێکی ئایدیۆلۆجیکییە کە درێژەی شارستانییەتی ڕۆژاوا لە ئەژمار دێت.

زاراوەی بلۆکی ڕۆژاوا، هەندێ جار دەوڵەتانی داندراو یان یەکگرتووی ڕۆژاوا لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەمەریکای لاتینیش لە خۆدەگرێ. لێرەدا واتای ئایدیۆلۆجیکی و سیاسی ئەم زاراوە مەبەستە.

دوای شەڕی جیهانی دووهەم، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە هێزی یەکەمی جیهان و پێشەنگاوی سیستەمی سەرمایەداری. ئەم وڵاتە لە بەرامبەر سۆڤیەت دا بوو بە دەسەڵاتی سەرەکی بلۆکی ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات. هاوکات لە گەڵ ئاڵوگۆڕەکانی ١٩٦٠و ٧٠ لە جیهان، دەسەڵاتی سۆڤیەت لە بلۆکی ڕۆژهەڵات، هەر ئەهاتوو لاوازتر دەبوو. ئەمریکاش دەسەڵات و شەوتی جارانی لێ ئەستێندرا. پاش ئاوەدانکردنەوەی ئەوروپا و بە هێزبوونەوەی بەریتانیا و فەرەنسە و ئینجا ئەڵمانیا و ژاپۆن، ئەم وڵاتانە لە بڕیارە سیاسی و ئابوورییەکانی ئەمەریکادا ڕێدەستیان پەیدا کرد و لە ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، وڵاتانی هاوپەیمانی ئەمەریکا و ڕۆژاوا لە «جیهانی سێیەم»*دا بە زۆری بە پێچەوانەی ئەمەریکا، هەڵوێستیان دەگرت.

زاراوەی بلۆکی ڕۆژاوا و بلۆکی ڕۆژهەڵات، زیاتر لە قۆناغی «شەڕی سارد»* باو بوون.

## بلۆکی ڕۆژهەڵات — بلوك شرق — East(ern)Bloc

بە کۆمەڵێك لە وڵاتانی کۆمۆنیستی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، «بلۆکی ڕۆژهەڵات» دەگوترا. ئەم وڵاتانە هەڵگری ئایدیۆلۆجیای کۆمۆنیستی بوون کە لە بەرامبەریانا «بلۆکی ڕۆژاوا»* شیر و تیری نیشان دەدا.

تا شەڕی جیهانی دووهەم تەنیا دوو وڵاتی سۆڤیەت و مەغولستان، سەر بە کۆمۆنیست بوون. بەڵام پاش داگیرکردنی ئەوروپای ڕۆژهەڵات لە لایەن *ئەرتەشی سوور*ەوە، وڵاتانی ڕۆمانیا و پۆڵۆنیا و بولگاریا و ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و چێك، کەوتنە ڕیزی کۆمۆنیستەکانەوە. دواتر، وڵاتانی چین و کۆریای باکوور و ڤێتنام و کامبووج و لائۆس لە ئاسیا و کووبا لە ئەمەریکا هاتنە جەرگەی وڵاتانی کۆمۆنیستی و بلۆکی ڕۆژهەڵاتەوە.

بلۆکی ڕۆژهەڵات تا ماوەیەکیش دوای شەڕی جیهانی دووهەم، یەکگرتوویی سیاسی بووە و ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی و ئابوورییەکەشی، یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو بوو. بەڵام پاش هاتنە سەرکاری خرۆشچۆف لە سۆڤیەت و زلبوونەوەی قەیرانی سیاسی و ئایدیۆلۆجیکی نێوان چین و سۆڤیەت، یەکیەتی بلۆکەکە هەڵوەشا. مەیلی سەربەخۆیی وڵاتانی کۆمۆنیستی ژێر ڕکێفی یەکیەتی سۆڤیەت ڕۆژبەڕۆژ زیاتر دەبوو، جاری وابوو ئەم جیابوونەوە بە شۆڕشی خوێناوی مەیسەر دەبوو. پاش کۆتایی شەڕی سارد

PDF 4 KURD

رووخانی دیواری بەرلین لە کۆتایی سەدەی بیستەم، سیستەمی کۆمۆنیستی لەگوێن بلۆکێکی سیاسی بە تەواوەتی لێکهەڵوەشاوە و کۆمارییەکانی یەکیەتی سۆڤیەت سەربەخۆیی‌یان بەدەس هێنا و بلۆکی رۆژهەڵات وەك رێبازێکی ئایدیۆلۆجیکی سپێردرایە مێژووەوە.

## بنەڕەتی یەکسانی    اصـل برابـری    principle of equality

بنەڕەتێکی یاسایی و سیاسییە کە دەبێ بەو پێیە، لە هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی‌دا هەموو کەس بە یەك چاو تەمەشا بکرێ، بێجگە لەوەی بۆ کردەوەیەکی دیاریکراو دەرهەق بە هەندێ کەس یان گرووپ بەڵگەی تایبەت بە دەستەوە بێت. ئەم پرەنسیپە لە سەر ئەم گریمانە راوەستاوە کە تەواوی خەڵك لە بابەت «ماق سروشتی» پێکەوە یەکسانن. ئەم بۆچوونە هۆی نالێکچوویی زەینی و جەستەیی نێوان خەڵك ئەگەڕێنێتەوە بۆ «بەرووبوومی کۆمەڵایەتی»و «نایەکسانی دەرفەتەکان». لە لایەکی ترەوە دژبەرانی یەکسانی، لە سەر ئەم باوەڕەن کە نالێکچوویی کەسەکان تا رادەیەکی زۆر زاتییە و تەکوزی و هایراکی کۆمەڵایەتی بە پێی ئەم دۆخە دروست ئەبێ.

بنەڕەتی یەکسانی زۆرتر رواڵەتێکی ئەخلاقی و مرۆڤ دۆستانەی هەیە و کەمترین خواستەکەشی ئەوەیە کە ئەبێ هەمووی خەڵك لە هەندێ ماق سەرەکی هاوبەش و دابینکردنی پێداویستیەکانیان بە یەکسان بەهرەوەر بن. بەڵام رادەی ئەم مافانە نادیارە و هەرچی خەباتی یەکسانخوازانەش بەربڵاوترئەبێت، ئەوانیش زیاتر دەبن. مەسەلەیەکی تر پێوەندی نێوان یەکسانییەکانە، چونکا هەرکام لەوانە خۆبەخۆ یەکسانییەکانی‌تر لە خۆ ناگرن.

لانیکەم ٣٠٠ ساڵە ململانێ سیاسی و ئایدیۆلۆجیەکانی رۆژاوا لە سەر کێشەی یەکسانی چەقی بەستووە و کۆڵینەوەی فرەلایەنی ئەم مەسەلەش بۆتە هۆی سەرهەڵدانی جووڵانەوەی سیاسی جۆربەجۆر لە سەدەی بیستەمدا. ئەم باسە لە «یەکسانی لە بەردەم یاسا»وە کە دروشمی لیبرالیزم* بوو، دەستی پێکرد و تا «یەکسانی دەرفەتەکان» کە دروشمی سوسیالیزمە، درێژەی پێدرا. لە سەدەی بیستەمدا جووڵانەوەی راستگەرای گەورە بە دژی ئەم بیرۆکە بەرپا بووە.

## بۆرژوازی    بورژوازی    Bourgeoisie

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە کەسێکیان ئەگوت کە خەڵکی شاری ئازاد یا «بۆرگ»بێت، کەسێك کە نە ئاغا بێت و نە رەعیەت، پێیان دەگوت بۆرژوا. لە سەدەکانی ١٧و١٨ ئەرباب و خاوەنکار لە بەرامبەر چەرچی و کرێکار، یان بازرگان لە بەرامبەر کاسبکار، بە بۆرژوا ناو ئەبرا. کەواتە بۆرژوا بە مانای کەسێك لە چینی مامناوەندی ناوبردە کرا. بۆرژوازی، لە فەرەنسە بە گشتی ناونیشانێك بوو بۆ چینی مامناوەندی مەعامەلەچی یان شارۆمەندانێ کە بە هۆی پارە و دارایی‌یەوە ببونە خاوەن ماق سیاسی بەڵام دواتر لە باس وخواسە سیاسییەکاندا مانایەکی بەربڵاوی لێکەوتەوە.

PDF 4 KURD

لە سەدەی نۆزدە بە دواوە ئەم چینە کە بنیاتنەری شارستانیەتی نوێ لە ئەژمار هاتووە، بە شێوەی جۆراوجۆر نرخێندراوە. لە روانگەی ئابووری و سیاسییەوە بۆرژوازییان بە چینێکی کراوە و سەربەگێچەڵ و شۆڕشگێر لە قەڵەم داوە. بەو جۆرەی کە مارکس لە «مانیفیستی کۆمۆنیست»دا دەنووسێ: بۆرژوازی لە باری مێژووییەوە بالاترین دەوری هەبووە. بۆرژوازی ئەگەر هەمیشە ئامرازی بەرهەمهێنان و سەرجەم پێوەندییەکانی بە شێوەیەکی شۆڕشگێرانە وەرنەگێڕێ، ناتوانێ بژی. بۆرژوازی ئاڵاهەڵگری لیبرالیزم*لە ئەژمار دێت و ئەو شۆڕشانەی کە لە ژێر سێبەری ئەودا بە سەمەر گەیشتوون بە تایبەت شۆڕشی فەرەنسە. کۆتایی هێناوە بە زێدەمافی رەچەڵەك و لە سەر تاك و ماف و دەسکەوتەکانی تاك وەك پێودانگێك بۆ نرخاندنی بەهای کۆمەڵایەتی مرۆڤ پابەند بووە. بەڵام لە بواری کەلتوورییەوە نووسەران، لە مولیرەوە بگرە تاکوو بالزاك، بۆرژوازییان بە نیشانەی تەماحکاری و پەستی و ناحەزی ناوبردە کردووە و بێجگە لە پووڵپەرستی هاندەرێکی بۆ نابینن. لە دیدی خەڵکانی هونەری و کەلتوورییەوە بۆرژوازی، چینێکە کە هەمووشتێك تەنانەت کەلتووریش بە چاوی شمەك و کاڵا سەیر ئەکات.

بۆرژوازی لە گوتاری مارکسیزمدا بە واتای سەرمایەدار و مەعامەلەچی و کاسبکاری سەربەست لە قەڵەم ئەدرێ، لە بەرامبەر پرۆلتاریا کە تەنیا بە فرۆشتنی وزە و هێزی بازووی خۆی ئەژی. بە پێی ئەم پۆلێنبەندییە، بۆرژوازی لە لایەکەوە بە سەرمایەداری پیشەسازی و پارەدار و لەلایەکی ترەوە بۆرژوازی گەورە(سەرمایەدارەکان) و وردەبۆرژوازی(کاسپکاری دەستەنگ و دوکاندار و کەسانێك کە ئاستی ژیانیان لە پرۆلتاریا سەرناکەوێت) دابەش ئەکرێت. بەڕای مارکس، سەرمایەداری* پێکهاتێکە لە گەشەی چینی مامناوەندی معامەلەچی و سنعەتکاری کۆمەڵگای سەدەکانی ناوەڕاست کە بنیاتی سیاسی خۆی لە سەر بنەما وێرانەکانی داناوە و بە رێبازە لیبراڵەکانییەوە پێوەندی ئابووری و سیاسی کۆمەڵگای وەرچەرخاندووە.

بەم پێیە، چەمکی«بۆرژوا»(بە مانای تاکی هاوپێوەند بە چینی بۆرژوازی) و«بۆرژوازی» لە زمانی سۆسیالیستەکانی ئەورووپای کیشوەریی ـ کە لە ١٨٩٠ بەملاوە زۆریان بوونە مارکسیست ـ هاتە ئاراوە. لەوەدوا بە مانای«سەرمایەدار»و«نامارکسی» باو بووە. کەواتە لە گوتاری مارکسیزمدا «کۆمەڵگای بۆرژوایی»بە مانای«کۆمەڵگای سەرمایەداری»و«حیزبی بۆرژوایی» بە مانای«حیزبی ناسوسیالیستی»و سۆشیالیزمی بۆرژوایی بەواتای «سۆشیالیزمی نامارکسی» شرۆڤە کراوە. جاری واش هەیە، هەر بە مانای چینی مامناوەندی راڤە ئەکرێت.

دابەشکردنی بۆرژوازی بە بۆرژوازی گەورە(grand bourgeoisie) و وردە بۆرژوازی، لە روانگەی کەلتووریشەوە مانای تایبەتی لە خۆ گرتووە. بۆرژوازی گەورە، بەو توێژە ئەڵێن کە تەنیا فێر بووە دارایی بخاتە خزمەت بەهرەمەندی لایەنە مەعنەوی و کەلتوورییەکانی ژیانی ئاریستۆکراسی. بەڵام بەڕای هەندێك، وردە بۆرژوازی هێمایەکە بۆ رۆحیانەتی کاسبکارانە و معامەلەچی بەرچاوتەنگ و دوور لە بەرزەفڕی و بە گشتی بالانوێنی مرۆڤی نابالغ و پێ نەگەیشتووە. لەم سالانەی دواییدا بۆرژوازی کەمتر بە مانای بەد

PDF 4 KURD

سەریەکخستن لێکدراوەتەوە بەڵکوو زیاتر بە مانای شێوازی روانین بە ئاکاری زایەندی(ئەخلاقی سێکس)شرۆڤە کراوە.

**بۆرۆکراسی** بوروکراسی/دیوانسالاری Bureaucracy

لە زاراوەدا بە مانای دەزگای ئیدارییە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بە پێی رێسا و بڕیاری دیاریکراو کاروباری رۆژانەی دەزگایەك (وەزارەت، کۆمپانی، ئەنستیتۆ، دەوڵەت، زانستگە و...) بەڕێوە ئەبات.

دانەری تیۆری نوێ دەربارەی بۆرۆکراسی ماکس ڤێبەر کۆمەڵناسی ئەڵمانی بوو کە ئەم سیستەمە بە سەرنموونەی رەسمی ئەندێشەی رێکخستنی لۆژیکی دەزانێ. لە جوملەی تایبەتمەندییە زیندووەکانی بۆرۆکراسی بریتییە لە: هەبوونی رێسای قانوونی بۆ کاروبار، هەبوونی دامودەزگایەکی ئیداری مووچەخۆر، دیاریکردنی رۆڵێکی تایبەت بۆ هەر کارمەندێك، گرنگایەتی دەسەڵات و مەقام بە جێی دەسەڵاتی تاك و پاراستنی رێکوپێکی بەڵگە و داکیۆمێنتەکان. بە بڕوای ڤێبەر بۆرۆکراسی لۆژیکی، هۆکاری سەرەکی بە لۆژیکی کردنی سیستەمی دەوڵەت لە جیهاندایە.

بۆرۆکراسی دەرەنجامی باشی لێنەکەوتۆتەوە، بۆ نموونە: خاوبوونەوەی کارەکان لە جەغزی رێسای توند و تۆڵ و هایراکی دوور و درێژ، کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات بە قازانجی خۆت، حەزکردن بە بەربڵاوکردنی بەستێنی دەسەڵات و زیادکردنی شەوتی خۆت بە سەر لایەنەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی. بیرمەندانی سیاسی، بۆرۆکراسی بە دەسەڵاتێکی بێ هەوسار ئەزانن کە دەیهەوێت تەواوی کۆمەڵگا قووت بات. باڵزاك کە زاراوەی بۆرۆکراسی رەواج پێدا، لە چیرۆکی ***کارمەندان*** (١٨٣٦) دا بۆرۆکراسی بە «دەسەڵاتی دێوەزمەیەك» ئەشوبهێنێ کە بە دەست جەماعەتێك کوڵەبنەوەیە...

میل، (١٨٥٩) بۆرۆکراسی، دژی دیموکراسی و حوکمەتی پەرلەمانی و ئازادی لە قەڵەم ئەدا. گاتانۆمۆسکا، کۆمەڵناسی ئیتاڵی(١٩٣٩) دەوڵەتی مودێرن لە بنەڕەتدا بە دەوڵەتێکی بۆرۆکراتیك ناوبردە ئەکا کە کەمینەیەك بە سەریا دەسەڵاتداری ئەکات.

ئەمیستا ئەوشتەی داهێنەرانی تیۆری سیاسی بە خۆوە سەرقاڵ کردووە، مەسەلەی بۆرۆکراسی لەگوێن یەك «چینی نوێ»یە کە دەسەڵاتی سیاسی بە دەستەوەیە. ئەم بیرۆکە لە کتێبی ***چینی نوێ***، بەرهەمی میلوان جیلاس بیرمەندی یۆگوسلاڤی بڵاو کرایەوە.

**بولشویزم** بولشویسم Bolshevism

ئەم زاراوە ناوی ئایدیۆلۆجی حیزبی بولشویك، بە رێبەرایەتی لینین بوو کە «شۆڕشی سۆڤیەت»ی لە ئۆکتۆبەری ١٩١٧ بە ئەنجام گەیاند و یەکییەتی سۆڤیەتی دامەزراند. چۆنیەتی پێکهاتنی بولشویزم ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو ناکۆکیە کە لە کۆنگرەی حیزبی نهێنی سۆسیال دیموکراتی سۆڤیەت لە سەر ئەندامەتی لە حیزبەکەدا رووی‌دا، کە ئەمەش بوو بە هۆی شەقاربوونی حیزب و لادان و جیابوونەوەی دوو گرووپ

PDF 4 KURD

بولشویك(بە مانای زۆرینە) بە ڕێبەرایەتی لینین و مەنشویك(بەمانای كەمینە)بە ڕێبەرایەتی مارتۆف. لینین لە ساڵی ١٩٠٩ ئەم ناوەی لە گرووپەكەی خۆی نا و لە ١٩١٢ حیزبەكەیان دامەزراند. لە ساڵی ١٩١٨ ئەم ناوەیان بە «حیزبی كۆمۆنیستی سەرانسەری سۆڤیەت» گۆڕی و پاشان لە ساڵی ١٩٥٣ دیسانەوە بە«حیزبی كۆمۆنیستی یەكیەتی سۆڤیەت»ناوداریان كرد.

تایبەتمەندییەكانی بولشویزم، بریتی بوو لە: یەكەم، لایەنگری لە ماركسیزمی ئۆرتۆدۆكسی. دووهەم، هەبوونی ڕێكخراوەیەكی ناوەندیخوازی حیزبی. سێیەم، شۆڕشگێڕی و خەبات لە گەڵ ریفۆرمخوازی و حیزبەكانی‌تر.

بولشویزم، وەك ئایدیۆلۆجیایەكی شۆڕشگێڕانە، ئاوێتەیەكە لە ماركسیزمی ڕۆژاوایی لە گەڵ ترادسیۆنی جڤاتیخوازی سۆڤیەت. دوای بە دەسهێنانی دەسەڵات لە ١٩١٧ بەملاوە، هاوتەریب لە گەڵ حوكمەتی ڕەهای سۆڤیەت، تیۆر و كردەوە لە سەر پرەنسیپەكانی لێنینیزم چەقی بەست. ڕۆڵی مێژوویی بولشویزم لەم ڕاستییەدا بوو كە لە لایەكەوە پێوەندی خۆی لە گەڵ ماركسیزم بپارێزێ و لە لایەكی تریشەوە، دەس هەڵگرێ لەم بیرۆكەی ماركس، كە گوتبووی: «ئازادی چینی كرێكار تەنیا بەدەس خۆیان مەیسەر ئەبێ» و لەجیاتی ئەوە، ئەندێشەی تكاچۆف پەسند بكەن كە دەڵێ: شۆڕشی كۆمەڵایەتی، تەنیا بە هێنانی وشیاری چینایەتی بۆ ناو كرێكاران لە دەرەوەی چینەكەیان و لە لایەن شۆڕشگێڕانی لێهاتووی سەر بە ڕۆشنبیرانی سۆشیالیستییەوە پیادە ئەكرێت.

لێكۆڵەرانی ئەورووپی تا ١٩٤٥، بولشویزمیان بە توندڕەوترین لقی جووڵانەوەی چەپ لە قەڵەم داوە بەڵام لەوەدوا زۆربەیان، بە سیمایەكی توتالیتەر تەعبیریان لێكردووە.

## بونیاتگەرێتی/بنەڕەتخوازی  بنیادگرایی/ اصول گرایی  Fundamentalism

بڕوابوونی كوێرانە بە هەموو ناوەرۆكی ئینجیل و ئەوەیكە ئەم كتێبە پاك و بێغەشە و وشە بە وشەی «فەرمایشتی خودایە» وەك چۆنییەتی درووستبوونی جیهان و ئادەم و حەوا و بەهەشت و دۆزەخ. ئەم زاراوە لە زنجیرە وتارێك لە ژێر سەردێڕی *بناغەكان* وەرگیراوە كە لە ساڵی ١٩٠٩ لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بڵاو كرایەوە. هەندێ لە پرۆتستانە ئەمریكییەكان تا سەر ئێسقان بونیاتگەران و كلێسەی كاتۆلیكی ڕۆما و هەر ئەندێشەیەكی تازە و نوێباو، بە كوفر دەزانن.

بونیاتگەرێتی بە مانای گەڕانەوەیە بۆ بناغەكان. وەك دەرئەكەوێ ئەم زاراوە لە دنیای مەسیحیدا سەری هەڵداوە بەڵام لە دنیای ئیسلام زێدەتر پەرەی سەندووە. لە دنیای مەسیحی سڕینەوەی پیرۆزیی لە ئایین و شكاندنی تابۆ ئایینییەكان هاوكات دەستی پێكرد.

ئارێشەی بونیاتگەراكان لە سەر هەقیقەتە. ئەوان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە هەقیقەت، وەك چەمكێكی ڕەها بە تەواوەتی لای ئەوان دەست ئەكەوێت. هەندێ خەسڵەت بۆ بونیاتگەرێتی دیاریكراوە كە هەندێ بنەڕەتی مەعریفی تایبەتی هەیە. بۆ وێنە خوایەكی «قەهار» و «سزادەر» وێنا دەكەن و بڕوایان بە

PDF 4 KURD

هەقیقەتێکی تاقانە هەیە کە تەنیا لە لای خۆیان دەست ئەکەوێ. لە باری مرۆڤناسییەوە، مرۆڤ بە کەسێکی تاوانبار دەزانن و ئەم دنیاش وەك شوێنێك بۆ بەسزاگەیاندنی تاوانباران دەبینن.

بەڕای هەندێ، بونیاتگەرێتی جیاواز لەئۆرتۆدۆکس، دیاردەیەکی نوێیە و لە سەردەمی جیهانگیریدا بواری باشتری بۆ دەرەخسێ(گیدێنز). بە وتەی هەندێکی دیکەش بونیاتگەرێتی، سەرچاوەیەکە بۆ بەرهەمهێنانی شوناس کە لە کۆمەڵگای رایەڵەییدا بە گەڕانەوە بۆ رابردو و هەروەها گوڵبژێر کردنی چەن رەهەندێکی ئەو رابردووە، دەخوازێ بە شوێن هاوسانکردنەوە بێت(کاستێلز). ئەم کەسانە پێیان وایە کە بونیاتگەرێتی بە درێژایی مێژوو بووە بەڵام لەم سەردەمەدا دەرەتان و ئیمکانی زیاتری بۆ رەخساوە.

سکاتلی، پێی وایە ئەبێ لەنێوان دوو جۆر بونیاتگەرێتی جیاوازی قاییل بین: یەکەم، بونیاتگەرێتی ئایینی و نامودێرنە. دووهەم، بونیاتگەرێتی مودێرنە.

دیارە بونیاتگەرێتی ئیسلامی لە ڕووی مەعریفییەوە، لە چەشنی یەکەم ناونووس دەکرێ. لە کۆتایی سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی ٢١ بە تایبەت کارەساتەکەی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ لە ئەمەریکا، بونیاتگەرێتی لە رواڵەتە ئیسلامییەکەی دا بە جۆرێك لە گەڵ چەمکی تیرۆریزم*هاوواتا دەبێتەوە لەبەر ئەوە تۆرێکی شەڕەنگێز بە ناوی ئەلقائیدە*، بە دەسپێچکی ئیسلام خوازی و رزگارکردنی موسوڵمانان لە چنگی کافرەکان، چەندەها هێرشی تۆقێنەر و کوشندە لە جیهان ئەنجام ئەدەن کە هاوکێشە سیاسی و ئەمنی و نێونەتەوەییەکان بەرەو پێناسەیەکیتر دەگوازێتەوە.

**بەرژەوەندی نەتەوەیی**     منافع ملی     National Interest

بەرژەوەندی نەتەوەیی بریتییە لە ئامانجی سەرەکی و چارەنووسساز لە پرۆسەی بڕیاردان لە سیاسەتی دەرەکی وڵاتێك. هەر وڵاتێك کۆمەڵێك بەرژەوەندی بۆ خۆی دیاری دەکات کە پەیوەندی هەیە بە مان و نەمانی ئەو وڵاتەوە. بۆ نموونە: پاراستنی خاك و زێد، سەربەخۆیی، ئاسایش و خۆشگوزەرانی ئابووری. هەر کاتێك بەرژەوەندی نەتەوەیی وڵاتەکان پێکەوە تەبا بێت، ئەم وڵاتانە بۆ چارەسەری کێشەکانیان هاودەنگ دەبن و هاریکاری یەکتر دەکەن بەڵام ئەگەر وا نەبوو، کێشمەکێش و رکەبەرایەتی و ململانێ و سەرەنجام شەڕ دەکەوێتە نێوانیان.

بەرژەوەندی نەتەوەیی بە چەند جۆر دابەش کراوە کە بریتییە لە: بەرژەوەندی هاوسەنگ، بەرژەوەندی هاودژ، بەرژەوەندی هاوبەش و بەرژەوەندی گرفتساز.

هانس مورگنتا، یەکێك لە لایەنگرانی قوتابخانەی ریالیزم، بەرژەوەندی نەتەوەیی لە گەڵ پاراستنی دەسەڵات لە لایەن دەوڵەتەوە، بە یەك مانا شرۆڤە دەکات. ریالیستەکان دەسەڵات بە شتێکی پێویست دەزانن بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندی دەوڵەتەکان. بەڕای مورگنتا کەمترین خواستی یەك دەوڵەت بریتییە لە: پاراستنی شوناسی فیزیکی(پاراستنی خاکی وڵات)، شوناسی سیاسی (پاراستنی رژێم) و شوناسی کەلتووری(پاراستنی بەها و نەریتە مێژووییەکان)کە لە ژێر سێبەری دەسەڵات و هێزی پێویست بەئەنجام‌دەگات.

PDF 4 KURD

## بەشداریی سیاسی — مشارکت سیاسی — Political Participation

هاوکاریی شارۆمەندان بە شێوەیەکی ڕێکخراوەیی بۆ هەڵبژاردنی ڕێبەرانی سیاسی و بەشداری چالاکانە لە کاروباری کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارکردن لەسەر فۆرم و ڕێنمونی کردنی سیاسەتی دەوڵەت.

لە زۆربەی وڵاتانی جیهان نەك هەر بەشداریکردنی جڤاك لە سیاسەت پەسند ناکرێت بەڵکوو ئیجازە نادەن جەماوەر خۆی لە سیاسەت هەڵقورتێنێ. هۆی ئەم ڕێگرتنەی دەسەڵاتدارانیش ئەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆکار: یەکەم، حوکمەت توانای سنووردارکردنی دەستێوەردان لە سیاسەتی هەیە تا ئەوکاتەی نەخوێندەواری و بێئاگایی گشتی، لاوازی و نەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و کەمتەرخەمی جەماوەر بۆ تێگەیشتن لە ئاریشە سیاسییەکان لە گۆڕێدا بێت، سنووردارکردنی هاوبەشیی سیاسی و دەستێوەردان لە سیاسەت لە لایەن حوکمەتەکان وەك ئاوخواردنەوە دەبێت. دووهەم، دەسەڵاتداران بەزۆری دەترسن لەوەی بەرژەوەندی و قازانج و حەز و تاسەیان لەناوبچێت. بۆیە بەگشتی ڕژێمە سەرکوتکارەکان تێدەکوشن بە شێوازی جۆراوجۆر ڕێگر بن لە بەشداریی سیاسی جەماوەر و دەستێوەردان لە سیاسەتدا.

بیرمەندانی زانستی سیاسی ٣ هۆکار بۆ بەشداری سیاسی بە گرنگ دەزانن: یەکەم، پاڵنەر و هاندەری بەشداری کردن، واتە بۆ هەر چەشنە هاوبەشییەك دەبێ ناڕەزایەتییەك بۆ تاك لەئارادا بێت تاکوو بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەم ناڕەزایەتییە ببێتە ئەندامی ئەنجومەن یا ڕێکخراوەیەك کە هەوڵ ئەدات لە بواری جۆراوجۆر هاوبەشێتی بکات. هەوڵدان بۆ ڕازی هێشتنەوەی تاك دەبێتە پاڵنەرێك بۆ هاوبەشی کردن. دووهەم، ڕێکخستن چ بە شێوەی کۆن و چ بە شێوەی مودێرن، وزە و فیکر دەبەخشێ بە بەشداربووان و یارمەتی ئەوان دەدات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان. سێهەم، نەرمونیانی حوکمەتەکان، واتە حوکمەتەکان تا چ ڕادەیەك لە واقیعدا دەرفەتی ڕاستەوخۆی هاوبەشی کردنی جەماوەر سازدەکەن و تا چ رادەیەك لە بەرامبەر ئەم پرۆسە بە نەرم ونیانی ڕەفتار دەکەن.

## بەعس — بعث — Baath

مانای وشەکە «هەستانەوە»یە بەڵام لە زاراوەدا ناوی جووڵانەوەیەکی عەرەبی و حیزبێکە کە تێدەکۆشێ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی مارکسیستی لە گەڵ ناسیۆنالیزمی عەرەب موتوربە بکات. ناسیۆنالیزمی عەرەب، خەونی بەدیهێنانی کیانێکی یەکپارچەی عەرەبی دەبینێ کە هەر لە مەراکیش تا کەنداوی فارس ئەگرێتەوە. بەعس بە شوێن تەعبیری ئەم خەوە بوو، لەم ڕێبازەشدا بۆ ئیسلام وەك دەسپێچکێك بۆ گەیشتن بە ناسیۆنالیزم دەیڕوانی.

ئەم جووڵانەوە لە ١٩٤٤ لە دیمەشق بە شێوەیەکی نهێنی بە ناوی یەکیەتی خوێندکاران و ڕۆشنبیرانی لاو بە ڕێبەرایەتی میشل ئەفلەق و سەلاح بەیتار بە ئامانجی کورتکردنەوەی دەستی فەرەنسە لە سوریا دامەزرا. پاش سەربەخۆیی سوریا، حیزبەکە ئاشکرا بوو ئینجا بەرنامەیەکی نەرمەوی سەرزەوینی ڕاگەیاند و لە گەڵ دەسەڵاتی سیاسی و ئابووری بازرگان و موڵکدارە گەورەکانی دیمەشق و حەڵەب کەوتە ململانێ و خەباتەوە

PDF 4 KURD

لە ساڵی ١٩٥٣ حیزبی بەعس و حیزبی سۆشیالیستی سوریا(حزب الاشتراکیە) بە ڕێبەرایەتی ئەکرەم حورانی یەکیان گرت و ئەم دووانە پێکەوە «حیزبی سۆشیالیستی بەعسی عەرەبی»یان دامەزراند. ئەم حیزبە سەرەتا لە ڕێبازی پان ـ عەرەبیزمی توندڕەوی ڕێبەرانی شۆڕشی ١٩٥٢ میسر بە جیددی پشگیری کرد و یەکێك لە هۆکارەکانی یەکگرتنی سوریا و میسر لە ژێر ناوی«کۆماری یەکگرتووی عەرەب»بوو کە لە گەڵ حوکمەتی عەبدولکەریم قاسم لە عێراقیش کێشمەکێشی سەخت و خوێناوییان بوو.

پاش هەڵوەشانەوەی تەواوی حیزبەکان لە کۆماری یەکگرتووی عەرەب، حیزبی بەعس بە تایبەت لقی ئەکرەم حورانی، کەوتە دژایەتی کردن لە گەڵ ناسر و دوای نەمانی کۆماری یەکگرتووی عەرەب لە١٩٦١ هێدی هێدی، دەسەڵاتی لە سوریا بەدەستەوە گرت و ساڵی ١٩٦٣ بوو بە حیزبی دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە. بەڵام لەبەر ئەوەیکە دەسەڵاتی سیاسی بە دەست لقی چەکداری بوو، لە ساڵی ١٩٧٠ بەملاوە حیزب گرنگایەتی خۆی لە دەس دا. ئەم حیزبە پاش ڕووخانی حوکمەتی قاسم لە عێراقیش، دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت بەڵام جێگرەکەی عەبدوسەلام عارف، هەموی پێچانەوە. پاش مردنی عارف دووبارە لە ساڵی ١٩٦٥ سەریان هەڵداوە و دەستیان گەیشتەوە بە حوکمەت. لە واقیعدا گرووپێکی سەربازی لە بری ئەم حیزبە حوکمەتی بە دەستەوە بووە.

حیزبی بەعس ساڵی ١٩٦٤ لە سوریا، هەندێ دامودەزگا و کارخانەی بە نەتەوەیی ڕاگەیاند و لە گەڵ ئیخوانولموسلمین* کەوتە ململانەوە. ئەم حیزبە لە ئەردەن و لوبنانیش لقی کردۆتەوە. حیزبی بەعس لە عێراق، دەرحەق بە گەلی ئەو وڵاتە و بە تایبەت گەلی کورد کردەوەی نامرۆڤانەی زۆری لە خۆی نواند. لە ساڵی ١٩٨٧، هێزەکانی بەعس بۆ یەکەم جار لە ئاستێکی بەربڵاودا چەکی کیمیاوییان لە شار و دێهاتە کوردنشینەکان بەکار هێنا و هەزاران کەس تیاچوون. پاش ساڵێکیتر ئۆپەراسیۆنی ئەنفال* و تیابردنی کوردەکان بە ئەنجام گەیشت کە لە ئاکامدا زیاتر لە ٢٠٠ هەزار کەس کوژران و ٤٠٠٠ گوندیش وێران کرا. لە ئاگۆستی ١٩٩٠ سەدام هێرشی کردە سەر خاکی کوەیت و ئەم وڵاتەی داگیر کرد. دوای ساڵێك هێزەکانی هاوپەیمانان، لە ئاسمان و زەوییەوە هێرشێکی چڕوپڕیان کردە سەر عێراق و زەبرێکی کاریگەریان گەیاندە هێزی سەربازی ئەم وڵاتە. سەرەنجام ساڵی ٢٠٠٣ هێرشی هاوپەیمانان بۆ سەرخاکی عێراق بووە هۆی ڕووخانی ڕژێمی بەعس و پاش ٣ ساڵ بە لە سێدارەدانی سەدام حسەین، حیزبی بەعس پەکی کەوت. بەڵام وادەرئەکەوێت پاش چەن ساڵێك، پاشماوەکانی ئەم حیزبە هەر بە شێوەی نهێنی هەلسوکەوت بکەن بە چەشنێك کە بۆ داهاتووی ئەم وڵاتە مەترسی دروست بکەن.

**بەیاننامەی باڵفۆر** اعلامیەی بالفور Declaration Balfour

بەیاننامەی حوکمەتی بەریتانیا کە بە نامەیەك لە لایەن ئارتور جیمز بالفۆر (١٨٤٠–١٩٣٠)، وەزیری دەرەوەی ئەووڵاتە لە ڕێکەوتی ٢ی نۆڤەمبەری ١٩١٧ بۆ ڕۆچیلد (سەرۆکی کۆنگرەی زایۆنیستەکانی بەریتانیا)دەرکراوە. لەم نامەدا وێڕای هاوسۆزی کردن لە گەڵ ئاواتی جوولەکان، ئامادەیی بەریتانیا

PDF 4 KURD

«دامەزراندنی نیشتمانی جوولەکە» لە ولاتی فەلەستین راگەیاندراوە. لەو کاتەدا فەلەستین لە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی بووە بەلام لە سەر بڕیاری کۆمەلی نەتەوەکان(۱۹۲۲) ئەسپێردرێتە حوکمەتی بەریتانیا. لەوە بەدواوە بەریتانیا مابۆوە کە چۆن ئەو مەرجەی نامە کە جێبەجێ بکات کە ئەلێ: «نابێ کارێکی وەها بکرێت کە ماف مەدەنی و ئایینی گەلانی دیکەی فەلەستین پێشێل بکرێت». سەرجەمی ئەو رووداوانەی کە بوو بە هۆی دابڕانی جوولەکە و عەرەبان لە یەکتر و دامەزرانی ئیسرائیل و شەڕی نێوان عەرەب و ئیسرائیل، لێرەوە دەستی پێکرد. جا بۆیە، عەرەب پێی وایە بەیاننامەی بالفۆر پیلانێکی ئیمپریالیستی بووە لە لایەن بەریتانیاوە بە دژی عەرەب و فەلەستینەکان.

**جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ:** بڕوانە ماف مرۆڤ.

**بەیاننامەی سێ لایەنەی ۱۹۵۰** اعلامیەی سە جانبەی ۱۹۵۰

Tripartite Declaration of 1950

بەیاننامەی دەولەتانی بەریتانیا، فەرەنسە و ئەمەریکا لە سەر زامنکردنی دۆخی ئەو کاتەی فەلەستین. بە پێی بەیاننامەکە ئەم سێ دەولەتە، رێك کەوتن لە سەر ئەوەیکە هەرکاتێك ئیسرائیل یان ولاتانی عەرەب پێیان خستە ئەودیو سنوور و هێلەکانی دەسکێشانەوە لە شەڕ، ئەوکات بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ لە ڕێی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان یان ڕێگەی تر، «دەسبەجێ» بێنە مەیدانەوە.

**بەیاننامەی قاهیرە** اعلامیەی قاهرە Cairo Declaration

ئەم بەیاننامە پاش دیداری سەرۆکی دەولەتانی چین و بەریتانیا و ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە دیسەمبەری ۱۹٤۳ لە شاری قاهیرە بلاوکرایەوە. ئەم دەولەتانە جارێکیتر داوایان کرد لە ژاپۆن کە بێ مەنەمن خۆی تەسلیم بکات. ئەمانیش کارێك ئەکەن کە خاکە داگیرکراوەکانی بگەڕێننەوە بۆ دۆخی ۱۸۹۵. لەملایشەوە ژاپۆن دەبوا لە هەموو ئەو دوورگە و خاکانەی کە لە شەڕی جیهانی یەکەم لە بەحری هێمن گرتبووی، پاشەکشە بکا و ئەو ناوچانەش کە لە چین داگیری کردبوو، بداتەوە بەو ولاتە. لەم بەیاننامەدا هەروەها بڕیار درا کە کۆریا ببێتە ولاتێکی سەربەخۆ.

**بەیاننامەی هاوانا:** بڕوانە کاسترۆئیزم.

**بێ لایەنی** بیطرفی Neutrality

ئەم زاراوە لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم هاتە ئاراوە، مەبەستیشی لە حالەتی ئەو دەولەتانەیە کە لە باری سیاسی و دیپلۆماسییەوە لە گێرە و کێشەی دەولەتانی کۆمۆنیست و لایەنگرانی رۆژاوا، بە هیچکام لەم دوو لایەنەوە نەبەسرانەوە. ئەم سیاسەتە ئامرازێکە کە بەو پێیە ولاتێك ئەتوانێ خۆی لە قەیران

PDF 4 KURD

ئایدیۆلۆژیکی نێوان وڵاتانی دیکە دەربهاوێژێ.

مەبەست لە بێلایەنی بۆ هەر وڵاتێك لە بواری جوگرافییەوە، واتایەکی جیاواز لە خۆ دەگرێ. بێلایەنی لە لایەکەوە بە مانای گۆشەگیری و دوورەپەرێزی تەواوە و لە لایەکیترەوە بە «بزووتنەوەی بێلایەن* non-alignment» لە بەرامبەر دوو لایەن و بەشداری چالاك و پۆزەتیڤ بۆ دابەزاندنی قەیرانی نێو نەتەوەیی شرۆڤە دەکرێت (بڕوانە بزووتنەوەی بێلایەن).

پێویستی بێلایەنی، نەچوونە ناو پەیماننامەی سەربازی و وەرنەگرتنی چەك یان یارمەتی سەربازی لە هیچ لایەنێك یان نەدانی بنکە بە هیچ لایەنێکی شەڕە و بەرعۆدەنەبوونی هیچ شتێك لە بەرامبەر خواستی لایەنەکانی تێوەگلاو بە شەڕەوەیە. ئەم شێوازەی بێلایەنی، گرتنەبەری سیاسەتی دەرەکی سەربەخۆیە و بە لایەنگرانی ئەم ڕێبازە دەڵێن وڵاتانی «بێلایەن». بێلایەنی، ڕواڵەتێکی پۆزەتیڤیشی هەیە کە بریتییە لە هەوڵدان بۆ ئاشتکردنەوەی دوو لایەن یا ناوبژیوانی لە نێوان دوو گرووپی ڕەقیب و تەقەلا بۆ پاراستنی ئاشتی جیهانی لە ڕێگەی چەك کردنەوە(بڕوانە چەك داماڵین). بەم شێوازە دەوترێ «بێلایەنی پۆزەتیڤ». وڵاتی هیند لە سەردەمی نێهرۆ گەورەترین پێڕەوکاری ئەم سیاسەتە بووە لەجیهاندا.

جۆرێکی تر لە بێلایەنی بریتییە لەوەیکە دەوڵەتانی پیلانگێڕ، بە پێی بەرژەوەندی هاوبەشیان لە کاتی هەڵگیرسانی شەڕێك، وڵات یا ناوچەیەك لە شەڕەکە ئەپارێزن، ئەویش پەیمان ئەبەستێ کە لە پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا خۆ هەڵنەقورتێنێ. ئەم جۆرە بێلایەنییە، چەشنێکی نیگەتیڤە کە لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم لە سەر نەمسا پیادە کرا. دەوڵەتی سۆڤیەت بەو مەرجە هێشتی نەمسا سەربەخۆیی بە دەس بێنێ کە بێ لایەن بمێنێتەوە. کۆنترین و بەناوبانگترین وڵاتی بێلایەن لەم چەشنە، وڵاتی سویسرا یە کە تەنانەت نەبۆتە ئەندامی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئەم شێوازە لە سیاسەتی دەرەکی، بۆتە پێشینەیەکی پایەداری ئەم وڵاتە. بە بۆچوونی ڕەشگەل بێلایەنی، بە مانای دوورمانەوە لە شەڕە. ئەم جۆرە بێلایەنییە، بارودۆخی ئەو کەسانەن کە لە ئاشتیدا بە سەر ئەبەن بەڵام دیتران سەرقاڵی شەڕن. لە ڕوانگەی ئەکادیمییەوە، بێلایەنی واتایەکی تازەتری لە خۆ گرتووە کە بریتیە لە بارودۆخێکی یاسایی کە ئەرك و مافگەلێکی دیاریکراو پێشنیاز ئەکات. واتە بێلایەنی هەڵگری بارێکی یاسایی و قانوونی نێودەوڵەتییە کە لە دوو کاتی شەڕ یان ئاشتیدا ئەبێ پەیڕەو بکرێت. لەم بارەوە پاتێر دەڵێ: ئەم زاراوە بەو جۆرەی کە پێش ساڵی ١٩٤٥ پێناسە کرابوو لە لایەن هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە مەنشوورییان مۆر کردبوو فشەلی هێنا. ئیگلتۆن پێی وایە کە شکاندنی پەیماننامەی بێلایەنی لە شەڕدا بە واتای نەمانی ئەم پەیمانەیە.

PDF 4 KURD

# پ

**پارادایم/سەرمەشقی فیکری** الگوی نظری/پارادایم Paradigm

زاراوەی پارادایم یا *سەرمەشقی فیکری* لە لایەن تۆماس کوهن(١٩٦٢) بۆ فەلسەفەی زانست ئاراستە کراوە مەبەست لەم زاراوە پێمل بوونی گشتیی ستافێکی زانستییە بە ڕێبازێکی تایبەتی زانستەوە. کوهن، بە نووسینی کتێبی *پێکهاتەی شۆڕشە زانستییەکان* (١٩٧٠)دەورێکی بالای لە پەرەسەندنی زانست بە خۆوە بینی. بەڕای کوهن، بۆ ئەوەی بزانین چ *شتێك زانستی* یە، دوو نەریتی فیکری لە ئارادایە: یەکەم، نەریتی ئەرەستۆیی بە ڕێبازی ئایینزانی و دووهەم، نەریتی گالیلۆیی بە ڕێبازی میکانیکی.

چەمکی پارادایم، بەرهەمهێنی ئەو پێوەندانگانەیە کە مرۆڤ بە پێی ئەوان ئاریشە و گرفتە فکرییەکانی خۆی هەڵدەبژێرێ و دواتر پێناسەیان دەکات. کەواتە پارادایم، میتۆد و شێوازی پرۆژەی زانستی دیاری ئەکات. لە پارادایمی زانستیدا کاتێك شۆڕش بەرپا ئەبێت کە چەن زانا و توێژەری زانستی لە بڕگەیەکی زەمەنی تایبەتدا تووشی چەن بابەتێکی نائاسایی و ناوازە دەبنەوە و تێدەگەن کە ئەم بابەتانە بە پێوانەی پاردایمی پێشوو ناخوێندرێنەوە.

بە کورتی، پارادایم بە واتای کۆمەڵێ گریمانەیە کە لە بوارێکی تایبەت دەبێتە هۆی دروست بوونی تیۆرییەك. بە واتایەکی‌تر، تیۆرییەکی گشتییە کە ئینسان لە بابەت بەستێنێکی گەردوون ئاراستەی دەکا و بە پێی ئەو تیۆرییە دەست ئەکا بە مووقەڵاشتن و وردەکاری و توێژینەوە لەو بەستێنەدا. لە سیاسەتدا مرۆڤ بە پێی جیهانبینی*یان سەرمەشقی فیکری و پارادایمی زاڵ بەسەر ئەندێشەیدا ئەو بابەتەی کە دەیخوازێت، هەڵیدەبژێرێ و ئەیخاتە مەیدانی ئەزموونەوە.

**پاراستنی نێودەوڵەتی مادەی ئەتۆمی** پادمان بین المللی مواد هسته‌ای
International Nuclear Materials Safeguard

بریتییە لەو هەنگاوانەی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی* بە مەبەستی دۆزینەوە و ڕاوەستاندنی ئەو هەوڵ ودەوڵەی کە بەکارهێنانی مادەی ئەتۆمی ڕێدراو(مجاز) بە لاڕێدا ئەکێشێ و دەسبەجێ لە ڕێگای پەیماننامە و یاسای پێویست بە لاڕێ چوونی وڵاتان لە دامودەزگا ئەتۆمییەکان رادەگەیەنێ.

**پارە سپی کردنەوە** پولشویی Money Laundering

پرۆسەی گۆڕینی پارەیەك کە سەرچاوەی بەدەسهێنانەکەی نایاسایی بێت بۆ دارایی و داهاتێکی یاسایی. بۆ وێنە پارەیەك کە لە ڕێگای قاچاخی کردن بە مادەسڕکەرەکان، خواردنەوەی ئەلکولی، تیرۆریزم، بەرتیلدان و



کاری نارەوای دیکە بەدەست هاتووە. ئاریشەی سپی کردنەوەی پارە، کاتێك سەر هەڵ دەدا کە ئەم جۆرە پارانە لە سیستەمی ئابووریی ودامودەزگا ماڵییەکانی وڵاتێکدا بکەونە گەڕ. سەرچاوەی بەکار هێنانی ئەم زاراوە یەکەم جار، دەگەڕێتەوە بۆ دەسەڵاتی مافیا بەسەر تۆڕێکی جلشۆریی مەکینەیی ئەمریکی لە دەیەی ١٩٣٠. لەو ساڵانەدا گانگسترێك بە ناوی ئال کاپۆن، پارەیەکی زۆری کە لە ڕێگای دەسبڕی و چەتەیی، قومار، تاوان، قەحبەگەری و قاچاخ کردن بە مادەهۆشبەرەکان وەدەستی هێنابوو، لە جلشۆرخانەکان خستییەگەڕ تاکوو سەرچاوەی بەدەستهێنانەکەی ون بکات و کەس نەزانێ چۆن ئەو پارەی بەدەست هێناوە.

**پاسپۆرت/ پەساپۆرت** گذرنامه/پاسپورت Passport

بەڵگەنامەیەك کە لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەت دەردەکرێت و بەو پێیە کەسێك دەبێتە شارۆمەندی کاتەکی وڵاتێکی دیکە و ڕێگەی پێ ئەدرێ لە وڵاتەکەی خۆی بچێتە دەرەوە. پاسپۆرت بە ناوی جۆراوجۆر دەرئەکرێت کە بریتین لە:

١- پاسپۆرتی سیاسی (Diplomatic Passport) ئەم جۆرە پاسپۆرتە تایبەتی کاربەدەستانی باڵای حوکمەت و دیپلۆماتەکانە.

٢- پاسپۆرتی خزمەتگوزاری (Service Passport) تایبەتی کارمەندانی دەوڵەت بۆ جێبەجێکردنی کاروباری حوکومییە.

٣- پاسپۆرتی ئاسایی(نەتەوەیی)، بۆ هەموو هاووڵاتیان دەرئەکرێت.

ئەو کەسانەی کە خاوەنی پاسپۆرتی سیاسی و خزمەتگوزاری بن، لە وڵاتانی دەرەکی ماف پارێزراوییان هەیە. دەرکردنی پاسپۆرتی سیاسی و خزمەتگوزاری لە لایەن وەزارەتی دەرەوە و پاسپۆرتی ئاسایی لە لایەن وەزارەتی ناوخۆوە بە ئەنجام دەگات.

**پاسیفیزم:** بڕوانە ئاشتیخوازی.

**پاشایەتی** سلطنت/پادشاهی Monarchy

شێوازێکی حوکمەت کردنە کە تێیدا سەرۆکی وڵات بە ناوی پاشا یان شاژن ناوبردە ئەکرێ(بۆ وێنە قەیسەری ڕووم، تێزاری ڕووس، خاقانی چین، شاهەنشای ئێران و شاژنی بەریتانیا).

ئەرەستۆ، پاشایەتی بە «فەرمانڕەوایەتی تاکەکس» پێناسە ئەکا و زۆرداریی* بە شێوازە گەندەڵەکەی لە قەلەم ئەدات. پاشایەتی ئەگەر ڕەوا بێت - پاشا مانایەکی ئایینی و پلەیەکی هێماییی هەیە - جێی «باوك»ی نەتەوە ئەگرێتەوە.

لە زاراوەی نوێدا بە فەرمانڕەوایەتی بێ هەوسار دەوترێ پاشایەتی ڕەها. لە بەرامبەر ئەویشدا پاشایەتی مەرجدار دێتە ئاراوە. لەم چەشنەی دواییدا پاشا، تەنیا ئەوەنەبێ دەورێکی ڕەسمی و تەشریفاتی هەیە بەڵکوو کەمتاکورتێك کاروباری حوکمەتیش بەڕێوەئەبات، بۆ وێنە هەڵبژاردنی سەرەك وەزیر.

PDF 4 KURD

بەزۆری شازادەی جێ نشین، تایبەتمەندی سەرەکی سیستەمی پاشایەتییە بەڵام ڕەنگە پاشایەتی بە هەڵبژاردن بێت یان ڕەوا بێت کە پاشا جێنشینەکەی خۆی بە ئازادی دیاری بکات یان ژنێکی فاڵگیر پاشای داهاتوو دیاری بکات. دەزگای پاشایەتی، بە دوو مەرج لە دەزگاکانی تری حوکمەت جیا دەبێتەوە: (١) ئەگەر بە مانای جادویی یان ئایینی بێت کە لە مەراسیمی تاجگوزاری دەر ئەکەوێ. (٢) گرنگی هێمایینی پاشایەتی، بە مەبەستی ئەوەیکە پاشایەتی هێمایەکە بۆ پێوەندی مێژوویی و ڕەتەوەیی نەتەوەیەك بۆ وێنە پاشایەتی لە بەریتانیا و ژاپۆن.

**پاشکۆ/ لکاندن** الحاق/پیوست Annexation

لکاندنی وڵاتێکی بێ خاوەن یان دەم دانی خاکی وڵاتێك بە خاکی وڵاتێکی دیکەوە. ئەم ڕەوتە بە تەرزێکی یەکلایەنە دێتە ئەنجام یان لانیکەم ئەو دەوڵەتەی کە بەشێك لە خاکەکەی لە دەس ئەدات، بەم کارە خۆشحاڵ نییە. لکاندن، ماف فەرمانڕەوایی ئەبەخشێ بە دەوڵەتی لکێنەر و خەڵکی خاکە دەم دراوەکەش دەبنە شارۆمەندی ئەو دەوڵەتە. کڕین یا بە کرێگرتنی وڵاتێکیتر، لەگوێن معاملەیەکی دوولایەنە، پاشکۆ لە ئەژمار نایەت. لکاندنی نەمسا و ناوچەی سودەت بە ئەڵمانیای پێش شەڕی جیهانی دووهەم، دوو نموونەی گرینگی پاشکۆ ناونووس دەکرێن.

**پاش مۆدێرنیزم** پست مدرنیسم/ فرانوگرایی/پسانوگرایی Post-modernism

لە بەستێنی کردەی سیاسیدا ئەم قوتابخانە لە سەر ئەم باوەڕەیە کە خەباتی چینی کرێکار بەرەو کوژانەوە ئەڕوات و لە هەناوی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی سیستەمی سەرمایەداریدا پووکاوەتەوە. بەڕای دانیال بێل، کۆمەڵناسی ئەمریکایی قۆناغی پاش مودێرنیزم سەردەمی دژایەتی کردنە لە گەڵ نۆرمەکانی بورژوازی و نەلێکردن لە شوناسی کۆمەڵایەتی، تاك باوەڕی توندڕەوانە، چێژپەرستی کوت و کوێر و یاخیبوون لە کەلتووری نوێخوازی، سیاسەتی دیموکراتیك، ئابووری سەرمایەداری و بەها ئایینییەکان. هەندێ کەس پاش مودێرنیزم، وەك بەرسڤێکی کەلتووری بە دوایین گۆڕانکارییەکانی سیستەمی سەرمایەداری ناوبردە ئەکەن. هەندێکیش بێجگە لە ڕەنگدانەوەی چاخی نەزۆکیی هزری و سیاسی کە دەسکەوتێکی مەزنی نەبووە بە شتێکیان نەزانیوە. پاش مودێرنیزم، لە ڕاستیدا هەڵبڕینی دەنگێك بوو بە دژی هەموو دەسکەوتەکانی چاخی ڕۆشنگەری، ئەو چاخەی کە زەمینەی شۆڕشی فەرەنسە و حەز و لاگیری زانستی و کۆمەڵایەتی خۆش کرد.

**پالاوتن** پاکسازی/تصفیه Purge

لە گوتاری کۆمۆنیستەکان، شێوازێکە بۆ خاوێن هێشتنەوەی حیزبی کۆمۆنیست لە هەر چەشنە ڕەگەزێکی گەندەڵ یان گومانلێکراو یان بژار کردن و پاکردنەوەی حیزبێك لە ئەندامی ناپاك. بنەمای

PDF 4 KURD

پاڵاوتنی حیزبی ئەگەڕێتەوە بۆ لێپرسینەوە لە کردار و مەرامی سیاسی ئەندامانی حیزب کە یەکەم جار لە کۆنگرەی دەهەمی حیزبی کۆمۆنیست لە ساڵی ١٩٢١ بە تایبەت لە سەردەمی ستالین هاتە کایەوە. لەم قۆناغەدا پاڵاوتن بە شێوەی تیرۆری پۆلیسی بە ئەنجام ئەگەیشت و رادەیەکی زۆر لە رێبەران و کادێری پایەبەرزی حیزب تیاچوون و بە ملوێنان کەسیش رەوانەی تاراوگە کران بۆ کاری زۆرەملی. دوای نەمانی ستالین، شێوازی پاڵاوتنە خوێناوییەکانی چین و سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات کۆتایی پێهات و بە جێی ئەم ئاکارە، رەوشتی نەرمتر وەك دەرکردن لە حیزب و کاروباری دەوڵەتی پیادە کرا.

**پاڵاوتنی ئەتنیکی** پالایش قومی Ethnic cleansing

تەعبیرێکی مودێرنە لە دابێژان یا لابردنی پلانمەند یا بەئەنقەستی ئەندامانی گرووپێکی ئەتنیکی لە وڵاتەکەی خۆیان کە بە شێوەی نامرۆڤانە و زۆرەملی، روو ئەدات. لە باری تیۆرییەوە، ئەکرێ بڵێین لە گەڵ جینۆساید*یان کوشتاری بە کۆمەڵ کە بە ئامانجی فەوتاندنی بەئەنقەستی نەتەوەیەك رووئەدات جیاوازە بەڵام لە واقیعدا ناکرێ ئەم دووانە لێك جیا بکرێنەوە. بۆ وێنە پاکسازی و دابێژانی ئەتنیکی لە لایەن سیربەکان و کرۆواتەکان لە نێوان ساڵەکانی(١٩٩٢ تا ١٩٩٦). یان دەرکردنی زۆرەملێی کوردی کەرکووك لە لایەن رژێمی سەدام حسەین بۆ شارە عەرەب نشینەکان و هاوردنی عەرەبان بۆ ئەم شارە بە مەبەستی تێکدانی دیمۆگرافی شارەکە. پاڵاوتنی ئەتنیکی، یەکێکە لە شێوازەکانی شەڕی پاش مودێرن کە تێیدا ناتەبایی نێوان دەوڵەتەکان، جێی خۆی ئەدا بە دژبەریی نێوان هێزی میلیشیایی و گرووپی ئەتنیکی. بە وتەی رابێرت کاپلان، شەڕی پاش مودێرن و پاڵاوتنی ئەتنیکی و جینۆساید، بەرهەمی دیاردەی دەوڵەت ـ نەتەوە دۆڕاوەکانی دوای شەڕی ساردە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی کە بە چاوی خۆیان لاوازبوونی حوکمەتی ناوەندی و بە هەرێم کردنی عەشیرەیی ناوچەکان و پەیابوونی لە ڕادەبەدەری نەخۆشی و پەرەسەندنی شەڕیان دیوە.

**پان** پان Pan

بە زمانی لاتینی، پێشگرێکە بە مانای«هەمووان». لە سەدەی نۆزدە و بیست، سەرەتا لە ئەورووپا و ئینجا لە ئاسیا و ئەفریقا چەن بزووتنەوەیەکی سیاسی سەریان هەڵدا کە بە لکاندنی ئەم پێشگرە بە ناوی وڵات یان نەژاد یان ئایینەکەیان، خۆیان پێناسە دەکرد. ئامانج لەم کارەش ئەوە بوو کە جەماوەری هاوڕەگەز و هاوئایین یان هاوزمان، بە ناوی نەتەوە یان ئۆمەت یا نەژادێکی تایبەت لە یەکەیەکی سیاسی و نەتەوەییدا کۆبکەنەوە. بە ناوبانگترینی ئەم بزاوتانە بریتین لە: پان ئیسلامیزم*، پان ئسلاڤیزم*، پان جێرمەنیزم* و پان عەرەبیزم*.

**پان ئسلاڤیزم** پان اسلاویسم Pan-slavism

راپەڕینێکی سیاسی و کەلتوورییە کە لە سەدەی نۆزدە لە سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات بە

PDF 4 KURD

مەبەستی یەکخستنەوەی ئەو نەتەوانەی کە خاوەنی رەگەز و زمان و کەلتووری ئسلاڤی بوون. کێشی سیاسی ئەم جووڵانەوە، بە زوویی دەنگی دایەوە و لە ساڵی ١٨٤٨ پاش لاواز بوونی ئیمپراتۆریەتی نەمسا و بە پێشەنگی مێژووناسێکی چێك، کۆنگرەی ئسلاڤی لە پراگ بەڕێوە چوو. ئامانجی ئەم کۆنگرە هاریکاریی هەموو نەتەوە ئسلاڤییەکان بوو بۆ رازیکردنی ئیمپراتۆر کە سوڵتەی خۆی بدا بە فدراسیۆنێکی پێکهاتوو لە نەتەوەکان.

**پان ئیسلامیزم** پان اسلامیسم Pan-islamism

بزاڤێکی سیاسی پان ـ نەتەوەیی و پان ـ ئەتنیکی کە لە سەدەی نۆزدەوە دەستی پێکرد بە مەبەستی بردنەسەرەوەی هۆشیاری سیاسی موسوڵمانان بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی یەکگرتوو لە مەڕ پاراستنی بەرژەوەندی و کیانی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە بەرامبەر شاڵاوەکانی سیاسەتی ئیستیعماردا. پان ئیسلامیزم بریتییە لە: ئارمانجی رێبەرانی موسوڵمان لە ١٨٩٠ بەملاوە بۆ زیندووکردنەوەی دەسەڵات و یەکگرتوویی خەڵکانی موسوڵمان لە ژێر ئاڵای دەسەڵاتێکی یەکگرتوودا. ریشەی ئەم جووڵانەوە لە لایەکەوە ئەگەڕێتەوە بۆ وشیاربوونەوەی موسوڵمانان دەرحەق بە دواکەوتوویی دەسەڵاتی جیهانی ئیسلام. لە لایەکی ترەوە، پاڵنەری سەرەکی ئەم جووڵانەوە پەیوەست بوو بە دەست بەسەراگرتنی ئەورووپییەکان بە سەر وڵاتانی ئیسلامی لە سەدەی نۆزدە و بیستدا. وشیاربوونەوە بە رێژەی دواکەوتوویی ئیسلام، بووە هۆی سەرهەڵدانی وەهابییەت کە بانگەشەی بۆ گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام و زیندووکردنەوەی سوننەتەکانی پێغەمبەر دەکرد. بەڵام لە هەمان کاتدا رواورووبی لە گەڵ رۆژاوا، رێبەرانێکی وەك سەید جەمالەدینی ئەفغانیشی هێنایە مەیدان کە خوازیاری گۆڕانی بەرەو تەبا کردنی ئیسلام بوو لە گەڵ هەلومەرجی ژیانی هاوچەرخدا. بێجگە لەمەش، ئەفغانی، بە شوێن یەکگرتوویی جیهانی ئیسلام بوو لە ژێر سایەی خەلیفەیەك کە بتوانێ بەر بە هێرشی مەسیحییەکان بۆ سەر خاکی موسوڵمانان بگرێ.

لە سەدەی شازدە، کاتێك کە وڵاتانی عەرەبی کەوتە دەستی سوڵتانی عوسمانی، شیعە و سوڵتانی مەراکیش و پاشای مەغوولانی هێند نەبێ، تەواوی موسوڵمانان بۆ سوڵتانی عوسمانی ـ کە پێیان دەگوتن خەلیفە ـ وەك پارێزەری ئایین سەیریان دەکرد. ئەودەم سوڵتانی عوسمانی بەناوی خەلیفەوە بە سەر بەشێکی زۆر لە «دارولئیسلام»حوکمڕانییان دەکرد.

سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم(١٨٧٦-١٩٠٩)، تەبلیغاتێکی وەهای بۆ ئیسلام کردبوو کە دەسەڵاتدارانی ئەروپا، تۆقابوون لە وەیکە نەکا موسوڵمانانییان لێ یاخی بکات! ئەگەرچی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لە باری سیاسی و سەربازییەوە لە بەرامبەر دەسەڵاتی ئەورووپاییەکاندا هەر ئەهاتوو لاوازتر دەبوو، بەڵام بە دروشمی پان ئیسلامیزم، خۆی لە لای موسوڵمانان هەڵئەکێشا و توانیبوی وەك دەمڕاستی دەوڵەتی پێشڕەوی ئیسلامی لە ئەنجومەنە ئەورووپاییەکان دەنگی خۆی لە لایەن ئیسلامەوە هەڵبڕێ. پێش ئەوەیکە بیرۆکەی ناسیۆنالیستی لە ئەورووپاوە بێتە ناو ئیسلامەوە، پان ئیسلامیزم، ئایدیۆلۆجیای زاڵ بوو بە...

PDF 4 KURD

دونیای ئیسلامیدا و عەبدولحەمید، وەك خەلیفەی موسوڵمانان، پشتیوانی لێئەکرد و چەند کەسایەتییەکیش تەبلیغیان بۆ ئەکرد. سەیدجەمالەدینی ئەفغانی یەکێك لەوانە بوو کە لە چەندین وڵاتی ئیسلامی وەك، ئەفغانستان و ئێران و هێند و میسر و عوسمانی، بانگەشەی بۆ ئیسلام دەکرد. تەنانەت تەبلیغەکانی لە جاوە و تونێس و شانگهای دەنگی دابۆوە.

لە ساڵی ١٩٠٣ عەبدوڵا سوهرەوەردی ئەنجومەنی پان ئیسلامی لە لەندەن دامەزراند و لە بڵاۆکێکیشدا کە بەناوی پان ئیسلام دەری ئەکرد، بۆ ئاراستە کردنی ئیسلام لە چەمکگەلێکی ئەندێشە ئەورووپاییەکان وەك هیومانیزم و لیبرالیزم و سوسیالیزم کەڵکی وەردەگرت و هێرشی ئەکردە سەر لایەنە دزێوەکانی شارستانییەتی ئەورووپایی. لەو کاتەدا بۆ یەکگرتنی شیعە و سوننەش هەوڵ ئەدرا و بەم بۆنەوە لە ساڵی ١٩١١ تاقمێك لە زانایانی ئێرانی و عوسمانی، لە نەجەف کۆ بوونەوە و بەم قەناعەتە گەیشتن کە لە بنەڕەتەکاندا هیچ جیاوازییەك لە نێوان دوو فیرقەکەدا نییە. بەڵام ئەم هەوڵانە جێگیر نەبوون. لایەنگرانی یەکگرتنی ئیسلامی هەموو ساڵێك بە هۆشمەندییەوە لە مەراسیمی حەج بۆ تەبلیغ کەڵکیان وەردەگرت. بەڵام گەورەترین پلانێك کە لەم بابەتەوە سەرنجی حاجییەکانی ڕاکێشا، هێڵی ئاسنی حیجاز بوو کە بە دارایی شەخسی کەسانێکی وەك سوڵتان عەبدولحەمید دروس کرا و بووە یادگارێك بۆ ئامانجی پان ئیسلامیزم.

پان ئیسلامیزم، لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا واتای شوناسی توێژاڵکی ـــ ئایینزایی موسوڵمانەکانی کردە شوناسێکی سیاسی. لەم ڕووەوە پان ئیسلامیزم، بە پلەی یەکەم، بزاڤێکی ناسیونالیستی بووە بۆ دامەزرانی دەوڵەتێکی نەتەوەیی نوێ لە ڕێی ئاوێتەکردنی کەلتوور و سیاسەتەوە. ئەم بزاڤە بە چەمکەکانی «ئۆمەت و خەلافەت»، بێئەوەی بەڵێنی ڕزگاری یا کۆچ بدات، مانایەکی سیاسی دەبەخشێ. لە واقیعدا پان ئیسلامیزم بوو بە کەرستەیەکی بەهێز بۆ بە دنیایی کردن و دەروونی کردنی چەمکی نوێی نیشتمان و ناسیۆنالیزم.

*ململانێی ناسیۆنالیزم:* ڕووخانی عەبدولحەمید لە ساڵی ١٩٠٩ نیشانەی لە بەین چوونی پان ئیسلامیزم بوو. شکست هێنانی عەبدولحەمید لە یەکخستنەوەی جیهانی ئیسلام و بەرگری نەکردن لە داگیرکارییەکانی ئەورووپا لە وڵاتە ئیسلامییەکان، گەلێك لە زانایانی ئیسلامی کە لە دەست ئیستبدادی سوڵتان تەنگیان پێ هەڵچنرابوو، هان دا کە بۆ گۆڕینی ئەو سیستەمە سیاسیە ڕێگە چارەیەك بدۆزنەوە. بەرەی نوێ کە لە حوکمەتی قانوون و ناسیۆنالیزمی ڕۆژاوا کاریگەریی وەرگرتبوو، بە هیوا بوو کە بە یارمەتی ئەم چەمکانە، دەوڵەتێکی بەهێز لە عوسمانیدا بێنێتە سەر کار. بەڵام ناسیۆنالیزم بووە هۆی لێك ترازانی وڵاتە ئیسلامییەکان. چونکا ناسیۆنالیزم لە کۆمەڵگایەکی وەك «دارولئیسلام» کە پێکهاتێك بوو لە ڕەگەز و نەتەوەی جۆراوجۆر، بووە هۆی لێك پچڕان و لاگیری بۆ دامەزرانی دەوڵەتی نەتەوە. تورکە ناسیۆنالیستەکان، کە سۆزێکیان بە نیسبەت وڵاتانی ئیسلامییەوە نەبوو، لە شەڕی یەکەمی جیهانی بوونە هاوپەیمانی ئەڵمانیا بەڵام عەرەبی موسوڵمان ئەم هاوپەیمانییەیان ڕەت کردەوە.

PDF 4 KURD

ئەو رژێمە تازەی کە لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم لە تورکیا دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت، بە پێی بنەماکانی ناسیۆنالیزم دامەزرا. دەسەڵاتی خەلیفەکان لە پێشدا لە مستوای مەعنەوی(١٩٢٢) پووچەڵ بۆوەو ئینجا لە ١٩٢٤ ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لێك هەڵوەشا و بە یەکجاری رووخا. موسوڵمانە سوننەکان بەم کارەی تورکان ناقاییل بوون.

پاش شەڕی دووهەمی جیهانی، دوو وڵاتی پاکستان و ئەندونیسیا سەربەخۆییان وەرگرت و ئەم دوو وڵاتە ئیسلامییە، بوونە هۆی لەدایك بوونی راپەڕینێکی ئیسلامی. هەروەها لە رۆژهەڵاتی ناوین و باکووری ئەفریقا، چەندین وڵاتی عەرەبی موسوڵمان دامەزرا. بەڵام گەشەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی کە بۆ ئیسلام بە چاوی رەگەزێکی عەرەبی دەیڕوانی، ئاواتی یەکگرتنی جیهانی ئیسلامی بە فیڕۆ ئەدا. لەم رووەوە بوو کە وڵاتانی ئیسلامی بۆ یەکخستنی دەنگی ئەم وڵاتانە لە رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، لە ساڵەکانی ١٩٥٢ لە کەراچی و ١٩٥٤ لە مەککە، «کۆنفڕانسی نەتەوە موسوڵمانەکانیان»دامەزراند کە بوو بە هۆی پێکهێنانی کۆنگرە و نووسینگەی هەمیشەیی. کاری ئەم نووسینگە سازدانی دیداری ساڵانەی سەرۆکی وڵاتانی ئیسلامییە و هەوڵدان بۆ رێکخستنی چالاکی و هاوڕاکردنیان لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی. ئینجا هێدی هێدی لە خەونەکانی پان ئیسلامیزمیش دوور کەوتەوە.

## پان تورکیزم پان ترکیسم Pan-turkism

ئەم بزاڤەش وەك بزاڤە هاوشێوەکانیتر، لە دووی ئەو پلان و نەخشە سیاسیەوەیە کە لە جیاتی ئەوەیکە گرووپێکی نەتەوەیی تایبەت لە خۆ بگرێ، هەموو خەڵکانی بە رەچەڵەك تورك دەخاتە بازنەی خۆیەوە. کەواتە ناسیۆنالیزمی تورکی بزاڤێکی پان ـ نەتەوەییە کە بە شوێن دامەزرانی یەکەیێکی سیاسییە لە سەر بنەمای پەیوەندی کەلتووری تورکان.

بە گشتی زۆرترین لایەنگری لەم بزاڤە ئەگەڕێتەوە بۆ دوای هەڵوەشانەوەی ئەو ئیمپراتۆریانەی کە خەڵکی تورکیان لە خۆ گرتبوو. ئەم جووڵە لە رەوتی رۆچوونی ئیمپراتۆرییەکانی عوسمانی و سۆڤیەت، زیاتر ئاشکرا بوو. لە جوملەی ئەو کەسانەی کە لە سەر پێکهێنانی بزاڤی نەتەوەیی تورك قسەی کرد، رۆژهەڵاتناس، ئارمینییۆس وامبێری بوو کە لە ساڵی ١٨٦٠ لەمبارەوە دەستی بە نووسین کرد. ناودارترین کەسێك کە لە ناسیۆنالیزمی تورك پشتگیری کرد، سمایل بای گاسپیرینسکی(١٨٥١-١٩٤١ ) ناسراو بە قاسپیر عەلی، خەڵکی کریمە بوو کە داوای کرد تورکەکانی سۆڤیەت یەکبگرن. قاسپیرعەلی، رۆڵی میدیای گشتی بە باشی هەست پێکردبوو. بەم بۆنەوە گۆڤارێکی بە زمانی تورکی عوسمانی لە ئاستێکی بەرفراواندا بڵاوکردەوە. دەوڵەتی کاتی سۆڤیەت لە ١٩١٧ لایەنگری خۆی لە بەرنامەکەی قاسپیرعەلی راگەیاند و خوێندنی ئەم زمانەی لە قوتابخانەکانیش پیادە کرد. پاش هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١، خەونەکانی ناسیۆنالیزمی تورکی زیاتر بەرجەستە بوونەوە و بزاڤی پان تورکیزم، ئاهێکی تازەی بە بەردا هاتەوە.

PDF 4 KURD

**پان جێرمانیزم** پان ژرمنیسم Pan-germanism

بەو تیۆری و گەلاڵە و پیلانە شەڕخوازە ئەڵمانییانە دگوترێ کە لە بەرایی سەدەی نۆزدە بە ئامانجی یەکگرتنی سیاسی وڵاتانی ئەڵمانی زمان، هاتە کایەوە. ڕەگ و ڕیشەی فەلسەفی پان جێرمەنیزم ئەگەڕێتەوە بۆ یوهان فیشتە، فەیلەسووفی ئەڵمانی(١٨١٤-١٧٦٢). فیشتە، لەو سەردەمەی کە هێشتا ئەڵمانیا دابەش ئەکرا بە میرنشینی بچووك و یەکگرتوویییەکی سیاسی لە ئارادا نەبوو، باسی لە «چارەنووسی گەورەی نەتەوە»دەکرد و نەتەوەی ئەڵمانیای بە خاوەن ڕۆحێکی ئافرێنەر دەزانی و لە بەرامبەر ئەمەشدا نەتەوە لاتینییەکانی بە چارەڕەش ناوبردە ئەکرد.

ڕاپەڕینی سیاسی و ڕۆمانتیکی سەدەی نۆزدە کە بنیاتەکەی لە سەر ناسیۆنالیزم بینا کرابوو، بیرۆکەی ڕێبەرایەتی جیهانی ئەڵمانییەکانی بە هێزتر کرد و بیرمەندان و نوسەرانی ئەڵمانی بەرەو داڕشتنی گەلاڵەی زیندووکردنەوەی ڕایش*، هان دا و سەرەنجام ئەم پلانە بەدەستی بیسمارك بە ئەنجام گەیشت. بەڵام یەکگرتنی یەکجارەکی وڵاتە ئەلمانی زمانەکان، بە دەستی ئادولف هیتلەر بە ئەنجام گەیشت. کەچی ئیمپراتۆرییەتەکەی زۆری نەخایاند و بە شکست هێنانی ئەڵمانیا لە شەڕی دووهەمی جیهانی (١٩٤٥) وڵاتی ئەڵمانیا بە دوو پارچەی (ئەڵمانیای ڕۆژاوا و ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات)دابەش کرا (بڕوانە دیواری بەرلین).

**پانچاشیلا** پانچاشیلا Panchashila

بە زمانی سەنسکریت، بە مانای پێنج بنەڕەتە. پانچاشیلا، لە شەریعەتی بوودا بە گشتی ناوی پێنج یاسای کرداریی بوودایيەکانە کە بریتییە لە: خۆپاراستن لە کوشت و کوشتار، دزی، بەئالۆشی، درۆ و مەیخۆری. ئەم زاراوە لە لایەن دەوڵەتی هیندەوە بە واتای پێنج بنەڕەتی سیاسەتی دەرەوە بەم شێوازە بە کار براوە: ١) بایەخ دانان بۆ سەروەری و حاکمیەتی نەتەوەیی و سنووری وڵاتەکان.

٢) دەسدرێژنەکردن.

٣) دەست نەبردن بۆ ناو کاروباری ناوخۆیی وڵاتەکانی دیکە.

٤) ڕێز گرتنی دوولایەنە و یەکسان لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکان.

٥) پێکەوە ژیانی ڕژێمی جۆراوجۆر. کۆنگرەی نەتەوەکانی ئاسیا و ئەفریقا لە باندۆنگ، ئەم بنەڕەتانەی بە «پێنج بنەڕەتی پێکەوە ژیانی ئاشتی خوازانە»پەسند کرد. لە ساڵی ١٩٦٥ وڵاتی ئەندونیسیا بنەڕەتەکانی پانچاشیلای بۆ سیاسەتی دەرەوەی خۆی بە کار هێناوە.

**پان عەرەبیزم** پان عربیسم Pan-arabism

زۆربەی سەرچاوەکان، دوو زاراوەی پان عەرەبیزم و پان ئیسلامیزم، بە یەك دەروو(مدخل) لە ئەژماردێنن و نزیکایەتی مێژوویی و مەفهوومی ئەم دووانە بەرجەستە ئەکەنەوە. بۆیە ئاخێزگەی پان عەرەبیزمیش، هەر دەگەڕێتەوە بۆ ڕاپەڕینی عەرەبان لە هەمبەر حوکمەتی تورکانی عوسمانی پێش شەڕی جیهانی یەکەم

PDF 4 KURD

(١٩١٤).

دەزگای هەواڵگری بەریتانیا، بە سەرپەرشتی تۆمس ئیدوارد لۆرێنس (١٩٣٥-١٨٨٨)، بەڵێنی دا بە عەرەبان کە وڵاتێکی مەزنی عەرەبی، هەر لە کەنداوی فارسەوە تا جۆگەی سوئێز، دابمەزرێنێ. ئەم راپەرینە سەرەتا لە حیجازەوە دەستی پێکرد ئینجا رووی کردە دیمەشق لە سووریا و رۆژی ٣ی ئۆکتۆبەری ١٩١٨ دەستی تورکان لە حوکمەت کردن لەم شارە، کورتبۆوە. لە لایەکی‌ترەوە بە هۆی دەسبەسەراگرتنی فەرەنسە و بەریتانیا بە سەر چەن ناوچەی عەرەبی (وەك لوبنان و ئەردەن و سوریا و فەلەستین و عێراق) راپەرینی پان عەرەبی لە کەشێکی تردا رووی خەباتەکەی کردە ئەو دوو وڵاتە. بۆیە کەسانێکی وەك ئەمین ئەلحەسەنی(موفتی ئۆرشەلیم)، شوکری قووەتلی، جەمیل مەردەم، رەشید عالی گێلانی، میشل ئەفلەق و سەلاحەدین بەیتار، بوونە رێبەرانی قۆناغ بە قۆناغی بزووتنەوەی پان عەرەبیزم. (بروانە بەعس)

زاراوەی پان عەرەبیزم، یەکەم جار لە لایەن جەمال عەبدول ناسر رێبەری ناسیۆنالیستەکانی میسر لە ساڵەکانی ١٩٥٠ بەکار هێنرا. ناسر، زۆری هەوڵ داوە کە پان عەرەبیزم بکاتە بەرەیەکی دژ بە ئێرانی و بەم بۆنەوە یەکێك لەو پرۆژانەی کە ویستوویە ئەنجامی بدات، گۆرینی ناوی «کەنداوی فارس» بووە بە «کەنداوی عەرەبی». ئەفلەق و بین لادەن و سەدام حسەین، لە جوملەی ئەو عەرەبە شوڤێنیانە بوون کە لە ئیسلام کەڵکیان وەرگرتووە بۆ زیندووکردنەوەی عەرەبییەت. نژادپەرستی عەرەبی، لە سەردەمی سەدام حسەین بەو پەری شەرمەزاری و بێویژدانی خۆی ئەگا و ئەم سیاسەتە چەپەڵە، بە نیسبەت گەلی کورد بە دڕندانەترین رووکار خۆی پیشان ئەدات. بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٧٠ هەزاران کورد بەرەو ئێران دەرئەکات کە زۆرینەیان تا ئیستاش نەگەڕاونەوە و هەر لە ئێران دەژین. بە عەرەب کردنی شاری کەرکووك و کارەساتەکانی ئەنفال* و هەڵەبجەش دوو نموونەی دیکەن لە کردەوە نامرۆڤانەکانی سەدام وەك ئەنجامی پان عەرەبیزم.

## پرۆپاگەندە/بانگەشە — تبلیغات — Propaganda

لە وشەی لاتینی propagare وەرگیراوە و بە واتای «بڵاوکردنەوە»یە. بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای راگەیاندنی ئەو واقیع و رووداوانەیە کە زێدەتر سیاسی بن یان بە دەمهەڵبەستنی راپۆرتێك بە مەبەستی کارتێکردن لە سەر زەینی بیسەر بۆ هاندان بەرەو ئەنجامی کردارێکی تایبەت. لە پرۆپاگەندەدا زیاتر بە ئامانج گرنگایەتی دەدرێ، تاکوو ناوەرۆك. پرۆپاگەندە، هەمیشە بووە بەڵام لە سەدەی بیست بەملاوە بە هۆی پەرەسەندنی میدیا و کەرەستەی راگەیاندن(وەك رادوێ، تەلەفیزیۆن، رۆژنامە، سینەما و ئینتەرنێت) کارلێکی زیاتری پەیدا کردووە و دەوڵەتان و حیزب و گرووپی سیاسی، زیاتر لە سەر ئەم دیاردە لەنگەریان گرتووە و تەنانەت لە کۆمەڵناسیدا لقی ئەکادیمیشی لێ کەوتۆتەوە. حیزب و دەوڵەتانی فاشیستی و نازیستی و کۆمۆنیستی، بۆ بەدەسهێنانی دڵی رەشەگەل و راکێشانی سەرنجی خەڵکانی جیهان بەرەو لای خۆیان توانایی زۆریان لە خۆ نیشان داوە.

PDF 4 KURD

کێشمەکێشی تەبلیغاتی لە نێوان دەوڵەت و حیزبە راست و چەپییەکان، زاراوەی «شەڕی پڕۆپاگەندەیی»و «شەڕی سایکۆیی»هێنایە ئاراوە. شەڕی پڕۆپاگەندەیی لە قۆناغی شەڕی جیهانی دووهەم و سەردەمی *شەڕی سارد**دا گەیشتە بەرزترین ئاستی خۆی.

پڕۆپاگەندە، لەم سەردەمەدا لە سەر دوو دیاردە بە باشی کاریگەری بووە:

١) بەدەستهێنانی زۆرترین *رای گشتی** بە قازانجی دەوڵەتەکانی کۆمەڵگای پیشەسازی.

٢) بە کارهێنانی کەرەستە و ئامرازی تەکنیکی بۆ بە قەناعەت گەیاندنی کۆمەڵ.

کەواتە پڕوپاگەندە لایەنی تایبەتی شارستانییەتی هاوچەرخ لە ئەژمار دێ چونکا وەیلانی خرکردنەوەی تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگایە بە دەوری فیکر و رێباز یا ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەتەوە.

*دریان کوور*، لە نێوان پڕۆپاگەندەکان چەند جیاوازی قایل دەبێت:

١ـ هەڵگر: هەرشتێك کە بلاو بکرێتەوە (واتە هەر شتێك کە هەڵگری باری تەبلیغاتی بێت).

٢ـ ئامرازی تەکنیکی: رادوێ، تەلەفیزیۆن، رۆژنامە و...

٣ـ ناوەرۆك و ناواخن: ئایدیۆلۆجیا، ئەندێشە، دروشم، زانیاری درۆ و...

٤ـ ئامانج و مەبەست: فەرمانبردنی کوێرکوێرانە، سەرسپوردەگی، دژەپڕۆپاگەندە، وەتەن پەرستی، وەفاداری بە حوکمەت.

## پرۆتۆکۆڵی گۆڕینی کەش و هەوای کیۆتۆ    پروتکل تغییر آب و هوایی کیوتو

## Kyoto Climate Change Protocol

ئەم پرۆتۆکۆڵە لە ساڵی ١٩٩٧ لە نێوان سەرۆکی وڵاتانی جیهان لە کیۆتۆی ژاپۆن مۆرکرا بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئەو گازانەی کە دەبنە هۆی گەرمبوونی گۆی زەوی. واتە چونکو ئەو گازانەی کە لە سووتاندنی سووتەمەنییە فوسیلییەکان (نەوت و گاز و خەڵووزی بەرد) بڵاو دەبێتەوە دەبێتە هۆی گەرم بوون و گۆڕینی کەشوهەوای سەرزەوی، دەبێ وڵاتان هەوڵ بدەن لە بەکارهێنانی ئەم سووتەمەنییانە کەم بکەنەوە و رووبکەنە وزەی هەتاوی و ... بۆ پیادەکردنی ئەم پرۆتۆکۆڵە دەبوایە لە لایەن ئەو وڵاتانەی کە ٥٥٪ ئەم گازانە بڵاو دەکەنەوە، پەسند بکرایە. مانگی ژووەنی ٢٠٠٢ لە لایەن پانزە وڵاتی یەکیەتی ئەورووپا پەسند کرا. هەر لەو ساڵەدا پتر لە ٧٠ وڵاتی جیهان ئەم پرۆتۆکۆڵەیان پەسند کرد. رەشنووسی کیۆتۆ داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەکات لە قەدەر بڵاوکردنەوەی ٣٦٪ ئەو گازانە لە ساڵی ١٩٩٠، بۆ کەمکردنەوەی ئەم گازانە هەنگاو بنێت. کەچی بەم حاڵەش، لە نێوان ساڵەکانی ٢٠٠٢ـ١٩٩٧ بڵاوکردنەوەی ئەم گازانە لە ئەمریکا، نزیکەی ٨٪ زیاتر بووە. ئەمریکا تەنها وڵاتێکە کە لە گەڵ ئەم رەشنووسەدا نەیارە.

## پرۆسە/ رەوت    فرایند/پروسه    Process

وشەکە فەرەنسییە و بە مانای شێوەی جێبەجێکردنی کارێك یان قۆناغەکانی پێداڕۆشتنی کردارێك.

PDF 4 KURD

تەواو بوونییەتی بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای رەوتی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی کۆمەڵگا و راپەرینەکان پێناسە ئەکرێ.

**پرۆلتاریا/چینی کرێکار** پرولتاریا/طبقەی کارگر Proletariat

بە زمانی لاتینی لە وشەی proles بە مانای منداڵ وەرگیراوە. ئەم زاراوە یەکەم جار لە سەدەی شەشەمی پ. ز، لە ئیمپراتۆرییەتی رووم بە کار هێنرا. لەو سەردەمەدا پرۆلتاریا بە کەسانێك دەگوترا کە ماف و مووچە و ملکیان نەبووە بەڵکوو تەنیا ئەرکیان ئەوە بوو کە منداڵەکانیان بنێرنە خزمەت دەوڵەت. بە پێی یاسا دەبوایە خاوەن ملك و چینەکانی دیکە، یان بە سەرانە و باج یان بە چوون بۆ سەربازی خزمەتیان بە دەوڵەت بکردایە، ئەوانەش کە شتێکیان نەبوو دەبوایە منداڵەکانی خۆیان بناردبا خزمەت دەوڵەت.

ئەم زاراوە لە سەدەی ٢ی زایینیدا بزر بوو. لە ساڵی ١٨٣٨ لە لایەن سیسمۆندی(ئابووریناسی سویسی)، جارێکیتر زیندوو کراوە و دەرحەق بەو کەسانە بە کار هێنرا کە«هیچ بەشێکیان بە دارایی و سامانی کۆمەڵگاوە نییە و بۆ ژیانی سادە و ساکار و داهاتووشیان دواڕۆژێکی روون بەدی نەدەکرا».

ئەم زاراوە زیاتر لە گەڵ ناوی مارکسدا گونجاوە. مارکس لە کتێبی ***رەخنە لە فەلسەفەی حەق ی هێگل***(١٨٤٣)، پرۆلتاریا بە«چینێکی دەست و پێ سپی» پێناسە دەکا و ***مانیفێستی کۆمۆنیست*** (١٨٤٨) بەم دەستەواژە پڕ تەنتەنەوە دەست پێئەکات:

«مێژووی هەموو کۆمەڵگا ئینسانیەکان لە ئێستا و رابردوودا مێژووی شەڕی چینەکان بووە و سەردەمی بورژوازی، کێشمەکێشی چینەکانی خاو کردۆتەوە و کۆمەڵگای بە دوو چینی گەورەی دژبەیەك(دوژمن) واتە بورژوازی و پرۆلتاریا دابەش کردووە». دیسانەوە لە هەمان شوێندا ئەڵێ: «مەبەست لە پرۆلتاریا، ئەو چینە کرێکارە نوێباوەیە کە خاوەنی هیچ ئامێرێکی بەرهەمهێن نییە و وزە و هێزی خۆی بۆ دابینکردنی ژیانی خۆی ئەفرۆشێت».

زاراوەی پرۆلتاریا، لە راپەرینی کۆمۆنیستی سەدەی بیستەم و هەروەها لە نێوان هەندێ لە هونەرمەندان و رۆناکبیرانی لایەنگری«کەلتووری پرۆلتاریایی» لە ئەڵمانیا و سۆڤیەتدا چەمکێکی سەرنج راکێشی لێدەرهات و لە بابەت گرنگایەتی و دەوری سەرەکی لە شۆڕشدا جەختی لەسەر کراوە. دەوری مێژوویی پرۆلتاریا، لە گوتاری مارکسیزم* ئەوەیە کە بە پێی رەوتی بەپرۆلتاریایی بوونی چینی مامناوەندی و جووتیاران ـ بە لەدەستدانی سەروەت و دارایییەکەیان ـ ئەم چینە دەبێتە زۆرینەی کۆمەڵگا و ئینجا دەبێ شۆڕشی سۆشیالیستی بە ئەنجام بگات.

***دیکتاتۆری پرۆلتاریا*** : رابردن و هەنگاو نان بۆ کۆمەڵگایەکی بێ چین و توێژ، قۆناغ بە قۆناغ بە ئەنجام ناگات. یەکەم قۆناغ، شۆڕشی کرێکارییە، ئینجا بەدیهاتنی پرۆلتاریا وەك چینی دەسەڵاتدار یان چینی حاکم. پاش سەرهەڵدانی دیکتاتۆری شۆڕشگێڕی پرۆلتاریا، دیکتاتۆری پرۆلتاریا پەیدا ئەبێ تاکوو دەوڵەت لە ناو بچێ و لەبری حوکمەتکردن بە سەر ئینسانەکان، ئیدارەکردنی شتەکان بێتە کایەوە.

PDF 4 KURD

**پرێستۆریکا** پرستوریکا Perestorika

لە زمانی رووسیدا بە مانای سەرلەنوێ بینا دروسکردنەوەیە. بەڵام مەبەستی داهێنەرانی ئەم زاراوە، «گۆڕینی کۆمەڵگای سۆڤیەت»بوو. بە باوەڕی گۆرباچۆف پرێستۆریکا، شۆڕشێکی کاریگەر بوو بۆ فراژووتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری کۆمەڵگای سۆڤیەت.

ئەگەر لینین منداڵی نیهیلیزمی رووسیە و میراتگری پرۆسەی رۆشنبیری هەشتاکانی سەدەی نۆزدە بووە، ئەوا پرێستۆریکا، منداڵی شۆڕشەکەی لینین بووە بەڵام منداڵێکی جیاواز لە سەردەمی باوکەکەی خۆی کە هەوڵئەدات ئەو شتەی کە بۆی بەجێماوە بە کەمترین زیان و بە شێوازێکی ئیمرۆیی پێشکەش بە جیهانی نوێی بکات.

پرێستۆریکا سێ پێشنیازیان بۆ باشترکردنی ئابووری یەکیەتی سۆڤیەت ئاراستە کرد:

١ـ زیاکردنی تەقەلا بۆ بەسەمەر گەیاندنی پێداویستیە کۆمەڵایەتییەکان لە ئابووردا(ماڵ، نان و تەندروستی)

٢ـ لادان لە گەشەی رووکاری و گەیشتن بە گەشەی جەوهەری.

٣ـ باشترکردنی بەڕێوەبەرایەتی.

**پشتیوانیی سیاسی** حمایت سیاسی Diplomatic Protection

بریتییە لە هەر چەشنە هەوڵ و تەقەلای دەوڵەتێك لە بەردەم دەوڵەتێکی دیکە بە مەبەستی بەدواداچوونی ماف هاووڵاتیانی خۆی و پشتیوانی کردنیان کە لە قەڵەمڕەوی وڵاتێکی بیانی شەریان پێ فرۆشتبێتن و دەستدرێژی کرابێتە سەریان.

**پلاتفۆرم/سیاسەتی حیزب** پلاتفرم/سیاست حزب Platform

پلاتفۆرم بەو بەرنامە و سیاسەتە حیزبییانە دەگوترێ کە لە پێش هەڵبژاردنەکان لە لایەن حیزب یان رێکخراوەیەکی سیاسی بە مەبەستی بەدەست هێنانی دەنگی زیاتر، بە خەڵك رادەگەیەندرێت. ئەم زاراوە هەروەها لە کاتی هەڵبژاردندا بەو تیۆری و بۆچوونانەی پاڵێوراوان دەگوترێ کە بە راگەیاندنیان سەرنجی خەڵك بەرەو لای خۆیان رادەکێشن بۆ ئەوەی دەنگیان پێ بدەن. بە واتایەکیتر پلاتفۆرم بەو ئەندێشە و تیۆرییانە دەگوترێ کە بانگەشە بۆ شێواز و رێبازێکی سیاسی تایبەت دەکەن.

**پلۆرالیزم/فرەدەنگی** پلورالیسم/کثرت باوری Pluralism

ئەم زاراوە، ئەو تیۆریانە لە خۆ دەگرێ کە باوەڕیان هەیە بە فرەدەنگی لە کۆمەڵگادا. فرەگەنگی لە سیاسەتدا بە مانای زیادبوونی چەندایەتی و چۆنایەتی حیزب، ئەنجومەن، رێکخراوە و گرووپی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووریە لە یەك سیستەمدا. پلۆرالیستەکان پێیان وایە کە ئەبێ ماف هەر

PDF 4 KURD

دەزگا وەك خێزان و ئاین و ئەنجومەن و حوكمەتە خۆجێی‌یەكان بە ڕێژەی دەوڵەت، زیاتر ڕەچاو بكرێ و دوویاتی ئەكەنەوە كە دەوڵەت نابێ دەسەڵات مۆنۆپۆل بكات بەڵكوو ئەبێ چاودێرییەكی گشتی هەبێ و دەزگا كۆمەڵایەتییەكانی‌تر سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن.

فرەدەنگی كارێكی وا ئەكات خەڵك بەرەو حیزبایەتی و دامەزرانی ڕێكخراوەی سیاسی و ئابووری و كومەڵایەتی و كەلتووری بچن تاكوو لە ڕێگەی ئەم جۆرە هاوبەشیەوە بەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگا دابین بكرێ و ئیدارەی كۆمەڵگاش باشتر بەڕێوە بچێت. لە زاراوەی سیاسیدا بە زۆری بە واتای هەلومەرجێك پێناسە ئەكرێت كە تێیدا هیچ گرووپێكی سیاسی و ئایینی و ئەتنیكی و كەلتووری تایبەت، حوكمەت نەكات. ئەم پانتایە ئەبێتە هۆی كێبەركێ و ململانێی نوخبەكان یا گرووپی بەشدار لە كۆمەڵگادا. لە وەها دۆخێكدایە كە كۆمەڵگای فرەدەنگ یان پلۆرال لە دایك ئەبێت.

مۆنتسكیو(١٧٥٥-١٦٨٩)پێی وایە پلۆرالیزم كاتێك سەمەربەخشە كە لە نێوان ئەندامانی حیزب و ئەنجومەن و یەكیەتی و تەنانەت كەمینە ئایینی‌یەكان، كە بە لێبووردن و عەداڵەت ڕەفتار بكرێ و بۆ بیر و بۆچوون و دەنگی جیاواز ڕێز دابندرێ. ئەو لە گەڵ چەقبەستن و كۆجێ بوونی دەسەڵات نەیار بووە و داوای لە دامودەزگا ناحكوومییەكان ئەكرد كە لە ئیدارەی حوكمەتدا بە شێوەیەكی ئارەزوومەندانە بەشداری بكەن.

پلۆرالیستەكان بە پێچەوانەی ئانارشییەكان، خوازیاری سڕینەوەی دەوڵەت لە كۆمەڵگادا نین بەڵكوو پێیان وایە كە كاركردەكانی دەوڵەت، بە قازانجی كۆمەڵگایە بۆ وێنە، ڕێكخستنی ئابوور و پاراستنی ئازادییە مەدەنییەكان و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئیدارەی سیاسەتی دەرەكی.

### پلۆنۆم پلنوم Plenum

لە وشەی لاتینی پلێنۆس بە مانای لێوانلێو وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بە كۆی ئەندامانی ڕێبەرایەتی یان دەستەی بەڕێوەبەری ڕێكخراوە یان حیزبێكی سیاسی دەگوترێ. بە كۆمەڵێ لە ئەندامانی كۆمیتەی ناوەندی، پلۆنۆمی كۆمیتە ناوەندی ئەگوترێ. لە پلۆنۆمی بەربڵاودا بێجگە لە ئەندامانی سەرەكی، هەندێ پسپۆڕیش لە بابەتی جۆراوجۆردا بە شداری ئەكەن.

### پۆپۆلیزم/گەل پەروەری پوپولیسم/مردم باوری Populism

بە مانای ڕێزگرتن و بەرزكردنەوەی مەفهوومی گەل یان خەڵك تا ئاستی چەمكێكی پیرۆز و باوەڕ بەوەیكە ئامانجە سیاسییەكان ئەبێ بە پێی خواست و ئیرادە و هێزی گەل ــ بە جیا لە حیزب و ڕێكخراوە سیاسییەكان ـ دەستەبەر بكرێن.

پۆپۆلیزم، ئایدیۆلجیای ئەو كۆمەڵگا سیاسیە جڤاتی و داخراوەیە كە تێیدا كۆمەڵگای مەدەنی پەرەی ستاندووە و بوونەتە مەترسییەك بۆ دۆخی سەقامگرتووی سیاسی. پەرچەكرداری دەوڵەت لە بەرامبەر ئەم مەترسییەدا ئەوەیە كە بێئەوەی بتوانێ كۆمەڵگای مەدەنی بە تەواوی سەركوت بكات دەس ئەكا بە هێنانە مەیدانی ڕەشەگەل بۆ لاوازكردن و گۆشەگیركردنی ئەم كۆمەڵگا مەدەنییە. ئەم جۆرە كۆمەڵگایە لە ڕاستیدا

PDF 4 KURD

کۆمەڵگایەکی قەیراناوی سیاسی داخراو و ناجۆراتییە کە لە کۆمەڵناسی سیاسیدا بە ئایدیۆلۆژیای پۆپۆلیزم پێناسە ئەکرێ.

لەم جۆرە کۆمەڵگایانەدا دەوڵەت بە هەموو کەرەستە و هێما شەرعیەکانیەوە لە بەرامبەر بەهێزبوونی گرووپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی رادەوەستێ بەڵام ئەم گرووپانە لە بەر هۆی جۆراوجۆر، بەهێزترن لەوەیکە دەوڵەت بتوانێ بە ئاسانی سەرکوتیان بکات. لە وەها کەشێکدا تیابردنی کۆمەڵگای مەدەنی ئەستەمە، بۆیە دەوڵەت بە هەرەوەز، رەشەگەل لە خۆی کۆئەکاتەوە.

قەیرانی شەرعیەت و هاوبەشی سیاسی لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا بە تەواوی خۆی دەرئەخات. بە هەرەوەزکردنی کۆمەڵ تەنیا ئەتوانێ رێگا چارەیەکی کاتی بێت بۆ ئەم قەیرانە. لە بواری شەرعییەتی سیاسییەوە ئەگەر حوکمەت بتوانێ هەستی رەشەگەل بەرەو لای خۆی راکێشێ، رەنگە تا رادەیەك ناڕەوابوونی خۆی قەرەبوو بکاتەوە. رەشبگیری و هەڵخڕاندنی خەڵکی ساکار، نیشانەی لاوازبوونی حوکمەتە لە بەرامبەر کۆمەڵگای مەدەنیدا. پۆپۆلیزم، ئایدیۆلجیایەکی دیاریکراو و گونجاوی نییە و لە هەر وڵاتێکدا بە شێوازێك خۆی دەرئەخات. ئەم رێبازە هەڵگری ئەم تایبەتمەندیانەن:

چەواشەکاری، پیرۆزکردنی کەسایەتی رێبەر(کاریزما)، دەمارگرژی، پشتبەستن بە رەشەگەلی لە خۆ بێگانە، نەبوونی ئایدیۆلۆجیایەکی دیاریکراو، ریفۆرم خوازی، ناسیۆنالیزم و ئازادی سەندیکا و بزر بوونی دیموکراسییەت. پۆپۆلیزم رەنگە چەپڕەو بێت یان راستڕەو یا هیچکام بەڵام هەرچی بێت، خەسڵەتی کۆنەپەرستانە و گەڕانەوە بۆ بەهاکانی رابردووی هەیە.

ئەندێشەی پۆپۆلیستی، یەکەم جار لە ١٨٦٠ بەملاوە لە نێوان روناکبیرانی توندڕەوی سۆڤیەت بە سەرهەڵدانی نارۆدنیەکان(گەل پەرستان) هاتە ئاراوە. ئەمانە پێیان وابوو کە سۆڤیەت دەتوانێ بێئەوەیکە قۆناغی سەرمایەداری تێپەڕێنێ، بچێتە قۆناغی سۆشیالیزمەوە.

رەنگە گرنگترین نموونەی پۆپۆلیستی لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم، پێرۆن، دیکتاتۆری ئەرجەنتین بێت(بڕوانە پێرۆنیزم). نزیکترین نموونەی پۆپۆلیزم بە سەردەمی ئێستا، بارودۆخی سیاسی هەشتاکانی سەدەی بیست(١٩٨٠)ی بەرەی نەتەوەیی فەرەنسەیە بە رێبەرایەتی جان ماری لۆپێن. بە گشتی ئەم شێوازە سیاسییە زیاتر لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین باوە. هەندێ لە بیرمەندان بۆ وێنە، کۆرن هازێر، وڵاتەکان بە نیسبەت پۆپۆلیسم وشیارئەکەنەوە و ئەم رێبازە بە مەترسییەك بۆ کۆمەڵگا دیموکراتیەکان لە قەلەم ئەدەن.

**پەردەی ئاسنین** پردەی آهنین Iron curtain

ئەم زاراوە تەعبیرێکە لە دیوارێکی سەربازی و ئەمنی کە یەکیەتی سۆڤیەت و وڵاتانی کۆمۆنیستی ئەورووپای خۆرنشین، لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم (قۆناغی شەڕی سارد)، بە دەوری خۆیان کێشابوویان و لە گەڵ وڵاتانی رۆژاوا بە تەواوەتی پێوەندی خۆیان بڕیبوو. یەکەم جار وینستۆن چرچیل لە ساڵی ١٩٤٦ ئەم زاراوەی لە مەجلیسی عەوام بەکار هێنا.

PDF 4 KURD

**پەرستشی کەسایەتی** شـخص پرستی Personality cult

ڕێزگرتن لە پلە و پێگە و تایبەتمەندییەکانی ڕێبەرێك یان کەسایەتیەکی کۆمەڵایەتی تا ڕادەی پەرستش کردن یان هەڵکێشانی لە ڕادە بەدەر و زیادەڕۆیی دەربارەی دەوری کەسایەتی و پاڵەوانەکان لە مێژوودا. زاراوەی پەرستشی کەسایەتی، لە لایەن خرۆشچۆف لە پێوەند لە گەڵ خەبات بە دژی ستالینیزم لە وتارێکی پەنهانی لە کۆنگرەی بیستەمی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت(١٩٥٦)، بە کار هێنرا. ئەم زاراوە زیاتر وەك ناتۆرەیەك بۆ پرۆتستۆ کردنی پەرەستشی ستالین و هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە یادەوەری ستالینیان لە پاش مەرگی زیندوو ئەهێشتەوە. دوای خۆکێشانەوەی خروشچۆف(١٩٦٤)، ئەم تۆمەتەش بە دژی خۆی بە کار برا. دژبەرانی پەرستشی کەسایەتی، لایەنگری«ڕێبەرایەتی جڤاتن».

**پەرلەمان** مجلس/پارلمان Parliament

بە زمانی فەرەنسە، بە شاندێك دەگوترێ کە لە هەر وڵاتێك لە لایە ن خەڵکەوە هەڵئەبژێردرێ بۆ دانانی یاسا و چاودێریکردن بە سەر چۆنییەتی پیادەکردنیدا. پەرلەمانەکان بە زۆری بە دەنگی نهێنی و ڕاستەوخۆی جەماوەر هەڵئەبژێردرێت(بڕوانە هەڵبژاردن). لەو وڵاتانەی کە دەستووری بنچینەیی لە سەر جیاکردنەوەی هێزەکان (تفکیك قوا) دامەزراوە، پەرلەمان ئەبێتە هێزی یاسادانان و ئەنجومەنی وەزیرانیش لە بەرامبەریا، بەرپرسە. هەبوونی پەرلەمان لە هەر وڵاتێك هێمایەکە بۆ حاکمییەتی خەڵك یان پیادەبوونی دیموکراسی. پەرلەمان لە زۆربەی وڵاتان لە دوو کۆڕ پێکدێت: یەکەم، پەرلەمانێك کە بە دەنگی ڕاستەوخۆی جەماوەر و بەزۆری بێ‌مەرج هەڵئەبژێردرێ و دەبێتە دەمڕاست و نوێنەری ڕاستەوخۆی جەماوەر، وەك مەجلیسی شۆڕا، یا مەجلیسی عەوام(لە بەریتانیا) یا کۆنگرەی نەتەوەیی(لە فەرەنسە)، یا کۆنگرەی نوێنەران(لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا). دووهەم، پەرلەمانێك کە تێیدا مەرجی پاڵێوراوان و دەنگدەران سنووردارە و جاری واش هەیە هەندێ لە نوێنەرەکانی دائەنرێن(وەك مەجلیسی سێنای پێشووی ئێران)، جاری واش هەیە مەقامی نوێنەرایەتی بە میرات بەجێ دەمێنێ بۆ کەسێك(وەك مەجلیسی لۆردەکانی بەریتانیا). نوێنەرانی پەرلەمان لە ماوەی نوێنەرایەتیدا ئەماننامەی سیاسیان هەیە. واتە کەس بۆی نییە بێ ئیجازەی پەرلەمان، بە هەر گومانێکەوە بیانخاتە بەندیخانەوە. بەزۆری دەسەڵاتی سیاسی پەرلەمانی یەکەم لە پەرلەمانی جۆری دووهەم گرینگترە و پەرلەمانی دووهەم، لە کاروباری سیاسی و داراییدا بەو جۆرە دەستی ناڕوات. بوونی پەرلەمانی یاسادانەر بە مانای دەسەڵاتدارێتی جەماوەر لە ئەژمار دێت بەڵام بە چەشنی«دیموکراسی ناڕاستەوخۆ». پەرلەمانی ئالتینگی ئیسلەندا، کۆنترین پەرلەمانی جیهانە کە لە ساڵی ٩٢٥ زایینی، دامەزراوە و تا ئێستاش دەوامەی هەیە. یەکەمین پەرلەمانی بەریتانیا لە ١٢٦٥ دامەزرا و نەریتی پەرلەمانی ئەم وڵاتە، کۆنترین و ڕیشەدارترین نەریتی پەرلەمانی جیهانە (پەرلەمانی بەریتانیا بە دایکی پەرلەمانەکانی جیهان ناوبانگی دەرکردووە). دوو پەرلەمانەکەی فەرەنسە بەم شێوازەی ئێستا، لە بەرایی سەدەی نۆزدە دامەزرا. پەرلەمانی ئەڵمانیا لە ١٨٤٨ پێکهات و پەرلەمانی ژاپۆن بەناوی «دیت» لە

PDF 4 KURD

۱۸۸۹ دامەزراوە. پەرلەمانەکانی ئوسترالیا، کەنەدا، زیلاندی نوێ و ئەفریقای باشوور بە لاسایی کردنەوە لە پەرلەمانی بەریتانیا دامەزراون.

**پەرلەمانتاری** پارلمان‌داری Parliametarism

پەرلەمانتاری بە مانای لایەنگری لە حوکمەتی پەرلەمانی، مێتۆدی ئەو وڵاتانەیە کە تێیدا پەرلەمان لەگوێن هێزی یاسادانەر، ئیش دەکا و هێزی بەڕێوەبەر(ئەنجومەنی وەزیران) لە بەرامبەریا بەرپرسە و دانانی سەرەك وەزیر و وەزیران بە پشتبەستن بە دەنگی پەرلەمانەوە مەیسەر دەبێ. هەرکاتێك هێزی یاسادانەر، متمانەی خۆی بە ئەنجومەنی وەزیران لە دەست بدات، ئەو ئەنجومەنە فەشەل ئەهێنێ و ئەنجومەنێکی دیکە دادەمەزرێت. لە سیستەمی *سەرۆك کۆماری** کە تێیدا سەرەك وەزیران و سەرۆك کۆمار، جیاوازییان نییە(وەك وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و فەرەنسا) سەرۆك کۆمار بە دەنگی راستەوخۆی خەڵك هەڵئەبژێردرێ و هێزی یاسادانەر، تەنانەت ئەگەر متمانەشی پێ نەکرابێ ناتوانێ لە سەر کار لایبات. سەرۆك کۆمار لە بەرامبەر دەستووری بنچینەیی و ئەو خەڵکەی کە هەڵیانبژاردووە، بەرپرسیارە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی پەرلەمانتاری ئەوەیە کە مادامێکی سیستەمی سیاسی لە سەر بنەمای *جیاکردنەوەی هێزەکانە**(تفکیك قوا)، حوکمەت یان سەرۆك کۆمار ناتوانێ پەرلەمان هەڵوەشێنێتەوە بەڵام لە سیستەمی کۆنڤانسیۆنیدا ئەکرێ پەرلەمان هەڵبوەشێتەوە(وەك کۆمارییەکانی سێهەم و چوارەمی فەرەنسە و وڵاتانی کۆمۆنیستی).

**پەرلەمانی ئەورووپا** پارلمان اروپا European Prliament

ئەنجومەنی پەرلەمانی«کۆمەڵگەی ئەورووپا»کە بە سەر«لیژنەی وزەی ئۆتۆمی ئەورووپا»و«لیژنەی خەڵووزی بەرد و پۆڵای ئەورووپا» و کۆمەڵی ئابووری ئەورووپا، یان «بازاری هاوبەش»چاودێری ئەکات.

ئەم پەرلەمانە لە ساڵی ۱۹۵۸ لە شاری ستراسبورگی فەرەنسە دامەزرا و نوسینگەی هەمیشەییەکەشی لوکزامبۆرکە. ناوی پەرلەمانەکە تاساڵی ۱۹٦۲، کۆنگرەی ئەورووپا بووە. ۱۹۸ ئەندامی هەیە کە لە لایەن پەرلەمانی وڵاتانی ئەندام، ناوزەد ئەکرێن. فەرەنسە وبەریتانیا و ئەڵمانیا و ئیتالیا، هەرکامیان، ۳٦ نوێنەریان هەیە. بەلجیکا و نەمسا، هەرکام ۱٤ نوێنەر و دانیمارك و ئیرلەندا، ۱۰ نوێنەر و لوکزامبۆرك ٦ نوێنەر. پەرلەمان بۆ هەموو بابەتێکی گرینگ، راوێژی پێئەکرێ و ئەتوانێ کۆمیتەی بەڕێوەبەرایەتی و ئەنجومەنی وەزیران، بخاتە ژێر پرسیارەوە.

**پەروەردەی سیاسی** تربیت سیاسی Political Education

راهێنانی تاك بۆ هاوبەشی چالاکانە لە ژیانی سیاسی و قبووڵکردنی بەرپرسیاریەتی لە کۆمەڵگا و ئاگادارکردنی لە مافە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکان و فەلسەفە و سیستەمە سیاسییەکان. هەروە

PDF 4 KURD

ئاگاداركردنی تاك لـه دەوری سیاسـەت لـه ژیـانی كۆمەڵایـەتی، ئاریشـه سیاسـییەكانی ڕۆژانـه و پێگـه و شوێنگەی وڵاتەكەی له ناو گۆڕەپانی نێودەوڵەتیدا. پەروەردەی سیاسی گونجاو، ئەبێتە هۆی خۆشبەختی و یەكیەتی نەتەوەیی و ڕێككەوتنی نێونەتەوەیی.

**پەرەسەندنی بەردەوام** توسعەی پایدار Sustainable development

به مانای بەڕێوەبردن و كەڵك وەرگرتنی بەرێوشوێن له سەرچاوەی سروشتی و دارایی و وزەی ئینسانییه بۆ گەیشتن بـه مـۆدێلێكی مـەزاختن و بـه كارهێنـانی توانسـتی تـەكنیكی و پێكهاتـەی بـەرێوجێ بـۆ لابردنـی نیازەكانی بەرەی نوێ و داهاتوو.

پەرەسەندنی بەردەوام، پەرەسـەندنێكه كه پێداویستیەكانی بـەرەی ئێستا دابین ئەكات بێئـەوەی زیانێك بگەیەنێت به تواناییەكانی بەرەی داهاتوو له دابینكردنی پێداویستیەكانی خۆیدا.

*پەرەسەندنی ئینسانی* به واتای پرۆسەی بەرفراوانكردنی زەمینـەی خۆشگوزەرانی و بژێوی باشی مرۆڤ پێناسه كراوە.

**پەرەسـەندنی سیاسـی** توسـعەی سیاسـی Political development

بریتییه له: بەرزبوونەوەی ئاستی كارامەیی سیستەمێكی سیاسی بۆ چارەسـەركردنی ناتەبایی و كێشـەكانی تاك و كۆمەڵ، هەروەها بریتییه له خەڵكی بوون و رادەی ئازادی و گۆڕانكارییـه بنەڕەتییـەكانی كۆمەڵگایـەك. پەرەسەندنی سیاسی پەیوەسته به گەشەی دیموكراسی له وڵاتێكدا. تا چ رادەیەك سیستەمێكی سیاسی له سیستـەمێكی داخراو بەرەو سیستـەمێكی كراوە، لـه ساكارییەوە بەرەو ئاڵۆزی، لـه دەسبەسـەرییەوە بەرەو خودموختـاری و لـه پـەرژ و بڵاوییـەوە بـەرەو یـەكگرتوویی هـەنگاو بنێـت، بـه هـەمان رادەش پەرەسـەندنی سیاسی لەو وڵاتەدا روو له زیادبوون دەبێت.

تازەگەری سیاسی، زیاتر خۆی به ئاڵووالكردنی سیاسییەوە سەرقاڵ ئەكات كەچی پەرەسـەندنی سیاسی بنیاتـەكان تووشـی گـۆڕان ئـەكات. سـێ هـۆكـاری پێویسـت بـۆ پەرەسـەندنی سیاسـی بـریتین لـه: ڕێكخـراوە، كارامەیی و ئەقڵانییەتی كردەیی و یەكگرتوویی ئایدیۆلۆجیایی ڕێبەران.

بۆ پەرەسەندنی سیاسی، پێویست ئەكات سەرچاوە و ئامرازەكانی دەسەڵات له نێوان حوكمەت و گرووپـه سیاسـییەكانی كۆمـەڵگا دابـەش بكرێـت. كاتێـك حوكمـەت بـه تـەنیایی، دەسـت بگـرێ بـه سـەر هـەموو سەرچاوەیەكی دەسـەڵاتدا ئینجا مەیدانی ململانێی سیاسـی ئەگاتـه نزمترین ئاستی خۆی. لـەم ڕووەوە بـه كـورت بوونـەوەی دەسـتی حوكمـەت لـه سەرچاوەكانی دەسـەڵات، پانتـای ململانێـی سیاسـی و هاوبەشـێتی سیاسی له كۆمەڵگادا روو له زیادبوون دەكات. كەواتـه لـه نێـوان ململانێـی سیاسی و پەرەسـەندنی سیاسیدا پێوەندییەكی بایەخدار له گۆڕێدایه.

PDF 4 KURD

پە. کە. کە: بڕوانە ناسیۆنالیزمی کورد لە تورکیا.

**پەنابەریی** پناهندگی Asylum

لە ساڵی ١٩٥٠ دوای ئەو هەموو ڕووداوانەی کە بە درێژایی ٢٥ سەدەی ڕابردوو بە سەر پەنابەران هاتبوو، کۆمیتەی باڵای پەنابەران، بەم جۆرە زاراوەی پەنابەر پێناسە دەکات:

پەنابەر بەو کەسە دەڵێن کە «بە هۆی تایبەتمەندی ڕەگەزی، ئایینزایی، نەتەوەیی یان باوەڕی سیاسی، لە ترسی دەسبەسەربوون بچێتە دەرەوەی وڵاتەکەی و بە هۆی ئەم مەترسییەوە نەیهەوێت دووبارە بچێتەوە وڵاتەکەی خۆی». بە پێی پێناسەی دیوانی نێونەتەوەیی داد، ئەگەر کەسێک لە لایەن دەوڵەتێکەوە کەوتبێتە ژێر گوشار و لەدووی کەوتبن و وڵاتێکی تر لەم ڕێگەوە پشتیوانی لەو کەسە بکات، بەو کەسە دەوترێ پەنابەر.

پەنابەریەتی شێوازی جۆربەجۆری هەیە کە پەنابەریەتی دیپلۆماتیک یان دەرەکی بەناوبانگترینیانە. پێشێلکاران و تاوانبارانی ماف گشتی، لە جوملەی پەنابەران ناگونجێن. هیچ یاسایەکی نێونەتەوەیی دەوڵەتەکان پێمل ناکات بە بەخشینی ماف پەنابەریەتی بە کەسێک.

**پەنابەریی سیاسی** پناهندگی سیاسی Political Asylum

پەنابەریی سیاسی یان پەنابەریی نێوان سنووری، دالدەبەخشین و هانادان بەو تۆمەتبارە سیاسیانەیە کە لە وڵاتێکی دیکە بە هۆکاری سیاسی دەکەونە ژێر فشار و ئازار و لە مەترسی دەسگیرکردن یان لەناوچووندا بن.

**پەیماننامە** پیمان Pact

بڕیارێکی نێونەتەوەییە کە لە چەندین بابەتی جۆراوجۆر لە نێوان دەوڵەتەکاندا مۆر دەکرێ:

پەیمانی یەکگرتن: بەڵێن و قەرارێکە لە بەینی دوو یا چەن دەوڵەت بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی لە ڕێگەی سەربازی یان هاریکارییەوە.

پەیمانی یەکگرتنی نێونەتەوەیی: وەك یەکیەتی پۆستی.

پەیمانی یەکگرتن بۆ بەرگری.

پەیمانی یەکگرتن بۆ دەستدرێژی: وەك هاوکاری لەمەڕ داگیر کردنی وڵاتێك.

پەیمانی یەکگرتنی گشتی.

پەیمانی یەکگرتنی سەربازی.

پەیمانی بێلایەنی:(هەمیشەیی و کاتی)

پەیمانی وازهێنان لە دوژمنایەتی ڕەها.

پەیمانی سیاسی و بازرگانی و تایبەتی.

پەیمانی ئاشتی.

پەیمانی هاوکاری.

PDF 4 KURD

**پەیماننامەی بەغدا** پیمان بغداد Baghdad pact

لە ٢٤ی فێوریەی ١٩٥٥ لە نێوان دوو وڵاتی تورکیا و عیراق ڕێککەوتننامەیەکی دوو قوڵی بە ناوی «پەیمانی هاوکاری دوو لایەنە» لە بەغدا مۆر کرا کە بە پەیماننامەی بەغدا ناوی دەرکرد.

ئامانجی ئەم پەیماننامە بریتی بووە لە زامنکردنی بەرگری و هێمنی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە دوو لایەن لە پێناو داکۆکی کردن لە ئاسایش و هێمنی و بەختەوەری و بەهرەمەندی نەتەوەکانی خۆیان، هاریکاری یەکتر بدەن. بە پێی مادەیەکی ئەم پەیماننامە، بە ئەندام بوونی وڵاتانی ناوچەکە ئازاد بووە و هەر بۆیە بەریتانیا لە ٣٠ی مارسی ١٩٥٥ و پاکستان لە ٢٣ی سێپتەمبەر و ئێرانیش لە ١١ی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ هاتنە ناو پەیمانەکەوە. پێکهێنانی پەیمانی بەغدا، بەرئەنجامی چالاکانەی دەوڵەتی ئەمریکا بە تایبەت فاستر دالس، وەزیری دەرەوەی ئەم وڵاتە بوو کە دەیویست ڕێکخراوەیەکی بەرگری بەهێز لە ڕۆژهەڵاتی ناوین پێك بێنێت تاکوو لە دزەکردن و پەرەستاندنی سۆڤیەت بۆ ناوچەکە ڕێگر بێت. بەڵام لە بەر گومان نەکردن و دەسخەڕۆ کردنی سۆڤیەت، ئەمریکا خۆی نەبووە ئەندامی ئەم پەیمانە. دوای کۆدەتای ١٤ی ژووئیەی ١٩٥٨ لە عێراق، دەوڵەتی عەبدولکەریم قاسم، ڕایگەیاند کە بە هەموو پەیمان و شەرت و قەرارەکانی وڵاتەکەی وەفادارە. بەڵام بە کردەوە لە هیچ کام لە دانیشتنەکانی ئەم پەیماننامانە بەشداری نەئەکرد تا ئەوەیکە دوای کۆتایی هاتنی پێنج ساڵەی یەکەمی پەیمانەکە لە ساڵی ١٩٦٠ خۆی لێکێشاوە. پاشان ناوەندی پەیمانەکە لە بەغداوە بۆ ئەنقەرە گواسترایەوە و ناوەکەشی لە مانگی ئاگۆستی ١٩٥٩ بە ڕێکخراوەی پەیمانی ناوەندی(سێنتۆ) گۆڕدرا. ئەم ناوەش ئاوێتەیەك بوو لە دوو پەیمانی (ناتۆ) و (سیتۆ) کە تورکیە و پاکستان هەرکام تێیدا ئەندام بوون.

**پەیماننامەی سەعدئاباد** پیمان سعدآباد Saadabad pact

ئەم پەیماننامە لە ساڵی ١٩٣٧ لە نێوان چوار وڵاتی ئێران، ئەفغانستان، تورکیا و عێراق لە کۆشکی سەعدئابادی تاران بە مەبەستی دۆستایەتی و دەست درێژنەکردن بۆ خاکی یەکتر مۆرکرا. ناوەڕۆکی ئەم ڕێکەوتنە، هاوڕایەتی و یەکدەنگی ئەم چوار وڵاتە بوو لە هەڵوێستە سیاسییەکان و یەکگرتنیان لە کاتی مەترسی و شەڕدا. ئەم دەوڵەتانە بەڵێنیان دابوو کە لە دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی یەکتر خۆ بپارێزن و سنوورەکانی یەکتر نەبەزێنن. بۆ یەکتر دەست درێژی نەکەن و لە پێکهێنانی ئەنجومەن و گرووپی بەرهەڵستکار کە ئامانجیان لە ناو بردنی ئاشتی و ئارامی یەکێك لەم وڵاتانە بێت، خۆ بپارێزن.

لە کاتی ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٤١ (داگیرکردنی ئێران لە شەڕی جیهانی دووهەم)، دەرکەوت کە ئەم پەیماننامە، سەنگێکی نییە و شتێکی بێ قیمەتە.

**پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنی و سیاسییەکان(١٩٦٦)**

میثاق بین المللی حقوق مدنی و سیاسی (۱۹۶۶)

International Covenant on Civil and Political Rights (1966)

PDF 4 KURD

یەکێکە لەو دوو پەیماننامە گرنگە نێودەوڵەتییە کە ئەو مافانەی لە جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤدا باسی لێکراوە، لەباری یاساییەوە زەمانەتیان دەکات تاکوو جێبەجێ بکرێن(بڕوانە مافی مرۆڤ). پەیماننامەکە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك مافی مەدەنی و سیاسی هاوبەش بۆ هەموو مرۆڤێك کە دەوڵەتەکان پابەند ئەکات بە پیادەکردن و بەرزڕاگرتنیان. ئەم پەیماننامە ٥٣ مادە لە خۆ دەگرێ و گرنگترین مافەکانی بریتین لە: مافی ژیان و ئاسایش، ئازادی بزووتنەوە، ئازادی ڕێکخستنی کۆبوونەوە و خۆپیشاندان، ئازادی بیر و ڕا و ئایین و ئەندێشە و سڕینەوەی کۆیلایەتی، مافی چارەی خۆ نووسینی نەتەوەکان و قەدەغەکردنی ئەشکەنجە. ڕەشنووسی ئەم پەیماننامە، سەرەتا لە ساڵی ١٩٥٤ لە کۆمیسیۆنی مافەکانی مرۆڤی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشنیاز کرا و لە ساڵی ١٩٦٦ لە لایەن کۆمەڵی گشتی پەسند کرا. ئەم پەیمانە لە ساڵی ١٩٧٦ بە کۆی ٣٥ دەنگ تەوزیم کرا و وەك یاسایەك بڕاوەتەوە.

## پەیمانی بەربەستکردنی چەکی ئەتۆمی پیمان منع گسترش سلاح‌های هسته‌ای

## Non-prolifeation Treaty (NPT)

ئەم پەیماننامە لە یەکەمی ژوئییەی ١٩٦٨ بۆ بەرگریکردن لە پەرەسەندنی چەکی ناوەکی لە لایەن وڵاتانی بەریتانیا و ئەمریکا و سۆڤیەت مۆر کرا و لە ساڵی ١٩٧٠ بەملاوە پیادە کرا. وڵاتانی دیکەی جیهان دوا بە دوای یەکتر بوونە ئەندامی ئەم پەیماننامە.

ئەندامانی ئەم ڕێکەوتننامە، بە دوو گرووپ دابەش ئەکرێن:

١- وڵاتانی خاوەن چەکی ناوەکی کە بەڵێن ئەدەن ئەم جۆرە چەکانە بە ناو وڵاتەکانی دیکەدا بڵاو نەبێتەوە و پەرە نەستێنێ.

٢- وڵاتانی نائەتۆمی کە بەڵێنیان داوە، نەبنە خاوەنی ئەم جۆرە چەکانە.

ئەم پەیمانە لە ڕاستیدا ڕێبازێکی لۆژیکییە بۆ بەدیهێنانی ناوچەگەلی پاککراو لە چەکی ناوەکی(Nuclear Weapons Free Zone).

## پەیمانی بەرگرتن لە تاقیکاری ئەتۆمی پیمان منع آزمایشهای هسته‌ای

## Nuclear Test Ban Treaty

پەیمانێك کە لە نێوان بریتانیا و ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەت لە ژوئییەی ١٩٦٣ لە مۆسکۆ واژۆ کرا. بە پێی بەندی ١ی پەیمانەکە:

١) هەر دەوڵەتێك کە ئەم پەیمانە ئیمزا دەکات، دەبێ خۆ بپارێزێت لە تاقیکردنەوەی چەکی ئەتۆمی یان هەر چەشنە تەقاندنەوەیەکی ناوەکی لە هەر شوێنێکی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی خۆیدا لە ئاسمان و زەوی.

٢) هەر دەوڵەتێك کە ئەم پەیمانە واژۆ دەکات، بۆی نییە ئاسانکاری بکات بۆ تاقیکردنەوەی ئەتۆمی

PDF 4 KURD

یان لەم کارەدا بەشداری بکات یا ببێتە هاندەر بۆ ئەم مەبەستە.

بە پێی بەندی ٣، ئیمزاکردنی ئەم پەیمانە بۆ هەموو دەوڵەتەکان ئازادە. تا ساڵی ١٩٦٥ نزیکەی ١٠٠ وڵات پەیمانەکەیان مۆرکرد بەڵام وڵاتانی چین و فرەنسا لە مۆرکردنی ئەم پەیمانە خۆیان پاراست. لە ١٩٩٦/٩/٢٤ لە دانیشتنی ساڵانەی کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرك، پێنج زلهێزی ئەتۆمی جیهان واتە ئەمریکا، بریتانیا، رووسیا، چین و فرەنسا پەیمانەکەیان مۆرکرد. بەڵام ئەم پەیمانە تا ئەو کاتەی کە لەلایەن ٤٤ وڵات کە توانایی دروستکردنی چەکی ئەتۆمییان هەیە بە ئیمزا نەگات، بە شێوەیەکی جیددی پیادە ناکرێت.

## پەیمانی سێسنوور پیمان سە مرز Three-Borders Treaty

لە مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٩٤٤ کۆبوونەوەیەکی نهێنی بە مەبەستی یەکگرتنی کوردستانی گەورە لە سەر کێوی دالانپەر(کە سنوورەکانی ئێران و عێراق و تورکیا لەوێدا یەك دەگرنەوە) بەسترا. نوێنەرانی سێ پارچەی کوردستان لەو کۆبوونەوەدا پەیمانێکیان ئیمزا کرد بۆ هاوکاری و پشتیوانی یەکتر کە بە پەیمانی سێ سنوور ناوبانگی دەرکرد. نوێنەران بریتی بوون لە: قاسم قادری، لە لایەن کۆمەڵەی ژ. ك (کوردستانی رۆژهەڵات)، شێخ عوبەیدوڵا(کوردستانی باشوور) و قازی مەلا وەهاب (کوردستانی باکوور). لەو دانیشتنەدا ئەو نەخشەیەی کوردستانی گەورە پەسند کرا کە لە لایەن کۆمەڵەی کوردی بەیروت بڵاوکرابۆوە.

## پەیمانی سیڤەر پیمان سور Sever pact

دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٨، ویلسۆن، سەرکۆماری ئەمریکا لە پلانەکەی خۆیدا بە ناوی ئاشتی رایگەیاند کە ئەبێ بە کەمایەتیە غەیرەتورکەکانی عوسمانی، مافی سەربەخۆیی بدرێت. بەم بۆنەوە لە ١٠ی ئاگۆستی ساڵی ١٩٢٠ کۆنفرانسێك بە بەشداربوونی بەریتانیا، فەرەنسە، ئیتالیا، ژاپۆن، ئەرمەنستان، بەلجیکا، یۆنان، حیجاز، پۆڵەندا، پورتوگال، رۆمانی، چێك و تورکیا سەرەنجام ئەمریکا و شاندێکی کورد وەك ئەندامی چاودێر لە گفتوگۆکانی پەیوەست بە کوردستان و ئەرمەنستان رێکخرا. لەم کۆنفرانسەدا پەیماننامەیەکی ٤٣٢ مادەیی مۆرکرا کە ئەم ٣ مادەی خوارەوە پێوەندی بە کێشەی کوردەوە بوو بەڵام هیچ کات نەگەیشتە ئاستی جێبەجێکردن.

مادەی ٦٢

کۆمیتەیەك کە لە ئەستەنبوڵ دانیشتن ئەکات و بریتیە لە سێ ئەندامی دانراوی دەوڵەتانی بەریتانیا و فەرەنسە و ئیتالیا، لە ماوەی ٦مانگ (لە بەرواری پیادەکردنی ئەم پەیماننامەوە) نەخشە و گەڵاڵەیەك دائەرێژێ بۆ خودموختاری ناوچە کوردنشینەکانی رۆژهەڵاتی فورات، باشووری سنووری ئەرمەنستان، کە دواتر دیاری ئەکرێ و هەروەها باکووری سنووری تورکیە و سووریە و مێزۆپۆتامیا(بە جۆرێك کە لە مادەکانی ٢و٣و٢٧ ئاماژەی پێکراوە). لە سەر هەر خاڵێك کە پێك نەهاتن، ئەم بابەتە لە لایەن ئەندامان

PDF 4 KURD

کۆمیتەکە، بە دەوڵەتە پێوەندیدارەکان رابگەیەندرێ.

ئەم گەڵاڵە هەڵگری هەموو پێشنیازێکی پێویست بێت بۆ داکۆکی کردن لە کەمینەی ئاسووری و کلد و کەمینە ئایینی و نەژادییەکانی ناوچەکە. هەر بەم بۆنەوە کۆمیتەیەك بە بەشداری نوێنەرانی بەریتانیا و فەرەنسە و ئیتالیا و ئێران و کوردەکان دادەمەزرێ بۆ لێکدانەوە و بڕیاردان لە کاتی پێویستدا و لە سنووری تورکیە - ئەو شوێنەی کە بە پێی ئەم پەیمانە، لە گەڵ سنووری ئێران یەك ئەگرێتەوە - دیتن بکات.

مادەی ٦٣

بە پێی ئەم پەیماننامە دەوڵەتی تورکیا، رازی ئەبێت کە بڕیارەکانی هەر دوو کۆمیتەی ناوبراو لە مادەی ٦٢ تاکوو سێ مانگ لە بەرواری راگەیاندن بە دەوڵەتی ناوبراو، پیادە بکات.

مادەی ٦٤

دوای یەك ساڵ لە پیادە کردنی ئەم پەیماننامە، هەر کاتێك خەڵکی کوردی دانیشتووی ئەو ناوچانەی کە لە لە مادەی ٦٢ باسکراون، هانا بەرن بۆ کۆمەڵی نەتەوەکان و بتوانن بیسەلمێنن کە زۆرینەی حەشیمەتی ئەم ناوچانە حەز بە جیابوونەوە لە وڵاتی تورکیا دەکەن و کۆمەڵی نەتەوەکانیش، بەو قەناعەتە بگات کە ئەم خەڵکە شیاوی سەربەخۆیین و دان بەم شتەدا بنێ، ئەوا ئەبێ تورکیا بە پێی ئەم پەیماننامە، رەفتار بکا و لە هەموو ماف و خواستەکانی خۆی لەم ناوچانە چاوپۆشی بکات.

چۆنییەتی شیکردنەوەی ئەم چاوپۆشییە، ئەبێتە بابەتی پەیماننامەیەکیتر کە لە نێوان دەوڵەتە بەناوبانگەکانی ناوچەکە و دەوڵەتی تورکیا، مۆر ئەکرێ.

مادامێکی تورکیا لە ماف خۆی چاوپۆشی کرد، دەسەڵاتدارانی ناوچەکە نابێ لە گەڵ پەیوەست بوونی ئارەزوومەندانەی کوردانی دانیشتووی ئەو ناوچە لە کوردستان کە تا ئێستا بەشێك بوون لە ویلایەتی موسڵ بۆ دامەزرانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی دژایەتی بکەن...

## پەیمانی ڤێرسای — عهدنامه ورسای — Versailles Treaty

پەیمانی کۆتایی هێنان بە شەڕی جیهانی یەکەم کە لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمان و ئەڵمانیا لە ڕێکەوتی ١٩١٩/٦/٢٨ لە کۆشکی ڤێرسای پاریس مۆرکرا. بە پێی ئەم پەیمانە کە بریتیبوو لە ١٥ پاژ و ٤٤٠ بەند، بەشێك لە خاکی ئەڵمانیا لە لایەن وڵاتانی فرەنسا، بەلجیکا، دانمارك و پۆڵەندا داگیر کرا و بڕیاری چەککردنی تەواو لەسەر ئەڵمانیا دەرکرا و بەرپاکردنی دامەزراوە و دامودەزگای سەربازی لێ قەدەغە کرا.

پاش ئەوەی نازییەکان لە ئەڵمانیا دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرت و بە پێگەیشتنی هیتلەر (١٩٣٣) بەرەبەرە پەیمانی ڤێرسای بایەخی خۆی لەدەست دا و هەموو گەمارۆ سەربازییەکان هەڵوەشێنرایەوە. ئەمەش ڕێگای بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی جیهانی دووهەم خۆش کرد.

## پەیمانی لۆزان — پیمان لوزان — Losan pact

لە ڕۆژی ٢٤ی ژووئیەی ساڵی١٩٢٣ لە نێوان وڵاتانی بەریتانیا، فەرەنسە، ئیتالیا، ژاپۆن، یۆنان، ڕۆمانیا

PDF 4 KURD

سێرب، کرۆوات و تورکیا، پەیماننامەیەك مۆر کرا کە لە راستیدا بە واتای بە رەسمییەت ناسینی وڵاتی تازەی تورکیا بوو. بە پێی ئەم پەیمانە نیشتمانی نەتەوەیی گەلی کورد بە چوار پارچە دابەش ئەکرێت. ئەم پەیمانە بێ بەشداربوونی هیچ کوردێك مۆرکرا و بۆ کورد، وەك سەرەتای کۆیلەیی و دیلبوونی سیاسی ناوبردە کراوە.

لایەنەکانی بەشدار لەم کۆنفرانسەدا پەیمانێکی ئاشتیشیان مۆرکرد. زۆربەی خاکی کوردستان کەوتە ژێر دەسەڵاتی تورکیا. لەم پەیمانەدا ناوێك لە کورد نەبراوە و هیچ مافێکیشیان پێ رەوا نەبیندراوە. تەنیا لە بابەت داکۆکی لە ماف کەمینەکان، چەن هێمایەك کراوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە کەمینەکان لە یاسای تورکیادا تەنیا بە ئەرمەنی و یۆنانی ناوبردە کراوەوە و بە ناوی ئەوەی کورد لە گەڵ تورك یەکسانە، هیچ باسێك لە کورد نەهاتۆتە ئاراوە.

## پەیمانی ماستریخت پیمان ماستریخت Masstricht Treaty

ئەم پەیمانە لە لایەن سەرۆکی ١٢ وڵاتی ئەندام لە کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپا کە بریتی بوون لە: ئەڵمانیا، ئیسپانیا، بریتانیا، ئیتالیا، ئیرلەندا، بەلجیکا، پورتوگاڵ، دانیمارك، فەرەنسا، لۆکزامبورگ، هۆڵەندا و یۆنان لە دیسەمبەری ١٩٩١ لە شاری ماستریختی هۆڵەندا مۆر کرا. مەبەست لەم پەیمانە یەکگرتنی سیاسی و ئابووری ئەورووپا بوو. هەروەها پیادەکردنی سیستەمێکی دراقی یەکگرتوو، بەڕەسمییەت ناسینی «شارۆمەندیی ئەورووپایی»، هاوکاری گەرمی وڵاتانی ئەورووپی لە بواری سیاسەتی دەرەکی، ئاسایش، دادوەری و هەموو کاروبارێکی ناوخۆیی هاتە ریزی داواکارییەکانی ئەم پەیمانەوە.

ساڵی ١٩٩٣ خەڵکی دانیمارك ئەم پەیمانەیان پەسند نەکرد. پاش ئەوەی هەندێ زێدەماف و بەڵێنیان بەم وڵاتە بەخشی، ئینجا خەڵکی ئەم وڵاتە دەنگی «ئەرێ»یان پێدا. ساڵی ٢٠٠١ هەر هەمان شت لە بارەی خەڵکی وڵاتی ئیرلەندای باشووری هاتە گۆڕێ. نەیاریی خەڵکی فەرەنسا و پاشان هۆڵەندا لە ساڵی ٢٠٠٥ لە گەڵ ئەم پەیمانە کە بە دەستووری بنچینەیی ئەورووپا ناوبراوە، نیگەرانییەکی گەورەی لەمەڕ چەسپاندنی ئەم دەستوورە هێناوەتە گۆڕێ و یەکیەتی ئەورووپا تووشی ئاریشە دەکات. پەسند نەکردنی دەستووری یەکیەتی ئەورووپا لە وڵاتێکی وەك فەرەنسا کە رۆڵێکی سەرەکی هەیە لەم یەکیەتیەدا بووە هۆی دواخستنی پرۆسەی راپرسی ئەم قانوونە. بە پێی بەرنامەی دارێژراوی یەکیەتی ئەورووپا، بڕیار بوو تا مانگی حەوتی ٢٠٠٦ دەستوورەکە لە هەر ٢٥ ئەندامی یەکیەتی بکەوێتە بەر راپرسییەوە و لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧ لە تەواوی ئەورووپا جێبەجێ بکرێت بەڵام بەم بۆنەوە دواکەوتووە.

## پەیمانی نێودەوڵەتی مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان (١٩٦٦)

میثاق بین‌المللی حقوق اقتصادی، اجتماعی و فرهنگی(۱۹۶۶)

International Covenant on Economic, Social and Cultural Rights

PDF 4 KURD

یەکێکە لەو دوو پەیماننامە گرنگە نێودەوڵەتییە کە ئەو مافانەی لە جاڕنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤدا باسی لێکراوە، لە باری یاساییەوە زەمانەتیان دەکات تاکوو جێبەجێ بکرێن. ئەم پەیماننامە داخوازییەکانی هەموو مرۆڤێکی لەمەڕ مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان لە بەر چاوگرتووە و دەوڵەتەکانی بە مسۆگەرکردنی ئەم مافانە راسپاردووە. ئەم پەیمانە ٣١ مادە لەخۆ دەگرێ کە بۆ نموونە دەکرێ ئاماژە بدەین بە مافی خودموختاری، کار و پشوودان، مافی مانگرتن و دامەزراندنی رێکخراوە، رزگاربوون لە هەژاری و برسییەتی و نەخۆشی، پەروەردە و باشترکردنی باری ژیان و گوزەران.

هەنگاوە سەرەتاییەکان بۆ داڕشتنی ئەم پەیمانە لە لایەن کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە ئەنجام گەیشت و لە ساڵی ١٩٥٤ بە کۆمەڵی گشتی ئەم رێکخراوە راگەیاندرا. بەڵام تاساڵی ١٩٦٦ لە لایەن کۆمەڵی گشتییەوە پەسند نەکرا و لە ساڵی ١٩٧٦ پاش پەسند کردنی ٣٥ وڵات یەکلاکرایەوە.

## پەیمانی وارشەو — پیمان ورشو — Warsaw Treaty

پەیمانی وارشەو (Eastern European Mutual Assistance Treaty – پەیمانی هاریکاری هاوبەشی ئەورووپای رۆژهەڵات) پەیمانێکی سەبازی بوو کە لە بەرامبەر پەیمانی یەکیەتی ئەورووپای رۆژاوا، ناتۆ* لە نێوان وڵاتانی کۆمۆنیستی ئەورووپای رۆژهەڵات بەسترا. ئەم پەیمانە لە ١٩٥٥/٥/١٤ لە نێوان وڵاتانی چیك، ئەلبانیا، ئەڵمانیای رۆژهەڵات، پۆڵەندا، مەجارستان، رۆمانیا و یەکیەتی سۆڤیەت لە شاری وارشەو بۆ ماوەی بیست ساڵ گرێدرا. ئامانجی پەیماننامەکە دابینکردنی هاریکاری سیاسی و سەربازی لە نێوان ئەم وڵاتانە بوو. بە پێی پەیمانەکە هەرکات یەکێك لە ئەندامەکانی رێکخراو، بکەوتایە بەر هێرش، ئەندامانی دیکە بە دەنگییەوە دەهاتن و بە هەموو هێزێکەوە پشتیوانییان لێ دەکرد.

ناوەندی سەرکردایەتی عەملیاتی چەکداری لە شاری مۆسکۆ بوو. ئەلبانیا لە ساڵی ١٩٦٨ وازی لەم پەیمانە هێنا. ئەم پەیمانە لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ ماوەی بیست ساڵیتر واژۆ کرایەوە بەڵام دوای رووداوەکانی ساڵی ١٩٨٩ کە لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات هاتە کایەوە و پاش هەڵوەشانەوەی بلۆکی رۆژهەڵات*، ئەم پەیمانەش لە ساڵی ١٩٩١ بە شێوەیەکی رەسمی هەڵوەشایەوە. (بڕوانە دیواری بەرلین).

## پەیمانی وێستفالیا — عهدنامۀ وستفالی — Treaty of Westphalia

پەیمانێك کە لە پاش شەڕی ٣٠ ساڵەی ئایین لە ئەورووپا (١٦٤٨-١٦١٨) لە نێوان هەموو وڵاتانی ئەورووپی جگە لە بریتانیا و پۆڵەندا واژۆ کرا. گرینگی ئەم پەیمانە لە ئاست پێوەندییە نێونەتەوەییەکان، لەبەر ئەم هۆکارانەی خوارەوەیە:

١ـ ئەم پەیمانە بوو بە دەسپێك و رێنموونێك بۆ کۆنفرانس و پەیمانەکانی دواتر لە پێوەندی نێونەتەوەییدا.

PDF 4 KURD

٢ـ بە پێی ئەم پەیمانە، کۆنفدراسیۆنی سویسرا و هۆڵەندا بە سەربەخۆ ناسرا.

٣ـ نزیکەی ٣٥٠ یەکینەی سیاسی ئەڵمانیا، بە پێی ئەم پەیماننامە سەربەخۆییان وەرگرت.

٤ـ سەربەخۆیی فەرەنسا و پورتوگال بە رەسمییەت ناسرا و دەستێوەردانی پاپا لە کاروباری ناوخۆیی و دەرەکی ئەم وڵاتانە قەدەغە کرا.

٥ـ بنەمای سەربەخۆیی وڵاتەکان(سیاسی و ئایینی) هەروەها یەکسانییان لە گۆڕەپانی نێونەتەوەیی و پێوەندی دەرەکی، بۆ یەکەمین جار بەڕەسمییەت ناسرا و لەسەری رێککەوتن.

٦ـ وڵاتەکان لەهەڵبژاردنی ئایین سەرپشك دەبن و لە سەر ئەوەش رێککەوتن کە گرووپە ئایینیەکانی کاتۆلیك و لۆتری و کالۆنیست ئازادی تەواویان هەبێت.

٨ـ سیستەمی هاوسەنگی هێزەکان لە ئیمپراتۆری رۆما و ئەورووپا بە مەبەستی بەرگریکردن لە سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی «سەردەست» لە نێوان یەکە سیاسیەکانی ئەورووپا بەدیهات.

٩ـ ئەندامانی پەیمانەکە، بەڵێنیان دا کە لە بەرامبەر هەر چەشنە دەستدرێژی و داگیرکارییەك، بێڕەچاوکردنی ئایین، یارمەتی یەکتر بدەن.

## پێتەخت — پایتخت — Capital

ناوەندی حوکمەتی هەر وڵاتێك کە تێیدا پادشا یان سەرۆك کۆمار یان تاقمی دەسەڵاتدار نیشتەجێ بن و هەموو کاروباری ئیداری و سیاسی وڵات لەوێ بە ئەنجام بگات. لە هەندێ لە وڵاتان کاروباری سیاسی تەنیا لە یەك شار جێبەجێ ناکرێت و لە یەك کاتدا خاوەنی چەند پێتەختن. بۆ وێنە وڵاتی هۆڵەندا کە ئامستردام، شوێنی نیشتەجێ بوونی پادشایە و بنکەی ئەنجومەنی وەزیرانیش لە شاری لاها یە.

## پێرۆنیزم — پرونیسم — Peronism

لە ناوی خوان پێرۆن(١٨٩٥-١٩٤٧)، دیکتاتۆری بەناوبانگی ئەرجەنتین لە ساڵەکانی(٥٥-١٩٤٦) و (٧٤-١٩٧٣) و هاوسەرەکەی ئیڤا پێرۆن وەرگیراوە کە بریتیە لە پرۆگرامە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی.

پێرۆن، بە رێکخستنی جڤاتەکی چینی کرێکار لە یەکیەتی کرێکاری و میلیشیای کرێکاری بە دژی گرووپی نوخبە و توێژی باڵای مامناوەندی و بە سپاردنی دەسەڵات لە بەستێنی سیاسەتی دەرەوە و هاندانی ئەرجەنتین یەکان بە دژی ئەمریکا و هەروەها بانگەشەی بەدەستەوە گرتنی رێبەرایەتی ئەمریکای لاتین، توانی سەرنجی جیهان بەرەو لای خۆی راکێشێ. ئەگەرچی نەیتوانی کێشە ئابوورییەکانی وڵاتەکەی خۆی چارەسەر بکات بەڵام لە دڵی هەمووان جێی خۆی کردبۆوە.

پاش مەرگی پێرۆن، هاوسەرەکەی وەك سەرکۆمار، رێبازەکەی درێژە پێدا بەڵام دوای دەرکەوتنی کارنەزانی و گەندەڵبوونی حوکمەتەکەی، لە لایەن ئەرتەشەوە سەرنگوون کرا و لە باو کەوت.

PDF 4 KURD

**پێشکەوتن خوازی** پیشرفت خواهی/ترقی خواهی Progressism

به مانای بڕوا هێنان بە گۆڕان و بووژانەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی مرۆڤە. ئەم بڕوایە هەمیشە یەکێک بووە لە بنەماکانی ئایدیۆلۆجی لیبرال و چەپ بۆ پێکهێنانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی باشتر و کارامە. بەم بۆنەوە لەم بەرەدا راپەڕینی شۆڕشگێڕانە و ریفۆرم خوازانە سەریان هەڵداوە کە خوازیاری لەناوچوونی ئەو تەگەرە سیاسییانە بوون کە لە بەردەم گەیشتن بە سیستەمی باشتر و عەدالەتخواز و «خۆشبەختی هەمووان»، ڕێگر بوون.

پێشکەوتن خوازەکان، بە دوو تاقم دابەش ئەکرێن: یەکەم، ئەوانەی کە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی لە روانگەی دیموکراسی*و یەکسانی ئابووری لە روانگەی ئەخلاقییەوە، بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی یەکسان بە پێویست ئەزانن. دووهەم، ئەوانەی کە گەیشتن بە یوتۆپیا*ی برایەتی و یەکسانی، بە جەوهەری یاسای سروشت و مێژوو دەزانن. مارکسییەکان، توندڕەوترین و شەیداترین پێشکەوتن خوازەکان لە ئەژمار دێن.

چەمکی«پێشکەوتن» ئێمڕۆکە بۆتە یەکێك لە بەها سەرەکییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم کە خۆیان بە شۆڕشگێڕ دەزانن، بۆ«پێشکەوتن»هەوڵیان داوە. پێشکەوتن خوازەکان کە هەمیشە ئێستا و ئایندە لە رابردوو بە باشتر ئەزانن، لە بەرامبەر هەر چەشنە رابردووخوازییەك دژایەتی ئەکەن و دژبەرانی خۆیان بە «کۆنەپەرستی»* تاوانبار دەکەن.

مەرجەکانی پێویست بۆ پەرەپێدان بە بیرۆکەی پێشکەوتنی مرۆڤ بریتییە لە:

١) مەحفکردنەوەی ئەفسانەی سەدەکانی ناوەڕاست، چونکا پێی وایە دنیا لە داهاتوویەکی نەزۆر دووردا کۆتایی پێ دێت.

٢) جێماوەکانی رێنسانس و شۆڕشی زانستیانە و کاردانەوەی لە سەر باوەڕی مرۆڤ بەوەیکە لۆجیك و ژیربێژی جیهانگیر ببێت.

٣) بە هێزبوونی ئەم باوەڕە کە ئەندێشەی مرۆڤ هەر دێتوو بەرەو ژیری و لۆژیکی بوونی زیاتر ئەڕوات.

**پێکهاتن/ ڕۆنان** فورماسیون/ صورت بندی Formation

زاراوەی فۆرماسیۆن لە وشەی form بە واتای شێواز و دارشتن وەرگیراوە. فۆرماسیۆن بە واتای پێکهاتن و ڕۆنان هاتووە و لە بواری سیاسیدا بۆ پێکهاتە و شێوازبەندی رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری ژیانی مرۆیی بەکاردێت. مەبەست، سیستەمی ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکانە کە لە مێژوویەکی دیاریکراودا بیچم دەبەستێ و دێتەدی. (بڕوانە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری).

**پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری** صورت بندی اجتماعی ـ اقتصادی

Socio-Economic Formation

پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری بریتییەلە سیستەمی ئابووری دیاریکراوی مێژوویی و سەرخان*ی تایبەت بەو پێکهاتە. لە زاراوەی مارکسییەکاندا لە مێژووی مرۆڤ پێنج پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ـ ئا

PDF 4 KURD

بەرچاو دەکەوێ کە بریتین لە: کۆمۆنی سەرەتایی، کۆیلەداری، فیۆدالیزم، سەرمایەداری و کۆمۆنیزم. هەرکام لەم پێکهاتانە، لە بواری چۆنییەتی سەرهەڵدان و فراژووتنیان خاوەنی یاسای تایبەت بە خۆیانن. لە هەمان کاتدا یاسایەکی گشتیش لە ئارادیە کە لە هەموو پێکهاتە کۆمەلایەتی ـ ئابوورییەکاندا دەور دەبینێت.

هەریەك لەم قۆناغانە پێکهاتەیەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی تایبەت بە خویان هەبووە. لە راستیدا گۆڕینی پێکهاتەیەك بۆ پێکهاتەیەکی‌تر بە هوی ئەو ناکۆکییانەوە بوو کە لە کۆمەڵگای پێشوودا سەریان هەڵداوە و بوونەتە هۆی ئامادەبوونی پێکهاتەیەکی‌تر. بۆ نموونە سەردەمی کۆیلەداری بە هۆی ئەو ململانێ و ناکۆکییانەوە بوو کە لە ناو ئەو پێکهاتەدا هەبوون. ئەمەش بووە هۆی لێك هەڵوەشانەوەی ئەو پێکهاتە و فیۆدالیزم، وەك پێکهاتەیەکی نوێ جێی گرتەوە. بەم پێیە لە هەر سەردەمێکدا پێوەندی نوێی بەرهەمهێنان و شێوازێکی نوێی ئابووری و کۆمەڵایەتی سەقامگیر دەبێ و فۆرمێکی تازە لە کۆمەڵگادا دروست دەبێ.

## پیلان/کەتن — توطئه — Plot

کردەیەکی پەنامەکی و شاراوەیە کە لە لایەن گرووپێکی شۆڕشگێر یان سیاسی بۆ رووخانی ناوەندی رێبەرایەتی سیاسی ولاتێك بە ئەنجام ئەگات. بۆ وێنە: پیلان بە دژی هیتلەر(١٩٤٤) هەروەها بەدژی نووری سەعید و مەلیك فەیسەڵ(١٩٥٨) و عەبدولکەریم قاسم (١٩٦٣)لە عێراق.

## پێوەندی نێودەوڵەتی — روابط بین الملل — International Relations

پێوەندی نێودەوڵەتی کە پتر بە سیاسەتی نێونەتەوەیی و سیاسەتی دەرەکی ولاتان پێناسە کراوە بریتییەلە توێژینەوەی پێوەندی و دانوستان و وەگەڕخستنی زانیاری و پەرچەکرداری ولاتانی لێك جودا. توێژینەوەی پێوەندی نێودەوڵەتی لەگەڵ ئەم بابەتانەی خوارەوە سەروکاری هەیە:

١ـ ئەکتەری گۆڕەپانە نێودەوڵەتییەکان: بۆ نموونە، ولات، حوکمەت، رێبەر، دیپلۆمات و جەماوەر.

٢ـ ئەو ئامانجانەی کە ئەکتەرەکان دەیانهەوێت پێی بگەن: واتە ئاسایش، خۆشگوزەرانی و دەسەلات.

٣. ئەو ئامرازانەی کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان کەڵکی لێ وەردەگیرێ: واتە دیپلۆماسی، بەکارهێنانی دەسەلات و بەقەناعەت گەیاندن.

٤ـ مەیدانی کار و چالاکی: بونیادە سەرەکییەکانی پێوەندی نێودەوڵەتی، پاش بەدیهاتنی سیستەمی ولاتان لە ئەورووپا بە پێی پەیمانی وێستفاڵی ١٦٤٨ دارێژرا و شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لەساڵی ١٧٨٩ قایمتری کرد.

PDF 4 KURD

# ت

## تابوری پێنجەم — ستون پنجم — Fifth column

لە زاراوەی سیاسیدا بریتیە لە دەستوپێوەن و سیخوڕەکانی وڵاتێك لە وڵاتێکی دیکە، یان داروەستەی گرووپێکی نەیاری دەوڵەت لە ناو دەزگا دەوڵەتیەکاندا. ئەم زاراوە یەکەم جار لە شەڕە ناوخۆییەکانی ئسپانیا(٣٩ـ ١٩٣٦) هاتە ئاراوە: لەو کاتەدا کە فرانکۆ فەرماندەی سوپای دژە کۆمار، بە چوار تابور هێرشی بردە سەر مەدرید، هاوکات بڕیار بوو گرووپێکیتر دژە بکەنە ئەم شارە و لە ناوەوە هێرش بەرنە سەر هێزەکانی پاراستنی شارەکە. ئەم گرووپەیان بە «تابوری پێنجەم» لە قەڵەم دا. ئیمڕۆکە ئەم زاراوە بۆ ناوبردەکردنی خەیانەتکاران و دەستوپێوەنی دوژمن لە ناو حیزب، ڕێکخراوە یان وڵاتێك بە کار دەبرێت.

## تاك باوەڕیی — فردباوری — Individualism

تیۆرییەکی سیاسی و ئەخلاقییە کە بە ئارەزووگەیشتنی تاك، بە دەرەنجامی ژیان و ڕەفتاری کۆمەڵایەتی ناونووس دەکات و لە سەر ئەم گریمانە ڕاوەستاوە کە سوودپەرستی تاك، خۆبەخۆ قازانجی کۆمەڵگای بە دواوە دەبێ. لەم ڕووەوە، ئەم تیۆرییە لە سەر ماڤ خاوەندارێتی وەك مەرجی پێویست بۆ ئازادی لەنگەر ئەگرێ و چاودێریی دەوڵەتیش، زەمانێك پەسند ئەکات کە بە مەبەستی دابینکردنی ئازادی کردەوەی تاك بێت. بە پێی ئەم تیۆرییە تاك خۆبەخۆ دەبێتە دەرەنجام و سەرەڕای گوشاری کۆمەڵگاش بۆ یەکسانکردنی تاکەکان، ئەبێ سەربەخۆ و ئازاد بێ.

ڕیشەی تاك باوەڕی ئەگەڕێتەوە بۆ باوەڕی سۆفستەکانی یۆنان بەڵام لەم چاخەدا بە شێوەی جووڵانەوەیەکی فیکری ئاوێتە بووە لە گەڵ جووڵانەوەی ڕیفۆرماسیۆن لە سەدەی شانزەدا کە لە ئەورووپا سەری هەڵدا. هەر ئەم جووڵانەوە بوو کە هەلی ئازادی تاکەکەسی لە پێوەند لە گەڵ خوداوەند، بێواسیتەی کلێسە و ڕەهابوون لە ژێر سوڵتەی کلێسەی ڕەخساند.

ئەغڵەب، تاك باوەڕییان بە واتایەکی ناپەسند بە کارهێناوە و بە مانای دەرچوونی تاك لە ژێر تەوزیمی کۆمەڵایەتی و خودپەرستی بێ قەید و بەند لە قەڵەم دراوە بەڵام نووسەرە کۆنەپارێزەکانی سەدەی بیستەم، تاك باوەڕییان زیاتر لە بەرامبەر سۆشیالیزم*و چەشنەکانی دیکەی کۆباوەڕی (کۆلکتیویزم) ئاراستە کردووە و لەو ناوانە بۆ داکۆکی کردن لە ماف و ئازادییە سەرەکییەکانی تاك سوودیان وەرگرتووە کە بەڕای ئەوان سۆشیالیزم دەیپووکێنێتەوە.

## تاڵیبان — طالبان — Taliban

گرووپێکی سیاسی ـ چەکداری کۆنەپەرست و توندڕەوی ئەفغانییە کە لە میانەی ساڵی ١٩٩٤ بە...

PDF 4 KURD

ڕاستەوخۆی وڵاتانی ناوچەکە بۆ وێنە پاکستان، بوونی خۆی ڕاگەیاند. زۆرینەی ئەندامەکانی لە قوتابخانە ئایینیەکانی پاکستان لە بواری ئایینی و چەکدارییەوە ڕاهاتوون. پاش ئەو ئاخۆران باخۆرانە سیاسییەی کە لەدوای پاشەکشێی هێزەکانی ئەرتەشی سوور(یەکیەتی سۆڤیەت) لە ئەفغانستان هاتە کایەوە، تالیبان بە پاڵپشتی عەرەبستانی سەعودی و پشتیوانی چەکداریی پاکستان، توانی لە سیپتەمبەری ١٩٩٦ دەست بەسەر کابول(پێتەختی ئەفغانستان)دا بگرێ و نەجیبوڵلا، سەرکۆماری پێشووی ئەم وڵاتە لە سێدارە بدات. تالیبان لە دەوامەی هێرشەکانی خۆیدا توانی لە ئاگۆستی ١٩٩٨ شاری مەزار شەریف بگرێتەوە و هەزاران شیعە و ئەندامانی کۆنسولگەری ئێران لەو شارە، بە کۆمەڵ بکوژێت.

تالیبان پاش گرتنەوەی نزیکەی ٩٠٪ خاکی ئەفغانستان ناوی وڵاتەکەی بە «میرنشینە ئیسلامییەکانی ئەفغانستان» گۆڕی و«مەلا محەمەد عومەر»ی وەك «امیر المومنین» بە دەسەڵات گەیاند. سیاسەتی توندڕەوانەی ناوخۆ و دەرەوەی ئەم ڕژێمە، بووە هۆی بەرپابوونی ترس و خۆفێکی گەورە لە ناوەوە و دەرەوەی ئەفغانستان و دوای چەندەها کوشتاری بەکۆمەڵ لە لایەن دەستوپێوەنەکەی، ڕق و کینێکی جیهانی بەدژی هەڵگیرسا.

دوابەدوای ڕووداوە تیرۆریستییەکەی یازدەی سێپتەمبەری* ٢٠٠١ لە ئەمریکا، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، پەنجەی گومانی بەرە و ئۆسامە بین لادەن، بەرهەڵستکاری سەعودی درێژ کرد کە لە لایەن تالیبانەوە پشتیوانی لێ دەکرا و ئەفغانستانی کردبووە مۆڵگە و فێرگەی هێزە تیرۆریستییەکانی خۆی بەدژی ئەو شتەی کە پێی دەگوت، بەرژەوەندی ئیمپریالیزمی جیهانی.

تالیبان کە نەیدەویست بین لادەن ڕادەستی ئەمریکا بکات و بنکەکانی«ئەلقاعیدە»* کۆبکاتەوە، کەوتە بەر هەڕەشە و غەزەبی چەکداریی ئەمریکا و لە ٢٠٠١/١١/٧، هێزەکانی ئەمریکا، هێرشیان بردە سەر خاکی ئەفغانستان و بە ساڕووخ و فڕۆکەی جەنگی ئەم وڵاتەیان دابێژا. بەم بۆنەوە ڕێگا بۆ نەیاران و بەرهەڵستکارانی تالیبان خۆش بوو. لەم سەروبەندەدا کە یەکیەتی باکوور بە ڕێبەرایەتی ئەحمەدشامەسعوود، شیرازەی لێك پچڕابوو، توانی هێزەکانی خۆی تەیار بکاتەوە و بە پشتگیریی نێودەوڵەتی دەست بەسەر کابولدا بگرێت. تالیبان، کە تەنیا ڕێگای هەڵاتنی بۆ مابۆوە سەنگەرەکانی خۆی چۆڵ کرد و پەرەوازەی کوێستانەکان بوو. پاش دامەزرانی«لۆیە جەرگە» (ژوەنی ٢٠٠٢) حامید کارزای بە سەرۆك کۆماری ئەفغانستان هەڵبێژدرا.

لەو کاتەوە تاکوو بەرایی ساڵی ٢٠١٠ هێزەکانی ناتۆ خاکی ئەم وڵاتەیان چۆڵ نەکردووە و جارجارێك لە لایەن چەکداری تاڵیبان دەکەونە بەر هێرش و ئێستاش ئاسایش بۆ ئەم وڵاتە نەگەڕاوەتەوە.

## تامیزم | تامیسم | Thomism

ئەم زاراوە ئەگەڕێتەوە بۆ توماس ئاکوینیاس(١٢٧٣-١٢٢٥)فەیلەسوفی بەناوبانگ و کەسایەتی پیرۆزی کلێسەی کاتۆلیکی ڕووم. ئەم قوتابخانە پێی وایە کە: مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیە. ئامانج

PDF 4 KURD

دەوڵەت پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگایە و سەرچاوەی حوکمەت ئەگەڕێتەوە بۆ خوا. لە پێوەندی تاك و دەوڵەتدا حوکمەت نابێ بە هاووڵاتیانی خۆی ستەم ڕەوا بینێت. باشترین شێوازی حوکمەت پاشایەتییە بە مەرجی چەقبەستنی یاسا و پیادەکردنی.

**تاوانی سیاسی** جرم سیاسی Political offence

کردارێکی تاوانبارانە کە بە مەبەستی ڕووخانی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و شێواندنی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی بە ئەنجام بگات، یان هەر کردارێکی تاوانبارانە کە دەرەنجامەکەی ڕووخانی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و زیان گەیاندن بە ڕێبەرانی سیاسی بێت. ڕوودانی تاوانی سیاسی وەك هەر تاوانێکی‌تر، گرێدراوی سێ ڕوکنی ماددی و مەعنەوی و قانوونیە و مادامێکی یەکێك لەم کۆڵەکانە بلەنگێت، ئەوا تاوانێك ڕووی نەداوە. بۆ سەلماندنی تاوانێکی سیاسی دوو ڕێسا گرنگە: یەکەم، ڕێسای زەینی. دووهەم ڕێسای عەینی(بەرچاو). بە پێی ڕێسای زەینی، کەسە تاوانبارەکە و ئامانجەکەی گرینگە نەك تاوانەکە و شوێنەوارە بەجێماوەکەی. بەم پێیە تاوانی سیاسی بریتییە لەوە کە تاوانبار بە پاڵنەری سیاسی و بە مەبەستی نسکۆ لێدان بە حوکمەت دەسبەکار بووبێت. بە پێی ڕێسای عەینی، پێودانگی سەرەکی بۆ دەرکەوتنی تاوانێکی سیاسی، شوێنەوارێکە کە لە تاوانەکە بەجێ ئەمێنێت. ئەگەر تاوانەکە زیان بگەیەنێ بە حوکمەت و ئازادیە گشتییەکان، ئەوا لە جوملەی تاوانی سیاسی لە ئەژمار دێت.

**تاوانی نێودەوڵەتی** جرم بین المللی International Crime

لادان لە پرەنسیپەکانی دەوڵەت و نەتەوەکان و سستکردنی بنەماکانی یاسای نێودەوڵەتی و هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایش کە بریتین لە: دەست درێژی، داگیرکاری*، جینۆساید*، ئاپارتاید*، ڕەگەزپەرستی و نەپاراستنی پاك و خاوێنی ژینگە.

**ترۆتسکیزم** تروتسکیسم Trotskism

لقێکە لە ڕێبازی کۆمۆنیستی کە لە لایەن لیۆن ترۆتسکی (١٨٧٩-١٩٤٠ )شۆڕشگێری بە ناوبانگی سۆڤیەت و چالاکوانی شۆڕشی ١٩١٧ سۆڤیەت، هاتە ئاراوە.

لایەنگرانی ترۆتسکی بە سەرۆ وەرگرتن لە ئەندێشەکانی مارکس و ئەنگڵس و لینین، هەروەها ئەزموونەکانی شۆڕشی سۆڤیەت کە ترۆتسکی تێیدا دەورێکی بالای هەبووە، خۆیان بە مارکسیە شۆڕشگێڕەکان ناوبردە ئەکرد. ئەمانە دەیانویست سەرمایەداری بە شۆڕشێکی کرێکاری بڕووخێت. لە دیکتاتۆری پرۆلتاریا پشتیوانی دەکەن بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستی کە تێیدا چینی چەوسێنەر بێدەست بکرێ و دەسەڵات بکەوێتە دەس چینی ڕەنجدەران و کۆمەڵگا بە شێوازی سیستەمی فرە حیزبی ئیدارە بکرێ.

PDF 4 KURD

ترۆتسکی، بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠٦ لە وتارێکدا بە ناوی «شۆڕشی ئێمە» تیۆرییەکەی خۆی دەربارەی شۆڕشی هەمیشەیی ئاراستە کرد. لەم ڕێبازەدا ئەم فیکرەی هێنایە ئاراوە کە شۆڕش ڕووداوێکی کتوپڕ نییە بەڵکوو لە زنجیرە گۆڕانێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەچێ کە وەك وەرچەرخانێکی بێڕاوەستان بۆ بزووتنەوەی کرێکاری دەرفەتێك ئەڕەخسێنێ تاکوو سەربەخۆ لە هێزە بەرهەمهێنەکانی خۆی شۆڕشەکە دەسپێئەکا و بەرە و پێشی دەبات.

لە بەرامبەر تیۆری «شۆڕشی هەمیشەیی» ترۆتسکیدا تیۆری ستالین دەربارەی «سۆشیالیزم لە وڵاتێکدا»هاتە ئاراوە. لە بەردەوامیئەم ڕێبازە، ترۆتسکی لە چەن وتارێکی بەناوبانگ لە ژێر سەردێڕی«ڕێگەی نوێ»، شەڕی خۆی بەدژی بورۆکراسییەت دەسپێکرد. ئەو ڕەخنەی گرت لەوەیکە بڕیارەکانی حیزب تەنیا لە لایەن چەن کادێرێکی پایەبەرزی حیزبەوە دەرئەکرێت و ئەندامانی ئاستی خوارەوەی حیزبەکە تەنیا لێی ئاگەدار ئەبن. ترۆتسکی لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٣ ئەمەی ڕەت کردەوە کە بورۆکراسییەت تەنیا«ئیدارە گەرێتی» و پاشماوەی بارودۆخی ڕابردوو نییە بەڵکوو لاگیرییەکی سەرەکییە کە ڕەنگە ببێتە دژە شۆڕشێك.

ترۆتسکی پێشنیازی کرد کە حیزبایەتی، دیموکراتیزە بکرێت. ناوەندی چالاکی لە سەرەوە ڕادەستی خوارەوە بکرێت. ئەو پێی وابوو کە بەدیهێنانی دیموکراسی دەروون حیزبی تاکە ڕێگەی زاڵبوونە بە سەر نەستی لاگەیی کادێرەکان. ئەو لە کتێبی «ئەو شۆڕشەی کە خەیانەتی پێکرا» دەڵێ: «یەکییەتی سۆڤیەت لەگوێن وڵاتێکی کرێکاریی، هەڵقولاوی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧یە کە بەدەوڵەتی کردنی کەرەستەی بەرهەمهێنان، بۆتە هۆی گەشەی خێرای ئابووری. بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی ستالینیزم، دەوڵەت بە تەواوی تووشی وەرچەرخان بووە و لەجیاتی ئەوەی ببێتە کەرەستەیەك و بە دەست چینی کرێکارەوە بێت، بۆتە داردەستێك بۆ چەوساندنەوەی کرێکار».

بە ڕای ترۆتسکی، «پرۆسەی شۆڕشگێڕی ئەبێ بە دژی نایەکسانیی کۆمەڵایەتی و خنکانی سیاسی بێت. سێندیکا و ئەنجومەنی کارگەکان ئەبێ ئازادی خۆیان وەدەست بێنن. حیزبەکان تا ئەو شوێنەی کە بڕوایان بە سۆشیالیزم بێت، یاسامەند بکرێن، ئابوور بکەوێتە خزمەت بەرهەمهێن و ئەنجومەنی کارگەکان بە سەر بەرهەمهێناندا چاودێری بکەن و ...»

لەم چەن دەساڵەی دواییدا ڕێبازی ترۆتسکی لە هەندێ بابەتەوە بووە جێگای هیوایەت بۆ لایەنگرانی«چەپی نوێ» کە مەیلێکیان بە کۆمۆنیزمی سۆڤیەت و مائۆئیزم نەبوو. بۆیە لە شۆڕشەکانی مانگی مای ١٩٦٨ لە فەرەنسەدا دەوری گێڕا. لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش بەناوی ئەڵتەرناتیڤی چەپی «شۆڕشگێڕی - مارکسیستی» سەری هەڵدا.

ترۆتسکی لە ساڵی ١٩٤٠ کوژرا و لایەنگرەکانیشی تەنیا لە وڵاتی سەیلان، توانییان ببنە هێزێکی سیاسی.

PDF 4 KURD

**تۆتالیتاریزم/پاوانخوازی** فراگیرندگی/توتالیتاریسم Totalitarianism

ئەم زاراوە لە ریشەی لاتینی (totus) بە مانای «گشت» وەرگیراوە. بەو ریباز و ئەندیشە سیاسی و ئایینی و ئەخلاقییانە دەگوترێ کە هیچ سنووریك لە نێوان ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیانی تاکەکەسی قایبل نابێت و بۆی هەیە تەواوی کەلێن و قوژبنی ژیانی خەڵك بپشکنێ و دەستی تێوەردات. هەڵبەت ئەوە لە بیر نەکەین کە تۆتالیتاریزم، لە خۆیدا ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەت نییە بەڵکوو تایبەتمەندی ئایدیۆلۆجیکی سیستەمگەلێکی وەك کۆمۆنیزم و فاشیزم و نازیسم لە ئەژمار دێت.

تۆتالیتاریزم، یەکەم جار لە دوای ساڵی ١٩٢٣، واتە ئەو ساڵەی کە مۆسۆلینی لە ئیتالیا دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت، بۆ ناوبردە کردنی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتی و سیاسییەی کە دەیویست لەم وڵاتەدا پیادەی بکات بە کار براوە و پاشان دەماودەم بڵاو بۆتەوە.

بە گشتی ئەو رژێمانەی کە هەڵگری خەسڵەتی تۆتالیتەرین، ئەم تایبەتمەندییانە لە خۆ دەگرن:

١- کۆنترۆڵی دەوڵەت بە سەر هەموو کاروبارێکی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا.

٢- پاوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی بە دەستی حیزبی دەسەڵاتدار.

٣- لابردنی هەموو جۆرە شێوازێکی چاودێریی دیموکراتی لە کۆمەڵگادا.

٤- پەنا بردن بە تیرۆر بۆ سەرکوتکردنی هەر چەشنە نەیارییەك.

٥- قۆرخکردنی حیزب و دەوڵەت لە لایەن تاکە کەسێکەوە.

٦- هەوڵدان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەك بە پێوانەکانی ئایدیۆلۆجی حیزبی دەسەڵاتدار.

٧- خستنەگەری هەموو هێزەکانی کۆمەڵگا لە پێناو ئامانجەکانی حیزب و دەوڵەت و ئیفلیجکردنی سەربەخۆیی تاکەکەسی.

**تۆڕی سەرانسەری جیهانی** شبکە سراسری جهانی World Wide Web (www)

تۆڕی سەرانسەری جیهانی کە زۆرجار بە وێب یا «www» ناسراوە، باشترین خزمەتی ئەنتەرنێتە کە لە رێگای چەندەها میدیاوە دەتوانێ نووسراوە، دەنگ، وێنە و ئەنیمەیشێن راگوێزێت. بنکەکانی وێب لە تەواوی جیهاندا بڵاو بوونەتەوە بەڵام زۆرترینیان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادایە. لە تۆڕی ئەنتەرنێتدا ملیۆن - ملیۆن کۆمپیتەری خانەخوێش پێکەوە پێوەندییان هەیە. هەرکام لەم کۆمپیتەرانە لە زاکیرەی خۆیاندا کۆمەڵێ زانیاری جۆراوجۆریان جێگیر کردووە. ئەگەر کەسێك بخوازێت لە دەریای بێ برانەوەی ئەم زانیارییانە بە خێرایی و بەلەز کەڵك وەربگرێت، دەبێ لە رێگای تۆڕی جیهانی ئەنتەرنێتەوە دەستبەکار بێت. ئەم تۆڕە لە ساڵی ١٩٩٢ لە لایەن تیم بێرنێرز لیی، شارۆمەندی ئەمریکایی داهات و یەکەم بنکەکەشی لە لایەن ناوەندی توێژینەوەی فیزیکی گەردیلەیی ئەورووپا cern لە بەینی سویسرا و فەرەنسەدا بنیات نراوە.

PDF 4 KURD

**تەبایی** سازش Conciliation

پرۆسەی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی نێونەتەوەیی(دوو وڵات) بە ناوبژیوانیی لایەنێکی سێهەم کە رادەستی کۆمیسیۆنێکی تایبەتی سازش کرابێت و بە رەزامەندی هەر دوو لایەن دیاری کرابێت بۆ روونکردنەوەی هەقیقەت. ئەم کۆمیسیۆنە ملزەمە بە دەرکردنی راپۆرتێك کە تێیدا رێچارەیەکی گونجاو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە دەستەبەر بکات. هەڵبەت دوو لایەنی کێشەکە لە باری یاساییەوە بۆیان هەیە پەسندی نەکەن.

**تەکتیك** تاکتیک Tactic

وشەکە لە زمانی یۆنانیدا بە مانای «رێك و پێکی»یە بەڵام ئیمرۆکە دوو مانای لێ ئەبێتەوە:

١- زانستی فەرماندەیی لە مەیدانی شەردا (شارەزای تەکتیکی جەنگی).

٢- کەرەستە و رێوشوێن و پلانی زیرەکانە کە بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانج بە کار ئەبرێ.

تەکتیك، بە پێچەوانەی ستراتیجی*، دەربەستی بەرزی و نزمی رووداوەکانە و بە پێی زەمەن دەگۆڕێ. لە واقیعدا تەکتیك بەشێکە لە ستراتیجی.

**تەکلیفی سیاسی/ئەرکی سیاسی** تکلیف سیاسی political duty

تەکلیف(ئەرکی سەرشان) بە کردەوە یان خۆپاراستن لە بە ئەنجام گەیاندنی کردارێك دەگوترێ کە بە پێی یاسا فەرمان درابێت یان نەهی لێکرابێت. بەڵام تەکلیفی سیاسی، بە «ئەرکی هاووڵاتی بۆ گوێڕایەڵ بوون بە یاسا» ئاماژە دەکات. ئەم ئەرکە لە بنەڕەتدا هێمایەکە بۆ گوێڕایەڵی و سەرسپوردەگی بە «دەسەڵاتێکی سیاسی» تایبەتەوە.

مەسەلە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی ئەوروپا بریتی بوون لە: ١ـ چۆنیەتی و هەلومەرجی پەیدابوونی ئەم ئەرکە. ٢ـ سنوورەکانی ئەم ئەرکە. بۆ وێنە لە سەر ئەم بۆچوونە کۆنە کە پێی وابووە ئەم ئەرك و تەوزیمە لە لایەن خوا یان سروشتەوە بە ئینسان راسپێردراوە، گریمانەی جیاواز لە سەر تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی ئاراستە کراوە. بیرمەندانێکی وەك هیووم، ئوستوارت میل هێگل و گرین، پێیان وابوو کە ناکرێ مرۆڤ کوتومت بەرعۆدەی وەها ئەرکێك ببێت بەڵکوو ئەو ئەرکانە بە پێی بەهاگەلێك کە لە کۆمەڵگاکان سەرهەڵئەدەن، ئەخوێندرێنەوە.

**تیۆری سێ جیهان** نظریەی سە جهان Three Worlds Theory

بە پێی ئەم تیۆرییە کە لە لایەن مائۆ ( ١٨٩٣- ١٩٧٦) رێبەری چینی کۆمۆنیست ئاراستە کراوە، دنیای ئەمرۆ بە سێ جیهان دابەش ئەکرێت کە بریتین لە: جیهانی یەکەم واتە دوو زلهێزی ئەمریکا و سۆڤیەتی پێشوو کە یەکەمیان ئیمپریالیستییە و دووهەمیش سۆسیال ئیمپریالیستە. جیهانی دووهەم پێکهاتووە لە

PDF 4 KURD

وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری وەك بریتانیا، ئەڵمانیا و ژاپۆن و وڵاتانی سۆشیالیستی. جیهانی سێهەم، وڵاتانی هەژار و دواکەوتوو. بە باوەڕی مائۆ، دەبوایە جیهانی سێهەم لە گەڵ جیهانی دووهەم، بە دژی جیهانی یەکەم یەك بگرن. ئیمرۆکە باس لە جیهانی چوارەمیش دەکرێ کە لە جیهانی سێهەم نەدارترە و لە حاڵی یەك کەوتندایە.

**تیئۆکراسی/یەزدانپەرستی** تئوکراسی/یزدانسالاری Theocracy

تیۆرییەکی سیاسی و ئاینیە کە تەنیا حوکمەتی ئاینی بە ڕەوا دەزانێ و یاسایەك بە دروست ئەزانێ کە لە لایەن خواوە دانراوە و بە پێغەمبەرەکانا بە خەڵکی ڕاگەیاندووە. بە پێی ئەم تیۆرییە ئاین و سیاسەت(مەلا و دەوڵەت)لێك جیا نین و ئەبێ یاسا و دەستوورەکانی خوا لە پێوەند لە گەڵ خەڵك پیادە بکرێت.

**تیرۆریزم** تروریسم Terrorism

وشەی تیرۆر لە ڕەگی لاتینی(terrere) بە مانای ترس و تۆقاندنە. ئەم وشە یەکەم جار (ساڵی ١٧٩٦) لە «فەرهەنگی زانستی فەرەنسە»، هاتووە و تیرۆریزمی بەم شێوە مانا کردۆتەوە: «ڕژێم یان سیستەمی تۆقێنەر».

فەرهەنگی زاراوەی سیاسی دالۆز (dalloz) تیرۆریزم بە کردارێکی سیاسی شەڕەنگێزانەی جەماعەت یان کەمینەیەکی ڕێکخراو بە دژی کەسان یان دارایی یان دامودەزگەیەك لە قەڵەم ئەدا کە بۆ گەیشتن بە ئامانجگەلێکی وەك، سەربەخۆبوون لە دەوڵەتێك، ڕووخانی ڕژێمی دەسەڵاتدار یان خەبات بەدژی هەندێ ڕووکاری سیاسی دەوڵەتێك ڕوو ئەدات.

فەرهەنگی زاراوەی سەربازی (وەزارەتی بەرگری ئەمریکا) تیرۆریزم، بەم جۆرە پێناسە دەکات:

دەسبەکاربوون بۆ شەڕەنگێزی نایاسایی یان هەڕەشە بۆ ئەنجامدانی وەها کردارێك بە مەبەستی ترساندن و سەرکوتکردن یا تۆقاندنی حوکمەت یا کۆمەڵگاکان، بۆ گەیشتن بە ئامانجێك کە بە گشتی سیاسی، ئایینی یان ئایدیۆلۆجیایی بێت.

پاش تەنینەوەی قۆناغی تیرۆر و تۆقاندن لە فەرەنسە(سێپتەمبەری ١٩٧٣ تاکوو ژوئییەی ١٩٧٤) تیرۆریزم، بووە بەشێك لە زاراوەی سیاسی ئەورووپا و بە درێژایی زەمەن مانا و کارلێکی جیاوازی بە خۆوە بینی و هەندێ جار مانای دژبەیەکی لێکەوتۆتەوە. بۆیە ئەو کەسەی کە بە باوەڕی هەندێك «تیرۆریست» لە قەڵەم ئەدرا، بەڕای هەندێکیتر «جەنگاوەری ڕێگای ئازادی» پێناسە دەکرا. واتە پێناسە کردنی ئەم چەمکە پەیوەست بوو بە گۆشە نیگا و ئایدیۆلۆجی ئەو کەسەی کە شرۆڤەی دەکرد.

*تایبەتمەندییەکانی تیرۆریزم* :

١ـ لە گەڵ شەڕەنگێزی فیزیکی ئاوێتەیە بۆ ترساندن و تۆقاندن.

٢ـ چاوەڕوان نەکراوە و کتوپڕ ڕوو ئەدات.

PDF 4 KURD

٣- بە ئامانج و پاڵنەری سیاسیەوە روو ئەدات.

٤- لە دەرەوەی سنووری رەسمی شەڕی نێوان دوو گرووپی شەڕخواز روو ئەدات.

تیرۆر بە گشتی لە هەلومەرجێکدا روو ئەدات کە تێیدا دەسەلات بە شێوەیەکی یەکسان و بەرامبەر دابەش نەکرابێت. لەم کەشوهەوادا لایەنێك هەموو جۆرە دەسەلاتێکی سیاسی و سەربازی و ئابووری و کۆمەلایەتی بە دەستەوەیە و لایەنەکەی تریش بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم کەموکووڕییە هەڵدەستێ بە تیرۆر کردن. ئەم دیاردە لە وڵاتانی ئیستبدادی شتێکی بەرچاوە. لە وڵاتانی دیموکراتیشدا جاری وا هەیە کۆجێیی دەسەلات لە دەستی هەندێ لە گرووپەکانی کۆمەڵگا دەبێتە هۆی ئەوەی گرووپی نەیار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەست بدەنە تیرۆر.

تیرۆریزم لە بنەڕەتدا لە مەسەلە ئەخلاقییەکان ریشەی داکوتاوە، کەواتە پێناسەکردنی ئەم دیاردە دژوارە. چونکا هەندێ لە پۆلێن بەندییەکانی«شەڕەنگێزی سیاسی» پاساو ئەدرێن و هەندێکیشیان بێپاساون. کەواتە بۆ شرۆڤەی چەمکی تیرۆریزم و گەیشتن بە پێناسەیەکی جیهانی، ئەبێ پاڵنەری تاکەکەسی و ئاخێزگەی کۆمەلایەتی و ئامانجی سیاسی لە بەر چاو بگیرێ.

هەندێ کەس بە سانایی کردەوەیەك بە تیرۆریستی ناوبردە ئەکەن کەچی هەندێکیتر هەمان کردەوە هیچکات بە تیرۆریستی لە قەڵەم نادەن. بەڕای هەندێك رێکخراوەی ئازادیخوازی فەلەستین(PLO) رێکخراوەیەکی تیرۆریستی نارەوایە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی هەڵدەستێ بە ئەنجامدانی کردەوەی شەڕەنگێزانە. بەپێچەوانەوە هەندێ لە وڵاتان ئەم رێکخراوە بە تیرۆریستی لە قەڵەم نادەن و بە نوێنەری قانوونی و راستەقینەی گەلی زۆرلێکراوی فەلەستین پێناسەی ئەکەن کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی رووی کردۆتە کردەوەی شەڕەنگێزانە. لەم سالانەی دواییدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەوڵی داوە بە پێی سیاسەتەکانی خۆی لیستی گرووپە تیرۆریستیەکانی جیهان ناوبردە بکات و بەم جۆرە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا دەخوازێت بۆ بەرەنگاربوونەوەیان، وڵاتانی هاوپەیمان لە گەڵ خۆیدا هاوئاهەنگ بکات.

تیرۆریزم لق و پۆپ و شێوازی جۆراوجۆری لێبۆتەوە کە گرنگترینیان بریتین لە:

١- تیرۆریزمی پێشێلکاری ماڧ گشتی. وەك کردەوەکانی ماڧیا لە ئیتالیا و تیرۆریزمی مادە سڕکەرەکان لە ئەمریکای لاتین.

٢- تیرۆریزمی پەراوێزی. ئەم جۆرە وەبیر هێنەرەوەی تیۆرییە پارتیزانییەکانی چێگوارایە بە مەبەستی راکێشکردنی رەشەگەل لە رێی کردەوەی تیرۆریستی وەك بۆمب تەقاندنەوە.

٣- تیرۆریزمی سیاسی. بریتییەلە کوشت و کوشتاری زنجیرەیی و هەڕەشە و ترساندنی کەسان و گرووپ و کۆمەڵگا یان دەوڵەتەکان بۆ بڕیاردان لە بەرامبەر خواستی سیاسی تیرۆریستەکان.

٤- تیرۆریزمی گریلایی. لە پرۆسەی شۆڕش یان شەڕی ئازادیخوازی بە مەبەستی راکێشانی هەستی جڤات بۆ لای خۆی.

PDF 4 KURD

٥- تیرۆریزمی ئایینی. لە گەڵ تیرۆریزمی سیاسی نزیکایەتی هەیە بەڵام بە شەرەنگێزییەکی بەرفراوانترەوە.

٦- تیرۆریزم بە پاڵنەری شەخسییەوە. وەك جووڵانەوەکانی گیاخۆری، ژینگەیی و بەراویتن(سك لە باربردن). ئەم جۆرە تیرۆرە لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا زۆر بەرچاوە.

٧- تیرۆریزمی دەوڵەتی. ریشەی ئەم جۆرە تیرۆرە ئەگەرێتەوە بۆ کولتووری مارکسیەت کە بە پشتبەستن بە پۆلیسی نهێنی و کردەوەی سەرکوتکارانە، ئامانجەکانی خۆی ئەپێکن. بۆ وێنە ***سوارچاکانی مەرگ*** لە رژێمەکانی ئەمریکای لاتین کە دەستیان دابووە کوشتن و برینی نەیاران.

ئیمرۆکە تیرۆریزمی دەوڵەتی بریتیە لە شێوازێکی تیرۆر کە دەوڵەتێك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی، ستراتیجی تایبەتی بۆ دائەرێژێ. بۆ وێنە پشتیوانی سیاسی و ئابووری لە کاتێکدا کە شەڕی چەکداری نەتوانێ ئامانجەکان بپێکێ.

٨- تیرۆریزمی نێونەتەوەیی. وەك هاوکاری بزووتنەوە تیرۆریستییەکانی ساڵەکانی ١٩٦٠ (لە نێوان رووس و کووبا) لە سەردەمی شەڕی سارد.

٩- تیرۆریزمی ئەنفۆرماتیك. شێواندنی تۆڕی ئەنفۆرماتیکی ولاتێك بە مەبەستی خستنە ژێر گوشار یان بەیەکادانی دەوڵەتێك. ئەم جۆرە تیرۆرە بە چەن شێوە روو ئەدات کە بریتین لە:

١- هێرش بردن بۆ سەر بنکە و دامودەزگای ئەنفۆرماتیکی لە رێگەی تەقاندنەوە یا ئاگرتێبەردان.

٢- هێرشی سینتاکسی. لە رێی ناردنی ڤایرۆس.

٣- هێرشی مانایی. لە رێگەی شێواندنی پلانە کۆمپیتەرییەکان.

١٠- سوپەر تیرۆریزم. ئەم تیرۆرە بە کەڵك وەرگرتن لە مادەی کیمیاوی و بایەلۆجی و رادیۆلۆجی و ناوەکی روو ئەدات.

١١- گەورە تیرۆریزم. لەم جۆرە تیرۆریزمە کە رووداوەکەی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ (تەقاندنەوەی تاوەرە ئەفسانەییەکانی رێکخراوەی بازرگانی جیهانی) وەك نموونەیەکی بەناوبانگ لە ئەژمار دێت، تیرۆریستەکان بە تەقاندنەوەی فرۆکەی نەفەرهەڵگر و بە هاندەری سیاسی، دەست ئەدەنە کوشتنی ئینسانی بێتاوان بۆ تۆقاندنی هەموو جیهان.

هەر لەم جۆرە تیرۆرە لە لایەن گرووپی تیرۆریستی ئەلقائیدە*لە کوردستانیش بە ئەنجام گەیشتووە کە دەکرێ بە تەقاندنەوەکەی جێژنی قوربانی ٢٠٠٢ ئاماژە بدرێ کە سەدان کەس کوژراو و برینداری لێکەوتەوە.

١٢- سایبر تیرۆریزم(تیرۆریزمی کۆمپیتۆری)، کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە کۆمپیتۆرییەکان و تەکنۆلۆجی زانیاری بە مەبەستی تۆقاندن یا پێمل کردنی خەڵك بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ...

PDF 4 KURD

## ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان و تیرۆریزم

ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، هەوڵەکانی خۆی لە ساڵی ١٩٧٢ بۆ پێناسەکردنی تیرۆریزم دەست پێکردووە و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٩ گوزارشتی خۆی بێئەوەی ئەم دیاردەی پێناسە کردبێت، پێشکەش بە کۆمەڵی گشتی کرد. ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٨٩ بە پێی بڕیارنامەیەك، بە تەئکید بیروڕای خۆی لە بابەت ماف چارەی خۆنووسین و سەربەخۆیی هەموو گەلانی زۆرلێکراو لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمە نژادپەرست و ئیستیعمارییەکان ڕاگەیاند و هەوڵی ئەو ڕاپەڕینە ڕزگاریخوازانەی کە لە گەڵ ئامانجەکانی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بگونجێت، بە قانوونی و ڕەوا ناوبردە کرد. کۆمەڵی گشتی هەموو کردەوەیەکی تیرۆریستی، لە هەر کوێ و لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت مەحکووم کرد و ئەم جۆرە کردەوانەی، تاوانبارانە و بێپاساو لە قەڵەم دا.

**بڕیارنامەی ١٣٦٨**: ڕۆژێك دوای ڕووداوەکەی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە کۆی دەنگ بڕیارنامەیەکی پەسند کرد کە تێیدا لە سەر ماف بەرگری ڕەوای تاکەکەسی و کۆمەڵەکی بە پێی مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان، تەئکید کراوە. بەم پێیە ناسینی تیرۆریزم ئەو مافەی ئەدا بە دەوڵەتێك مادام بەر شاڵاوی تیرۆر کەوتبێ، بە پێی مادەی ٥١ مەنشووری نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ داکۆکی کردن لە خۆی دەس بباتە هێزی سەربازی.

**بڕیارنامەی ١٣٧٣**: لەم بڕیارنامە کە هەموو ١٥ ئەندامی ئەنجومەنی ئاسایش بە دەنگییەوە هاتن، ڕاگەیێندرا کە «تەواوی کردەوە تیرۆریستییە نێو نەتەوەییەکان بۆ وێنە ١١ی سێپتەمبەر، مەترسییەکە بۆ ئاسایش و هێمنایەتی نێونەتەوەیی».

ئەم بڕیارنامە لە باری بەرفراوانییەوە، گرینگترین بڕیارنامەی ئەنجومەنی ئاسایش لە ئەژمار دێت کە سەرچاوەی دارایی و بنیاتی ئابووریش ئەداتە بەر مەدی نەزەر و داوا لە دەوڵەتان ئەکات کە لەبەر پێوەندی توندوتۆڵی تیرۆریزمی نێونەتەوەیی لە گەڵ جەنایەتە داڕێژراوە بان ـ نەتەوەییەکان، بۆ وێنە قاچاخی مادە سڕکەرەکان، قاچاخی چەك و تەقەمەنی و ڕاگواستنی نایاسایی مادەی ئەتۆمی و کیمیایی و بایۆلۆجی، هەوڵ و تێکۆشانەکانی خۆیان بخەنە ڕیزی یەکترەوە.

**تیرۆریزمی کوێر** — ترورسم کور — Blind terrorism

مەبەست لەم جۆرە تیرۆرە، ئەنجامدانی زنجیرە کردارێکە بۆ پرۆپاگەندە* و هاتوهاوار بە قازانجی گرووپێك یان ڕاکێشانی سەرنج و ڕای گشتی بۆ شتێك. لە بەر ئەوەیکە هیچ پلان و بەرنامەیەکی داڕێژراو لە ئارادا نییە، پێی دەگوترێ تیرۆریزمی کوێر.

**تێکنۆکراسی** — فن سالاری — Technocracy

ئەم زاراوە لە لایەن ویلیام هێنری سمیت، نووسەری ئەمریکایی لە ساڵی ١٩١٩ داهێنراوە و بەم جۆرە پێشنیازی کردووە کە حوکمەت بکەوێتە دەست خاوەن پیشە و تەکنیکەکان. جۆرە حوکمەتێك کە لە

PDF 4 KURD

سەردەمی پێشکەوتنی هونەری و زانستی هەنگاو بنێت. لەم جۆرە حوکمەتەدا پێویستە هەموو سەرچاوە ئابوورییەکان و کاروباری کۆمەڵ لە لایەن تەکنیکسازان و زانایانەوە بەڕێوە بچێت. تێکنۆکراتەکان، کۆمەڵێك بوون کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی دەستیان کرد بە توێژینەوەی بارودۆخی ئابووری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەم جۆرە حوکمەتە دەرەنجامی پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنۆلۆجییە لە جیهاندا و ئەم پێشکەوتنەش لە سەر بیر و بڕوای سیاسی حاکم و ئاکاری سیاسەتمەداران کاریگەریی دانا. زۆربەی توێژەرانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەم شتەیان بەلاوە پەسندە کە لە کۆمەڵگای پێشکەوتووی پیشەسازیدا هەر دێتوو دەوری تەکنیککاران و زانایان گرینگتر دەبێت بەڵام لەوە بەگومانن کە رژێمی تەکنیکسازان بتوانێ جێی نەزم و تەکوزیی سیاسی بگرێتەوە.

## تیۆری — تئوری/نظریه — Theory

بە کۆمەڵێ ئەندێشە و بۆچوونی گونجاو لە بابەت زانستێکی تایبەتەوە تیۆری دەگوترێ. وەك تیۆری رێژەیی ئانشتاین(لە فیزیا)، تیۆری ئابووری کۆن(ئابووری)، تیۆری پێوەندییەکان(کۆمەڵناسی) و تیۆرییەکانی دەوڵەت(لە سیاسەتدا). زانایان لە رێگای کۆڵینەوە و توێژینەوە هەوڵ ئەدەن بۆ کۆکردنەوەی داتا واقیعەکان لە بوارێکی تایبەتی زانستی بەڵام پێویست ئەکات ئەم زانیاریانە بە وردبینی و وشیاری زانستییەوە رێکی بخەن و پۆلێن بەندی بکەن و پێوەندی مانادراری نێوان داتاکان روون بکەنەوە و دەری بڕن. بۆ وەها کارێك پێویست بە شتێك بە ناوی تیۆری هەیە.

ئامانجی سەرەکی و بەرەنجامی زانست گەیشتن بە داڕشتنی تیۆرییە و ئامانجی تیۆریش بریتییە لە:

١ـ کورت کردنەوەی داتاکان و پێکهێنانیان لە ناو سیستەمێکی گونجاودا. ٢ـ مانا بەخشین بە دەسکەوتەکان وەك ئەزموون. ٣ـ دەربڕینی و ئاشکراکردنی ئەنجامی ئەزموونەکان لە رێگەی دیاریکردنی پێوەندی نێوان بگۆڕەکان. ٤ - پێش بینی دواهات و رووداوەکان لە ئایندە و ٥ ـ لەبار کردن و خۆش کردنی زەمینە بۆ پەخش و بڵاوکردنەوە و پەرەسەندنی زانست.

## تیۆریی سیاسی — نظریەی سیاسی — Political theory

تیۆریی سیاسی لە سۆنگەی بابەت و باسەوە، چوار تەوەری سەرەکی لەخۆ دەگرێ کە دوو تەوەری ١و٢ بە فەلسەفەی سیاسی ناوبردە کراوە:

١) تیۆری ئەخلاقییانەی زانستی سیاسەت.

٢) خوێندنەوەی مێژوویی ئەندێشە سیاسییەکان.

٣) شیکاریی زمانەوانیی ئەندێشە سیاسییەکان.

٤) دۆزینەوە و بەربڵاوکردنی سیستەماتیکی بنەما گشتییەکانی رەفتاری سیاسی.

PDF 4 KURD

لە روانگەی مێژوویی‌یەوە، کۆنترین پێناسەی ئەم زاراوە بۆ ناوبردەکردنی لقێك لە زانستە سیاسییەکان بە کار هاتووە کە لایەنی تیۆریکی بووە، دیمانەیەك بە مانای تێفکرین لە بالاترین ئاستی ماهییەتی ژیانی باش و ئەو دەزگا سیاسییانەی کە وەها ژیانێك بەدی دەهێنن.

## تیۆری کەوانەی جەی نظریە منحنی جی J Curve Theory

جۆن جەی (John Jay) کۆمەڵناسێکی بەناوبانگە کە هۆکاری شۆرش دەگەڕێنێتەوە بۆ جیاوازی فراوان لە نێوان چاوەڕوانی تاکەکانی کۆمەڵگا و ئاستی جێبەجێکردنی پێداویستیەکانیان کە ئەم فەرق و جیاوازییە، بە شێوەی بەش‌خوراوی و هەژاریی خۆی نیشان ئەدات. ئەو پێی وایە کەموکوڕییەکان، رەها نین بەڵکوو لە نەداریی و بەش‌براویی رێژەیی یەوە سەرچاوە دەگرن و ئەم ئاستەنگییەش کاتێك روو ئەدات کە سەردەمی دوور و درێژی خۆشگوزەرانی ئابووری، لە ناکاو راوەستێ و بە شێوەیەکی بەرچاو پێچەوانە ببێتەوە. کۆمەڵناسی ناوبراو، تیۆرییەکەی خۆی لە قەبارەی خشتەیەك ئاراستە کردووە کە بە کەوانەی جەی ناوی ناسراوە.

PDF 4 KURD

## ج

**جارنامەی ئیسلامی مافەکانی مرۆڤ** اعلامیه اسلامی حقوق بشر

Islamic Declaration of Human Rights

جارنامەی ئیسلامی مافی مرۆڤ لە دانیشتنی وەزیرانی دەرەوەی ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی لە ساڵی ١٩٩٠ لە قاهیرە پەسندکرا. ئەم جارنامە بە پێی سەرمەشقەکانی ئایینی ئیسلام، مافی مرۆڤ و ئازادییەکانی تاکی خستۆتە بەر چاو و هەوڵ ئەدات تا رادەیەك خوێندنەوەیەکی هاوشێوە لە گەڵ مافەکانی مرۆڤ لە روانگەی ئاایینی و سەر زەمینییەوە بدا بە دەستەوە.

**جارنامەی سەربەخۆیی وڵاتە داگیرکراوەکان** کمیته ختم استعمار

The special Committee on Decolonization

لە ڕێکەوتی ١٤دیسەمبری ١٩٦٠ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، جارنامەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی وڵاتانی کۆلۆنیایی و داگیرکراو(جارنامەی کۆتایی داگیرکاری) کە لە لایەن ٤٣ وڵاتی ئەفریقایی و ئاسیایی ئامادە کرابوو بە کۆی ٩٠ دەنگی ئەرێنی و ٩٩ دەنگی پارێزکەر و بێ هیچ دەنگێکی نەیار، پەسندی کرد. لەم جارنامەدا روون کراوەتەوە: ژێردەستەبوون، وەبەرهێنان، یا خستنە ژێر رکێفی جەماوەرێك لە لایەن حوکمەتێکی بێگانە، پێشێلکەریی جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ماف و ئازادییە مەدەنییەکان لە ئەژمار دێت و ڕێگرێکە لەبەردەم ئاشتی و هاریکاریی نێودەوڵەتیدا.

بۆ نەهێشتنەوەی ئەم بەربەستانە، کۆمەڵی گشتی «داواکاری کۆتایی هێنانی خێرای داگیرکارییە و دەخوازێت، بێ هیچ مەرجێك سەرەبەخۆیی وڵاتانی داگیرکراو لە ژێردەسەڵاتی بێگانە» ڕاگەیەندرێت.

ئەم جارنامە لەسەر ئەوە جەغد دەکات کە نەبوونی ئامادەیی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووری ئەم وڵاتانە نابێت ڕێگر بێت بۆ دواخستنی پرۆسەی سەربەخۆیی.

**جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان** منشور ملل متحد United Nations charter

جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێسانامەی نەتەوە یەکگرتووەکانە. ئەم جارنامە بریتیەلە ئامانج و پرەنسیپ و یاسا و ڕێساکانی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە پێکهاتووە لە یەك پێشەکی، ١١١ بەند و یەك پاشەکی هەفتا بەندی کە پەیوەستە بە دادگای نێونەتەوەیی داد. جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/١٠/٢٤ لەپاش پەسند کردنی دەوڵەتانی چین، فەرەنسا، بریتانیا، سۆڤیەتی پێشوو،وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و زۆرینەی وڵاتانی ئەندام، گەیشتە قۆناغی جێبەجێ کرد.

PDF 4 KURD

**جڤات/جەماوەر** تودە Mass/mob

جڤات بە کۆمەڵێکی چالاک ئەوترێ کە هاوشێوەی جەماعەت لە ئەژمار دێت. تایبەتمەندییەکانی جڤات بریتییە لە: نزیکایەتی شوێن، ناپایەداری و کردەوەیەکی کۆمەڵەکی کە بکەوێتە ژێر کاریگەریی پاڵنەرێکی بەسۆزی هاوبەش تاکوو بگاتە دەور و پێگە رەسمییەکانی. لە روانگەیەکی ترەوە بە گشتی بە مانای کۆمەڵێ بوونەوەری سروشتی کە زیاتر وەك جەستەیەك سەیر ئەکرێت، لێکدراوەتەوە. لە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکاندا جڤات دەلالەت ئەکا بە سەر خەڵکێکی زۆر کە لە شوێنێك نیشتەجێ بووبێتن.

لە بارەی جڤاتەوە، تەنیا شتێك کە گرنگە گشت بوونەکەیەتی ئەگینا سەرنج نادرێتە کەرت و رەگەزە پێکهێنەرەکانی، بۆیە لە گەڵ گرووپ جیاوازی زۆری هەیە.

لە جەماوەردا بە گشتی بیروڕا و لایەنگری و تواناییەکانی تاکەکەس و گرووپ، یان شێوازی ژیان بە تەرزێکی لێك ترازاو خۆی نیشان نادات بەڵکوو ئەم شتانە لەناو کۆمەڵێك هۆکار و شێواز و لاگیریی رەشۆکی دەتوێنەوە.

جڤات، گرووپ نییە کە لە رووی ویست و ئیرادەوە خاوەنی تایبەتمەندی و یەکگرتوویی بێت. لە جڤاتدا بە رێژەی گرووپ هەست بە گوشارێکی کەمتر ئەکرێت. دەسڕۆشتن و سەیتەرە پەیاکردن بە سەر جڤاتدا ئەغڵەب بە ئاسانی روو ئەدات. بە هاسانی ئەکرێ جڤاتێکی ناڕازی بگۆڕیتە جڤاتێکی رازی و بە پێچەوانەشەوە ئەم شتە روو ئەدات.

**جودایی خوازی** تجزیه طلبی separatism

خواستی گرووپێکی ئەتنیکی دانیشتووی وڵاتێك بۆ جیا بوونەوە لە ژێر دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتێك کە ئەو گرووپە ئەتنیکیە تا ئەو کاتە بەشێك بووە لەو وڵاتە. ئەغڵەب، ئامانجی جودایی خوازەکان دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێیە لە وڵاتێکی تازە بۆ نەتەوەیەکی تایبەت. سەدەی نۆزدە لە ئەورووپا و سەدەی بیستیش لە ئاسیا و ئەفریقا، بە هۆی پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم* و تەنینەوەی وشیاری نەتەوەیی لە ناو ئیمپراتۆریەکاندا بزاڤی جودایی خوازی بە زۆری پەرەی سەند و بووە هۆی هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەکان و سەرهەڵدانی نەتەوەی نوێ. گرینگترین رووداوی لەم چەشنە هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریە گەورەکانی فەرەنسە و بەریتانیا و عوسمانی بوو کە لە ئاسیا و ئەفریقا و ئەمریکا دەسەڵاتیان بە دەستەوە بوو.

هاندەری جودایی خوازی، رەنگە جیا بوونەوە لە وڵاتێك بێت و موتوربە بوون بە وڵاتێکیتر. جودایی خوازی، لە یاسای زۆربەی دەوڵەتەکاندا رەنگە لە جوملەی تاوانی سیاسی* لە قەڵەم بدرێت و هەندێ جاریش بە واتای خەیانەت پێناسە ئەکرێ و بەناوی دژبەری و ناتەبایی حاکمییەتی نەتەوەیی سزای بۆ دیاری ئەکرێت.

PDF 4 KURD

**جوگرافیای سیاسی**(جیئۆپۆلیتیك) جغرافیای سیاسی Geopolitic

پلاندانان بۆ سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێك بە لە بەرچاوگرتنی هۆكارە جوگرافییەكان. بابەتی جوگرافیای سیاسی، خوێندنەوەی بنەما جوگرافییەكانی دەسەڵاتی دەوڵەتە واتە لێكدانەوەی دەوری كەشوهەوا، سەرچاوە سرووشتییەكان، شوێنكاتی جوگرافیایی، حەشیمەت و تایبەتمەندیە كەلتوورییەكان بە سەر سیستەمی سیاسی وڵاتێك. ئەرەستۆ دەڵێ: بە بێ رەچاوكردنی جوگرافیا، ئەقڵی سیاسی بڕ ناكات. جان بۆدن، یەكەم بیرمەندی هاوچەرخ بوو كە پێوەندی نێوان زانستی سیاسەت و جوگرافیای بەرجەستە كرد. مۆنتسكیف و رۆسۆ، هەركامیان بە نۆبەی خۆیان لە سەر پێوەندیی هۆكارە جوگرافییەكان و كەشوهەوا بە سەر شێوازی حوكمەت كردن و كاریگەری ئەم هۆكارانە بە سەر سیاسەت و ئازادی خەڵك، توێژینەوەیان كردووە.

یەكێك لە پێشەنگەكانی جوگرافیای سیاسی، هاڵفۆرد مەكیندر( ١٩٤٧-١٨٦١) نووسەری بەریتانی بووە كە پێی وابوو چارەنووسی مێژووی جیهان، ئاكامی شەڕ و ململانێی هێزی وشكایی بووە لە بەرامبەر هێزی دەریاییدا.

بابەتی نوێی جوگرافیای سیاسی، لێكدانەوەی مەسەلە جیهانییەكانە لە روانگەی جوگرافیاییەوە. سەرهەڵدانی ناوەندە جیهانیەكانی دەسەڵاتی نوێ، گرنگایەتی سەرچاوە سرووشتیەكان لەباری دەسەڵاتی سیاسی و پێوەندیی باكوور و باشوور لە جوملەی سەرباسەكانی جوگرافیای سیاسی مودێرنەیە. لێكدانەوەی سنوورە سیاسییەكان و ناوچە سەرسنوورییەكان، هێزی دەریایی و وشكایی و ناوەندە سیاسییە بەهێزەكانی دەسەڵات لە باری جوگرافییەوە بابەتی توێژینەوەی جوگرافیای سیاسییە.

**جوولەكە قڕان** یهودستیزی Anti-semitism

دوژمنایەتی یا نەفرەت لە جوولەكان بە مەبەستی ئازاردان یا لەناوبردنیان. لە ئەورووپای سەدەی بیستەمدا دوژمنایەتی لە گەڵ جوولەكان ـ كە پێشتر لە سۆنگەیەكی ئایینییەوە بوو- جێی خۆی دا بە دوژمنایەتی رەگەزی(رەگەزپەرستی) و ئەڵمانیای نازیی(بڕوانە نازیسم) بووە ناوەندی بڵاوكردنەوەی ئەم نەفرەتە. دوژمنایەتی لە گەڵ جوولەكە، لە میانەی سەدەی نۆزدە هاوكات لە گەڵ سەرهەڵدانی رێبازەكانی باڵادەستی رەگەزی ئاریایی(نوردیك) پەرەی سەند و لایەنگرانی ئەم بیرۆكە هەوڵیان دا بۆ رێبازەكەیان بنیاتی زانستی بدۆزنەوە.

لە ئەڵمانیای نازی هەوڵیان دا كە رەگەزی «ئاریایی» لە «نا ئاریایی» جیابكەنەوە و لە «تێوەدانی» ئەم رەگەزە بەرگری بكەن و لەم بابەتەوە یاساگەلێكیان دانا. بە پێی ئەم قانوونانە جوولەكە، بێگانە و خاوەن رەگەزێكی سووك بوون كە خوێنی ژەهراوییان خۆبەخۆ تاوانباریان دەكات. لەم رووەوە بوو كە زەماسە و خۆشەویستی لە نێوان جوولەكە و ئاریایی پاوان كرا.

دوای ئەم قانوونانە، زانایانی ناوداری جوولەكە وەك ئەنیشتەین و فرۆید، خرانە تاراوگەوە و بەرە...

PDF 4 KURD

مۆسیقاییەکانی *مەندلسۆن* و باخ یاساغ کرا. جوولەکان لە ماف مەدەنی و پیشەیی و بازرگانی بێبەش کران و دەستەدەستە نێردرانە ئۆردووگاکانی کاری زۆرەملی.

لە سەدەی نۆزدە و نیوەی یەکەمی سەدەی بیست، ئەورووپای رۆژهەڵات بووە ناوەندی پرۆپاگەندە دژی جوولەکە و لێرەوە بوو کە جووڵانەوەی زایۆنیزم* دەستی پێکرد. لە دەستووری بنچینەیی ئەم وڵاتانەدا (لە ١٩٤٥ بەملاوە) ئەگەرچی بە رێزەوە باس لە ماف کەمینە ئایینی و رەگەزییەکان کرابوو بەڵام جارجارێك ئەم دوژمنایەتییە ئەبیندرا و زۆربەی ئەو جوولەکانەی لەم وڵاتانەدا مەنسەبی دەوڵەتییان هەبوو، دەستیان لە کار پێ کێشانەوە.

دوای شۆڕشی ١٩١٧ سۆڤیەت، دەوڵەتی نوێ بە جوولەکانی وڵاتەکەی کە ئەودەم ٢ ملوێن و ٢٠٠ هەزار کەس بوون، مژدەی خودموختاری لە ژێر چاودێری دەوڵەت دانی. هەروەها دانانی شانۆ و دەرکردنی رۆژنامە و گۆڤار و کتێب بە زمانی ئیدی(زمانی جوولەکەکانی ئەورووپا کە ئاوێتەیەك بوو لە زمانەکانی ئەورووپی و عیبری) ئازاد کرا بەڵام ئەم بەڵێنانە بە رێوە نەچوو.

سەرهەڵدانی زایۆنیزم و دەوڵەتی ئیسرایل، بۆتە هۆی پەرەسەندنی جۆربەجۆری جوولەکە قڕان لە رۆژهەڵاتی ناوین و شوێنی دیکە. ئەگەرچی دەوڵەتی ئیسرایل هەوڵ ئەدات هەر جووڵەیەکی دژ بە زایۆنیزم بە جوولەکە قڕان لە قەڵەم بدات بەڵام دژایەتی لە گەڵ زایۆنیزم و لەناوبردنی جوولەکەکان هەمیشە یەك واتایان نییە، چونکا لە ناو جوولەکانیشدا گرووپ و خەڵکانێکی نووسەر و لێکۆڵەر هەن کە دژی زایۆنیزم و دەوڵەتی ئیسرایلن.

## جیاکردنەوەی هێزەکان　　تفکیك قوا　　Separation of powers

ئەم زاراوە دەلالەت ئەکا بە سەر دابەشکردنی دەسەڵات لە بەینی دەزگا جۆراوجۆرەکانی حوکمەت کە لە ئەنجامدا هەر دەزگایەك خۆی بە ئەرك و تەوزیمێکی جیاوازەوە سەرقاڵ ئەکا و لەم بەستێنەشدا کەمتاکورتێك بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە دەزگاکانی دیکە ئیش دەکات. لە راستیدا ئەم بیرۆکە بۆ بەرگری کردن لە دەسەڵاتی زۆرداری و ملهوڕیی ئاراستە کراوە، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی حوکمەت لە شوێنێکدا چەق نەبەستێ و کۆ نەبێتەوە. سەرچاوەی ئەم بیرۆکە ئەگاتەوە بۆ ئەرەستوو بەڵام بە شێوەی نوێ و ئەمێستایی ئەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسوفانی سیاسی سەدەکانی ١٧و١٨ی ئەورووپا، بە تایبەت جۆن لاك لە بەریتانیا و مۆنتسکیڤ لە فەرەنسە. نەریتی هەڵوەشاندنی هێزەکان لە حوکمەتدا بە سێ هێزی راپەڕاندن، یاسادانان و دادوەری بووە.

لەم بارەوە شرۆڤە و پرسی جیاوز لە ئارادایە کە بریتین لە: ئەو ئەرك و تەوزیمانەی کە ئەبێ بە وردی لێك جیا بکرێنەوە کامانەن؟ رادەی سەربەخۆیی پێویست چەندەیە؟ تا چ رادەیەك چاودێری دەزگاکان بە سەر کاری یەکتردا ئەگونجێت؟ و ئەم بابەتەش کە ئایا دەرەئەنجامی جیاکردنەوەی هێزەکان، هاوتەرازیی دەزگا جیاوازەکان دابین ئەکات؟

PDF 4 KURD

بنەمای جیاکردنەوەی هێزەکان، بۆ یەکەم جار بە لەبەر چاوگرتنی بیرۆکەی مۆنتسکیڤ لە دەستووری بنچینەیی ئەمریکادا هاتە ئاراوە. ئەم دەستوورە هێزی راپەڕاندنی سپاردە سەرکۆمار و هێزی یاسادانانیشی بە کۆنگرێس بەخشی. دوای شۆڕشی فەرەنسە و بە لەبەرچاوگرتنی دەستووری بنچینەیی ئەمریکا، ئەم بنەڕەتە لە دەستووری فەرەنسەشدا پەسندکرا و ئینجا ئەم فیکرە زۆربەی وڵاتانی دیکەی جیهانی گرتەوە.

## جیاوازیی/فەرقدانان تبعیض Discrimination

بە گشتی بە مانای جیاکردنەوە، سەرنج پێدان، یان قایل بوون بە جیاوازی لە نێوان شتەکاندایە. بە واتایەکی سەرزارەکی بریتیە لە بەربەستگەلێکی یاسایی، نەریتی یان قەرار و بڕیاری نارەسمی بە دژی گرووپێکی تایبەت بۆ وێنە گرووپێکی ئایینی یا ئەتنیکی جیاواز.

## جیاوازیی رەگەزایەتی تبعیض نژادی Apartheid/Segregation

جیاکردنەوەی هاووڵاتیان لە یەکتر بە پێوەندگی ئەتنیکی و بەربەستکردنی کەمایەتییە رەگەزییەکان لە بابەت شوێنی ژیان و تێکەڵبوون لە گەڵ رەگەزی«باڵادەست»و هەروەها بێبەش کردنیان لە مافی مەدەنی و سیاسی و بێ عەداڵەتی و نابەرامبەری لە وەرگرتنی مووچە و پەروەردە و راهێنانی کۆمەڵایەتی. نموونەی جیاوازی رەگەزایەتی، سیاسەتی ئەڵمانیای نازی بوو دەرحەق بە «خەڵکانی نائارییایی» (بڕوانە جوولەکە قڕان).

بە ناوبانگترین رژێمێك کە بەرێوەبەری ئەم سیاسەتە دژە مرۆڤانە بووە، رژێمی ئەفریقای باشووری بووە کە بە ناوی «ئاپارتاید»* لە ساڵی ١٩٤٨ سیمایەکی یاسایی و رەسمی بە خۆوە گرتووە. لە ناوەراستی سەدەی حەڤدەوە کە ئەورووپییەکان دەستیان بەسەر ئەم وڵاتەدا گرت، ئەم سیاسەتە بەرێوە چووە. حیزبی«نەتەوەیی» کە لە ساڵی ١٩٤٨ بە دەسەڵات گەیشت، رێساگەلێکی بۆ ئەو خەڵکانەی کە سپیپێست نەبوون پەسند کرد کە هەموو بوارێکی ژیانی ئەوانی ئەگرتەوە. (بۆ وێنە، بەرگری کردن لە زەماوەندی سپی پێستەکان لە گەڵ رەگەزەکانیتر، بەربەستکردنی مافی سیاسی و هاتووچۆ و هەڵبژاردنی ماڵ و ئیش و کار و ...)

لە ساڵی ١٩٥٢ نەتەوە یەکگرتووەکان لەم بارەوە دەستی بە پەیجووری کرد و ئەم سیاسەتەی وەك مەترسییەك بۆ ئاشتی و مافی مرۆڤ لە قەڵەمدا بەڵام دەوڵەتی ئەفریقای باشووری، رێگەی بە کۆمیتەی لێپرسراوی ئەم مەسەلە نەدا. سەرەنجام ئەم رژێمە لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی بیستەمدا بە خەباتی بێوچانی خەڵکانی ئەم وڵاتە بە رێبەرایەتی *نیلسۆن مەندێلا* رووخێندرا و دەسەڵاتی راستەقینە بە بێ رەچاوکردنی جیاوازی رەگەزیی کەوتەوە دەست خەڵك.

## جیهاد/خەباتی ئایینی جهاد (Jihad (holy war

بۆ وشەی جیهاد ئەم پێناسانەی خوارەوە کراوە:

PDF 4 KURD

- شەڕ لە گەڵ کافرەکان لە پێناوی ئایین. لە قورئاندا زیاتر لەگەڵ وشەی قتال (کوشتار) بەکار براوە.
- قتال بۆ پشتیوانی کردن لە ئایین، کارێکی رەوایە.
- خەباتی موسوڵمانان لە گەڵ ئەجنەبی بە مەبەستی بانگهێشتنیان بۆ ئاییینی ئیسلام یان بۆ پاراستنی سەربەخۆیی حوکمەتی ئیسلامی.
- لە خۆ بووردن و کۆشش لە رێی خوا.

لە ئاییینی ئیسلامدا لەم وشە زاراوەگەلێکی‌تر دروست بووە:

جیهادی سەرەتایی: شەڕێك کە بە مەبەستی داکۆکی کردن نەبێت و لە شەڕێکی ئاسایی بچێت.

جیهادی بچووك: بە مانای شەڕ لە گەڵ کافرەکان.

جیهادی مەزن: بە واتای شەڕی گەورە کە شەڕی ئینسانە لە گەڵ نەفس(دەروون)ی خۆی بۆ چاکسازی و پاراستنی خۆی.

جیهادی بانگهێشتن: ئەم جیهادە جۆرە شەڕێکە بە مەبەستی بڵاوکردنەوە و پەرەپێدان بە دیانەتی ئیسلام.

## جیهانبینی　　جهان بینی　　Weltanschaung/ world outlook

رەگی ئەم وشە ئەڵمانییە و بە مانای«روانین بۆ جیهان»ـە. لە فەرهەنگی فەلسەفی ئەڵمانیدا بە مانای وێنایەکی گشتییە لە جیهان و بە پێگە و هەڵوێستی ئینسان لە ناو خۆیدا لێکدراوەتەوە. جیهان بینی روانین و تەفسیرێکی تایبەت لە گەردوون و ژیان ئەدا بەدەستەوە.

لە زاراوەدا بریتییە لە دەزگای تیۆری و مەفهومی و وێناندنی جیهان. بە مانایەکی بەربڵاو هەموو تیۆرییەکانی ئینسان لە بارەی جیهانی دەوروبەر، هەر لە تیۆری و بیرۆکە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانەوە بگرە هەتا ئەخلاق و هونەر و زانستە سرووشتییەکان ئەگرێتەوە. بەڵام مانا جەوهەری و کاکڵەکەی بریتیە لە تیۆری و بیر و بڕوای فەلسەفی. بە گشتی جیهانبینی، سێ رێچکەی لێ بۆتەوە:

- جیهانبینی زانستی
- جیهانبینی فەلسەفی
- جیهانبینی ئاییینی

## جیهانیگەری/جیهانی بوون　　جهانی شدن　　Globalization

ئەگەرچی وشەی جیهانی (global– گلۆڤەر) مێژوویەکی سەدان ساڵەی هەیە بەڵام زاراوەی (globalization) لە ساڵی ١٩٦٠ بەدواوە برەوی پەیداکردووە. فەرهەنگی وێبستێر، یەکەم فەرهەنگیکی موحتەبەر بوو کە لە ساڵی ١٩٦١ ئەم زاراوەی پێناسە کرد. بەم حاڵە بەرفراوانی «جیهانگەری» وەهایە کە

PDF 4 KURD

گەیشتن بە پێناسەیەکی پرپێست و گونجاو دژوار ئەنوێنێ. ئەم پێناسەی ژێرەوە، کۆی پێناسە و بۆچوونی چەن کەسێکی پسپۆڕە لەم بارەوە:

جیهانگەری، بریتییە لە پرۆسەی پەستاوتنی کات و شوێن کە بەو پێیە خەڵکانی جیهان کەمتاکورتێک بە وشیارییەوە لە کۆمەڵگای جیهانیدا تێوەگلێن. بە واتایەکی‌تر ڕەوتێکە کە بەو پێیە تاکەکەس و کۆمەڵگا لە پانتایەکی جیهانیدا یەکئەگرنەوە. لە پێناسەیەکی‌تردا جیهانگەری، پرۆسەیەکی ئاڵۆزە کە دەوڵەتە نەتەوەییەکان زیاتر لە جاران پێکەوە گرێ ئەدا و تیۆری دیموکراسی تووشی کێشە و قەیرانێکی نوێ دەکات. کاریگەریی جیهانگەری بە سەر دیموکراسی و حاکمییەتی نەتەوەیی لەم پرسیارانەدا خۆی دەرئەخات:

ئایا حوکمەتە دیموکراتیەکان، وەك جاران دەسەڵاتیان بە سەر کاروباری ناوخۆی وڵاتەکەیان ئەشکێ یا ئەوەی شارۆمەندان بە حوکمەتێك دەنگ ئەدەن کە نەتوانێ بڕیارەکان جێبەجێ بکات؟ چونکا دەسەڵاتی ڕاستەقینە بەدەست بازاری دۆلار و کۆمپانییە فرەنەتەوەییەکان و بانکە نێونەتەوەییەکانەوەیە.

ئایا لە نێوان هاووڵاتیانی وڵاتێك لە گەڵ ئەو کەسانەی ئەکەونە ژێر کاریگەریی سیاسەتەکانی حوکمەتی نەتەوەیی، وێکچوویی و هاوشێوەیی‌یەك لە ئارادایە؟ (بۆ وێنە سیاسەتی یارمەتیدان یا پاوەجێکردنی دامەزراوە ئەتۆمییەکان).

ئایا دەکرێ دەزگا نێونەتەوەییەکان، بۆ وێنە «سندووقی دراوی نێونەتەوەیی» و«بانکی جیهانی» بە شێوازێکی دیموکراتیك بەڕێوە ببرێن؟

بە گشتی دوو ڕوانگەی جیاواز لە بابەت جیهانگەری لە ئارادایە: ڕوانگەی یەکەم، نەیارانی ئەم پرۆسە لە ئەژمار دێن و ڕوانگەی دووهەم لە گەڵیا هاودەنگن. نەیاران پێیان وایە کە جیهانگیری و یەکپارچە بوونی جیهان زیاتر لە ئەفسانە دەچێ و ئەم زاراوە بە پاڵنەری سیاسییەوە داهاتووە. لەم ڕوانگەوە شتێکی ئەوتۆ لە جیهاندا ڕووی نەداوە و جیهانگەری دیاردەیەکی نوێ نییە و ئەم هەلومەرجەی ئێستا زیاتر لە بارودۆخی سەدەی نۆزدە ئەچێ بە واتایەکی‌تر ئەم ڕەوتە دەوامەی مێژووە.

لە بەرامبەر ئەم ڕوانگەدا هەندێکی‌تر دەڵێن جیهانگەری هەموو شتێکی خستۆتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە و پێکهاتەی دەوڵەت و ماهییەتی سیستەمی ئابووریی وڵاتانی تووشی وەرچەرخان کردووە. تیۆری دانەری بەناوبانگی ئەم بۆچوونە، کینچی ئۆمایی لە ژاپۆنە کە پێی وایە: دەوڵەت ـ نەتەوەکان بەرەو تیاچوون ئەڕۆن و پێشبینی ئەکات لە ۳۰ ساڵی داهاتوودا ۱۰۰ تا ۳۰۰ دەوڵەت ـ شار، بەدی بێت. بە باوەڕی ئانتۆنی گیدێنز، تیۆری دووهەم نزیکترە لە واقیع. ئەو دەڵێ جیهانگەری بە تایبەت لە بەستێنی ئابووردا بە گوتەی ئابووری ناسی بەناوبانگ، دانی کواخ، هێدی هێدی بەرەو ئابوورییەکی بێبارست دەڕوا. ئابووریی سووك لە ئاستی جیهانیدا پەیوەستە بە دانوستان و بازرگانی کردن بە زانیاری نەك بازرگانی کردنی کاڵا و شمەك.

گیدێنز، پرۆسەی جیهانگەری بە بەرهەمی بەیەکادرانی نەزمی هەمیشەیی و شوێن و کات لە قەڵەم ئەدا و پێی‌وایە ئەم ڕەوتە بە مانای ئاڵوگۆڕکردنی هەموو دەزگاکانی کۆمەڵگایە و ئەم وەرچەرخانە هەر لە بەست

PDF 4 KURD

ئابووری روو نادات بەڵکوو لە ئاستی پێوەندییەکاندا ئەقەومێ بە چەشنێك کە دەوڵەت و نەتەوە و ژیانی کەسەکی ئێمە دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە.

د. حسەین عەزیمی، تیۆری داڕێژی ئابووری و پەرەسەندن لە ئێران دەڵێ: جیهانگەری بە واتای هاوسانبوونەوەیەکی سادەی کەلتوورەکان نییە بەڵکوو بە واتای ئەوەیە کە پێوەندی کەلتوورەکان خێراتر ئەبێ و لێکحاڵیبوون و فاماندنی فەرهەنگی نەتەوەکان زیاد ئەکات. بەڵام ئەوەندی مێژوو نیشانی داوە، وادیارە وێکچوویی هەمە لایەنەی فەرهەنگی روو نادات و جیهان کەلتوورێکی تاقانە بە خۆیەوە نابینێت.

## جیهانی ئازاد دنیای آزاد Free world

ئەم زاراوە لەلایەن سیاسەتمەدارانی رۆژاوایی بۆ باسکردن لە جیهانێك بەدەر لە کۆمۆنیست بەکار براوە

## جیهانی سێهەم جهان سوم Third world

زاراوەی جیهانی سێهەم، یەکەم جار لە لایەن ئابووریناسێکی فەرەنسی بە ناوی«ئالفرێد سوویی» بەکار براوە. ئەم زاراوە لە ساڵەکانی ١٩٥٠ تا ١٩٦٠ رەواجی پەیدا کرد و مەبەستیش لەو وڵاتە ئاسیایی و ئەفریقاییانە بوو کە تازە سەربەخۆییان بە دەس هێنابوو. هەروەها ئەو وڵاتانەشی ئەگرتەوە کە نە لە ریزی وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریدا ئەگونجان و نە لە ریزی وڵاتانی پێشکەوتووی کۆمۆنیستیدا.

پێناسەگەلێکی تریش لەبری ئەم زاراوە بە کار براوە کە بریتین لە: وڵاتانی دواکەوتوو، وڵاتانی کەمتر پێشکەوتوو، وڵاتانی روو لە پەرەسەندن. خەڵکی وڵاتانی جیهانی سێهەم، بەزۆری خەریکی کشتوکاڵن و لە دێهاتەکاندا ئەژین و بۆ کاری بەرهەمهێنان زیاتر لە شێوازی کۆنباو کەڵك وەرئەگرن.

لەم ساڵانەدا براڤێکی سیاسی نێونەتەوەیی لەم جۆرە وڵاتانە پەرەی سەند کە لە دووی شوناسێکی تایبەتی سیاسی و ئەخلاقی بووە بۆ روبەڕوبونەوە لە بەرامبەر دوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژاوادا. بە ناوبانگترین رێبەرانی ئەم براڤە بریتیبوون لە: جەواهیرلەعل نێهرۆ لە هێندستان، جەمال عەبدولناسر لە میسر، ئەحمەد سۆکارنۆ لە ئەندونیسیا و تیتۆ لە یۆگوسلاڤیا. هەندێ لەمانە هیوادار بوون بە پێکهێنانی«هێزێکی سێهەم» بلۆکێکی‌تر لە بەرامبەر دوو بلۆکەکە دابمەزرێنن.

چینییەکان بە پەسندکردنی بیرۆکەی سێ جیهان، ئەم زاراوەیان برەو پێدا. بەڕای ئەوان جیهانی سێهەم، جیهانی حەقیقی و دژی ئیمریالیزمە.

PDF 4 KURD

# چ

**چارتیزم** چارتیسم Chartism

چارتیزم لە وشەی charte بە مانای نووسراوە، بەڵگە، بەیاننامە، بلاّقۆك و وەرەقەی شوناس وەرگیراوە.

چارتیزم، بزاڤێکی ریفۆرمخوازانەی بەریتانی بوو کە لە ساڵەکانی ١٨٤٠ تا ١٨٤٨ لەم وڵاتەدا بۆ باشتر کردنی پەرلەمان لە ئارادا بووە. سەرکەوتنی چارتیزم بە هۆی گرووپێکی کرێکاری بوو کە خۆیان بە چارتیست لە قەڵەم دابوو. هۆی ئەم ناولێنانەش ئەوە بوو کە لە ساڵی ١٨٣٨ نووسراوەیەکیان دەرکردبوو کە بەناوی «بلاّقۆکی گەل» ناوی دەرکرد. هەندێ لە چارتیستەکان لە بنەڕەتدا ئەو سوسیالیستانە بوون کە لە گەڵ شێوازەکانی سەرمایەداری دژایەتییان دەکرد و پێیان وابوو کە سەرەنجامی چالاکییەکانیان ئەبێ ناردنی چینی کرێکار بۆ پەرلەمان بێت. ڕێبەرانی ئەم بزاڤە لە بەیاننامەی ساڵی ١٨٣٨ خواستەکانی خۆیان بەم شێوە ڕاگەیاند:

- هەڵبژاردنەکانی مەجلیسی عەوام، ئەبێ ساڵی جارێك بەڕێوە بچێت.
- هەر کەسێك باڵغ بووبێت بۆی هەیە لەم هەڵبژاردنانەدا بەشداری بکات.
- دەنگدان بە وەرەقەی شاراوە بێت.
- سندووقەکانی دەنگدان بە شێوەیەکی یەکسان دابەش بکرێت.
- مەرجی مڵکدارییەتی لە مەرجەکانی ئەندامەتی مەجلیسی عەوام لابرێت.
- بۆ ئەندامانی مەجلیسی عەوام، مووچە دیاری بکرێت تاکوو خەڵکانێك بە داهاتی کەمیشەوە بتوانن ببنە ئەندامی پەرلەمان.

چارتیستەکان لە باری مێژووییەوە هاندەری چینی کرێکار بوون بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانە. ئەگەرچی ئەم بزاڤە لە ساڵی ١٨٤٨ لێکهەڵوەشا بەلاّم دواتر هەندێ لە ئامانجەکانی لە قەوارەی بەرنامەکانی ئەنجومەن و یەکیەتی کرێکاری پیادە کرا.

**چڵە زەیتوون** شاخە زیتون Olive Branch

چڵە زەیتوون هێمایەکە بۆ ئاشتی و ئاسایش.

**چواردە مادەی ویلسۆن** چهاردە مادەی ویلسون Fourteen points

لە ڕێکەوتی ١٨ی ژانوییەی ١٩١٨ تۆماس وودرۆ ویلسۆن (١٨٦٩-١٩٥٩) سەرکۆماری ئەو کاتەی ئەمریکا، بەیاننامەیەکی دەربارەی ئامانجەکانی دەوڵەتانی یەککەوتوو(لە شەڕی جیهانی یەکەم) بۆ

PDF 4 KURD

کردووەوە کە بە چواردە مادەی ویلسۆن ناوی دەرکردووە ئەم چواردە مادە بریتین لە:

١- راوەستانی سیاسەتی نهێنی و مۆرکردنی پەیماننامەی ئاشکرا بۆ ئاشتی.

٢- ئازادبوونی هاتوچۆ لە دەریاکاندا.

٣- لابردنی کۆسپی گومرگی و لەبەرچاوگرتنی یەکسانی و ئازادی لە بازرگانیدا.

٤- کەمکردنەوەی چەکەکان.

٥- چارەسەرکردنی دادپەروەرانەی کێشە ئیستیعمارییەکان.

٦- چۆڵکردنی خاکی سۆڤیەت.

٧- سەربەخۆیی دووبارەی بەلجیکا.

٨- چۆڵکردنی فەرەنسە و گەڕانەوەی «ئالزاس و لورن» بۆ ئەم وڵاتە.

٩- پیاچوونەوە بە سنوورەکانی ئیتاڵیا.

١٠- خودموختاری بۆ کەمایەتییەکانی نەمسا ـ مەجارستان.

١١- چۆڵکردنی خاکی سێربستان و مۆنتێنێگرۆ و رۆمانیا و چارەسەرکردنی دادپەروەرانەی کێشەکانی بالکان.

١٢- سەربەخۆیی ناوخۆیی نەتەوەکانی سەر بە ئیمپراتۆری عوسمانی و نێونەتەوەیی کردنی تەنگاوی داردانێل.

١٣- دامەزرانی دووبارەی دەوڵەتی پۆلۆنیا.

١٤- دامەزراندنی کۆمەڵی نەتەوەکان.

## چەپ — چپ — The left

ئاخێزگەی ئەم زاراوە ئەگەڕێتەوە بۆ شێوەی دانیشتنی «کۆمەڵی نەتەوەیی توێژەکانی فەرەنسە» لە ساڵی ١٧٨٩.لەم کۆمەڵەدا میران لەلای راستی پاشا و «چینی سێهەم» لەلای چەپییەوە دائەنیشتن. ئەم دابەشکارییە فیکرییە لە کاتی ڤیتۆکردنی پاشا پەرەی سەند. نوێنەرانی شۆڕشگێڕ لەگەڵ ڤیتۆدا دژایەتییان دەکرد،کۆنەپارێزەکان رازی بوون و نەرمڕەوەکان یا ئەو کەسانەی لە ناوەڕاستدا بوون، پێشنیازی ئاشتییان کرد.

ئەم تێگەیشتنە لە سیاسەت، شێوازێکی هەمیشەیییە کە تێیدا پەیکەری سیاسی لە لایەن روانگە جیاوازەکانەوە دەگۆڕدرێ و دابەش ئەکرێت کە دەرەنجامەکەی پەیدا بوونی چەپ و راستە. لەم روانگەوە ئەو حیزبانەی لایەنگری گۆڕانکاری بن، پێیان ئەوترێ «چەپی»و ئەو حیزبانەش کە خوازیاری دۆخی هەنووکە بن و نەخوازن هیچ شتێك بگۆڕدرێ، بە «راست» ناوبردە ئەکرێن.

## چەپ و راست — چپ و راست — Left and right

ئاخێزگەی زاراوەی چەپ و راست، شۆڕشی فەرەنسەیە کە لە کۆمەڵی نەتەوەیی نوێنەرانی شۆڕشگێ

PDF 4 KURD

توندڕەو لە لای چەپ و نوێنەرانی کۆنەپارێزیش لە لای ڕاستەوە دادەنیشتن. لەو سەردەمەدا ئەم دوو زاراوە مانایەکی ئاشکرا و جیاوازیان هەبوو: چەپ بە مانای شۆڕشگێڕیی و حەز بە گۆڕان کردن بووە و ڕاستیش بە واتای نەیاریکردن لە گەڵ هەر چەشنە گۆڕانێك یان گەڕانەوە بۆ ڕابردوو. بەڵام لەوە دوا، واتای زاراوەکان تووشی هەوراز و نشێو بوون و هاوکات لە گەڵ سەرهەڵدانی لاگیریی نوێی سیاسی، دیاریکردنی سنوورێکی بەرچاو لە بەینی ئەم دوو چەمکەدا ئەستەم بووە.

بە گشتی بزاڤی چەپ بریتییە لە هەموو گرووپێکی ڕیفۆرمخواز* و شۆڕشگێڕی ئەم سەردەمە. واتە لیبراڵ و سۆسیالیست و ئانارشیست و کۆمۆنیستەکان کە لە باری ئایدیۆلۆجییەوە کەوتوونە ژێر ڕکێفەی ئەندێشەی نوێی پاش ڕێنێسانس. ئەندێشەگەلێکی وەك: ڕاسیۆنالیزم(بڕوا بە ئەقڵ) لە بەرامبەر بڕوای ئایینی، پێشکەوتن خوازی، یەکسان خوازی، دیموکراسی و ئازادی و مرۆڤ دۆستی. تایبەتمەندییەکانی چەپ بریتییەلە :

١ـ لایەنگری لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری بە مەبەستی دابینکردنی یەکسانی و لەناو بردنی جیاوازی چینایەتی و کورتکردنەوەی دەستی دەوڵەت لە کاروباری کۆمەڵایەتی و ئابووری.

٢ـ لایەنگری لە ئیمانی سەرزەمینی، واتە بڕوا هێنان بە پێشکەوتنی بێسنووری زانست و مرۆڤ و مێژوو لە بەرامبەر ئیمانی ئایینی و پەسلانی، ڕووهێنانە ئەقڵ و بەڵگاندن و بڕوای فەلسەفی نائایینی و دژەئایینی.

٣ـ لایەنگری لە ئینتەرناسیۆنالیزم لەبەری نیشتمان پەروەری و ناسیۆنالیزم*. بڕواهێنان بە هاوسانیی مرۆڤ و چارەنووسەکەی.

٤ـ لایەنگری لە شکاندنی ترادسیۆن و نەریتەکان و حەزکردن بە شۆڕش لەبری ڕیفۆرم خوازی و ئاراستەکردنی پلانی نوێی کۆمەڵایەتی بە پێی پێودانگی ئایدیۆلۆجی لەبری کۆنەپارێزی و کۆنەپەرستی، بڕواهێنان بە جەماوەر وەك تاکە سەرچاوەی هەقیقەت و دەسەڵاتی سیاسی.

زاراوەی **ڕاست** دەربارەی زنجیرە تیۆرییەکی سیاسی ئەدوێ کە لە بەرامبەر چەپ ڕادەوەستێ. لە ڕاستیدا باڵی ڕاست بۆ ناوبردە کردنی ئەو کەسانە بەکارهات کە بەرگرییان ئەکرد لە دەستێوەردان و ڕمبازێنی شۆڕشی فەرەنسە بۆ سەر دەزگاکانی پاشا. بە درێژایی سەدەی نۆزدە زاراوەی ڕاست بە مانای قەبووڵی دەسەڵات و سەرچاوەبوونی دەزگایەك یان کەسێك (دەوڵەت. کڵێسە، ڕێبەر) پێناسە کراوە. بڕواهێنان بە حوکمەتێکی زۆردار، موڵکدارییەتی، کڵێسە و بەهێزبوونی سپا. تایبەتمەندییەکانی باڵی ڕاست لە سەدەی نۆزدە بریتین لە:

١ـ ڕەوابینینی نابەرامبەریی کۆمەڵایەتی و جیاوازیی چینایەتی لە کۆمەڵگای سەرمایەداری لەبەرامبەر هێرشەکانی سۆشیالیزم.

٢ـ پشتیوانی و داکۆکی کردن لە دەزگا مێژینەکانی کۆمەڵگا وەك خێزان، کڵێسە و پاشا لە بەرامبەر هێرشی چەپەکان.

٣ـ لایەنگری توند لە ناسیۆنالیزم و بردنەسەرەوەی دەسەڵاتی نەتەوەیی و ڕێزگرتن لە کەلتور

PDF 4 KURD

نەتەوەیی و نەژادی لە بەرامبەر لاگیریی ئینتەرناسیۆنالیستی.

٤ـ داکۆکی کردن لە ئازادی سیاسی و ئابووری تاکەکەس لە بەرامبەر هەر گوشارێکی دەوڵەتدا.

ڕووداوەکانی دوای شەڕی جیهانی دووهەم بە تایبەت دزەکردنی ئایدیولۆجی نوێی سیاسی لە ئەوروپاوە بە ئاسیا و ئەفریقا، دەسەڵات و بزاڤگەلێکی سیاسی وای هێناوەتە کایەوە کە جیاکردنەوەی ڕەگەزەکانی ڕاست و چەپ لە یەکتر دژوار ئەکات. بۆ وێنە هەندێ لەم بزاڤ و حوکمەتانە لە لایەکەوە، لایەنێکی ناسیۆنالیستی بەهێزیان هەیە و لە لایەکی تریشەوە، زۆربەی دروشمەکانی چەپ دەڵێنەوە و خۆیان وەك شۆڕشگێڕێك لە قەڵەم ئەدەن و بانگەشەی پێشکەوتن و گەشەسەندن ئەکەن.

لەم ساڵانەی دواییدا زاراوەی ڕاست و چەپ بۆ پۆلێن بەندی ناوخۆیی حیزبەکان بەکار براوە. وەك چۆن لە حیزبی کۆنەپارێزی بەریتانیا، مەبەست لە باڵی چەپ ئەو کۆنەپارێزانەن کە هەندێ چەمکی چەپی وەك پلان دانانی ئابووری و بەربڵاوکردنی خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی و سەربەستی داگیرکراوەکانە. لە حیزبی کرێکاری ئەم وڵاتەش، مەبەست لە چەپ گەیشتن بە سۆشیالیزمە و لایەنگری لە ڕاست، بە واتای لیبراڵەکانی ئەو حیزبەیە.

## چەپی نوێ — چپ جدید — New left

ئەم لایەنگرییە سیاسیە لە ١٩٥٠ لە دوای دەرکەوتنی نارەزایەتی لە چەپی کۆن سەری هەڵدا. بە گشتی ئەم زاراوە دەرحەق بە کەسانێك یا ڕێکخراوەگەلێك بە کار براوە کە پەیرەوی ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی مارکسیزمی نوێ، سۆشیالیزم، سێندیکالیزم، ئانارشیزم و پاسیفیزم بن. لایەنگرانی سەرەکی ئەم بزاڤە، کۆمەڵی خوێندکاریی و ڕێکخراوە ڕەشپێستەکان بوون. ئەم بزاڤە بۆ دژایەتی کردن لە گەڵ تەشەنەدان بە شەڕی ڤێتنام، لە ساڵی ١٩٦٤ چالاکی زۆری لە خۆی نواند.

چەپی نوێ لە هەموو شوێنێکدا بزاڤێکی خوێندکاری بووە، بۆ وێنە ساڵەکانی ١٩٦٠ لە ئەمریکا و ڕووداوەکانی مانگی مەی ١٩٦٨ لە فەرەنسە و ئەڵمانیا.

## چەقبەستن/کۆجێیی — تمرکز — Centralization

مەبەست لە چەقبەستن، کۆبوونەوەی لە ڕادەبەدەری دەسەڵات و هێز لە دەستی چەندکەسێکی سەر بە گرووپێکی کۆمەڵایەتیدایە. زاراوەی چەقبەستن لە سەرەتای سەدەی ١٩ بە تایبەت لە فەرەنسە بۆ ناوبردە کردنی پرۆسەی زیادبوونی هێزە حوکومییەکان(حوکمەتە سیاسییە ناوچەییەکان) بەکار براوە. ئەم زاراوە زیاتر، لە لایەن دۆتۆکویل، بڵاو بۆتەوە.

لە هەمبەر چەقبەستندا زاراوەی چەق سڕینەوە (decentralization) هاتۆتە ئاراوە کە بە مانای دابەزاندنی ئاستی کۆجێیی دەسەڵات بە نزمترین پلە پێناسە کراوە. چەقبەستن، پتر واتایەکی سووکایەتی ئامێزی لە خۆ گرتووە بەڵام چەق سڕینەوە وەك چەمکێکی پۆزەتیڤ پێناسە کراوە.

PDF 4 KURD

## چەك داماڵین — خلع سلاح — Disarmament

کەمکردنـەوە و لـەناوبردنی چـەك و تەقەمـەنی یـان کـۆنترۆڵی ئـامێری جـەنگی و کەمکردنـەوەی هێـزی سەربازی بە مەبەستی داشکاندنی مەترسی شەڕ و زیابوونی ئاسایش و هێمنایـەتی نێونەتـەوەیی. لە بابـەت چەك داماڵینی هەمەلایەن و گشتگیر، لە مێژە باس و کۆڵینەوە کراوە. یەکەم جار لە «کۆمـەڵی نەتـەوەکان» لە ساڵەکانی ٣٤- ١٩٢٧ و پاشـان لـە «ڕێکخـراوەی نەتـەوە یـەکگرتووەکان» بـەڵام هیچـکامیان نـەیانتوانی ئـەم کێشە چارەسەر بکەن. پاش شەڕی یەکەم و دووهەمی جیهانی و بە هۆی ئەو کارەساتانەی کە لە جیهان ڕوویاندا بە تایبەت، پاش دروستکردنی چەکی ناوەکی هەوڵ و دەوڵی نێونەتەوەیی بۆ ئەم مەبەستە زیاتر پەرەی سەند و ئەمەش وایکرد کە لایەنگرانی چەك داماڵین بە خێرایی کۆببنەوە و بڕیاری گرنگ دەربکەن و بە کردەوەش هەنگاوی بەرچاوی بۆ بنێن. بۆ وێنە پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری (ناتۆ) لە ساڵی ١٩٤٣ بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی لەبار بۆ ئەم مەسەلە چەن هەنگاوێکی هەڵگرت.

پرۆسەی داماڵینی چەك، ڕەنگە بە شێوەی یەکلایەنە، دوولایەنە و چەندلایەنە یان پـاژەکی و گشـتی بێـت. لە سیستەمە سیاسییەکانی هاوچەرخدا چەك داماڵین، بەدوای شکست هێنانی لایەنێکی شەڕ دێتە ئاراوە و دەوڵەتی سەرکەوتووی شەڕەکە دەست ئەکا بە داماڵینی چەکی لایەنی دۆڕاو.

پێویستە بگوترێ کە چەك داماڵین، خۆبەخۆ نابێتە هۆی دابەزاندنی مشتومڕ و کێشە. ناکۆکی مەسـەلەکە لەوەدایە کە پرۆسەی داماڵینی چەك کە بۆ نزمکردنـەوەی کێبـەرکێی چـەك و تەقەمـەنی دێتـە کایـەوە، هەندێ جار خـۆی دەبێتـە هـۆی کێشە و ململانێ. چاودێری کـردن بـە سـەر پرۆسـەی چـەك دامـاڵین پێویسـتی بـە بەڕێوەبەرایەتییەکی ناوەندگەرای بەهێزە.

## چین — طبقه — Class

چین، بەو کۆمەڵە خەڵکانە ئەڵێن کە لە چەند ئەندام پێکهاتوون و هەر یەکە بە پێی جێگا و شوێنی خۆی لە سیستەمی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتی و ئابووری لەوانی تر جیا دەبێتەوە. بە واتایەکیتر، چین بریتییە لە بەگرووپ کردن یا دیاریکردنی شوێنکات و هەڵوێستی تاکەکان بە پێی هایراکی کۆمەڵایەتی کە لە سـەر بنەمای پێوەندی ئابووری لە کۆمەڵگا دابەش بووبێت. ئەگەرچی جەماوەر، ئەغڵەب چینەکانی کۆمـەڵگا بـە دوو چینی سەرمایەدار و هەژار دابەش ئەکات بەڵام بەکاربردنی ئەم زاراوە، بۆچوونی جیاوازی لێبۆتـەوە کە ئەگەڕێتەوە بۆ شێوازی موڵکدارێتی ئابووری، نەك تەنیا ڕادەی بەهرەداری لە سەروەت و دارایی. مارکس، کە لە سەدەی نۆزدە بەردی بناخەی بیرۆکەی چینایەتی دانا، پێی وابوو کە لە دوای پەیدابوونی پیشەسازی، دوو چینی سەرەکی لەدایك ئەبێ: یەکەم، بۆرژوازی* یا چینی سـەرمایەدار کە خـەڵك بە ئیشـەوە سـەرقاڵ ئەکات. دووهەم، پرۆڵتاریا* یا چینی *کرێکاری بێ سەروەت و سامان.*

لێکدانـەوەی زاراوەی چـین، سـێ تـەوەری جیـاواز لـەخۆ دەگـرێ : دەرفـەتی کۆمەڵایـەتی، شـوناس و سیاسـەت. یەکـەم، ئـەم پرسـیارە دێنێتـە ئاراوە کە ئایا ئەندامانی چینە جۆراوجۆرەکان، بۆ گەشەکردن لە

PDF 4 KURD

کۆمەڵگا، لەگەڵ دەرفەتی نایەکسان بەرەورۆون؟ ( بۆ وێنە لە دەزگا پەروەردەییەکان یا لە مەیدانی ئیش و کار) یا لە ژیانی رۆژانەی خۆیان لە گەڵ رەفتاری رەگەزپەرستانە بەرەورۆو دەبنەوە؟ دووهەم، ئایا ئەندامانی چینەکان، شوناس گەلی تایبەتی هاوبەشیان هەیە؟(بۆ وێنە خودناسین، روانگەی کەلتووری یا شێوازە کۆمەلایەتییەکان). سێهەم، ئایا ئەندامانی چینەکان ئارەزووی سیاسی هاوبەشیان هەیە و لە پێناو گۆرانکاری کۆمەلایەتی پێکەوە هاوکاری یەکتر ئەکەن؟ مارکس، بۆ هەر سێ پرسیارەکە وەلامی ئەرێ ئەداتەوە. بەلام پێی‌وابوو کە سەرەنجام چینە ژێردەستەکان هەست بە هەژاری و چەوساوەیی خۆیان ئەکەن و بە «وشیاری چینایەتی» ئەگەن.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم کۆمەڵناسی ئەڵمانی، ماکس ڤیبەر، بۆچوونەکانی مارکسی رەت کردەوە. ڤیبەر ئەم بۆچوونەی مارکسی بەلاوە گران هات کە کۆمەڵگا تەنیا لە دوو چینی سەرمایەدار و کرێکار پێکهاتبێت! لە لایەکی‌ترەوە، ئەو پێی وابوو کە ئەو گرووپە هاوکووفانەی کە تەنیا بە پێی شێوازی ژیانیی هاوبەش پێك دێن، بە نیسبەت چینەکان باشتر ئەتوانن کاریگەریی دابنێن بە سەر ئینتیما دەروونییەکان. ڤیبەر، دەولەت وەك هێزێکی چالاکی کۆمەلایەتی ناوبردە ئەکات کە تێیدا کاربەدەستان و حیزبە سیاسییەکان لە سەر دەسەلات مشتومریانە. کەچی مارکس، دەولەت وەك گۆرەپانێکی بێ‌لایەن بۆ خەباتی چینەکان لە قەڵەم ئەدا.

ئێستاکە جگە لەو پۆلێن بەندییە کلاسیکەی چین، جیاواز لە چینی مامناوەندی، چەندین چینی دیکەی کۆمەلایەتی سەریان هەڵداوە کە ئەکرێ بەم جۆرە ناوبردە کرێن: پسپۆرانی پیشەیی، بەرێوەبەرانی ناوەندی و خاوەن پیشەی بچووکی ئازاد.

## چینی میانە/چینی مامناوەندی طبقـه متوسـط Middle class

چینی بورژوا، لە باری مێژووییەوە بە چینی میانە ناوی دەرکردووە. لە سیستەمی سەرمایەداریدا نێوان چینی سەرمایەدار و کرێکار، دوو گرووپی بەرفراوانی کۆمەلایەتی سەری هەڵداوە: گرووپی یەکەم بریتییەلە، خەڵکانی بازرگان، مامەڵەچی، دوکاندار، خاوەن دەزگای بچووکی ئابووری و بەرهەمهێنی سەربەخۆ. گرووپی دووهەم بریتییەلە: خەڵکانی خوێندەوار، ئەندازیار، پزیشك، ماف پەروەر، مامۆستای زانکۆ، فێرکار، خوێندکار، کارمەند و مووچەخۆر. ئەم دوو گرووپە بە چینی میانە یان چینی وردە بورژوا پێناسە کراون. (بروانە وردە بورژوازی)

مارکسییەکان ئەم گرووپانە لە باری عیلاقاتی سیاسییەوە بە دوو گرووپی دیکە دابەش دەکەن: یەکەم، توێژی بالای چینی میانە کە لە ژیانێکی خۆش بەهرەمەندە و لە بەریانی خەباتی چینایەتیدا دەچێتە بەرەی سەرمایەدار و تاقمی دەسەلاتدارەوە. دووهەم، توێژی خوارووی چینی میانە کە بە هۆی لەدەستدانی ئیمتیازەکانی، خۆی ئەخاتە پاڵ چینی پرۆلتاریا. کەواتە توێژی بالای چینی میانە، لە ماهییەتی سیاسیدا کۆنەپەرست لە ئەژمار دێ و توێژی خواروو، شۆرشگێر.

PDF 4 KURD

## ح

**حوکمەت/میریی** حکومت Government

وشــەکە بــە مانــای فــەرمانڕەوایی و حــوکم کردنــە بــەڵام لــە زاراوەی سیاســیدا بریتییــە لــە کۆمەڵــە ڕێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتی کە بۆ دیاریکردنی پێوەندی چینە کۆمەڵایەتییەکان و پاراستنی سامانی کۆمەڵگا بەدی دێت. چەمکی حوکمەت بە نیسبەت دەوڵەت، چەمکێکی عەینی و بەرچاوترە. ئەرکە سەرەکییەکانی حوکمەت، دانانی یاسا و پیادەکردنییانە. جیاواز لەمانەش حوکمەت و دەزگا حوکومییەکان، ئەرکی پەرەسەندن و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتییان لە ئەستۆدایە.

ڕێکخراوە حوکومییەکان، لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا بەدی ناکرێن چونکا ئەم جۆرە کۆمەڵگایە بە هۆی تێك تەنراوی و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی، بێ ڕێوشوێنی ڕێکخراوە یان کەسێکی تایبەت ڕەفتار ئەکات. کۆمەڵگای سەرەتایی لە بەر ئەم هۆیانەی خوارەوە پێویستی بە حوکمەت نەبووە:

١ـ گرووپێکی بچووکە.

٢ـ خاوەنداریەتی گشتی لە ئارادا نەبووە.

٣ـ کۆنەپەرست بووە.

بەڵام حوکمەت لەم چاخەدا جیاوازە و ڕۆژبەڕۆژ بەرەو ئاڵۆزبوونی زیاتر ئەچێت و ئەرك و تەوزیمی گەورە و بەربڵاوی لێ زیاد بووە. لەم بارەوە سێ هۆکار دەور ئەبینن کە بریتین لە:

**١ـ بەرفراوانی خاك و زێد:** بە هۆی زیادکردنی قەڵەمڕەوی هەندێ لە دەوڵەتەکان و یەکگرتنی نەتەوەی جۆراوجۆر لە وڵاتەکەدا دەوڵەتانێکی بەرفراوان دروست بوون.

**٢ـ ئاڵۆز بوونی ژیانی کۆمەڵایەتی:** ئیمڕۆکە، ئەو دەوڵەتانەی کە تەنیا لە یەك نەتەوە پێکهاتبن واتە کۆمەڵگایەکی هاوکووفیان ببێت کە خاوەنی بەرژەوەندی و زمان و مێژووی هاوبەش بێت بە دەگمەن هەڵدەکەون. هەندێ لەم دەوڵەتە تازەپیاکەوتووانە، خەڵکانێکی زۆریان لە خۆ گرتووە کە لە باری ڕەگەزی و ئەتنیکی و ئاینییەوە، جیاوازی زۆریان پێکەوە هەیە.

**٣ـ گۆڕانی هەمیشەیی:** کۆمەڵگای ئەم سەردەمە، لە سێبەری تەکنۆلۆجیەوە هەمیشە لە حاڵی گۆڕان و نوێ بوونەوەدایە و ئەم تازەبوونەوە بۆ حوکمەتەکان ئەستەم و دژوارە.

ئەم هۆکارانە بۆتە هۆی ئەوەیکە ئەرکی دەوڵەتەکان لە بەرامبەر کیشەکان ئەستەم بێت، بە چەشنێك کە حوکمەتانی ئەم سەردەمە ناتوانن وەك حوکمەتەکانی پێشوو بە سانایی ژیانی خەڵك خۆش بکەن و ئاسایشی کۆمەڵگا مسۆگەر بکەن. یەکێك لەو مەترسییانەی کە ڕێوشوێنی کۆمەڵایەتی لە دەوڵەت ئەشێوێنێ، شۆڕش و لادان لە داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانە. لەم ڕووەوە بە هۆی ئاڵۆزیی کاروباری حوکمەتی ئەم سەردەمە، ژمارەی ڕێکخراوە و بەڕێوەبەرانی دامودەزگا ئیداریەکان ڕوو لە زیادبوونە و

PDF 4 KURD

کۆمەڵگا بۆتە دیلێکی بەر دەستی بۆرۆکراسییەتەوە.

چەمکی حوکمەت ئەگەر لە گەڵ ئاوەڵناوێك بەکار ببرێت، ئەوە بۆ دیاریکردنی جۆری رژێمی سیاسیە. بۆ وێنە: حوکمەتی پەرلەمانی و حوکمەتی دیموکراسی. «حوکمەتی قانوونی»، بە پێی ماناکەی، نوێنەری «خواستی گشتی»یە و بەڕێوەبەری ئەم خواستانەیە بە پێی رێوشوێنەکانی دەستوور. بەم بۆنەوە تا ئەو کاتە حوکمەت «قانوونی» لە ئەژماردێت کە رەفتارەکانی لە گەڵ خواستی گشتیدا یەك بگرێتەوە ئەگینا ئەبێتە حوکمەتێکی دیکتاتۆری*.

لە روانگەی یاسای نێودەوڵەتی و پێوەندی نێوان وڵاتەکان، واقیعی حوکمەت ئەوەیە کە دەسەڵاتی راستەقینە بە دەست چ کەسانێك یا گرووپێکەوەیە. ئەغلەب پێوادانگی راستەقینە بۆ ناوبردەکردنی حوکمەتێك لایەنی واقعی شتەکەیە تاکوو لایەنی قانوونییەکەی. واتە لە گەڵ خواستی گشتیدا یەك بخوێنێتەوە. بەڵام هەندێ جار بۆ وێنە لە کاتی راپەڕین یان شۆڕش لە وڵاتێك، هەندێ لە دەوڵەتەکان رێکخراوە یان **دەوڵەتی ئازاد*** یان **دەوڵەتی کاتی*** وەك دەوڵەتی قانوونی، بە رەسمییەت ئەناسن نەك دەزگای حاکمێك کە بە هۆی پێشێلکردنی خواستی گشتی بە نایاسایی ناوی دەرکردووە.

### حوکمەتی پیران/پیر مەزنایەتی پیرسالاری/حکومت سالخوردگان Gerontocracy

حوکمەتێك کە تێیدا کاروباری وڵات بسپێردرێتە دەست بەساڵاچوانی دنیادیدەی زانا و بەئەزموون. ئەم تیۆرییە لە پێنجسەد ساڵ پێش زایینەوە کەمتاکورتێك لایەنگری خۆی هەبووە چونکە لایەنگرانی ئەم رێبازە، لاوان، بە کاڵفام و شەرهەڵایسێن دەزانن هەربۆیە پیرانی زانا بۆ بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگا بە شایستەتر دەزانن.

### حوکمەتی دەستووری حکومت مشروطه Constitutional government

بە رژێمێکی سیاسی دەگوترێ کە بەستێنی دەسەڵاتەکەی بە پێی بەربەستی قانوونی بەرتەسك کرابێتەوە. لەم رووەوە لە بەرامبەر حوکمەتی ئیستبدادی و دیکتاتۆریدا حوکمەتی دەستووری دێتە ئاراوە. بە واتایەکی تر، حوکمەتی دەستووری لە گەڵ حوکمەتی قانوونی بە یەك مانا لێکدراونەتەوە. قانوون بریتییە لە کۆمەڵێ بنەما و پرەنسیپ کە لە لایەکەوە سنووری کردەوەی تاك و کۆمەڵ دیاری ئەکات و لە لایەکیتریشەوە ئاستی بەکارهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەت سنووردار ئەکات. هێنانە کایەی پێوەندییەکی قانوونی لە نێوان حوکمەت و هاووڵاتیان و پابەندیی هەردوولا بە قانوون، لە مەرجە سەرەکییەکانی حوکمەتی دەستووری لە ئەژمار دێت. زاراوەی «ئازادییەکانی تاك» و «جیاکردنەوەی هێزەکان» * یەکێکیتر لە لایەنە سەرەکییەکانی ئەم جۆرە حوکمەتەیە.

لە بەرئەوەی ئەم حوکمەتە سیستەمێکی قانوونییە و بنەماکانی بە پێی یاسا دامەزراوە، لە گەڵ پەرلەمان و پەرلەمانتاری هاوشێوە دەنوێنن. حوکمەتی دەستووری، بە دوو شێوازی جودا هاتۆتە کایەوە: یەك

PDF 4 KURD

کۆماریی. دووهەم، پاشایەتی. بیرۆکەی حوکمەتی دەستووری لە بنەڕەتەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ بزووتنەوەی ئازادیخوازی(لیبرالیزم)*.

**حوکمەتی سەربازیی** حکومت نظامی Martial law

بریتییە لە پیادەکردنی دەسەلات و کۆنتڕۆڵی سەربازی و سوپایی دەوڵەتێك بەرامبەر بە کەسانی مەدەنی لە وڵاتێك لە کاتی شەڕ یان تەنگەتاوی. لە کاتی جێگیربوونی ئەم حوکمەتە لەبری فرمان و دەستووری مەدەنی، فەرمانەکانی هێزی سەربازیی پیادە ئەکرێ و دادگا مەدەنیەکانیش جێی خۆی ئەدا بە دادگای سەربازی.

**حوکمەتی هەرێم** حکومت محلی Local Government

حوکمەتی هەرێم یان حوکمەتی هەرێمی، پێکهاتەیەکە لە یەکەیەکی تایبەت بۆ وێنە شارۆچکە، شار یان هەرێمێك کە تا رادەیەکی زۆر بۆ خۆی سەرپشك بێت و بۆ راپەڕاندنی کاروباری ناوچەکە سەربەخۆییەکی کەمتازۆری هەبێت. خەڵکی ئەم ناوچە خۆیان بە دانانی یاسا ـ بەو مەرجەی لەگەڵ یاساکانی وڵات تەبا بێت ـ کاروباری هەرێمەکە بەڕێوە دەبەن. نموونەی ئەم جۆرە حکومەتە، هەرێمی کوردستانی عێراقە کە لە ساڵی ١٩٩١ بەملاوە، بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەسەڵاتی بە دەستەوەیە.

**حەماس** حماس Hamas

ئەم زاراوە کورتکراوەی «حرکە المقاومە الاسلامی»یە کە بە بزاوتی خۆڕاگری ئیسلامی خەڵکی فەلەستین ناوی دەرکردووە و بۆ ئازادکردنی هەموو خاکە داگیرکراوەکانی فەلەستین لە دەستی رژێمی ئیسرائیل خەبات ئەکات. حەماس لە رێکەوتی ١٥ ی دێسەمبەری ١٩٨٧ بە رێبەرایەتی شێخ ئەحمەد یاسین، بە شێوەیەکی رەسمی بوونی خۆی لە بەیاننامەیەکدا راگەیاند. حەماس دوابەدوای زیندانی کرانی زۆربەی ئەندامانی چالاکی خۆی لە لایەن ئیسرائیلەوە، لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٠ لقی چەکداریی خۆی بە ناوی هێزی شێخ عێزەدین قەسسام راگەیاند. ئەم رێکخراوە پێی وایە کە مەترسیدارترین پلانی ئاشتی کە تا ئێستا هاتۆتە ئاراوە، رێککەوتننامەی «غەززە ـ ئەریحا»یە کە لە رێکەوتی ١٣ی سێپتەمبەری ١٩٩٣ لە نێوان رژێمی ئیسرائیل و رێبەرایەتی رێکخراوەی رزگاریخوازی فەلەستین لە واشنتۆن واژۆ کرا. چونکا لەم رێککەوتنەدا ئیسرائیل لە خاکە داگیرکراوەکان بە رەسمییەت دەناسرێ و پێوەندی وڵاتانی عەرەب لە گەڵ ئیسرائیل هێور دەکرێتەوە.

لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی پازدەی ژانوییەی ٢٠٠٦ حەماس، توانی لە سەرجەم ١٣٢ کورسی، ٧٢ کورسی بباتەوە و بەم جۆرە دەوڵەتی نوێی فەلەستینیەکان دابمەزرێنێ. لەم ساڵانەی دواییدا ناکۆکی نێوان حەماس و رێکخراوی فەتح* رووی لە زیادبوون بووە و جاری واش هەبووە کێشەکانیان ئاکامی چەکداری

PDF 4 KURD

شەڕی لێ کەوتۆتەوە ئەمەش هەر دێتوو پرۆسەی ئاشتی نێوان ئیسراییل و عەرەبان ئالۆزتر و درێژخایەن تر دەکاتەوە.

دوابەدوای سەرکەوتنی حەماس ئیسراییل و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، یارمەتییەکانی خۆیان بۆ خەڵکی فەلەستین راوەستاند و ئیسراییل بۆ پێوەندی گرتن لە گەڵ حوکمەتی فەلەستینی، سێ مەرجی دیاری کرد کە بریتی بوون لە:

- دەبێ لقی چەکداریی حەماس چەك بکرێت واتە خۆی لە چەك داماڵێ.
- مادەی «لەناوبردنی ئیسراییل» لە پلاتفۆرمی حەماسدا نەمێنێ.
- هەموو رێککەوتنەکانی نێوان حوکمەتی فەلەستینی و ئیسراییل بەهەند بگرێت.

## حیزب/ پارت حزب Party

رێکخراوەیەکی سیاسییە کە تێیدا هاوبیران و لایەنگرانی ئارمانجێك بە شێوەیەکی ئارەزومەندانە لە دەوری یەك کۆدەکاتەوە. ئەم رێکخراوە وشیارترین کەسەکانی چین و توێژێك لە خۆ دەگرێ کە بە پێی بەرژەوەندییەکی هاوبەش خڕ دەبنەوە. لە پێناسەیەکی تردا حیزبی سیاسی بە رێکخراوەیەك دەگوترێ کە ئامانجی گەیشتن بە دەسەڵاتێکی رەوایە بە سەر حوکمەتدا لە رێی پرۆسەی هەڵبژاردنەوە.

**کورتە مێژوویەکی حیزبایەتی:** حیزبە سیاسیەکان هاوکات لە گەڵ رێورەسمی هەڵبژاردن و پەرلەمان هاتنە کایەوە و پەرەیان سەند. لە سەرەتادا بە ناوی کۆمیتەی هەڵبژاردن خۆیان دەرخست و ئەرکەکەیان سپاردنی سەرپەرشتی کردنی پیاوماقووڵان بوو بە دەست پاڵێوراوێك و کۆ کردنەوەی پارەی پێویست بۆ رکەبەرایەتی لە هەڵبژاردندا. ئینجا لە قەوارەی کۆمەڵی یاسادانان و گرووپی پەرلەمانیدا لە گەڵ نوێنەرانی لایەنێکی سیاسی یەك دەکەوتن. ئەم نزیکایەتیەی نوێنەران لە ئاستێکی باڵادا بووە هۆی پێکهاتنێکی سیاسی کە ئەم پێکهاتنە، یەکەمین حیزبە سیاسییەکانی بەدی هێنا.

سەرهەڵدانی حیزبەکان بووە هۆی پەرەسەندنی هەڵبژاردن و پەرلەمان. لە ناوەراستی سەدەی نۆزدە حیزبەکان وەك کۆبوونەوەی دەستە و گرووپە سیاسییەکان، شێوازێکی فەرمییان بەخۆوەگرت و لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان گەشەیان کرد. ئینجا کۆبوونەوەی کەسانی هاوبیر لە زۆربەی شوێنەکانی جیهان لە سەر شێوازی حیزب پەرەی سەند. لە ئەنجامدا حیزب بووە شوێنی کۆبوونەوەی رووناکبیران و ریفۆرمخوازانی کۆمەڵگا. لەم سەردەمەشدا حیزبی راستەقینە مەکۆی کەسانێکە کە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی جەماوەر و دابینکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە شێوەیەکی هاوبەش تێدەکۆشن.

لە بابەت ئەوەی لە وڵاتاندا سیستەمی تاك حیزبی یا فرەحیزبی لە ئارادا بێت بۆچوونی جیاواز هەیە: هەندێ کەس سیستەمی فرەحیزبی لە وڵاتێکدا بە نیشانەی ئازادی و دیموکراسی دەزانن و لەو باوەڕەدان کە چالاکی حیزبی جۆراوجۆر و پەرەسەندنی بیروبۆچوونی جیاواز، رەوتی چاکسازی کۆمەڵایەتی خێراتر دەکات. هەندێکیش لەو باوەڕەدان کە کۆبوونەوەی لایەنگرانی یەك رێباز لە حیزبێکدا بە قازانجی کۆمەڵگا

PDF 4 KURD

تەواو دەبێت چونکا بە رووخستنی ڕێبازی ڕاست و ڕەوا، گۆڕانکارییەکی باشتر بە ئەنجام ئەگات و هەر جۆرە ناکۆکی و ناتەباییەك لە ناو دەبات.

بە گشتی سەرهەڵدان و بەهێزبوونی حیزبەکان، پەیوەستە بە پاوەجێبوونی دیموکراسی واتە بەخشینی مافی دەنگدان بە خەڵك و سەقامگیربوونی پەرلەمان لە وڵاتێکدا. لە ڕژێمێکی پادشایی و سوڵتانیدا کە حوکمەتەکەی لە سەر بنەمایەکی کۆنباو دامەزراوە، حیزب و حیزبایەتی هیچ بایەخێکیان نییە.

هەندێ لە پێناسەکانی حیزب ئیمڕۆکە لە سەر بابەتی پاڵنەر و هاندەرەکانی دەسەڵاتی حیزبەکان جەخت ئەکەن. لەم ڕوانگەوە حیزب بریتیەلە دەزگایەك کە تەواوکەری حوکمەت و یارمەتیدەری دەنگدەران لە کاتی هەڵبژاردنی بەرپرسان لە ئەژمار دێت.

ڕێکخستنی حیزبێك، پێویستی بەم مەرجانەی خوارەوە هەیە:

١- پرۆگرام(مەرامنامە): بریتیە لە کۆمەڵێك ڕێوشوێنی سەرەکی حیزب کە هەموو ئامانج و ئەرکەکانی حیزبی تیا دیاری کراوە. لە پرۆگرامدا ڕێوشوێنی وەرچەرخانی بوێرانە و شێوازەکانی گەیشتن بە ئامانجەکان دیاری ئەکرێت بۆ وێنە لە بابەت پیشەسازی کشت و کاڵ و کاروباری کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و پێشکەوتنەوە، ڕێوشوێنی تایبەت دیاری ئەکرێت.

٢- پێڕەونامە: کۆمەڵە ڕێسایەکی ناوخۆیی حیزبە کە تێیدا چۆنیەتی پێکهاتنی ڕێبەرایەتی و دەزگا حیزبییەکان و کۆنگرە و دانیشتنەکانی حیزب ڕوون کراوەتەوە.

٣- کۆنگرە: بەرزترین پلەی ڕێبەرایەتی حیزبە و لە نوێنەری هەموو ناوچە و ڕێکخراوە حیزبییەکان پێك دێت. لە کۆنگرەدا ڕاپۆرتی سەرۆك یا سکرتێری گشتی حیزب دەخوێندرێتەوە و باس لە چالاکی و پێڕۆی تازەی حیزب ئەکرێت. پاشان ئەندامانی ڕێبەرایەتی حیزب، سەرۆك و سکرتێری گشتی و ڕاوێژکار و پشکنەران هەڵدەبژێرن.

٤- کۆمیتەی ناوەندی: بریتییەلە ئەندامانی هەمیشەیی و هەڵبژێردراوی حیزب کە لە نێوان دوو کۆنگرە کاروباری حیزب بەڕێوە ئەبەن و بەرپرسی کۆنگرەیە.

٥- ڕێبەرایەتی: ڕێبەرایەتی بە کۆمەڵ لە ناو حیزبدا جگە لەوەیکە ئەبێتە بەربەستێك لە بەردەم تاکڕەویی و خۆداسەپاندن بە سەر حیزبدا بەڕێوەبردنی ئەرکە حیزبییەکان و ڕێبەرایەتی کردنیش بە چاکترین شێواز بە ئەنجام ئەگات.

٦- کادێر: بە مانای کارمەندی شارەزایە. بوونی کادێری پیر و لاو لە ڕیزەکانی حیزبدا بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی حیزب زۆر پێویستە.

٧- پلۆنۆم*: کۆبوونەوەیەکی گشتییە کە هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و ڕاوێژکاران بەشداریی تێدا ئەکەن و کێشە گرنگەکان ئەخرێنە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

٨- کۆنفرانس: کۆبوونەوەی نوێنەرانی حیزبە بۆ بیرورا گۆڕینەوە لە مەڕ بابەتی جۆراوجۆری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و هونەری.

PDF 4 KURD

٩ــ دروشمی حیزبی: دروشم، بریتییە لە پەیام یان دەستەواژەیەکی کورت و مانادار و بەڕێوجێ کە حیزبێك لە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژوویی ئەیکاتە مەبەست بۆ کێشەیەکی گرنگ و بانگەشەی بۆ دەکات. ئەکرێ دروشم یان سیاسی و ئابووری بێت یا ستراتیجیکی و تەکتیکی.

١٠ــ دانیشتن(میتینگ): بە واتای دانیشتنێکی چڕوپڕە بۆ باس و لێکۆڵینەوە لە سەر کێشە یان ڕووداوێکی سیاسی. ئەم زاراوە هەروەها بە مانای کۆبوونەوەی حەشیمەتێکە بۆ گوێگرتن بە وتاری وتەبێژێکی حیزبی لە مەڕ کێشەیەك یان ڕووداوێکی سیاسی.

## حیزبایەتی فاکسیونالیسم/تحزب Factionalism

فاکسیۆن بە مانای حیزبە و ئەم زاراوە لە لایەن جۆرج واشینتۆن لە سەرەتای سەربەخۆیی ئەمریکا، لەبری حیزب بەکار براوە. فاکسیۆنالیزم بە واتای حیزب خوازی یە و بڕوا بەوەی کە بوونی حیزبی سیاسی پێویستە و دەبێ بنەمای حوکمەت و دەوڵەت لەسەر حیزبایەتی دامەزرێت. ئیمڕۆکە حیزبایەتی، بەشێکی جیانەکراوەیە لە ناوەڕۆکی حوکمەتە دیموکراسی و پەرلەمانییەکان کەچی فاشیزم و کۆمۆنیزم، حیزبایەتی و فرەحیزبی ڕەت دەکەنەوە چوونکە بڕوایان بە سیستەمی تاك حیزبی هەیە.

PDF 4 KURD

# خ

**خزمخوازی /خزم خزمینە** خویشاوندپروری / پارتی بازی Nepotism

نێپوتیزم یا خزمخوازی و خزم خزمینە، لە وشەی ئیتالی nepotismo بە واتای «لایەنگری لە ئامۆزاکان» وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە هێنانەسەرکاری خزم و عەشیرە بۆ کاروباری گشتی یان ماف تایبەت قایل بوون بۆ ئەوان و پشتگیری کردنیان بۆ بەخشینی پلە و پایەی ئیداری و سیاسی. ئەم ئاکارە زەمینە بۆ گەندەڵی سیاسی خۆش ئەکات.

**خۆماڵیکردن** ملی کردن Nationalization

دەست بەسەراگرتنی دەوڵەت بەسەر موڵك و ماڵ و داراییەك كە پێشتر لە لایەن كۆمپانی یا كەسانێكی بێگانەوە قۆرخ كرابێت. ئەم زاراوە هاوواتایە لە گەڵ زاراوەگەلێكی وەك «بەكۆمەڵ كردن» و «خاوەندارێتی گشتی» و «خاوەندارێتی دەوڵەتی». «خاوەندارێتی نەتەوەیی» لە بەرامبەر «خاوەندارێتی تایبەتی»دا دێتە ئاراوە. خۆماڵیكردن لە نەریتی ئیدارەی وڵات بریتییە لە گواستنەوەی خاوەندارێتی هەموو ئامرازەكانی بەرهەمهێنان و دامودەزگاكانی بەشی تایبەت بۆ دەوڵەت یا بەرگریكردن لە هاووڵاتیان و نارەزایی دەربڕین بەرامبەر كەمتەرخەمی بەشی تایبەت بۆ بەرژەوەندییە نەتەوەییەكان. بە كەڵك وەرگرتن لەم شێوازە بانكەكان، كارگەكان، دامودەزگا پرسوودەكانی كەرتی تایبەت، تەنانەت رووبار و دارستان و زەوی و زار و كانزاكان دەكەونە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت و دامودەزگا دەوڵەتییەكان. لەم رووەوە خۆماڵیكردن دوو بنەمای سەرەكی لەخۆ دەگرێ: یەكەم، گۆڕانی خاوەندارێتی تایبەتی بۆ خاوەندارێتی گشتی و دووەم، دەسبەسەراگرتن و كەڵك وەرگرتن لە داراییە نەتەوەییەكان بە قازانجی كۆمەڵگا واتە كۆنترۆڵی نەتەوەیی.

رژێمە شۆڕشگێرە سۆشیالیستییەكان، خۆماڵیكردن، دەكەنە ئامانجێكی سەرەكی خۆیان بۆ لەناوبردنی خاوەندارێتی تایبەتی بەسەر ئامرازەكانی بەرهەمهێناندا. لە نێوان ئەو رژێمانەش كە خاوەنی ئابوورییەكی ئازادن بە تایبەت پاش جەنگی جیهانی دووهەم، خۆماڵیكردنی هەندێ پیشەسازی و خزمەتگوزاری بە قازانجی گشتی رەواجی پێدرا. هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپی، هێڵی ئاسن و وزەی كارەبا و كانزای بەردەخەڵووز و پیشەسازی پۆڵایان خۆماڵی كردووە.

خۆماڵیكردن زاراوەیەكی نوێباوە و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەیەك لەمەوبەر كە ئەویش لە ژێر كاریگەریی بزووتنەوە ئابووری و كۆمەڵایەتییەكاندا گەشەی كردووە بەڵام لەم چەن دەساڵانەی دواییدا یەكلاكراوەتەوە. بە درێژایی ئەم سەدەیە جگە لە پاڵنەری ئابووری و كۆمەڵایەتی، هەندێ فەلسەفەی سیاسی و ئەخلاقیش كاریگەرییان داناوە لەسەر ئەم چەمكە و لایەنگرانی ئەم شێوازە ئەم بیرۆكەیان تەشەنە پێداوە كە خۆماڵیكردنی ئامرازەكانی بەرهەمهێنان جگە لە دابینكردنی پێداویستیە مادییەكانی مرۆڤ، دامودەزگا

PDF 4 KURD

کۆمەڵگاش لە سەر بنەمای عەدالەت و یەکسانی دادەمەزرێنێت کە ئەمەش دەبێتە ڕێگرێک لە بەردەم جیاوازی چینایەتی و بەرگریکردن لە چەوساندنەوەی مرۆڤ و گەیشتن بە ئاشتی.

**خۆیبوون** خويبون Xoybun

دوای تێکشکانی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥ و توندو تیژی کاربەدەستانی تورک بەدژی گەلی کورد، هەندێ لە نیشتمان پەروەرانی کورد، خۆکەوتن و لە ساڵی ١٩٢٧ لە ناوچەی ئارارات کۆبوونەوە و بە ئامادەبوونی هەموو ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردی ئەو سەردەمە، کۆنگرەیەکیان بەرپا کرد. ئەم کۆنگرەیە سەرەنجام لە ٥ ی ئۆکتۆبەری هەمان ساڵ بە کۆمەڵەی خۆیبوون ناوی دەرکرد و هەموو ڕێکخراوەکانی پێشوو هەڵوەشێندرایەوە و ئیحسان نووری پاشا بە سەرۆکایەتی هەڵبژێردرا و کۆماری ئارارات دامەزرا.

گرنگترین ئامانجەکانی خۆیبوون بریتییەلە:

- درێژە پێدان بە خەبات بە دژی تورکان تاکوو دوا سەربازی تورک خاکی کوردستان بە جێ دەهێڵێ.
- ڕێکخستنی هێزی سەربازی بە ئامرازی جەنگی نوێ وە.
- دروستکردنی پێوەندی برایانە لە گەڵ حوکمەتی ئێران، عێراق و سووریا.

سەرەنجام کۆماری ئارارات لە ساڵی ١٩٣١ بە هێرشی دوولایەنەی ئێران و تورکیا تێك شکا و مەیدانی چالاکیی خۆیبوون بەرتەسك کرایەوە.

**خوێن داکوژان** ترک مخاصمه/ترک جنگ Armistice

یەککەوتن بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە شەڕ و دوژمنایەتی لە نێوان دوو یان چەن دەوڵەتێك. لەم یەککەوتنەدا بە گشتی کەشوهەوا و ماوەی دەسهەڵگرتن لە شەڕ لە نێوان لایەنەکانی شەڕ دیاری ئەکرێت. سازش کردن و کۆك بوون لە سەر خوێن داکوژان ڕەنگە بە شێوەیەکی گشتی و هەمەلایەنە بێت: وەك خوێن داکوژانی فەڕەنسە و ئەڵمانیا، یان کاتی بێت: کە زیاتر بە مەبەستی کۆکردنەوەی کوژراوەکان لە مەیدانی شەڕدا بە ئەنجام ئەگات. ئەم جۆرە کردارە بە «هەڵپەساردنی شەڕ»یش ناوبردە کراوە.

لە ڕوانگەی ماق نێونەتەوەییەوە، ئەگەرچی خوێن داکوژابێتەوە و دەس لە شەڕ هەڵگیرابێ بەڵام حاڵەتی شەڕ، هەر بەردەوامە و ماف و ئەرکی لایەنەکانی شەڕ هەر لە ئارادایە. ڕێسا گشتییەکانی خوێن داکوژان لە کۆنفرانسی ئاشتی لاهای لە ساڵی ١٩٠٧ دیاری کرا و بەو پێیە لە خوێن داکوژانەوەی بێ سنووردا کاتێك شەڕ و ئاژاوە سەرهەڵئەداتەوە کە بە تەرزێکی جیددی و هەمەلایەن ئەم ڕێساگەلە وەلا بنرێت. ئەو کردەوانەی کە ئەبێتە هۆی پێشێل کردنی بڕیارنامەی خوێن داکوژان بریتییە لە: پێشڕەوی ئاشکرا، داگیرکردنی هەر ناوچەیەکی بەدەر لە هێڵی دیاریکراو، و جێبەجێکردنی سپایەك کە لە بارودۆخێکی لاوازدا بووبێت.

PDF 4 KURD

## خەباتی چینایەتی مبارزه طبقاتی Class struggle

بە باوەڕی مارکسییەکان خەباتێکە کە بە شێوازی جۆراوجۆر و لە ئاستی سیاسی و ئابووری و ئایدیۆلۆجیك، لە نێوان دوو چینی زۆردار و زۆرلێکراو لە گۆڕێدایە و بەردەوام بەرژەوەندییەکانی ئەم دوو چینە خەسڵەتێکی شەڕەنگێزانەیان هەیە. بە پێی ئەم رێبازە هەر شۆڕشێك کە هەڵگری خەباتی چینایەتی نەبێت، پووچەڵە. مارکس و ئەنگلس لە بەیاننامەکەی حیزبی کۆمۆنیست دەڵێن: «مێژووی هەموو ئەو کۆمەڵگا ئینسانیانەی کە تا ئیستا سەریان هەڵداوە، مێژووی خەباتی چینایەتی بووە. مرۆڤی سەربەست و کۆیلە، پیاوماقووڵ و رەشۆکی، ئاغا و رەعیەت، کرێکار و خاوەنکار، خۆلاسە، ستەمکار و ستەملێکراو هەمیشەی خوایی لە بەرامبەر یەکتردا وێستاون و تووشی شەڕ هاتوون». خەباتی چینایەتی دەکرێ شێوازی قانوونی یا ناقانوونی، ئاشتیئامێز یان شەڕەنگێزانە بە خۆیەوە بگرێت. بە پێی رێبازی مەتریالیزمی مێژوویی، تا ئەو کاتەی کۆمەڵگای ئینسانی نەگەیشتۆتە ئاستی کۆمۆنیزم و کۆمەڵگای بەدەر لە چینایەتی بەدینەهاتووە، لە نێوان هەموو چینەکان کێشمەکێش و مشتومڕ بەردەوام دەبێت.

## خەڵاتی ئاشتی نۆبل جایزه صلح نوبل Nobel Peace Prize

خەڵاتی نۆبل ئەگەڕێتەوە بۆ کیمیازان و داهێنەری سویدی بەناوی ئالفرێد نۆبل، کە لە نێوان ساڵانی (١٨٣٣ــ ١٨٩٦) لە ستۆکهۆڵم ژیاوە و لە رێی دروستکردنی دینامیت، سەروەت و سامانێکی زۆری پێکەوەناوە. بەڵام کاتێك زانی ئەم داهێنانەی ئەو بووەتە مایەی نیگەرانی و نائارامی لە جیهان، زۆری لە دڵ گران بووە و هەر بۆیە پارە و سامانەکەی کە پتر لە ٣١ ملیۆن کرۆنی سویدی بووە، بۆ شەش خەڵات تەرخان کرد. پێنج خەڵات بەو زانایانە دەدرێ کە لە بوارەکانی فیزیا، کیمیا، دەروونناسی، پزیشکی و ئەدەبی خزمەتی بەرچاویان کردبێت و خەڵاتی شەشەم بە کەسێك دەدرێ کە خۆی یا وڵاتەکەی لە بواری ئاشتی جیهاندا هەنگاوی گرنگ و بەنرخی هەڵگرتبێ. لەو کاتە بەدواوە، لیژنەیەك وەك بەرپرسی دابەشکردن، خەڵاتەکە بە کەسانی بەرجەستەی زانستی و ئەدەبی و سیاسی پێشکەش دەکات. لیژنەی نۆبل، خەڵاتی ئاشتی نۆبل لە ئۆسلۆ پێتەختی نەرویژ پێشکەش دەکات.

یەکەمین خەڵات لە ساڵی ١٩٠٢ بە هانری دونان، بنیاتنەری خاچی سووری جیهانی پێشکەش کرا. لەو کەسانەی کە ئەم خەڵاتەیان بردۆتەوە، دەکرێ ئاماژە بدەین بە کۆفی ئەنەنان لە غانا، سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان(٢٠٠١)، جیمی کارتەر، سەرکۆماری پێشووی ئەمریکا(٢٠٠٢)، خاتوو شیرین عیبادی پارێزەر و چالاکوانی مافی مرۆڤ لە ئێران (٢٠٠٣) و باراك ئۆباما سەرکۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(٢٠٠٩). بەڕای نەیاران و رەخنەگران، خەڵاتی نۆبل لەم دواییانەدا رەنگ و ڕوویەکی سیاسی لێ نیشتووە و لە چوارچێوەی دەسەڵاتی زلهێزەکان بە تایبەت وڵاتانی ئەورووپی دابەش ئەکرێت.

PDF 4 KURD

## ل

**دابڕان** گسست / انفصال Cessation

جیابوونەوەی بەشێك لە خاكی ولاتێك یان سەرزەمینێك لە ژێر دەسەلاتی ئەو ولاتە. دابڕان، زۆرتر لە دوای شۆڕش ڕوودەدات. چەن نموونەی دابڕان، بریتییە لە: جیابوونەوەی چواردە موستەعمەرەی بەریتانیا و دامەزرانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا(١٧٧٦)، جیابوونەوەی بەرازیل لە پۆرتوگال(١٨٨٢)، یۆنان لە عوسمانی(١٨٩٨)، كووبا لە ئیسپانیا(١٨٩٨) و پاكستان لە هیندستان(١٩٤٧). دابڕان سەرەنجامی «جودایی خوازی»*یە و پاش خەباتێكی دوور و درێژ بۆ دامەزرانی نەتەوەیەك پێك دێت.

**دادگای نۆرمبێرگ** دادگاه نورمبرگ Nuremberg trial

ئەم دادگایە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی بە مەبەستی لێكۆڵینەوە لە تاوانەكانی جەنگ و دادگایی كردنی ڕێبەرانی نازی لە سەردەمی شەڕ لە شاری نۆرمبێرگی ئەڵمانیا دامەزرا. ئەم تاوانانە بریتی بوون لە: داڕشتن و بەڕێوەبردنی شەڕی دەستدرێژكارانە، كۆمەڵكوژی*، سووكایەتی كردن بە دیلەكانی جەنگ، تاوان دژ بە مرۆڤایەتی، پێشێلكردنی یاسا و چوارچێوەكانی جەنگ.

لە نێوان ١٧٧ گومانبار، ٢٥ كەس لەسێدارەدران، ٢٥ كەس كەوتنە زیندانی هەمیشەیی، ٩٧ كەس زیندانی كورت و درێژخایەن( لە١٥ تا ٢٥ساڵ ) و ٣٥ كەسیش بێتاوان دەرچوون. ئەم دادگایە لە ساڵی ١٩٤٥ تا ١٩٤٧ بەردەوام بوو.

**دادگای نێونەتەوەیی داد** دیوان دادگستری بین‌المللی

International court of justice

ئەم دادگایە لقی دادوەری ڕێكخراوەی نەتەوەیەكگرتووەكانە كە لە ساڵی ١٩٤٦ بە مەبەستی ڕاگەیشتن بە كێشە وناكۆكیە نێودەوڵەتییەكان دامەزرا و ناوەندەكەشی لە شاری لاهای هۆڵەندایە. ئەم دادگایە پانزە دادوەری باڵای هەیە كە لە لایەن كۆمەڵەی گشتی و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ ماوەی ٩ ساڵ هەڵدەبژێردرێن و هەر ساڵەی پێنج كەسیان دەگۆڕێ. ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایش، هەمیشە مافی پاڵاوتنی یەكێك لەو دادوەرانەیان هەیە و دەتوانن هەڵیبژێرن.

ئەو كێشانەی كە لە دادگای نێونەتەوەیی لاهای لێكۆڵینەوەیان لە سەر ئەكرێ بریتین لە:

- گۆڕینی هەموو ڕێكەوتننامە و پەیماننامەكان.
- چارەسەركردنی ئەو گیروگرفتە یاساییانەی كە وەك پرسیار لە لایەن دەوڵەتانی ئەندام ئەخرێتە بەردەم دادگاوە.

PDF 4 KURD

- دیاریکردنی ئاستی بەرکەوتنی زیانێك کە لە ئەنجامی پێشێلکردنی یاسا نێودەوڵەتیەکان، رووبەرووی وڵاتێك دەبێتەوە و چۆنییەتی قەرەبووکردنەوەیان.

دادگای نێونەتەوەیی داد تاکوو ئێستا چارەسەری بۆ چەندەها کێشەی نێودەوڵەتی دۆزیوەتەوە بەڵام فرمانەکانی هەمیشە ناگەنە ئاستی جێبەجێ کردن.

**دادگای ماف مرۆڤی ئەوروپا:** بڕوانە مافەکانی مرۆڤ.

**داروینیزمی کۆمەڵایەتی** داروينيسم اجتماعی Social darwinism

تیۆریەکی کۆمەڵایەتی و مێژووییە کە لە لایەن چارلز داروین(١٨٠٩-١٨٨٢) ئاراستە کرا و باس لە پرۆسەی گەشەسەندنی سروشتی«جۆرەکان» ئەکات. ناوبراو لە کتێبە بەناوبانگەکەی بە ناوی ***سەرچاوەی رەگەزەکان***، بۆ سەلماندنی بونیادی گەشەی بوونەوەرە زیندووەکان، بە پێی هەندێ بەڵگە پێی وابوو کە بوونەوەرەکان لە ژێر کاریگەری هەلومەرجێکی دیاریکراودا گۆڕانیان بەسەرا دێت. بۆ نموونە مرۆڤی بە بەرهەمی فراژووتن و گەشەکردنی رەگەزێکی مەیموون دائەنا.

بنیاتی ئەم تیۆریە لە باری مێژووییەوە، پابەندی بنەمای «خەبات لە پێناو ژیان»دایە. ئەم رەوتە لە سرووشتەوە گوازراوەتەوە بۆ ناو رەگەز و نەتەوەکان. لەم جەنگەدا «شیاوترینەکان»، واتە «بەهێزەکان»، دەمێننەوە. ئەم تیۆریە لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و بەرایی سەدەی بیست، بووە بنەمایەکی ئایدیۆلۆجیکی بۆ ململانێی زلهێزەکان و دەسپێچکێك بۆ شەڕی دەسەڵاتداریەتی ئیمپریالیزم. ئەم تیۆریە لە گەڵ رەگەزپەرستی* ئاوێتە بووە بۆ نموونە لە سەر کەسایەتی هیتلەر، پێش ساڵی ١٩١٤ کاریگەری دانا و دواتر بەشێك لە فەلسەفەی نازیسمی پێك هێنا

**داگیرکاریی**(ئیستیعمار) استعمار Colonialism

ئەم وشە بە مانای حەز بە ئاوەدان کردنەوەیە بە چەشنێك کە تاقمێك لە خەڵکی وڵاتێك بچنە وڵاتێکی تر و دەست بدەنە ئاوەدانکردنەوەی ئەو جێیە. بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای زاڵبوونی سیاسی، سەربازی، ئابووری یا کەلتووری وڵاتێکی بەهێزە بە سەر وڵات یا نەتەوەیەکی بێ دەسەڵاتدا. چەمکی ئیستیعمار، ئیمڕۆکە لە گەڵ چەمکی ئیمپریالیزم لە باری مانابیەوە هاورەگەزیان لێ دەرهاتووە و لە بنەڕەتدا ئیستیعمار کردارێکی ئیمپریالیستی ناونوس دەکرێت واتە دەسەڵاتێك کە دەیهەوێ لە سنووره نەتەوەییەکانی خۆی تێپەڕ ببێ و وڵاتان و نەتەوەکانی دیکە بخاتە ژێر سوڵتەی خۆیەوە. بەم بۆنەوە دوو زاراوەی «ئیستیعماری سوور» و «ئیستیعماری رەش» هاتونە ئاراوە کە یەکەمیان، سیاسەتی داگیرکاریانەی یەکیەتی سۆڤیەت بووە و دووهەمیش، هێزە ئیمپریالیستیەکانی رۆژاوا. هەر بەم قیاسە، پاکستانیەکان لەبارەی «کەشمیر»ەوە رووبانکردۆتە «ئیمپریالیزمی قاوەیی».

PDF 4 KURD

**داگیرکراو** مستعمره Colony

ئەم زاراوە لە بنەڕەتدا بە واتای نیشتەنگای گرووپێك لە هاوولاتییانە کە لە ولاتێکی جیاواز لە ولاتی سەرەکی خۆیان دەژین. بەلام ئێستا بە واتای ولات یا سەرزەمینێکە کە لە ژێر دەسەلاتی ولاتێکی بەهێزی سیاسی یان سەربازی ئیدارە بکرێت و دەسەلاتی یاسادانانەکەی بە دەست ولاتە دەرەکییەکەوە بێت. واتە ولاتێکی بێ بەهرە لە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری و کولتورییە کە بە شێوەی ئاشکرا یان نادیار بەشێك لە ئیمپراتۆریەتێك لە ئەژمار دێت.

**دایەلیکتیك** دیالکتیک Dialectic

دایەلیکتیك لە وشەی لاتینی dialect و وشەی یۆنانی dialekt بە واتای «پەیڤ»، «گفتوگۆ»، «زمان» و «زاراوە» پێکهاتووە. زاراوەی دایەلیکتیك، یەکەم جار لە لایەن هێرکلیتس(٥٤٠-٤٧٥پ. ز) فەیلەسوفی یۆنانی روون کراوەتەوە. دایەلیکتیك، بە کورتی بریتییە لە لێکۆڵینەوەی ورد و لۆژیکیی مەسەلەیەك بۆ گەیشتنە ئەنجام. بە واتایەکی تر هونەر و زانستی گفتوگۆکردن. ئینسکلۆپیدیای دالامبر و دیدرۆ (١٧٦٦-١٧٥١)، دایەلیکتیك بە «هونەری بەلگاندن و گفتوگۆکردن» پێناسە دەکات. لەوە بەدواوە، مانای ئەم زاراوە تەنیا لە سەر «توانایی بەلگە هێنانەوە» خولاسە بوەتەوە و بەمجۆرە دایەلیکتیك. لە گەڵ لۆژیك (ژیربێژی) هاوواتا بوەتەوە. ئەم زاراوە لە سەدەی نۆزدە لە لایەن فەیلەسوفانی ئایدیالیست بە تایبەت فەیلەسوفی ئەلمانی، هێگل(١٨٣١-١٧٧٠) بە شێوەیەکی بەربلاو بە کارهێنرا. هێگل لەو باوەڕەدا بوو کە جیهان و هەموو ئەو شتانەی کە تێیدایە، بەردەوام لە گۆڕاندایە و هەمووشتێك گرێدراوی یەکترن و بە کەلك وەرگرتن لە دایەلیکتیك، دەتوانین بنچاخی گۆڕانکارییەکان بدۆزینەوە و لە چۆنییەتی گۆڕانییان بکۆڵینەوە.

بەلام هێگل، «رۆح»ی لە پێشەوە دادەنا و دەیگوت رۆح دایەلیکتیکە چوونکە پێوەندی بە پێشکەوتنی هزرەوە هەیە و پێشکەوتنی هزریش، بە هۆی گفتوگۆ و پێکدادانی ئەندێشەکانەوە دێتە بەرهەم. هەر بەم بۆنەوەیە کە هێگل وەك فەیلەسوفێکی ئایدیالیست ناسراوە. هەر چەند مارکس و ئەنگلس لە هەمبەر گۆڕانکاری شتەکان لە گەڵ تیۆرییەکەی هێگلدا هاودەنگن بەلام لە هەمان کاتدا دەڵێن کە وێناکانی ئێمە بە هۆی *شتەکانەوە* دروست دەبن و ئەگەر بیروڕای ئێمە دەگۆڕێت، بە هۆی ئەو گۆڕانکارییانەیە کە لە دەوروبەرماندا روو ئەدەن.

لە دایەلیکتیکی هێگلدا «ئایدیا» کە لە پرۆسەیەکی دایەلیکتیکی لە سروشت و زەین دا چێ دەبێت، بە هۆی ناتەباییەك دێتە ئاراوە. هێگل ئەم رەوتە بە سێ قۆناغ دابەش ئەکات کە بریتین لە: تێز (دۆخی هەنووکە)، ئانتی تێز (دۆخی بەرامبەر)، سەنتێز (دۆخی ئاوێتە). بۆ نموونە لە بارەی کۆمەلگای سیاسی فەرەنسەوە، ئەم سێ قۆناغە بەمجۆرە شرۆڤە دەکرێت:

لە قۆناغی یەکەمدا کە تێز دێتە ئاراوە، سیستەمی پاشایەتی لە ولاتی فەرەنسە دادەمەزرێت. لە قۆناغی دووهەم واتە ئانتی تێز، شۆڕشی مەزنی فەرەنسە سەردەکەوێت. سەرەنجام لە قۆناغی سێهەمدا کە قۆناغ

PDF 4 KURD

سەنتێز ناونووس کراوە، هێگل، «ئیمپراتۆریەتی ناپیلئۆن» کە کاریگەریی لە کەسایەتی ئەو وەرگرتووە، بە سەنتێزێك لە قەڵەم ئەدات.

بە گشتی دایەلیکتیك ئەم باوەڕە تەشەنە پێ ئەدات کە هەموو شتێك و هەر بابەتێکی کۆمەڵایەتی و چارەنووس‌ساز بە هۆی زنجیرەیەك پێشکەوتن و بە پێی گوزەران بە پرۆسەیەکدا دروست بوون و لەناوچوون و گەشە دەکەن. هەموو شتێك لە حاڵی جووڵە و گۆڕاندایە و دەکەوێتە بەر وەرچەرخانی مێژوویی. لەم رووەوە دایەلیکتیك ئامرازێکە کە دەسبەجێ دەتوانێ سەرەتا و کۆتایی شتەکانمان بۆ روون بکاتەوە و لە رێگای توێژینەوە و گفتوگۆ، لە راستییەکان ئاگادارمان بکاتەوە.

## دەستدرێژی — تجاوز — Aggression

بەکارهێنانی هێزی سەربازیی لە لایەن وڵاتێکەوە بە دژی حاکمییەت و یەکپارچەیی سەرزەمین یان سەربەخۆیی سیاسی وڵاتێکی‌تر. لە بەیاننامەی کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە دوو سۆنگەوە باسی دەستدرێژی کراوە:

١) مەبەست لە وڵات، ئەو وڵاتانەش ئەگرێتەوە کە نەبوونە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

٢) لە کاتی پێویست، مانای کۆمەڵێك وڵاتی لێ ئەکەوێتەوە.

## دژە شۆڕش — ضد انقلاب — Counter-Revolution

بەو عەمەلیاتە دەڵێن کە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕش بۆ پووچەڵکردنەی شۆڕش بە ئەنجام دەگات. بە واتایەکی‌تر، هەوڵ ودەوڵی حوکمەتی پێشوو بە دژی هەوڵی شۆڕشگێڕانەی حوکمەتی نوێ، بە دژی شۆڕش لە قەلەم دراوە. ئەم زاراوە یەکەم جار لە لایەن کوندرسە، لە ساڵی ١٧٩٣ لە سەروبەندی شۆڕشی فەرەنسا بەکار براوە. هەندێ جاریش لە لایەن دەسەڵاتدارانێك کە لە ئاکامی شۆڕشێك گەیشتوونە حوکمەت، ئەم زاراوە بە کەسانێك گوتراوە کە لە گەڵ ئەواندا نەیار بوون و بەم بۆنەوە خراونەتە پەراوێزەوە.

## دوکترین/بیرۆکە/ رێڕەو — دکترین / آیین سیاسی، آموزه — Doctrin

زاراوەی دوکترین، لە وشەی لاتینی docteur بە مانای فێرکردن و فێربوون وەرگیراوە و بە کۆمەڵێك بیر و بۆچوونی تایبەتی سیاسی دەگوترێ کە لە لایەن کەسێکەوە ئاراستە دەکرێ و دواتر ئەبێتە رێبازێك بۆ لایەنگرانی. لە زاراوەی سیاسیدا دوکترین، بریتییە لە جیهان بینی و بۆچوونێکی تایبەت کە دەسەڵاتدارانی وڵاتێك، بناغەی دەسەڵاتەکانی خۆیانی لەسەر دائەمەزرێنن و بەرنامەی کارەکانیان بە دەوری تەوەری ئەو دوکترینەدا دەسووڕێتەوە و خەڵکیش بە ناچار دەبێ لەسەر هەمان رێباز پێوەندیەکانی خۆیان رێك بخەن.

PDF 4 KURD

**دوکترینی ئایزەنهاوەر** دکترین آیزنهاور Eisenhower Doctrine

بە کۆمەڵە پێشنیارەکانی دوایت ئایزەنهاوەر، سەرکۆماری ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا(٦٠ـ ١٩٥٢) دەوترێ کە لەسەر سیاسەتی ئەمریکا دەربارەی رۆژهەلاتی ناوین و ناوچەکانی دەوروبەری لە ژانوییەی ١٩٥٧، ختییە بەردەم کۆنگرێس و بەو پێیە:

١) ئەمریکا بۆی هەیە بۆ پاراستنی سەربەخۆیی «ولاتانێك کە لە دەرەوە دەکەونە بەر هەڕەشەی کۆمۆنیزم یان لە ناوەوە تووشی ململانێ و گێرەشێوێنی دەبن»، مادامێکی ئەو ولاتانە بخوازن، بە یارمەتی هێزە چەکدارەکانی خۆی پشتیان بگرێت و داکۆکیان لێ بکات.

٢) ئەمریکا دەبێ بۆ پەرەسەندنی ئابووری ئەم ولاتانە هەنگاو بنێ.

٣) ئەمریکا دەبێ بەو ولاتانەی کە خوازیاری هاوکاری سەربازی بن، یارمەتی بگەیەنێت.

ئەو هەرێمانەی کە دوکترینەکەی تیا بەڕێوە دەچوو، هەر لە لیبی لە رۆژاواوە تا پاکستان لە رۆژهەلات و تورکیا لە باکوور و نیمچە دوورگەی عەرەبستان لە باشووری دەگرتەوە. نموونەی پیادەبوونی ئەم دوکترینە، ناردنی هێزی سەربازی بۆ لوبنان بوو لە ساڵی ١٩٥٨، بە هۆی قەیرانی کەناڵی سوێز.

**دوکترینی برێژنیف** دکترین برژنف Brezhnev Doctrine

ئەم زاراوە لە دەرەوەی سۆڤیەت دانراوە و ناوەکەی دیکەی «دوکترینی حاکمییەتی سنووردار»ە. بەلام بە گشتی بە رێبازەکانی لیئۆنید برێژنیف، رێبەری یەکییەتی کۆمارییەکانی سۆڤیەت (١٩٨٢ـ١٩٦٤) لە بەرامبەر ولاتانی ئەقماری دەگوترا. بە پێی ئەم رێبازە، هەرکاتێك سۆشیالیزم لە ولاتێك بکەوێتە مەترسییەوە، ولاتە سۆسیالیستەکان بۆیان هەیە لە پێناو پاراستنیدا دەست وەردەنە ئەو ولاتەوە. دوکترینی برێژنێف، دەستی ولاتانی سۆشیالیستی ئەبەستەوە بۆ ئەوەی نەتوانن ماف چارەی خۆنووسین و حاکمییەتی نەتەوەیی بەدەست بێنن.

**دوکترینی بۆشی دووهەم** دکترین بوش دوم Bush(Jr) Doctrine (2001)

بریتییە لە کۆمەڵێ بیرۆکە و پەرچەکردار کە لە لایەن جۆرج دەبلیۆ بۆش، چل و سێهەمین سەرکۆماری ئەمریکا لە ئاست مەسەلە جیهانییەکان ئاراستە کرا. بۆش لە کاتێکدا بە دەسەلات گەیشت کە نزیکەی ١٠ ساڵ بوو شەڕی سارد و هەلوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت کۆتایی پێهاتبوو. لەم سەروبەندەدا ئەمریکا دەیویست بەو هەلەی کە بۆی رەخساوە، دەسەلات و هێزی سیاسی و سەربازی خۆی لە جیهاندا پاوەجێ بکات تاکوو ببێتە یەکەم هێزی جیهان. کارەساتە تیرۆریستییەکەی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، کارێکی وایکرد کە دەسەلاتدارانی ئەمریکا شێلگیرانەتر بیر لە ئارمانجەکانی ویلسۆن بکەنەوە و هەنگاوی بۆ بنێن.

PDF 4 KURD

ئەمێستا یەکەم کارەکانی ئەمریکا، بەرەنگاربوونەوەیە لە گەڵ ئەو رژێمانەی کە لە روانگەی واشینتۆنەوە بە دەوڵەتانی لاسار (Rouge states) لە قەڵەم دراون و تیۆری پێکدادانی شارستانییەتەکان کە لە لایەن ساموئێل هەنتینگتۆن، هاتبووە ئاراوە وەك پاڵنەرێکی ئایدیۆلۆجیکی بۆ ئەم ستراتیجیە ناونووس دەکرێت.

دوکترینی بۆش، لە ئاست وڵاتانی جیهانیش خۆی نیشانداوە. بۆ وێنە وڵاتی سۆڤیەتی ـ وەك رەقیبێکی دێرینی خۆی ـ خانەنشین کردووە و بە هاوپەیمانییەتی لە رێکخراوەی ناتۆ*، وڵاتانی رۆژهەڵاتی ئەورووپای بەلای خۆیدا کێشاوە.

ئەم رێبازە، لەمەر سێ وڵاتی ئێران و عێراق (پێش رووخانی سەدام) و کوریای باشووری، سیاسەتێکی توندی بەرێوە بردووە و لە ژانوییەی ٢٠٠٢، ئەم سێ وڵاتە لە ریزی تەوەری شەیتانی (Axis of Evil) ناوبردە کراوە. هەر بە پێی ئەم دوکترینە بوو کە ئەمریکا لە دوای یازدەی سێپتەمبەر و بە ناوی شەڕ لە گەڵ تیرۆریزم، هێرشی بردە سەر دوو وڵاتی ئەفغانستان (ئۆکتۆبەری ٢٠٠١) و عیراق ( ٢٠ی مارسی ٢٠٠٣) و توانی رژێمەکانی تاڵیبان و بەعس برووخێنێ.

### دوکترینی بۆشی یەکەم دکترین بوش اول Bush Doctrine (1989-1993)

ئەم زاراوە کە دواتر لە گەڵ دەستەواژەی «سیستەمی نوێی جیهانی»* بە یەك مانا لێکدراونەوە، بریتییە لە کۆمەڵێك بیرۆکەی مژاویی. کەچی بەم حاڵە، زنجیرە رووداوێك کە لە سەرەتای نەوەدەکانەوە سەرانسەری جیهانی گرتۆتەوە، بیرمەندان و زانایانی والێکردووە کە ئەم رووداوانە لە قەبارەی «سیستەمی نوێی نێونەتەوەیی»دا شرۆڤە بکەن. رووداوەکانی جیهانی کۆمۆنیستی و دواتر گۆڕانی رژێمەکانی ئەورووپای خۆرهەڵات، رووخانی دیواری بەرلین، کۆتایی هاتنی شەڕی سارد و هێرشی ئەمریکا بۆ پاناما و شەڕی کوەیت، لە جوملەی ئەم رووداوانە لە ئەژمار دین. لە رێکەوتی ١١ی سێپتەمبەری ١٩٩٠، جۆرج بۆشی یەکەم، سەرکۆماری ئەمریکا دوای هێرشی عێراق بە کوەیت و داگیرکردنی ئەم وڵاتە(ئاگۆستی ١٩٩٠)، لە وتارێکیدا لە بەردەم نوێنەرانی کۆنگرێسی ئەمریکا، بەم شێوە سیستەمی نوێی جیهانی پێناسە کرد:

«جیهانێکی تەواو جیاواز لەو جیهانەی کە ناسیومانە. جیهانێك کە دەبێ تێیدا باڵادەستیی و حاکمییەتی قانوون لەبری قانوونی جەنگەڵ، سەروەر بێت. ئەو جیهانەی کە تێیدا وڵاتەکان، بەرپرسیارییەتی هاوبەش لە بەرامبەر ئازادی و عەدالەت بە رەسمییەت بناسن و دەسەڵاتداران رێز دابنێن بۆ ماف بێدەسەڵاتەکان».

### دوکترینی مۆنرۆ دکترین مونرو Monroe Doctrine

ئەم زاراوە باس دەکات لە سیاسەتەکانی جەیمز مۆنرۆ کە لەنێوان ساڵەکانی (١٨١٧–١٨٢٥) سەرکۆماری ئەمریکا بووە. مۆنرۆ لە ٢ی دێسەمبەری ١٨٢٣ لە پەیڤێکی خۆیدا بۆ کۆنگرێسی ئەمریکا، رایگەیاند کە وڵاتانی ئەورووپی ماف ئەوەیان نییە لە کاروباری ئەمریکییەکان دەستێوەردان بکەن و لە بەرامبەریشدا

PDF 4 KURD

ئەمریکییەکان نابێت دەستوەردەنە کاروباری ئەورووپییەکان. ئەم دوکترینە لە چوار تەوەری سەرەکی پێکهاتبوو کە بریتین لە:

١ـ کیشوەری ئەمریکا نابێ بکەوێتە مەترسیی پەیوەست بوون بە خاکی هیچ وڵاتێکی ئەورووپییەوە.

٢ـ وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەر چەشنە هەوڵدانێك بۆ پەرەپێدانی سیستەمە سیاسییەکانی ئەورووپا، لە هەر بستە زەمینێکی وڵاتەکەدا بە مەترسییەك بۆ ئاشتی و ئاسایشی خۆی دەزانێ.

٣ـ ئەمریکا هیچ دەستێوەردانێك ناکات لە موستەعمەراتی ئەورووپادا.

٤ـ ئەمریکا لە شەڕی وڵاتانی ئەورووپی کە لە سەر بەرژەوەندی تایبەت بە خۆیان هەڵئەگیرسێ خۆی تێ هەڵناقورتێنێ.

ئەم سیاسەتە لە بەرایی سەدەی بیستەمدا بەم ئەنجامە گەیشت کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببێتە ژەندەرمەی ئەمریکای باکووری و باشووری کە ئەمەش بووە هۆی کێشە و هەرا لە نێوان وڵاتانی ئەمریکای لاتین لە گەڵ ئەو وڵاتەدا. بە باوەڕی دەسەڵاتدارانی ئەمریکی سیاسەتی مۆنرۆ، ئێستاکەش وەك بنەمایەکی سەرەکی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە ئەژمار دێت.

## دۆگماتیزم/ وشکەمەرامی دگماتیسم/جزم‌اندیشی Dogmatism

ئەم زاراوە لە وشەی یۆنانی (dogma) بە مانای بیرو باوەڕی وشك و بنبڕاو وەرگیراوە کە یەکەمجار لە لایەن فەیلەسووفانی گوماندار، بۆ وێنە «زێنوون»، هاتە ناو فەلسەفەی یۆنانەوە. لە زاراوەی سیاسیدا بە شێوازێك دەڵێن کە لایەنگرانی، لە کاتی باس و گفتوگۆدا بە دەربەستی بەڵگەهێنانەوە نین و بیروباوەڕی پێشووی خۆیان بە بێ هیچ رەخنەیەك پەسند ئەکەن و هیچ گۆڕانکارییەك بە سەر ئەندێشە و هزری خۆیاندا ناهێنن. باوەڕمەندانی ئەم رێبازە، بڕواکانی خۆیان بە شتێکی موتڵەق و نەگۆڕ و بەدەر لە گومان و دڕدونگی دەزانن.

دۆگماتیەکان، گرنگی بە هەلومەرج و شوێنکات نادەن و شێوازێکی دژە دایەلیکتیکی دەگرنەبەر و بە چاوێکی کوێرانەوە پەیڕەوی لە رێسا و مەرامە وشکەکانی رابردوو ئەکەن.

ئەمڕۆ دۆگماتیك بەو کەسانە دەڵێن کە ئامادە نین تیۆری و بیرۆکەی نوێ پەسند بکەن و گوێ نادەنە ئەو گۆڕانکارییانەی کە بە سەر بووارەکانی ژیاندا هاتووە. بە گشتی ئەم زاراوە وەك ئاوەڵناوێك بۆ قوتابخانە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی دیکە بەکاردێت.

## دەروونناسی سیاسی/ سایکۆلۆجی سیاسی روانشناسی سیاسی Political psychology

لە ساڵەکانی ١٩١٠ بەملاوە، واڵتێر لیپمەن، رۆژنامەنووسی ئەمریکی(١٨٨٩-١٩٧٤) وتی: گەورەترین هەڵەی ئەندێشەی سیاسی ئێمە ئەوەیە کە بێ ڕەچاو کردنی«مرۆڤ»، دەم لە سیاسەتەوە بەین.

بابەتی سایکۆلۆجی سیاسی، لێکدانەوەی کاریگەریی کەسایەتی جەماوەرە بە سەر سیاسەتدا بە تایـ

PDF 4 KURD

گرنگایەتی سایکۆلۆجی لە بڕیارە سیاسییەکاندا سەرنجی پێدراوە. بەم حاڵەش جۆراوجۆری قوتابخانە سایکۆلۆجییەکان بۆتە هۆی فرەچەشنی سایکۆلۆجی سیاسی. بۆ وێنە جەخت کردن لە سەر سایکۆلۆجی فرۆید، سایکۆلۆجییەکی سیاسی جیاوازیش دێنێتە ئاراوە.

سایکۆلۆجی سیاسی، خۆی بە تایبەتمەندییە دەروونییەکانی ئەکتەرە سیاسییەکان سەرقاڵ ئەکات. متمانە کردن بە خۆ، هەست کردن بە گوناهباری، هەست بە ئاسایش یا نائەمنی، خودشەیدایی، ئیگۆی لاواز یان بەهێز و... لە جوملەی بابەتەکانی توێژینەوەی سایکۆلۆجی سیاسی لە ئەژمار دێن. بەڕای هەندێ لە پسپۆڕانی ئەم زانستە، سیاسەت بۆ ئەو کەسایەتییانە دڵڕفێنە کە لە قۆناغی منداڵی یا هەرزەکارییان تووشی شکست و سووکایەتی و نامورادی بوبێتن. وەها کەسانێك ئەیانهەوێت بە وەدەسهێنانی دەسەڵات، ئەم کەموکوورییانەی ژیان قەرەبوو بکەنەوە.

بەم پێیە سایکۆلۆجی ڕێبەرە سیاسییەکان، بەم سێ شتەوە پەیوەستە: یەکەم ناسینی پاڵنەرەکانی کەسایەتی، دووهەم چۆنییەتی بە سیاسی کردنی ئەم پاڵنەرانە و سێهەم پاساودانیان بە پێی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان. لەم ڕوانگەوە ڕەفتاری سیاسی ڕێبەران بریتییە لە دیتنەوە و ئاشکرا کردنی پاڵنەرە دەروونییەکان و گرفتە شەخسییەکانی تاقی منداڵی ئەوان.

## دەستووری بنچینەیی/یاسای بنەڕەتی — قانون اساسی — Constitutional law

دەستووری بنچینەیی بریتییە لە بەڵگەنامەیەکی بناغەیی و بنچینەیی کە لە وڵاتێکدا سروشتی دەسەڵات و ئەرك و مافەکانی شارۆمەندان دەست نیشان ئەکات. دەستوور، شێوازی حوکمەتکردن یا ڕاگواستنی دەسەڵاتە. واتە کۆمەڵە ڕێسایەك کە توانایی و ڕەفتاری هێزەکانی سەر بە دەوڵەت و مافە سەرەکییەکانی تاك و بەشداری شارۆمەندان لە بەڕێوەبردنی دەسەڵات لە ڕێگای دەنگدان بە نوێنەرانی خۆیان، دەست نیشان ئەکات. لە پێناسەیەکیتردا دەستووری بنچینەیی بریتییەلە کۆمەڵێ یاسا کە پێوەندی و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی نێوان دەسەڵاتداران و شارۆمەندانی وڵاتێك دیاری ئەکات. دەستووری بنچینەیی لەو وڵاتانەی کە بنەمایەکی دیموکراسییان هەبێ، لە لایەن کۆمەڵێ نوخبەی سیاسی کە بەپێی هەڵبژاردن لە «ئەنجومەنی دەستوور» یەك دەگرنەوە دەنووسرێ و دواتر بۆ پەسندکردنی جەماوەر دەخرێتە ڕیفراندۆمی دەستووری بنچینەیی (بڕوانە ڕاپرسی). دەستووری بنچینەیی، تاکە سەرچاوەی یاسادانان لە ئەژماردێت لە هەموو بوارێکی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و کەلتووری کۆمەڵگادا.

ئەرەستۆ، دەستووری بنچینەیی بە کۆمەڵێك ئەرك و کرداری وڵاتێك دەزانێت کە چۆنییەتی دابەشکردنەکەی لە لایەن ئەو دەستوورەوە دیاری ئەکرێت و دەسەڵاتی حاکمییەت و ناوەرۆکی ئەو ئامانجانەی کە دەبێ خەڵکی وڵاتێك پێی بگەن، دەستنیشان ئەکرێت. دەستووری بنچینەیی لە بەستێنی سیاسیدا لەو کاتەوە زەق بۆوە کە سەرچاوەی دەسەڵات لە شازادەیەکەوە گەڕایەوە بۆ خەڵك و بەم دەرکەوتە،

PDF 4 KURD

ئیدی پاشا و میران، وەك «خاوەن دەسەڵات» لەئەژمار نەهاتن بەڵكوو وەك دەسەڵاتدارانێك لەقەڵەم دران كە هێز و دەسەڵاتەكەیان لە دەستوورەوە سەرچاوە ئەگرێت.

**دەستووری بنچینەیی ئەورووپا**: بڕوانە پەیمانی ماستریخت.

**دەس‌تێوەردان** دخالت/ دست یازی Intervention

دەس‌تێوەردان بریتییە لە ڕەفتاری دەوڵەتێك كە ئەنجامەكەی پێشێلكردنی حاكمییەت (بڕوانە فەرمانڕەوایەتی) و سەربەخۆیی ناوخۆیی و دەرەكی دەوڵەتێكی‌تر بێت. بە واتایەكی‌تر دەس‌تێوەردان بە خۆ هەڵقورتاندن لە كاروباری ناوخۆیی و دەرەكی وڵاتێك ئەگوترێ كە لە ئەنجامدا بشێویی و ئاژاوە لەو وڵاتەدا دروست ببێت. ڕەنگە هەندێ جار دەس‌تێوەردان بە پێی ڕێكەوتن بێت، وەك دەس‌تێوەردانی هاوپەیمانان بە ڕێبەرایەتی وڵاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا لە ساڵی ٢٠٠٣ لە عێراق بە مەبەستی ڕوخانی ڕژێمی دیكتاتۆری سەدام. بێجگە لەو دەستێوەردانانەی كە بە پێی هاوڕایەتی و ڕێككەوتنی نێونەتەوەیی دێتە ئەنجام هەر چەشنە دەستێوەردانێك لە كاروباری دەوڵەتێكی‌تر، پێشێلكردنی یاسا نێودەوڵەتیەكانە و داگیركاریی* لە ئەژمار دێت.

**دەسەڵات** اقتدار Authority

تێكچڕاوییەكی مانایی لە بەینی دەسەڵات و هێز(قدرت) لە ئارادیە. دەسەڵات بریتییە لە «هێزێك كە بە هەقیانەت یان بە عەداڵەت جێبەجێ ئەكرێت» واتە بە هێزبوونی هەقیقی. بەڵام ئەگەر دەسەڵات بەم جۆرە پێناسە بكرێت، لە ڕەوایی (شەرعییەت) جیاناكرێتەوە چونكا هێزی ڕاستەقینە توانستێكی ڕەوایە و وزەی حەقیقیش ئەوەیە كە ڕەوا بێت. گرفتی ئەم چەمكە ئەوەیە كە دەسەڵات چەشنێك لە هێز تەعبیر ئەكرێت كەچی ئێستا وا باوە كە زاراوەی دەسەڵات لە تەنیشت زاراوەی هێز بە رووكارێكی دایەلیكتیكی بۆ شرۆڤەی شوێنكاتێك بە كار دەبرێت كە فەرمانبردن و بەیدەستی، شتێكی خۆبەخۆ و ئاساییە و دەسەڵاتدار، بە شوێن ئەم بەیدەستییەوە نەبووە. لە وەها كاتێكدا دەگوترێ كە دەسەڵاتدار، دەسەڵاتی هەیە بەڵام هێزی نییە. بەم قیاسەوە ناكرێ دەسەڵاتی پزیشكێكی بەناوبانگ بە پێی ژمارەی ئەو نەخۆشانەی كە دەستوورەكانی بە كار ئەبەن، بەراورد بكرێ.

كەواتە دەسەڵات، بەو هێزە ئەوترێ كە بە ڕەسمییەت ناسراوە واتە ڕەوایە و پەسند كراوە و هەمووان ڕێزی بۆ دائەنێن. پێوەندی نێوان دەسەڵات و هێز، پێوەندییەكی ئاسایی و ساكار نییە. بەكار هێنانی بڕست و توانایی لە ڕێی زەبرەوە، بە بێ دەسەڵات مەیسەر نابێ. بۆ ئەوەی دەسەڵاتی ڕاستەقینە بێتە مەیدانەوە ئەبێ مافی فەرمانڕەوایی و كاریگەریی لە سەر خەڵك هەبێت. ئەم مافە بە پێی ئەخلاق و قانوونی كۆمەڵگا كە باڵانوێنی بەرژەوەندی گشتی‌یە، دەستەبەر ئەبێت. بەم واتایە دەسەڵاتی ڕاستەقینە زامنی بوونی ...

PDF 4 KURD

و هاودەنگییە.

لە لایەکی ترەوە هەر کە دەسەڵات پاوەچێ دەبێ، خێرا بەرەو بێئاکاریی و گەندەڵیی دەڕوا و ئەبێتە گوشارێکی کۆمەڵەکی بێئەوەیکە ئەو کەسەی دەسەڵات بەڕێوە ئەبات، کەسێکی شایستە یان دەسەڵاتدارێکی دادپەروەر بێت. لە وەها کەشێکدا دەسەڵات ئەبێتە سوڵتە و بێدادیی و فەرمانڕەوایی بەپێی زۆر و ستەم.

جاری وا هەیە دەسەڵات مانای دژ بە یەك ئەدات، بۆ وێنە:

- دەسەڵات لە گەڵ ڕەخنەی شەخسی و ئەزموونی ڕاستەوخۆ بەرەوڕوو ئەبێتەوە، چونکا ئەندێشە یان بڕوایەك لە دەرەوە دائەسەپێنێ.

- نرخ و بایەخی زانستی یا ئەخلاقییانەی کەسانی پسپۆر یان بیرمەند لە دۆخ ئەدا: بۆ وێنە دەگوترێ فلانە بیرمەند دەسەڵاتدارە(واتە پلە و پایە یەکی بەرزی هەیە).

## دەسەڵاتی نەتەوەیی قدرت ملی National Power

کۆمەڵێ وزە و توانایی مادی و مەعنەوی کە لە قەڵەمڕەوی «یەکە»یەکی جوگراف و سیاسی بە ناوی وڵات* ئامادەیە کە بریتین لە:

١ـ بەروبووم، شوێنکات، کەشوهەوا و تۆپۆگراف قەڵەمڕەوی نەتەوەیی.

٢ـ سەرچاوە سروشتییەکان، وزە و مادەی خۆراکی بەرهەم هێنراو.

دەسەڵاتی نەتەوەیی، گرێدراوە بە گەشەسەندنی ئابووری و سیاسەتی سەربەخۆ، هێزی خەباتکار، ئارمانج و ئارمانی بەرز، دیموکراسی و هەست وخوستی نەتەوەیی.

## دەنگۆ/ قسەڵۆك شایعە Rumour

دەنگۆ، بە هەواڵێك دەگوترێ کە سەرچاوەیەکی ڕوون و ئاشکرای نییە و بەڵگەی پێویست لەسەر ڕاست و ڕەوابوونی بەدەستەوە نەبێت. لە ڕوانگەی سایکۆلۆجی کۆمەڵایەتییەوە، کاتێك کۆمەڵگا لەمەڕ بابەتێك بێ هەواڵ دەمێنێت، ڕێگا بۆ قاوداخستن و سازبوونی دەنگۆ خۆش و لەبار دەبێت. بە واتایەکیتر هەر کاتێك جەماوەر لە ئاستی شتێکدا هەستی ببزوێ و لەسەر ئەو بابەتە هیچ هەواڵێك بڵاو نەکرایەوە، ئینجا قاوداخستن و دەنگۆ بازاڕی گەرم دەبێت. وێدەچێ دەنگۆ پتر لەو کۆمەڵگایانە ڕوو بدات کە میدیاکان دەورێکی چالاك نەبینن لە ڕاگەیاندنە گشتییەکاندا. دەنگۆ، دەماودەم بڵاو دەبێتەوە و لە هەر گوتنەوەیەکدا کورتتر دەبێت و ئاسانتر لێی تێدەگەن.

## دەوڵەت دولت State

دەوڵەت لە وشەی لاتینی (status) وەرگیراوە کە ڕەگ و ڕیشەی ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ وشەی (stare) بە مانای «ڕاوەستاو». دەوڵەت لە مانایەکی بەربڵاودا بریتییە لە کۆمەڵگەیەك کە تێیدا هێزی سیاسی بە



دەستووری بنچینەیی شیکاری و دەستنیشان کرابێت. دەوڵەت باڵاترین ڕواڵەتی دەسەڵات و حاکمیەتە کە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەبووە. گرینگترین لایەنی فەرمانڕەوایی دەوڵەت، دانان و پیادەکردنی یاساکانە لە کۆمەڵگادا. دەسەڵاتی دەوڵەت لەگوێن فەرمانڕەوا، لە ناو وڵاتێکدا شتێکی بێوێنەیە. تێگەیشتن لە چەمکی دەوڵەت پێویستی بە فاماندنی ئەندێشەی سیاسی و سیاسەت لە سەدەکانی نۆزدە و بیستەمدایە. لە کردەوەدا ئەستەمە بێ دەوڵەت ژیان بەڕێوەبچێت. هەبوونی دەوڵەت جگە لەوەی بە مانای هەبوونی کۆمەڵێك دەزگا و ڕێکخراوەیە، بە مانای بوونی ڕوانگە و شێوازی هەڵسوکەوتی جۆراوجۆرە کە بە کورتی بە شارستانییەت ناوبردە دەکرێت. هەڵبەت هەندێ وێستگەی فیکری بە گومانەوە لە بەرامبەر ***پێویستیی دەوڵەت*** لەنگەر ئەگرن و هەندێ رامانەیان لە بابەت کۆمەڵگای بێدەوڵەت ئاراستەکردووە بەڵام دەوڵەت، لە ناو کاروباری ڕۆژانەدا بە وردی دزەی کردووە و ئەم ڕەوتەش تا دێت، بەرفراوانتر ئەبێت.

دەوڵەت لە هەر کۆمەڵگەیەك، هێمایەکە بۆ بەرژەوەندی و سوودی گشتی و ئەگەرچی ڕواڵەتێکی ئەخلاقی و ئایینی و ئابووری هەیە بەڵام لە بنەڕەتدا پێکهاتەیەکی ئەخلاقی و ئابووری و ئایینی نییە و ڕۆڵی جیاوازی هەیە، بۆ وێنە پاراستنی ئاسایش و پاراستنی مافە سروشتییەکانی تاك و دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆشگوزەرانی خەڵکی کۆمەڵگا.

لە پێوەند لە گەڵ دەوڵەت چەندین تێوری هاتۆتە ئاراوە کە بریتین لە:

- تیوری دەوڵەتی ڕەها (absolutism) بە واتای ڕژێمێکی بێ جڵەو و نەبەستراو بە دەستوورەوە. (لە راستیدا یەکەمین لێکدانەوە و هەڵوێستەی وشیارانە لە مەڕ چەمکی دەوڵەت، لەم تیۆرییەدا بەرجەستە بۆوە).
- تیۆری دەوڵەتی دەستووری (constitutional) (بڕوانە حوکمەتی دەستووری).
- تیۆری ئەخلاقیی دەوڵەت، ئەم تیۆرییە زیاتر پابەندە بە ئەندێشەکانی هێگل (١٨٣١-١٧٧٠).
- تیۆری چینایەتی دەوڵەت، ئەم تیۆرییە لێکدانەوەی چەمکی دەوڵەتە بە پێی بۆچوونەکانی مارکس و ئینگلس.

هەندێ لە تیۆرییەکانی دەوڵەت، لەسەر لایەنی ناچاریی دەوڵەتەکان پێ دادەگرن. ریالیستە سیاسی و مارکسییەکان، دەوڵەت بە ئامرازی ناچاریی و جەبری لە قەڵەم ئەدەن. هەندێکیتر دەوڵەتیان بە پێکهاتێکی یاسایی و بێدەسەڵات ناوبردە کردووە.

بە گشتی سێ پێناسەی جیاواز لە بابەت دەوڵەت ئاراستە کراوە: پێناسەی قانوونی، پێناسەی فەلسەفی و پێناسەی سیاسی.

لە پێناسە قانوونییەکەیدا دەوڵەت بریتییەلە یەکەیەك کە ئەم تایبەتمەندییانەی لە خۆ گرتبێ:

١- حەشیمەت،( واتە دەوڵەت، بێ حەشیمەتی ئینسانی نایەتە کایەوە).

٢- سەرزەمین، (دەوڵەت ئەبێ خاوەن کیانێکی دیاریکراو بێت).

٣- حاکمییەت، (بڕوانە فەرمانڕەوایەتی).

PDF 4 KURD

٤ـ حوکمەت، (خەڵك ناتوانن بە ئامانجەکانیان بگەن بێئەوەی بە شێوازێکی رێکخراوەیی لە کۆمەڵێك رێسای دیاریکراو پەیرەوی بکەن).

لە پێناسە فەلسەفییەکەیدا دەوڵەت، خاوەنی ئامانجێکی سەرەکییە و لە سۆنگەی دەوڵەتی چاك، دەوڵەتی خوازراو یا دەوڵەتی خاوێن، ئەم گوزارە لێك ئەداتەوە. لە روانگەی فەلسەفییەوە، سێ قوتابخانەی فیکری لە سەر دەوڵەت ئەدوێن:

١ـ بوونی دەوڵەت، بۆ رێکخستن و هاوئاهەنگی نێوان کەرتە جیاجیاکانی کۆمەڵگا شتێکی پێویستە. فەیلەسوفانێکی وەك پلاتۆ، ئەرەستۆ، ئەکڤیناس و ئاگۆستین و سیسرۆ لەم قوتابخانەدا جێئەگرن.

٢ـ دەوڵەت بەرەنجامی پەیمانێکی کۆمەڵایەتییە، ئەم تیۆرییە لەلایەن فەیلەسوفانێکی وەك هۆبز و لاك و رۆسۆ داکۆکی لێکراوە.

٣ـ دەوڵەت لە ئەنجامی خەباتی هێزە ناتەبا کۆمەڵایەتییەکان پێکهاتووە، مارکس ولایەنگرەکانی لەم تیۆرییە داکۆکی دەکەن. مارکس سەرچاوە و ماهییەتی دەوڵەت گرێ ئەداتەوە بە پێوەندی بەرهەمهێنان لە وڵاتێکدا و دەوڵەت بە ئامرازێکی راپەراندن دەزانێ بەدەست سەرمایەدارەکانەوە و بە ئەنجامی ململانێی چینایەتی دەزانێت کە بە هۆیەوە چینە ستەم دیدەکان لە کۆت و بەندی دیلیەتیدا دەمێننەوە.

لە پێناسە سیاسیەکەیدا دەوڵەت، ئەو پێکهاتە بێغەشە نییە کە فەیلەسووفان خەونیان پێوە دیوە بەڵکوو دیاردەیەکە، پابەند لەسەر واقیعەکانی رابردوو، ئێستا و داهاتوو.

چەمکی نوێی دەوڵەت، لە گەڵ ناسیۆنالیزم* پێوەندییەکی راستەوخۆی پەیداکردووە. ئەم روانگە کە لە دوا شۆڕشی فەرەنسەوە بە جیهاندا بڵاو بۆتەوە، هەموو جیهانی خستۆتە ژێر کاریگەری خۆی بە چەشنێك داخوازی بۆ دامەزراندنی«دەوڵەتی نەتەوە»، گرینگترین هاندەری بزاڤە سیاسییەکان و شۆڕشەکانی سەدەی بیستەم بووە. هەندێ لە بیرمەندانی سیاسی، لە نێوان کۆمەڵگا و دەوڵەت یان «کۆمەڵگای مەدەنی»و «کۆمەڵگای سیاسی»، جیاوازی قایل بوون. بە پێی ئەم جیاوازییە، دەوڵەت، هاومانا نییە لە گەڵ سەرجەم کومەڵگادا بەڵکوو بەشێکە لە کۆمەڵگا کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن ئەو، حوکم دەکات.

**دەوڵەت شار** دولت شهر Polis/city-state

بەو حوکمەتانە کە لە یۆنانی کۆندا دامەزرابوون پێیان دەگوت دەوڵەت شار. بەڵام لە سەدەکانی ناوەڕاست و چاخی نوێدا بەو شارە ئەوروپییانەش کە سەربەخۆ و خاوەن دەسەڵاتێکی بەهێز بوون، ئەم زاراوەیان بۆ بەکار دەبرا. دەوڵەت شارەکانی یۆنانی کۆن خاوەنی رێکخراوە و دامودەزگا بوون کە سەرجەم لە دەزگایەکی حوکمەتی بەناوی «دەوڵەت» پێك دەهات.

**دەوڵەتانی لاسار** دولت‌های خودسر Rogue states

بە دەوڵەتانی یاخی و چەمووش دەگوترێ کە لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا بە هۆی رژێمی سیاسی

PDF 4 KURD

بۆچوونی ئایدیۆلۆجیکی ڕێبەرەکەیان، تووشی گۆشەگیری دیپلۆماسی و سەرشۆڕیی ئەخلاقی دەبن. شەرعییەتی ئەم دەوڵەتانە لە بەر پێمل نەبوونیان بە یاسا نێودەوڵەتییەکان ئەکەوێتە ژێر پرسیارەوە. نموونەی کلاسیکی ئەم جۆرە دەوڵەتانە، ئەفریقای باشوورییە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٤ تا ١٩٩٤. ئاپارتایدو ئاکارە سیاسییەکانی ناوخۆیی و دەرەکی ئەم ڕژێمە، لە گەڵ پێوانەکانی ماف مرۆڤ و ماف چارەی خۆنووسین، دژایەتی ئاشکرای هەبوو(بڕوانە جیاوازی ڕەگەزایەتی).

زاراوەی دەوڵەتانی لاسار، بەزۆری ئاماژە ئەدات بە سیستەمی سەرکردایەتی (Leadership)، نەك سیستەمی سیاسی خەڵك یان نەتەوەکان بەتایبەت ئەو ڕێبەرانەی کە فێڵباز و کەللەڕەق و شەڕخواز و سەرسەری و ناکەس بن.

**دەوڵەتی ئازاد** دولت آزاد Free state

بریتییەلە دەوڵەتێك کە نیشتمانپەروەرانی وڵاتێکی داگیرکراو لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیان وەك دەوڵەتی کاتی دایدەمزرێنن و ڕزگارکردنی وڵات بە ئەرکی سەرەکی خۆیان دەزانن. ئەم دەوڵەتە کاتێك دروست ئەبێ کە ژمارەیەك لە دەوڵەتەکان، دانی پیا بنێن و بە نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکی ئەو وڵاتەی بزانن.

**دەوڵەتی پۆلیسی** دولت پلیسی Police state

دەوڵەتێك کە تێیدا پۆلیس ـ بە تایبەت پۆلیسی نهێنی ـ دەسەلاتێکی بەرفراوانی هەیە لە تۆقاندن و ترساندنی ئەو شارۆمەندانەی کە مافەکانیان پێشێل ئەکرێت و ناتوانن لەڕێی قانوونییەوە دەنگی نارازایەتی خۆیان هەڵبڕن. نموونەی ئەم حوکمەتانە وڵاتانی دیکتاتۆری یا تۆتالیتەرن کە تێیدا نەیارانی ڕژێمەکە سەرکوت ئەکرێن و کەسانی نارازی، تەنیا بە هۆی سیاسییەوە دەخرێنە بەندیخانەوە.

**دەوڵەتی تاراوگە** دولـت در تبعیـد Government in exile

دەوڵەتێك کە لە دەرەوەی خاکی وڵاتەکەی خۆی دامەزراوە. دەوڵەتی تاراوگە یا دەوڵەتی بزر، بە دەوڵەتی قانوونی وڵاتێك دەگوترێ کە ئەمێستا داگیر کرابێت و تا ئەوکاتەی کە دوورەپەرێزی خۆی بە کاتی بزانێت، لە دیدی ئەو وڵاتانەی کە وەك دەوڵەتێکی قانوونی بە ڕەسمییەت ناسیویانە، دەوڵەتی قانوونی دەمێنێتەوە. دەوڵەتێك کە لە دەرەوەی خاکی وڵاتەکەی خۆی دامەزراوە، هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ دەوڵەتی پێشوودا نییە. دەوڵەتی تاراوگەی نوێ، پێش ئەوەی ببێتە خاوەنی دەسەلاتی پێویست بۆ نوێنەرایەتی کردنی وڵاتەکەی دەبێ لە لایەن وڵاتانی دیکەوە بە ڕەسمی بناسرێت. لە وەها دۆخێکدا دەوڵەتی تاراوگەی نوێ، پێشبینی دەکات کە سەرەنجام ببێتە دەوڵەتی قانوونی ئەو وڵاتە. نموونەی دامەزراندنی دەوڵەتی تاراوگە، بریتی بوون لە: دەوڵەتانی چێك، ئیتیۆپیا، یۆنان، هۆڵەندا، نەرویج، پۆڵەندا و یۆگۆسلاڤیا لە شەڕی دووهەمی جیهانی.

PDF 4 KURD

**دەوڵەتی تەواودۆست** دولت كاملەالوداد(بهين دوست) Most Favoured Nation

ئەم زاراوە پتر لە ڕێککەوتننامە بازرگانییە نێودەوڵەتییەکاندا بەکاردێت. لەم جۆرە ڕێککەوتنەدا مادەیەك دەگونجێنن کە بەو پێیە هەر دوو لایەن ماف «دەوڵەتی تەواو دۆست»یان هەبێت. بە واتایەك ئەگەر لایەنێك باجی گومرگی دەوڵەتێکی سێهەم کەم بکاتەوە یا مافێکی بازرگانی تایبەتی بداتێ، ئەوا لایەنەکەی دیکەش خۆبەخۆ دەبێتە خاوەنی ئەو مافە. نموونەی ئەم ڕێککەوتنە لە دانیشتنی مۆسکۆ (١٩٩١/٧/٣٠) لە نێوان سەرۆکی هەر دوو وڵاتی ئەمریکا و سۆڤیەت بە ئەنجام گەیشت کە ئەمریکا ماف دەوڵەتی تەواو دۆستی بە پێی پێنج ڕێککەوتننامە بە سۆڤیەت بەخشی.

**دەوڵەتی جەنگی** دولت جنگی War state

بۆ ئەوەی دەوڵەتێك لە کاتی قەیران و بە تایبەت لە کاتی شەڕدا بەخێرایی و یەکگرتوویەکی پتەو بتوانێ ئیش بکات بە ناچار، دەوڵەتەکەی بە حاڵەتی جەنگی ڕادەگەیەنێ تاکوو بە دەسەڵاتێکی بەرفراوانەوە بە دامودەزگا حوکومییەکان ڕابگات. بەم بۆنەوە لە چالاکییەکانی بەرهەمهێنانی تایبەتی دەست وەرئەدا و ئازادی تاکەکەس، سنووردار ئەکات.

**دەوڵەتی خۆشگوزەران** دولت رفاه Welfare state

سیستەمێکی سیاسی کە دەوڵەت خۆی بە بەرپرسی پشتگیری و پێشکەوتنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانی شارۆمەندانی وڵاتەکەی دەزانێ. ئەم دەوڵەتە ئەبێ پێداویستی خزمەتگوزاریی دەرمانی و بیمەی نەخۆشی و بێکاری و خانەنشینی و یارمەتی ماڵ و خێزان، هەر لە منداڵییەوە تا سەری پیری بۆ هەمووان دابین بکات. بیمەی کۆمەڵایەتی لە ساڵی ١٨٨٠ لە ئەڵمانیا و ١٩١٤ لە بەریتانیا ڕەواجی پەیدا کرد بەڵام وەك بەرنامەیەکی گونجاو، هەروەها زاراوەی «دەوڵەتی خۆشگوزەرانی»، یەکەم جار لەلایەن حیزبی کرێکاری بەریتانیا لە ٥٠-١٩٤٥، هاتە ئاراوە.

ڕەخنەگرانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، لەسەر ئەم خاڵە پێدائەگرن کە خەڵکانی بەهرەدار لەم جۆرە دەوڵەتەدا لەش قورس دەبن و هەوڵی ئیش و کار نادەن. بە گشتی بزاڤی *سۆسیال دیموکراسی** لە ئەورووپا دەورێکی کاریگەری بووە لە پێشخستنی بیرۆکەی ئەم جۆرە دەوڵەتانەدا. سەرکەوتوترین نموونەی ئەم سیستەمە لە لایەن حیزبی سۆشیالیستی سوید دامەزراوە کە ئەگەڕێتەوە بۆ دوای شەڕی جیهانی دووهەم.

**دەوڵەتی داسپاردە** دولت دست‌نشانده Pappet Government

ڕژێمێك کە بە ڕواڵەت سەربەخۆ بێت کەچی لە ڕاستیدا لە لایەن حوکمەتێکی دیکەوە کۆنترۆڵ و ئیدارە ئەکرێت. بۆ وێنە ڤیچی فرانس لە سەروبەندی شەڕی دووهەمی جیهانی کە زێدەتر لە کۆنترۆڵی فەرەنسەدا بوو.

PDF 4 KURD

**دەوڵـەتی سـێبەر** کابینـەی سـایە Shadow cabinet

ڕێبەرانی حیزبی کەمینە لە پەرلەمانی بەریتانیا هەرکاتێك دەسەڵات بەدەستەوە بگرن، دەبنە ئەندامی کابینە. دەوڵـەتی سـێبەر یـان دەوڵـەتی خـەیاڵی، کابینەیـەکی گریمـانکراوە کـە حیزبـە کەمینـەکان لـە وڵاتـانی دیموکراسـیدا بـۆ خۆیـان سـازی دەکـەن و بـۆ هـەر وەزارەتێـك، وەزیرێکـی خـەیاڵی دەسـتنیشـان دەکـەن. تایبەتمەندی ئەم کارە لەوەدایە کە حیزبی کەمینە چاودێریی بە سەر هەموو کاروبارێکی دەوڵەتدا دەکات و دەتوانێت لەم بارەوە پێشنیاز و بیر و بۆچوونی سوودمەند بخاتە ڕوو.

**دەوڵەتی کاتی** دولت موقت Provisional State

دەوڵەت یا حوکمەتێك کە لـە بەرزەخێکی سیاسی واتـە لە کاتی گواستنەوەی دەسـەڵات لـە سیستەمێکی سیاسیەوە بۆ سیستەمێکی سیاسی دیکە دروست ئـەبێ و تا پەسندکردنی دەستووری بنچینەیی نـوێ و دانـانی دامودەزگـای تـازەی سیاسـی، کاروبـاری وڵات لـە ئەسـتۆ دەرەگـرێ. (بـۆ نموونـە گـۆڕینی سیسـتەمی بەعسی عێراق بە سیستەمی کۆماری فیدراڵی لە ساڵی ٢٠٠٥ لەم وڵاتـە یـان گـۆڕینی ڕژێمی پاشایەتی ئێران بـە کۆماری ئیسلامی لـە سـاڵی ١٩٧٩). ڕەنگـە دەوڵـەتی کـاتی لـە دەرەوەی وڵات بنیـات بنرێت، ئـەوەش لـە کاتێکدایە کە ئەو وڵاتە داگیرکرابێت یا سەرقاڵی شەڕ و شۆڕش بێت. ئەم جۆرە دەوڵەتە هەروەها بە دەوڵـەتی ئازاد* ناوبردە ئەکرێت.

**دەوڵەت ـ نەتەوە** دولت ـ ملت Nation-state

شێوازێك لە سیستەمی سیاسی کە لە سەدەی شازدەوە، لە نێوان حوکمەتە فیۆدالییەکانی ئەوروپا سـەری هەڵدا و هـەموو جیهـانی گرتـەوە. لـەم سیستەمەدا لـە نێـوان دەوڵـەت *ـ وەك بـاڵاترین ڕێکخـەری تـەکوزی و نـەزمی سیاسی ـ و نەتـەوە* ـ وەك پێکهێنـەری تـەکوزیی سیاسی ـ پێوەندییـەکی تێـر و تـۆخ و ڕەهـا دێتـە ئـاراوە. لـەم شێوازەدا مـەفرووزە کـە نەتـەوە کـەمتاکورتێك، کۆمـەڵێکی ئینسـانی هاوشـێوەیە کـە خـاوەنی هەسـتێکی نەتـەوەیی هاوبەشـە و لـە نـاو سـنوورێکی دیـاریکراوی دەوڵـەتێکی سـەربەخۆدا ئـەژی. «دەوڵـەتی نەتەوەیی» لە دنیای ئەمڕۆدا باڵاترین شێوەی تەکوزی سیاسی ناوبردەکراوە.

جیهـانی سیاسـی ئیمـڕۆ بـە واتـای پێکهاتێکـە لـە نەتـەوەکان، ئـەو نەتەوانـەی کـە ڕێکخـراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان پێکدەهێنن. ڕەنگە لـە گـەڵ ئەم پێناسـەدا نـەیاریی بکرێت کە ئەندامانی ڕێکخراوەکە، نەتـەوەکان نـین بـەڵکوو وڵاتـەکانن و زۆربـەی نەتـەوەکان لـە بـەینی چـەند وڵاتێك دابـەشکـراون بـەڵام ئەمـە پێناسەی ڕەسمی جیهانە لە پێکهاتەی خۆی ئەمەش بە میرات و جێماوەی ناسیۆنالیزم* لە ئەژمار دێت.

یەکێك لە سەرباسەکانی دەوڵەتی نەتەوە، جیاوازییەکانی دەوڵەت و نەتەوەیە کە لێرەدا بە چەن خاڵێك لەو جیاوازییانە ئاماژە دەکەین:

١ـ دەوڵـەت بەرهـەمی هۆکارگـەلێکی دیـاریکراوی وەك سـەربەخۆیی سیاسـییە بـەڵام نەتـەوە، دەرەنجامی

PDF 4 KURD

هۆکارگەلێکی دیاریکراوە کە بۆتە هۆی پەیدابوونی کۆمەڵێکی مێژوویی سەقامگرتوو.

٢- خەڵکی دەوڵەتێك، رەنگە پێوەندییان بە نەتەوەیەکەوە ببێت یا نەبێت، کەچی نەتەوە رەنگە بوونێکی سیاسی سەربەخۆی هەبێت یا کەرتێك بێت لە دەوڵەتێکی گەورەتری فرەنەتەوە. هەندێ لە نەتەوەکان رەنگە لەناو زیاد لە یەکەیەکی سیاسی دابەش بووبێتن وەك کۆریاییەکان و کوردەکان.

٣- دەوڵەت دەزگایەکی سیاسی - یاساییە، بەڵام نەتەوە، دیاردەیەکی مێژوویی - سیاسی و کەلتوورییە.

٤- دەوڵەت، بەرهەمی فراژووتنی مێژوویی نییە بەڵام نەتەوە دەرەنجامی ژیانی هاوبەشی دوور و درێژی جەماوەرە.

٥- دەوڵەت لە هەر سەردەمێکدا کیان و نیشتمانێکی دیاریکراوی هەیە و ئەم زێدەش، رەنگە بە هۆی زۆرداریی یا یەککەوتنەوە تووشی گۆڕان بێت کەچی نەتەوە، لەباری مێژووییەوە جڤاتێکی راوەستاو لەئەژمار دێت و بە پێی ویست و ئیرادە، گەورە و بچووك نابێتەوە.

٦- لە سەروبەندی کەونینەی مێژووی مرۆڤیشدا دەوڵەت هەبووە بەڵام نەتەوە، بەرهەمی چاخی نوێیە و دەرەنجامی ئاوێتەبوونی خێڵ و عەشیرەت و گروپە رەگەزییەکانە بە زەبری شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری.

## دەوڵەتی یاسایی — دولت حقوقی — Rechtsstaat

زاراوەی دەوڵەتی یاسایی بەرهەمی ئەندێشەی کۆنی ئەڵمانیایی و سویسرایە. فریدریخ یۆلیۆس، سیاسەتمەداری کۆنەپارێزی ئەڵمانی پێی وایە: «دەوڵەت ئەبێ سنووری رەفتارەکانی خۆی و پانتای هاندانی شارۆمەندان بە شێوازێکی وردی یاسایی دەستنیشان بکات بێئەوەی زیانێکی بچووك بەرکەس بکەوێت».
تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی یاسایی، بریتین لە:

- هەبوونی دەستووری بنچینەیی کە تێیدا هێزەکان جیاکرابێتەوە و دەسەڵات دابەش بووبێت. (بڕوانە: جیا کردنەوەی هێزەکان)

— دیاریکردنی هەندێ ماف ئازادیخوازانە و جوامێرانەی کۆمەڵایەتی شارۆمەندان لە دەستووری بنچینەییدا بە چەشنێك کە دانانی یاسای نوێ ببەستێتەوە بەم مافانەوە.

## دیپلۆمات — دیپلمات — Diplomat

بە کارمەندانی پایەبەرزی وەزارەتی دەرەوە و ئەو کەسانەی کە سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێك بەڕێوە ئەبەن، دیپلۆمات ئەگوترێ. دیپلۆماتەکان، لە زۆربەی وڵاتان بەم ریزەی خوارەوە پۆلێنبەندی دەکرێن:

راوێژکار(پلە ١، پلە ٢، پلە ٣)، سکرتێری یەکەم، سکرتێری دووەم، سکرتێری سێیەم و ئاتاشە (کارمەند) کە خۆی بە کارمەندی سیاسی، سەربازی، ئابووری و کەلتووری دابەش ئەکرێت.

دیپلۆمات ئەبێ جگە لە بوارە زانستییەکەی خۆی، لە بوارە جۆراوجۆرە زانستی و کۆمەڵایەتییەکا

PDF 4 KURD

دیکەش بەهرەی هەبێ و لە داب و نەریتی خەڵکی ئەو وڵاتەی کە تێیدا ئیش دەکات ئاگاداربێت.

**دیپلۆماسی** دیپلماسی Diplomacy

دیپلۆماسی، لە وشەی «دیپلۆما»ی یۆنانی و لاتینی وەرگیراوە کە بە مانای بەڵگە و بڕوانامەیە. هەروەها مانای زمان شیرین و زمان لووسیشی لێ بۆتەوە. ئەم وشە لە زاراوەی گشتی و زانستی سیاسەت بە سێ مانای سەرەکی راڤە کراوە:

١ـ بە گشتی، دیپلۆماسی بریتییەلە پێوەندی نێوان دەوڵەتەکان. هەندێ لە بیرمەندانی سیاسەتی نێونەتەوەیی، دیپلۆماسی بە رەگەزێکی دەسەڵاتی نەتەوەیی لە قەڵەم ئەدەن و هەندێکی تریش تەنیا وەك ئامرازێك بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی نەتەوەیی ناوبردەی ئەکەن.

٢ـ واتایەکی تری ئەم زاراوە، بە گفتوگۆ و دیالۆگ لێکدراوەتەوە چونکا مەبەست لە گفتوگۆ سازش کردنە کەواتە لەم روانگەوە ئەکرێ دیپلۆماسی بەم جۆرە پێناسە بکەین: هونەری مامەڵەکردن لە گەڵ سیاسەتی نێونەتەوەیی کە رێگا لە مەترسی تیاچوونی بەرژەوەندی و *ئاسایشی نەتەوەیی** دەگرێت.

٣ـ سەرەنجام، دیپلۆماسی پێناسەیەکە بۆ شێواز و مێتۆدی ئیشکردنی دەزگای بەڕێوەبەری پێوەندی نێودەوڵەتی و چۆنییەتی هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەی کە بەرپرسی کردنەوەی ئەم جۆرە پێوەندییانەن.

یەکێك لە بابەتە گرنگەکانی دیپلۆماسی، چۆنییەتی گرێبەستی جەنگ و دیپلۆماسییەتە. لەم رووەوە دیپلۆماسی، ئامرازێکە کە بە کەڵك وەرگرتن لێی، سیاسەتی دەرەکی لەبری شەڕ وپێکدادان بە ئامانجەکانی خۆی ئەگات بە دیوەکەی تریشدا دەستپێکردنی شەڕ بە مانای شکستهێنانی دیپلۆماسییەتە.

**دیپلۆماسی ئاو:** بڕوانە سیاسەتی ئاو.

**دێتانەت/هێورسازی** دتانت/تنش‌زدایی De`tente

وشەکە بە زمانی فەڕەنسی بە واتای شلکردنەوە و ئارامی و حەسانەوەیە. لە زاراوەی سیاسیشدا بە مانای کەم بوونەوەی ئاڵۆزی و ناحەزی و دوژمنایەتی نێوان وڵاتان و ئاسایشی نێوان وڵاتانە. قۆناغی هێورسازی، رەنگە بە پێی بڕیارنامەیەکی رەسمی یا خود لە ئاکامی گۆڕانی ستراتیجی نەتەوەیی لە ماوەی چەندین ساڵدا رووبدات. بۆ نموونە پەیمانی لۆکارنۆ(١٩٢٥) لە ئەورووپا کەم تا زۆر، بە دوا خۆیدا سەقامگیریی هێنا. لە دەیەی ١٩٦٠ قۆناغێکی هێورسازی لە نێوان وڵاتیەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەت هاتە کایەوە کە لە سەر بنەمای پێکەوە ژیانی ئاشتیخوازانە و ئەم راستییە دامەزرابوو کە شەڕێکی هەمەلایەن، سەرەنجام بە تیاچوونی هەر دوولا تەواو دەبێت.

**دیتێرمینیزم :** بڕوانە ئیرادەگەریتی.

PDF 4 KURD

**دیسپۆتیزم/ لاساریگەریی** دسپوتیسم/خدایگانسالاری Despotism

ئەم وشە لە ریشەی یۆنانی (despoties) بە مانای سوڵتان و دەسەڵاتداری تاکڕەو وەرگیراوە. مەبەست لەم زاراوە، دەسەڵاتێکە کە هیچ سنوورێکی رێژەیی و یاسایی نییە و بە لاساری و بەربەرەڵا بەکار ئەبرێت. پێشوونەی ئەم وشە لە زاراوەی سیاسیدا ئەگەڕێتەوە بۆ ٢ هەزار ساڵ لەمەوبەر. هەڵبەت تا چەند سەدەیەك بەر لە ئێستا، دیسپۆتیزم لە گەڵ زاراوەی تیرانی (بڕوانە زۆرداریی) بەبێ رەچاوکردنی جیاوازییەکانیان، لەبری یەکتر بەکار دەبران. بەڵام ئەم چەمکە بە مانا نوێباوەکەی، پەیوەستە بە ئەندێشەی بیرمەندانێکی وەك دۆتۆکویل، هێگل، مارکس و ویتفۆگێل.

هێگل و مارکس، ئەم زاراوەیان بە شێوەیەکی هاوبەش بۆ پێناسەکردنی ئەو جۆرە کۆمەڵگایانە بەکار هانیوە کە لە رەوتی مێژوویی خۆیان بەرەو شارستانییەت، تووشی کپبوون و بێدەنگی هاتوون. هێگل، پێی وایە کە مێژوو لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو رۆژاوا رۆشتووە و لەم رەوتە مێژووییەشدا دێسپۆتیزم، یەکەمین قۆناغی ئەم جووڵە بووە کە ئامانجە سەرەکییەکەشی دامەزراندنی حوکمەتێکی پادشایی بووە لە ئەورووپادا بە باوەڕی ئەو، لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی رۆژاوا لە ئازادی حەساونەتەوە، کەچی لە رۆژهەڵات، تەنها یەك کەس (پادشا یا دەسەڵاتدار) لە ئازادی بەهرەمەندە و لەم سۆنگەوە شارستانییەتی رۆژهەڵات لە یەکەمین قۆناغی مێژوویی خۆیدا ماوەتەوە.

کارۆڵ ویتفۆگێل کۆمەڵناسی ئەڵمانی. بە پێوانەی تیۆرییەکەی مارکس دەربارەی شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی، رامانەیەکی نوێ لە سەر دێسپۆتیزم دەرئەکات کە هەموو شارستانییەتە خۆرهەڵاتیەکان (چین، هێند و ئێران) و تەنانەت شارستانییەتە سوورهووڵەکانی ئەمریکا (ئینکا، مایا و ئازتەك) لە خۆ دەگرێ. بەڕای ئەو، تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە بریتییەلە:

١) رژێمی سیاسی ئیستبدادی.

٢) نەبوونی چینی ئاریستۆکراتی بەردەوام (بڕوانە ئاریستۆکراسی).

٣) چەقبەستنی لەرادەبەدەری سیستەمی ئیداری وڵات.

٤) نزمبوونی پێگەی کۆمەڵایەتی بازرگانەکان لە کۆمەڵگادا.

٥) بەکارهێنانی ئاودێریی بەرهەڵدا لە کشتوکاڵدا.

**دیفاکتۆ**: بڕوانە ناسینەوەی دووفاکتۆ.

**دیکتاتۆری** دیکتاتوری Dictatorship

زاراوەی دیکتاتۆری لە وشەی لاتینی dictator لە رۆمی کۆن، بە واتای مەقامی بڵیندپایە بە زماندا هاتووە کە بە دەسەڵاتێکی ئێجگار زۆرەوە ئیدارەی وڵاتی بەدەستەوە بووە. لە بنەڕەتدا دیکتاتۆری پلەیەك بووە کە لە کۆماری رۆمی کەونینەدا، لە کاتێکی قەیراناوی بە کەسێك دەدرا. لەم سەروبەندەدا ئەو کەسە

PDF 4 KURD

تەواوی دەسەڵاتی حوکمەت و هێزی سەربازی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو (٦ مانگ) بەدەستەوە دەگرت. لەم رووەوە دیکتاتۆری رۆمی، بە چەشنێك دەسەڵاتێکی یاسایی بووە بەڵام لە کۆتایی سەردەمی کۆماری ئەو سیاسالارانەی کە بە شێوەی ناڕەوا دەسەڵاتیان بەدەست ئەهێنا خۆیان بەم ناوبانگەوە ناساند و ئینجا دیکتاتۆری، رواڵەتێکی نایاسایی بەخۆوە گرت.

لە زاراوەی سیاسی ئیمرۆدا ئەم زاراوە بەو رژێمانە ئەگوترێن کە تێیدا کەسێك یان حیزبێك، مەجال نادات گرووپەکانیتر تاکوو ئەوانیش بەشداری بکەن لە دەسەڵاتدا و بەمجورە دەسەڵاتی هەموو هێزەکانی وڵات بەدەستەوە ئەگرێت. نموونەی رژێمی دیکتاتۆری لە سەدەی بیستەمدا بریتی بوون لە: هیتلەر(١٨٨٩-١٩٤٥) لە ئەڵمانیا، مۆسۆلینی(١٨٨٣-١٩٤٥) لە ئیتالیا، ستالین (١٨٧٩-١٩٥٣) لە یەکییەتی سۆڤییەت کە لە قەوارەی حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیست و فاشیست و کۆمۆنیزم پێکهاتن و سەرمەشقی حوکمەتی دیکتاتۆری حیزبی و تاکەکەسی لە ئەژماردێن.

دیکتاتۆرییەکان، بە سێ جۆری کۆنەپەرست و شۆڕشگێڕانە و تێکەڵ دابەش دەبن. دیکتاتۆری کۆنەپەرست، ناهێڵێت پێکهاتە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان تووشی وەرچەرخان ببن. بە پێچەوانەوە دیکتاتۆری شۆڕشگێڕانە، وەرچەرخانی ئەم پێکهاتە کۆمەڵایەتییانە خێراتر ئەکات. بەڵام جیاکردنەوەی ئەم جۆرە دیکتاتۆرییانە لە یەکتر هاسان نییە چونکا لە واقیعدا زۆربەی رژێمە دیکتاتۆرییەکان خۆیان بە شۆڕشگێڕ دەزانن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە سەر شارە وێرانەکان کۆمەڵگایەکی نوێیان دامەزراندۆتەوە. هەندێجار جۆرێك لە دیکتاتۆرییەت هاتۆتە مەیدانەوە کە لە میانەی کۆنەپەرستی و شۆڕشگێڕیدا هەنگاوی ناوە کە پێی دەگوترێ دیکتاتۆری تێکەڵ، بۆ نموونە رژێمی ناپیلئۆن.

رژێمە دیکتاتۆرییەکان بەزۆری لە رێگای نایاسایی وەك کۆدەتای سەربازی جڵەوی دەسەڵات بەدەستەوە ئەگرن بەڵام هەندێ رژێمی دیکتاتۆریش هەن کە لە رێگای یاسایی دەسەڵات بەدەستەوە ئەگرن کەچی پاش سەقامگیربوونی حوکمەتەکەیان ئامادە نین بە هەمان شێوە واز لە دەسەڵات بهێنن. بۆ وێنە هۆگۆ چاڤێز سەرۆك کۆماری ڤەنیزۆئیلا، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٩ بە دەرکردنی یاسایەك لە پەرلەمانی ئەم وڵاتە، توانی رێگا بۆ پاڵاوتنی هەمیشەیی خۆی بۆ پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار هەموار بکات.

هەموو رژێمە دیکتاتۆرییەکان لەم خاڵانەی خوارەوەدا هاوبەشن:

١- کۆجێبوون(چەقبەستن)ی دەسەڵات.

٢- پێشێلکردنی ئازادییەکانی تاك.

٣- نەبوونی قانوون و یاسایەك کە ماوەی دەسەڵاتداریەتی فەرمانڕەوا سنووردار بکات.

٤- نەبوونی یاسایەك بۆ جێ نشینی دەسەڵات.

٥- ملکەچکردنی جەماوەر بۆ دەسەڵات تەنیا بە هۆی ترسەوە.

٦- کەڵك وەرگرتن لە تیرۆر* وەك ئامرازی بەکارهێنانی زەبر و زۆر.

PDF 4 KURD

**دیکتاتۆری پرۆلتاریا** دیکتاتوری پرولتاریا Dictatorship of proletariat

یەکێك لە چەمکەکانی مارکسیزم*ـە کە چۆنییەنی بەکارهێنانی هێزی دەوڵەت لە نێوان شۆڕشی سۆشیالیستی و پیادەکردنی کۆمەڵگای سۆشیالیستی دیاری ئەکات. مارکس لە ڕێبازەکەی خۆیدا بۆ تێپەڕبوون لە قۆناغی سەرمایەداری بەرەو سۆشیالیزم، باسی قۆناغێکیتر دەکات کە بە «دیکتاتۆری پرۆلتاریا» ناوبردەی ئەکات. بە باوەڕی مارکس، دوای ئەوەی پرۆلتاریا لە ڕێی شۆڕشەوە دەسەڵاتی سیاسی بەدەست هێنا، حوکمەتی چینەکەی خۆی(کرێکاران) دائەمەزرێنێ. وەها حوکمەتێك مووچە و حەقدەست بە ڕێژەی ئیش و کار ئەدات و خاوەندارییەتی کەرەستەی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و مەزاختن بەدەستەوە ئەگرێ و هەوساری چینەکانیتر مەهار ئەکات. ئەم حوکمەتە، بە لەناوبردنی کاری دەستی و فیکری و جیاوازیی چینایەتی، ڕێگە بۆ لە دایکبوونی کۆمۆنیزم واتە کۆمەڵگای بەدەر لە چینایەتی، خۆش ئەکات. لەم کاتەدا پرۆلتاریاش وەك چینێك، لەناو ئەچێت و جێی خۆی ئەدات بە ئەنجومەنەکانی هاریکاری بۆ بەدەستەوە گرتنی کەرەستەکانی بەرهەمهێنان.

بەڕای مارکس و لایەنگرەکانی، دیکتاتۆری پرۆلتاریا قۆناغی گواستنەوەیە لە کۆمەڵگای سەرمایەدارییەوە بۆ کۆمەڵگای سۆشیالیستی. مارکسییەکان گرنگییەکی زۆر بەم تیۆرییە دەدەن و بە ئامانجی کۆتایی هاتنی«سەردەمی ڕەنجدەران»ی دەزانن کە بەو پێیە گۆڕانکارییەکی بەرچاو لە هەموو بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکاندا دێتە دی.

یەکێك لەو گرفتانەی کە بۆ مارکسییەکان بۆ بەکار هێنانی ئەم مۆدێلە لە وڵاتانێکی وەك سۆڤیەت و چین بەدی هات، ئەمە بوو کە لەم وڵاتانە بە هۆی دواکەوتوویی ئابووری، پرۆلتاریا زۆر بێتوانا و بێ حەشیمەت بوو بەڵام لێنین و مائۆ، بە دامەزرانی حیزب، لەبری چینێك کە حیزب خۆی بە نوێنەری دەزانێ، لەم مۆدێلە بۆ فەرمانڕەوایی ڕەهای حیزبی کۆمۆنیست کەڵکیان وەرگرت.

**دیکتاتۆریەتی** اقتدارگرایی Authoritarianism

بریتییە لە پشتیوانی کردن لە حوکمەتێکی سەرکوت کار کە فرمانەکانی تەنیا لە ترسی سزادان جێبەجێ دەکرێت. لایەنگرانی ئەم جۆرە حوکمەتانە لەسەر ئەم باوەڕەن کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بە شێوەیەکی خۆڕسك، شەرعی و ڕەوایە و پێویستە خێرا بەڕێوە بچێت چونکا ئەم دەسەڵاتە لە لایەن خواوەند یان ڕەوتی مێژوو بە دەسەڵاتدار سپێردراوە. لایەنگرانی نوێی ئەم ڕژێمانە، سیستەمە دیموکراسییەکان لەمەڕ ئیدارەی کۆمەڵگا بەر ڕەخنە ئەدەن و بۆ ئیدارەی کۆمەڵگا سیستەمێکی دەسەڵاتدار و بەهێز داوا دەکەن کە بێ سەرنجدان بە خواستەکانی فەرمانبەران کاروباری وڵات جێبەجێ بکات.

ڕژێمە دەسەڵات خوازەکان، لەم سۆنگەوە لە گەڵ ڕژێمە دیموکراسییەکان جیاوازییان هەیە کە ئەمان نەیاریی فیکرییان پێ قبوڵ ناکرێ و دەست ئەگرن بەسەر میدیاکاندا و لە بەردەم ئازادییەکانی تاك تەگەرە ساز دەکەن و دەسەڵاتیش ئەسپێرنە دەست تاقمێکی ناوازە. لە کۆمەڵگای دەسەڵات خوازدا بە شێوازی کە

PDF 4 KURD

تاقمی دەسەڵات خواز بۆ ڕاگرتنی دڵی جەماوەر هیچ هەوڵێك نادات و خۆی بۆ لێپرسینەوە ئامادە ناكات بەڵكوو هەوڵ ئەدات جەماوەر تەنیا ملكەچی خۆی بكات. نموونەی ئەم جۆرە حوكمەتانە، ڕژێمە دیكتاتۆرییە فاشیستییەكانن.

## دیماگۆژی — دماگوژی/عوامفریبی — Demagogie

ئەم زاراوە لە وشەی demagogia یۆنانی وەرگیراوە و لە سەرەتادا بە مانای «ڕێبەرایەتی خەڵك» بەكار براوە. لە ڕۆمی كۆنیشدا مانایەكی سەربەرزانەی بووە بە چەشنێك كەسانێكی وەك پریكلێس و دیمۆستێنس و سیسرۆن، بەم ناوە ناوبانگیان دەركردووە. لە زاراوەی سیاسی نوێدا دیماگۆگی، مانایەكی سووكایەتیئامێزی لەخۆی گرتووە و بە واتای فریودانی جەماوەر و بەڵێنی ناڕاست دان و كەڵك وەرگرتن لە هەست و سۆزی خەڵك بۆ گەیشتن بە ئامانجی تایبەت لێكدراوەتەوە.

دیماگۆگ، كەسێكە كە هەستی جەماوەر دەجوولێنێت و هانیان دەدات بە مەبەستی دەسكەوتنی ئامانجەكانی خۆی.

## دیموكراسی — دموكراسی/ مردم سالاری — Democracy

دیموكراسی لە دوو وشەی یۆنانی دیمۆس، بە مانای «خەڵك» و *كراتووس*، بە مانای «حوكمەت» پێكهاتووە. مانای ئەم زاراوە لە پوختەی قسەكانی ئابراهام لینكۆلن(١٨٠٩–١٨٦٥، شانزەهەمین سەركۆماری ئەمریكا) بریتی بوو لە: «حوكمەتی خەڵكی، لە لایەن خەڵكەوە، بۆ خەڵك». ئەم بیرۆكە بە ڕواڵەت زۆر سادەیە، كەچی لە واقیعدا زۆر ئاڵۆز و تێكتەنراوە. ئەگەرچی مانای دیموكراسی تا ڕادەیەك ڕوونە بەڵام ئەم مەسەلە كە «خەڵك» چۆن بە سەر خۆیاندا حوكمەت بكەن هێشتا هەر مژاوییە و ڕوون نەكراوەتەوە. بەم بۆنەوە بۆچوونی جیاواز لەسەر ئەم چەمكە هاتۆتە ئاراوە.

ئیمڕۆكە مەبەست لە دیموكراسی شێوازێكە لە ژیان كە تێیدا دەسەڵات جیا بكرێتەوە و بە هەموو كەس وەڵام بداتەوە. لەم سیستەمەدا جیاوازییەكان بەهەند ئەگیرێن و لە پێگە و جێگەی جەماوەر ڕێز دەگیرێ و دەرفەتی یەكسان بۆ هەمووان دەڕەخسێ. بە كورتی دیموكراسی بە مانای دابەشكردنی دەسەڵاتە بە بێ توندوتیژی و شەڕنانەوە. لە سیستەمێكی دیموكراتیدا هیچ كەس فەرمانڕەوای هەمیشەیی نییە و هیچ كەس لە سەر تەختی دەسەڵات كڕ ناكەوێ. سەركۆمار ئەكەوێتە بەر ڕەخنە و لێپرسینەوە و لە زەمەنێكی دیاریكراودا ئەبێ لە دەسەڵات دەست بكێشێتەوە. كەواتە لەم جۆرە ڕژێمەدا هیچ كەس بۆی نییە دەسەڵات مۆنۆپۆل بكات، بگرە دەسەڵات هەمیشە لە ژێر چاودێری و كۆنترۆڵی هەمووانداية.

دیموكراسی سەدەی بیستەم، بەرهەمی لیبرالیزمی سەدەی نۆزدەهەمە. هەڵبەت لیبرالیزمی ئەم سەدەیەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەندێشەكانی هیوم، میل و ڕۆسۆ. هەندێ كەس دیموكراسی بە ئایدیۆلۆجی سیاسی چینی مامناوەندی لە قەڵەم ئەدەن. جیاوازی سەرەكی دیموكراسی لە سەدەی نۆزدە و بیست لەوەدایە كە ئیمڕۆ

PDF 4 KURD

بنەماکان و ئایدیۆلۆجیای سیاسی چینە مامناوەندییەکان بە ناو چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵگادا بڵاو بۆتەوە.

لە پێناسەیەکی‌تردا دیموکراسی شێوازێکی حوکمەتکردنە بەسەر نەتەوەیەکی باڵغ و هەراش کە ئەندامانی ئەو نەتەوە خاوەنی بەهرەی بیرکردنەوە و رەخنەگرتن بن و لە راپەراندنی کاروباری کۆمەڵگادا بەشداری بکەن. لەم سیستەمەدا جەماوەر بە مافەکانی خۆیان شارەزان.

یەکێك لەو گرفتانەی کە لەسەر چەمکی دیموکراسی پێش هاتووە، جیاوازی نێوان دیموکراسی راستەوخۆ و دیموکراسی نوێنەرایەتی یا ناراستەوخۆیە. دیموکراسی راستەوخۆ، هەڵگری ئەو زەمانەتەیە کە خەڵك راستەوخۆ بێنە ناو مەیدانەوە بۆ دەرکردنی ئەو یاسا و بریارانەی کە پێوەندی بە ژیانی خۆیانەوە هەیە. بۆ وێنە خەڵکی ئاسینا لە ساڵانی ٥٠٧ تاکوو ٣٢٢ی پێش زایین، ئەم شێوازە حوکمەتەیان پیادە کرد. گەورەترین رەخنەگری دیموکراسی راستەوخۆ، پلاتۆ، فەیلەسوفی مەزنی یۆنانی بوو. ئەو پێی وابوو کە لە جیاتی ئەوەی بریارەکان لە لایەن کەسانی شارەزا و پسپۆرەوە دەرکرێن، سپێردراوە بە کەسانی خاوەن پیشە کە سەریان لە سیاسەت دەرناچێ کەواتە دیموکراسی راستەوخۆ حاکمیەتی جڤاتییە.

دیموکراسی نوێنەرایەتی بە واتای سیستەمێکی حوکوومییە کە تێیدا نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك، یاساکانی کۆمەڵگا دائەنێن. تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە دیموکراسییە بریتین‌لە: یەکەم، هەڵبژاردنی ئازاد ناوبەناو بێتە کایەوە و هەر شارۆمەندێکی هەراش ماف ئەوەی ببێ کە *دەنگ بدا* و *دەنگی پێ بدەن*. دەنگدان ئەبێ دوور بێت لە هەر جۆرە مەترسی و هەرەشەیەك. دووهەم، ئەم جۆرە هەڵبژاردنەش نابێ تەنیا ببەسرێتەوە بە پاڵێوراوانی حیزب یان لایەنێکی دیاریکراو، ئەگەریش زۆرینەی خەڵك دەنگیان نەدا بە مانەوەی حوکمەتی دەسەڵاتدار، ئەبێ دەسەڵات بدرێتە دەست کەسانی‌تر. سێهەم، نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك (پەرلەمان)، ئەبێ ماف یاسادانانیان لە هەموو بوارێك هەبێ و بتوانن بە راشکاوی بریارەکانی دەوڵەت بخەنە ژێر پرسیار یان لە گەڵیا نەیار بن بێ ئەوەی هیچ ترس و خۆفێك یان ئازار و مەترسییەك بێتە سەر رێگەیان.

لەم چاخەدا دیموکراسی پەرلەمانی، باوترین شێوازی دیموکراسییە. بنەمای دیموکراسی بڕواهێنانە بە بایەخەکانی تاکی مرۆڤ و دەرفەتی بریاردەرکردن لە کاروباری گشتی و تایبەتی. ئەگەرچی ئەم شێوازە، لە سەر بنەمای تاکەکەس دامەزراوە بەڵام کاتێك ماهییەتی فرە نەتەوەیی و فرەکەلتووری زۆربەی کۆمەڵگاکان شرۆڤە دەکرێت، گرفتی جۆراوجۆر دێتە بەرچاو. ئەگەر لە وڵاتێك زۆرینەیەکی کەلتووری یەکدەنگ هەبێت، ئەغڵەب جار بەرژەوەندییەکانی ئەو زۆرینە دەستەبەر ئەکرێت. کەواتە رەنگە ئەم شێوازەی دیموکراسی رێگە خۆش بکات بۆ «دیکتاتۆری زۆرینەی کەلتووری». چما نوێنەرانی کەلتووری کەمینەکان یان هیچکات هەڵنەبژێردرێن یان رادەیان هێندە کەم بێت کە لە ئەنجومەنی یاسادانان‌دا کاریگەر نەبن.

دیموکراسی سیاسی لە واقیعدا بە مانای حوکمەتی زۆرینە یان یەك لە سەر نیوەی دەنگەکانە. لە روانگەی فەلسەفەی سیاسییەوە دیموکراسی، خەڵك لە بەرێوەبردنی ئیدارەی کۆمەڵگا و چاودێری بە سەر

PDF 4 KURD

حوکمەت بە حەقدار ئەزانێ و دەوڵەت* بە بەرەنجامی ئیرادەی گشتی لە قەڵەم ئەدرێت.

هێرۆدۆت، مێژوونووسی بەناوبانگی یۆنانی ئەنووسێ: «ئەگەرچی دیموکراسی بۆ هەموو خەڵك لە بەردەم یاسا بە یەك چاو دەڕوانێ بەڵام گرفتێکی هەیە ئەویش بە هاسانی ئەبێتە مۆبۆکراسی، واتە سەروەری کەسانی نەزان و بازاڕی و دەسەڵاتی بۆرەپیاوانی سەرکێش و لاسار»(بڕوانە ئاژاوە خوازی).

ڕەوتی گەشەکردنی دیموکراسی لە جیهاندا ئەگەڕێتەوە بۆ یۆنانی کۆن بەڵام دواتر لە ساڵی ١٢١٥ی زایینی بۆ یەکەمجار، کینگ جۆن پادشای بەریتانیا پاش ڕاپەڕینێکی جەماوەری فەرمانێکی دەرکرد کە بە «جارنامەی گەورە» ناوبانگی دەرکردووە و تێیدا ئەنجومەنێك بۆ نوێنەران پێشبینی کراوە. لە فەرەنساش لە دوای شۆڕشێکی خوێناوی لە سەدەی هەژدە، ئەزموونی دیموکراسی تاقی کراوەتەوە. لە ساڵی ١٨٣١، لە بەلجیکا بۆ یەکەمجار دەستووری دیموکراتی دانراوە کە تێیدا ئازادی نووسین و ڕادەربڕین و کۆبوونەوەکان زەمانەت کراوە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەوە، لە وڵاتانی ئاسیایی و ئەفریقایی دوای دزەکردنی ئەندێشە ئەورووپییەکان، بزاوتی دیموکراسی خوازی لەم دوو کیشوەرەدا گەشەی کرد. بەڵام لە بەر نەبوونی هەلومەرجی پێویست و داکوتانی ڕەگی ئیستیبدادی لەم ناوچانە، زۆربەی ئەم بزاڤانە شکستیان هێنا و دوای ماوەیەك تەنیا بە هێشتنەوەی رووکەشێکی دیموکراسی سەرلەنوێ بە چەشنی دیکتاتۆری نوێ سەریان هەڵدایەوە. هەڵبەت لەم ناوەدا چەن نموونەی سەرکەوتووی دیموکراسی هاتەدی کە ئەکرێ ئاماژە بدەین بە ژاپۆن و هێندستان.

**دیموکراسی پیشەسازانە** دموکراسی صنعتی Industrial democracy

بە پێی ئەم بیرۆکە، ئەبێ کرێکاران لە بڕیارەکانی هاوپێوەند لە گەڵ کارخانە پیشەسازییەکاندا بەشدار بن. لەم بارەوە تیۆری جۆراوجۆر هاتۆتە ئاراوە کە سەرەنجامی ئەم تیۆرییانە خوازیاری رووخانی سەرمایەداری و چەسپاندنی دەسەڵاتی کرێکارانە. تیۆرییەکی نوێ لە بارەی دیموکراسی پیشەسازییەوە ئاراستە کراوە کە پێی وایە ئەم سیستەمە، سەرمایەداری و شانوشکۆی بەڕێوەبەرانی قبووڵ کردووە و ئەم ڕاستییەی درکاندووە کە کرێکاران ناتوانن لە بەڕێوەبردنی کارخانە پیشەسازییەکان سەرکەوتوو بن.

**دیموکراسی جڤاکی** دموکراسی تودەای/دموکراسی خلق People's democracy

ئەم زاراوە لە لایەن وڵاتانی کۆمۆنیستی‌یەوە بەکار ئەبرێت بۆ جیاکردنەوەی سیستەمی سیاسی تاك حیزبی خۆیان لە گەڵ سیستەمی سیاسی فرەحیزبی کە لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژاوا باو بووە و بە دیموکراسی بۆرژوایی ناوی دەبەن. لەم سیستەمەدا حیزبی کۆمۆنیست خۆی بە نوێنەری زۆرینەی کۆمەڵگا یا ڕەنجدەران دەزانێ و ماف چالاکیی سیاسی بە چینە چەوسێنەرەکان نادات. لەم سیستەمەدا بنەماکانی دیموکراسی لیبراڵی ڕۆژاوایی بەرچاو ناکەوێ. پێناسەیەکی تری ئەم سیستەمە، «دیکتاتۆری پرولتاریا»*یە.

PDF 4 KURD

**دیموکراسی کۆمەڵایەتی:** بڕوانە سۆسیال دیموکراسی.

**دیموکراسی لیبرال** دموکراسی لیبرال Liberal Democracy

دیموکراسی لیبرال شێوازێکە لە دیموکراسی ناڕاستەوخۆ یان دیموکراسی نوێنەرایەتی. دیموکراسی لیبرال ڕێز دادەنێ بۆ مافەسرووشتی و مەدەنییەکان و هەروا قاییل بە یەکسانی مافەکانە بۆ هەموو هاووڵاتیان لە بواری سیاسی و دادوەریدا. لەم جۆرە لە دیموکراسیەدا دەسەڵاتی *زۆرینە** بە شێوەیەکی سنووورداری یاسایی جێبەجێ دەکرێت. ئەم سنوورەش، بۆ زامنکردنی بەهرەمەندی کەمینە*یە لە هەندێ لە مافە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکانی وەك ئازادی بیر و ڕا و ئایین.

بە باوەڕی نەیارانی ئەم شێوازە حکوومییە دیموکراسی لیبرال، بێ ڕەچاوکردنی ماق هاووڵاتیان لە بەستێنی ئابووریدا چەواشەکردنی خەڵکە بۆ پەردەکێشان بەسەر جیاوازی چینایەتی کۆمەڵگا. مارکس، دیموکراسی لیبرالی بە دیکتاتۆری بۆرژوایی لە قەڵەم داوە. ئێستا بانگەشەی ئەوە دەکرێت کە لیبرالیزمی ئابووری، هاوڕێ لەگەڵ سیستەمی دیموکراسی، لە گۆڕەپانی خەبات لەگەڵ ئایدیۆلۆجیەکانی دیکەدا سەربەرز و سەرکەوتوو هاتۆتە دەرەوە. چونکا پێکهاتەی سیاسی دیموکراسی لیبرال، دەسپێچکێکی بەهێزە بۆ بەدەست هێنان و پاراستنی دەسەڵات. ئەم سیستەمە لە گەڵ تاقمی بوروکراتی سیاسی هاودەنگە و بەرژەوەندییەکانی ئەوان دەپارێزێت.

بە ڕای هەندێ کەس لیبرالیزم بە هۆی سەروساختی لەگەڵ سەرمایەداریدا ناتوانێ بەو بەڵێنەی کە لەمەڕ ئازادی تاکەکەس بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی داویەتی وەفادار بێت. چونکا لیبرالیزم پارێزەری بەرژەوەندی چینی بەهرەدار لە خاوەندارێتی تایبەتە کە ئەمەش ڕەنگە ببێتە هۆی ململانێ و شەڕی چینایەتی و بەرزبوونەوەی هەڵپەی شەڕ و پێکدادانی جیهانی.

**دیموکراسی مەسیحی** دموکراسی مسیحی Christian democracy

ئەم زاراوە بۆ ئەو حیزبە سیاسییانەی ئەورووپا بەکاردێت کە لە گەڵ کڵێسەی مەسیحی - زۆرتر کاتۆلیکەکان - هاوپەیمانن و بە حیزبی دیموکرات مەسیحی ناویان دەرکردووە و ئەندامەکانیشی بە «دیموکرات مەسیحی» دەناسرێن. ئەم حیزبانە لە سەدەی نۆزدە، بەدژی سەرمایەداری و سۆشیالیزم و جوولەکان بوون. لە ١٩٤٥ بەدواوە، لە شێوازی پێشووی خۆیان وەك حیزبێکی سەرەکی لایاندا و بوون بە کۆنەپارێز و لە وڵاتانی فرەنسا و نەمسا و ئیتاڵیا و بەلیکا و ئەڵمانیا دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت.

**دیواری بەرلین** دیوار برلین Berlin Wall

ئەم دیوارە کە هێمایەکە بۆ شەڕی سارد*، بەو دیوارە ئەگوترێ کە لە ئێوارەی ١٣ی ئاگۆستی ١٩٦١ بە فرمانی ڕووسەکان لە لایەن هێزەکانی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتەوە بینا کرا. ئەم دیوارە کە بە درێژی

PDF 4 KURD

٤٦ ك. م بوو، سەرەتا بە سیمی خاڵدار و پاشان بە بتۆن شاری بەرلینی بە دوو بەشی رۆژاوایی و رۆژهەڵاتی دابەش کرد و لە رێی خاکەوە، پێوەندی خەڵکی بەرلینی رۆژهەڵات و رۆژاوای لێك پچڕاند. هەر لە سەرەتاوە ئەمریکا و بەریتانیا بە بیناکردنی ئەم دیوارە ناڕازی بوون و ئەمەش بووە هۆی پیادەکردنی لەشکرێکی دەبابەی هێزەکانی ئەمریکا لە کەرتی رۆژاوای دیوارەکە.

بە پێی رێککەوتنی یالتا کە لە نێوان هاوپەیمانانی شەڕی دووهەمی جیهانی مۆرکرا، بەرلین لە نێوان هەر چوار وڵاتی داگیرکار دابەشکرا. بەڵام پاشان هەر سێ وڵاتی رۆژاوایی (ئەمریکا و بەریتانیا و فرەنسا) ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە بەرلینی رۆژاوایی بەیەکەوە لکاند و بە هاوکاری یەکتر لە ناوجەرگەی ئەڵمانیای رۆژهەڵات، بەرلینی رۆژاوایان کردە نموونەیەکی پێشکەوتن و گەشەکردنی ئابووری رۆژاوا.

بەدوای گۆڕانکاری و شەپۆلەکانی وەرچەرخان لە ئەورووپای رۆژهەڵات و هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەتی سۆڤیەت، مەسەلەی یەکگرتنەوەی دووبارەی هەردوو بەشەکەی ئەڵمانیا هاتەوە ئارا و سەرەنجام ئەم دیوارە لە ٤ی ئۆکتۆبەری ٨٩ لەدوای ٢٨ساڵ لە لایەن خەڵکی دوو وڵاتەکە رووخێندرا و بە شێوەیەکی رەسمیش، لە رێکەوتی ٨٩/١١/١٨ سنووری نێوان ئەم دوو وڵاتە سەرلەنوێ ئاوەڵا کرایەوە.

PDF 4 KURD

## ر

**راپرسی/ریفراندۆم** همه پرسی / رفراندوم Refrandum

پرسینی ڕا و بۆچوونی ڕاستەوخۆ لە ئەندامانی ڕێکخراوە یان کۆمەڵگایەک بۆ ڕەتکردنەوە یان قبوولکردنی سیاسەتێك لە سەر پێشنیاری نوێنەران یا ڕێبەران. ئامانجی ڕاپرسی ئەوەیە کە قانوونێك بە زیانی زۆرینەی خەڵك دەرنەچێ. لە سیستەمی نوێنەرایەتی و پەرلەمانی نوێدا تەنیا بۆ دەستووری بنچینەیی یان بۆ گۆڕینی ڕژێمی سیاسی، ڕاپرسی دێتە ئاراوە بەڵام لە هەندێ وڵاتی بچووکدا بۆ هەموو شتێك ڕاپرسی دەکەن.

ڕاپرسی بە چەن شێوە بەڕێوە دەچێ:

١- ڕاپرسی بۆ دەستووری بنچینەیی: وەرگرتنی ڕای شارۆمەندان لە بابەت پەسندکردنی دەستوور یان پیاچوونە پێیدا. ئەم ڕاپرسییە بە ریفراندۆمی زۆرەملیش ناوبردە کراوە. بۆ وێنە ڕاپرسی لە فەرەنسە بۆ سەربەخۆیی ئەلجەزایر (١٩٦١).

٢- ڕاپرسی بۆ ئەنجومەنی یاسادانان: کاتێك ئەنجومەن بیهەوێت قانونێك پەسند بکات، ئەبێ زۆرینەی خەڵك لە دۆخی بدەن ئینجا شتەکە ئەبڕێتەوە. ئەم جۆرە ڕاپرسییە بە ریفراندۆمی ئارەزوومەندانە ناوبراوە.

٣- ڕاپرسی بۆ سەرۆك کۆماری: لە کاتی هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار یان سەرۆك وەزیران بە شێوەی ڕاستەوخۆ بەڕێوە دەچێ.

دەکرێ ڕاپرسی بە خواستی هەموانیش بێتە ئاراوە. بەم شێوە کە ئەگەر پەرلەمان حەز نەکات بابەتێکی تایبەت بخرێتە ریفراندۆمەوە، ئەوا هەندێ لە خەڵکانی ئاسایی کە مافی دەنگدانیان هەبێ دەتوانن بە کۆکردنەوەی ئیمزا داوا بکەن ئەو بابەتە بخرێتە ڕاپرسییەوە. ڕادەی پێویست بۆ ئەم داواکارییە، بە پێی یاسای وڵاتەکان لە ٥ تا ١٥ لە سەدی دەنگدەرانی دوایین هەڵبژاردن ئەبێت. بە زۆری لە دەستووری وڵاتەکاندا چۆنیەتی و هەلومەرجی بەڕێوەچونی ڕاپرسی ئاماژەی پێ ئەکرێ.

**ڕادەستی تاوانباران** استرداد مجرمان / بازداد Extradition

بە واتای دوبارە دانەوەی تاوانبار یان گومانلێکراو لە دەوڵەتێکەوە بۆ دەوڵەتێکی ترە. لەم بارەوە هیچ یاسایەکی نێودەوڵەتی لە ئارادا نییە بەڵام دەوڵەتەکان لەناو خۆیاندا قەرار و بەڵێن ئەدەن کە تاوانباران یان گومانلێکراوان(جگە لە تاوانباری سیاسی) ڕادەستی یەکتر بکەنەوە. تاوانباری سیاسی (بڕوانە تاوانی سیاسی)، بە پێی یاسا نێونەتەوەییەکان بە «پەنابەر» ناونوسدەکرێ و ئەبێ لە مافی پەنابەران بەشدار و بەهرەوەر بێت.

PDF 4 KURD

**رادیکاڵ/ چەپڕەو** رادیکـال/ بنیادسـتیز Radical

قوتابخانــە، حیــزب یــان کەســێك کــە بــاوەڕی بــە گۆڕانکــاری خێــرا و بنــەڕەتی لــە بونیــادە سیاســی و کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە و دەخوازێت بنەڕەتەکان لە ڕیشەوە بگۆڕێ، بە تایبەت ئەگەر ئەم گۆڕانکارییانە ببێتە هۆی هێورکردنەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی یان سڕینەوەی گەندەڵییەکان.

**رادیکاڵیزم** رادیکالیسم/ بنیادگرایی Radicalism

ئەم زاراوە دەلالەت ئەکا بە سەر ئەندێشە و کردارێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە دەخوازێ بە پەلەو بێ‌ڕاوەستان، گۆڕانکارییەکی قووڵ بەسەر دامودەزگا کۆمەڵایەتییەکاندا بێنێت. رادیکالیزم (و ئاوەڵناوی رادیکال) زیاتر بۆ وەسفی ئەندێشە و کردەی سیاسی چەپی توندڕەو- مارکسی یا نامارکسی ـ بە کار هاتووە. زاراوەی رادیکالیزم، یەکەم جار لە بەریتانیا دەرحەق بە نەیاران، لە «پلانی ریفۆرم» ۱۸۳۲ هاتە ئاراوە وپاشان ج. بینتام و هاوڕێکانییان بە رادیکالی فەلسەفی، ناوبرد بەڵام بەم واتایەی کە ئیمڕۆ بە زاردا دێت، ئەگەڕێتەوە بۆ سێندیکا خوازی فەرەنسە. لە ساڵی ۱۹۲۰ بەملاوە رادیکالیزم ئێجگار لە گەڵ مارکسیزم ئاوێتە بووە. جووڵانەوەی چەپی توندڕەو زیا لە هەموو شتێ کەوتە ژێر کاریگەری ستالینیزمەوە. هەندێك رادیکالیزمیان لە بەرامبەر لیبرالیزمی نوێی ئەمەریکا، بە چەشنی فرانکلین ڕۆزوێڵت ناوبردە کردووە. لە سەردەمی چالاك بوونی«بەرەی خەڵکی» لە ۱۹۳۰ دژایەتی هاوبەش لە گەڵ فاشیزمی ئەورووپی بووە هۆی یەکگرتوویی رادیکالە مارکسی و لیبراڵەکان. مۆرکردنی پەیمان لە نێوان سۆڤیەت و ئەڵمانیای نازییەت، بووە هۆی خاو بوونەوەی ئەم یەکییەتیە بەڵام بە هاتنە ناو جەرگەی شەڕی یەکیەتی سۆڤیەت، دووبارە گورج بۆوە.

**راسپاردەی باڵای پەنابەرانی نەتەوەیەکگرتووەکان**

کمیساریای عالی پناهندگان سازمان ملل متحد

United Nations High Commissioner for Refugees

ئەم راسپاردە لە ژانوییەی ۱۹۵۱ دوو ئەرکی سەرەکی پێ سپێردراوە: یەکەم، ئاسانکاری بۆ پشتیوانی و پاراستنی نێونەتەوەیی پەنابەران. دووهەم، دابینکردنی پێداویستی و کەرەستەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و قانوونی بۆ سەقامگیربوونی پەنابەران لەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین و وڵاتانی نوێ. بارەگای ئەم راسپاردە لە شاری جنێڤا لە سویسرایە و هەموو کاروباری پەنابەران، بێجگە لەو ئاوارە و پەنابەرانەی کە وڵاتێکی‌تر بەرپرسیاریەتی بەرعۆدە گرتووە بۆ وێنە ئاوارەکانی فەلەستینی لە ئەستۆ دەگرێ. بوودجەی ئەم رێکخراوە لە لایەن دەوڵەتانەوە دابین ئەکرێت. ساڵی ۱۹۵٤ خەڵاتی نۆبێلی ئاشتی بەم رێکخراوە بەخشرا.

**راست** راست The Right

زاراوەی راست بریتییە لە کۆمەڵێ تیۆری سیاسی کە لە بەرامبەر «چەپ»دا دێتە ئاراوە. بە درێژایی سـەدەی نـۆزدە، ئـەم زاراوە لـە گـەڵ دەسـەڵات و نیشـتمان پـەروەری، نـەریتی کـۆن، حوکمـەتی

PDF 4 KURD

مولکداریتی، کلێسە و هێزی سەربازی هاوواتا بووە. دوای شەڕی جیهانی یەکەم راستێکی بونیادگەرای نوێ سەری هەڵدا کە لە گەڵ راستی کۆنەپارێزی کۆنباو جیاوازی هەبوو. ئەم جۆرە راستە لە گەڵ بەرژەوەندی چینەکانی باڵای کۆمەڵگا دوژمنایەتی کرد. نازیسم لە ئەڵمانیا توندڕەوترین شێوازی «راست»ڕەو بوو. لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم، هەر دوو زاراوەی راست و چەپ بە شێوازی جوراوجۆر بەکاربرا. (بڕوانە چەپ و راست).

## راستی نوێ — راست نو — New Right

دیاردەی راستی نوێ پێکهاتووە لە بنەڕەگ و ریشەکانی نیئۆلیبرالیزم و کۆنەپارێزیی نوێ. لە ١٩٨٠ بەملاوە زۆربەی دەوڵەتانی رۆژاوایی بۆ هەڵوێست نیشاندان لە بەرامبەر قەیرانی ئابووری حەفتاکان، بە دەستکێشانەوە لە سیاسەتەکانی کینزی، بەرەو بەرەی «راست» هەنگاویان نا. راستی نوێ رادیکالیزمێکە سەر بە باڵی لیبرالیزم و هێرشێکە کە هێزە بنچینەییەکانی خۆی لەم دوو رێبازە وەردەگرێ. ئەم زاراوە بە تایبەتی دەربارەی سیاسەتەکانی حیزبی کۆنەپارێزی بەریتانیا لە سەردەمی تاچێر و حیزبی کۆماریخوازی ئەمریکا لە سەردەمی ریگان دا بەکار براوە و بە گشتی لە بواری ئابووری و سیاسی، لیبراڵ لە ئەژمار دێت. واتە لە سەر ئازادی ئابووری و کەمکردنەوەی باج و بازاڕی ئازاد و دەوڵەتی سنووردار جەخت ئەکات بەڵام لە باری ئەخلاقی و کەلتووری و کۆمەڵایەتییەوە کۆنەپارێزە. راستی نوێ، حوکمەت لە باری ئابوورییەوە لاواز دەکات بەڵام لە بواری سیاسی واتە دابینکردنی ئاسایش، بەهێز دەبێت.

**رامیاریی: بڕوانە سیاسەت**

## رایش — رایش — Reich

ئەم زاراوە بۆ ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانیا بەکار براوە کە لە لایەن دۆن برووك، لە کتێبی رایشی سێهەم (١٩٢٤) رەواجی پەیدا کردووە. نازییەکان پێیان وابووە کە لە ئەڵمانیا ٣ *رایشی* هەبووە: رایشی یەکەم، یا ئیمپراتۆری پیرۆزی رۆما (رۆژاوایی) کە لە سەدەی نۆیەمی زایینی لە ئەورووپای ناوین دروست بوو کە زۆربەیان لە وڵاتانی ئەڵمانی زمان پێکهاتووە و بنەماڵەی هاپسبوورگ بە سەریا حوکمەتیان کردووە. رایشی یەکەم لە ساڵی ١٨٠٦ رووخاوە.

رایشی دووهەم، ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بووە کە لە ١٨٧١ تا ١٩١٩ لە لایەن بیسمارك دامەزراوە. ئینجا تا سەرەتای رایشی سێهەم، واتە کۆماری وایمار (١٩١٩ ـ ١٩٣٣) حوکمەتی کۆماری و دیموکراسی لە ئەڵمانیا پیادە کرا. رایشی سێهەم کە لە لایەن ئادۆلف هیتلەر بنیات نرا لە ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ درێژەی بوو. هیتلەر دەیویست رایشی سێهەم تەمەنی ١٠٠٠ ساڵە بێت.

PDF 4 KURD

**ڕای گشتی** افكار عمومی Public Opinion

پەرچەكرداری زۆربەی خەڵك لە بەرامبەر ئەو بابەت و ڕووداوانەی كە لە كۆمەڵگادا زۆر گرینگن یان لانیكەم زۆرینەی خەڵك بە گرینگی دەزانن. ڕای گشتی، بیروبۆچوون و هەڵسەنگاندنی هاوبەشی گرووپێكی كۆمەڵایەتییە لەمەڕ بابەتێكی جێگای سەرنجی گشتی كە لە كاتێكی دیاریكراو لە نێوان زۆرینەی جەماوەردا بەرجەستە بووبێت. ڕای گشتی، دەنگدانەوەی ڕەهەندی كۆمەڵایەتی مرۆڤە كە دەتوانێ لە پرۆسەی گۆڕانی بارودۆخەكان كاریگەریی دابنێت. پێشینەی ئاگاداربوون لە ڕای گشتی دەگەڕێتەوە بۆ چالاكییەكانی جۆرج گالۆپ لە ساڵانی ١٩٣٠ لە ئەمریكا. لەم وڵاتەدا زیاد لە هەموو وڵاتێكی دیكەی جیهان، هەوڵ دەدرێت لە ڕای گشتی ئاگادار بن.

ئێستا ڕای گشتی لە زۆربەی وڵاتان بەهای پێ ئەدرێت و بۆتە كانگایەكی ڕاستەقینەی دەسەڵات و ڕێژەی گرینگی پێدان بەم بابەتە پەیوەستە بە ئاستی گەشەسەندن و پەروەردەی سیاسی كۆمەڵگا.

ئەو دامودەزگایانەی كە لەسەر ڕای گشتی دەور دەبینن بریتین لە: كتێب، ڕۆژنامە، ڕادیۆ و تەلەفیزیون و ئامێری نوێی ئەنتەرنێت. بەم بۆنەوە دەوڵەتەكان هەوڵ ئەدەن بە كەڵك وەرگرتن لەم ئامێرانە و بەرنامەی سەتەلایت (مانگی دەسكرد) و تەلەفیزیۆن، سەرنجی ڕای گشتی بەرەو لای خۆیان ڕاكێشن. لە زۆربەی وڵاتان لە گەرمەی هەڵبژاردنەكاندا هەندێ دامودەزگای ڕا وەرگرتن هەیە كە زۆرجار بە دروستكەری ڕای گشتی لە قەڵەم دەدرێن. بۆ وێنە لەو كاتانەدا ڕادەگەیەنن كە فلانە پاڵێوراو ٧٠٪ دەنگەكانی جەماوەر بەدەست دەهێنێ كە ئەمە ڕاستەوخۆ كاردەكاتە سەر ڕای گشتی و پێگەی ئەو پاڵێوراوە لەناو خەڵكدا بەهێز دەكات.

ئەم زاراوە لە زۆربەی وڵاتان بەكار دێت و مانای بیر و ڕا و بۆچوونی خەڵكە دەربارەی بابەتێكی تایبەت. هەڵبەت بۆچوونی زۆربەی خەڵك دەربارەی بابەتەكان هەمیشە هەقیقی و بێغەش دەرناچێ چوونكە لە ڕاوەرگرتنەكاندا بیروڕای هەموو خەڵك چ خەڵكانی ڕووناكبیر و خوێندەوار و چ خەڵكانی ساكار و نەخوێندەوار بە یەك چاو سەیر دەكرێن. لە لایەكی ترەوە چوونكە زۆربەی خەڵك زانیاری تێر و تەسەلیان لەمەڕ بابەتە جۆراوجۆرەكان نییە و لە ژێر كاریگەریی هەست و سۆزدا بڕیار دەدەن، هەر بۆیە زۆرجار دەرەنجامەكانی ڕای گشتی بە ڕاست دەرناچێ.

**ڕژێم** رژیم Regime

لە وشەی لاتینی reginien وەرگیراوە بە واتای ڕێسایەكە دەربارەی شێوازی ژیان. لە زاراوەی سیاسیدا ڕژێم بە مانای شێوازی حوكمەتكردن و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتێك بە كار هاتووە. بۆ نموونە ڕژێمی پاشایەتی، ڕژێمی كۆماریی و ڕژێمی سەربازیی. بەڵام ئەغلەب ئەم زاراوە لە پاڵ حوكمەتێكی میلیتاریدا بە كار براوە.

**ڕژێمی سیاسی** رژیم سیاسی Political Regime

ڕژێمی سیاسی بەم دوو تایبەتمەندییەی خوارەوە پێناسە دەكرێت:

PDF 4 KURD

١) کۆمەڵێ میتۆد و شێوازی حوکمەت کردن کە بەو پێیە چەندوچۆنی ماف و ئازادییە دیموکراتیەکان و پێوەندی ئۆرگانەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت لە سەر بنەمای یاسا دیاری ئەکرێت.

٢) چۆنیەتی رێکخستن و سازدانی پێوەندی نێوان فەرمانڕەوا و خەڵکانی ژێر دەسەڵات.

دەستووری بنچینەی هەر وڵاتێك، رژێمە سیاسییەکەشی دیاری ئەکات.

رژێمە سیاسییەکان بە پێی پێودانگی جیاواز لە یەکتر جیا دەکرێنەوە:

- ئەگەر سەرچاوەی دەسەڵاتی دەوڵەت، پادشا بێت، ئەو رژێمە بە پاشایەتی لە قەڵەم دەدرێت کە دەسەڵات بۆ تاکێك بە جێ دەمێنێت.

- ئەگەر سەرچاوەی دەسەڵات، جەماوەر یان زۆرینەی خەڵك بێت، ئەو رژێمە بە کۆماریی ناونووس دەکرێت کە لەم شێوازە حوکومەتییەدا ناوەندەکانی باڵای دەسەڵاتی دەوڵەت بە شێوەی هەڵبژاردن. بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەسپێردرێتە دەست کەسانێك.

- بە لەبەر چاوگرتنی کۆجێیی دەسەڵات، وەك رژێمی دیکتاتۆری و رژێمی تاك حیزبی.

- لە سەر بنەمای پێکهاتەی دەوڵەت، وەك فێدرالیزم و کۆنفیدراسیۆن.

## رۆژهەڵات ناسی — شرق‌شناسی — Orientalism

رێبازێکی رۆژاوایی‌یە بە مەبەستی توێژینەوە و کوڵینەوە لە بارودۆخ و داب ونەریت و زمان و خووخدەی خەڵکانی رۆژهەڵاتی زەوی. رۆژهەڵات ناسی، ئەگەڕێتەوە بۆ حەز و خولیای خەڵکانی گەڕۆك و مامەڵەگەری رۆژاوایی و بەرهەمی ئامانجی سیاسی و داگیرکارانەی دەوڵەتانی بەریتانیا و سۆڤیەت و فەرەنسا و نەمسا و ئەڵمانیا بووە و زیاتر لە لایەن راسپاردەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەم وڵاتانە پەرەی ستاندووە.

رۆژهەڵات ناسی، دوو رەهەندی بووە: یەکەم، ئەو قازانج و بەهرە بووە کە وڵاتانی داگیرکەر لە رێگای خوێندنەوە و سەردەرهێنان لە بارودۆخی ناوچەکە وەدەستیان کەوتووە(بۆ وێنە بازرگانی کردن). دووهەم، لە بواری پێشکەوتنی زانستی بۆ وڵاتانی رۆژهەڵاتی حاڵەتێکی ئیجابی بووە، ئەویش خزمەتێکە کە ئەم رێبازە بە ناسینی پێشینەی کەلتووری و مێژوویی گەلانی رۆژهەڵات کردوویەتی. زاراوەی رۆژهەڵات ناسی بۆ گەلانی رۆژهەڵات، وەبیرهێنەرەوەی رابردوویەکی تاڵ و ئەو زیانە سیاسیانەیە کە بەناوی ناسینی گەلانی رۆژهەڵات لە لایەن رۆژاواییەکانەوە پێیان گەیشتووە. ئیدوارد سەعید دۆگماکانی رۆژهەڵات ناسی بەسەر چوار تەوەر دابەش دەکات:

١- دوگمای جیاکارییەکی نامێژوویی و جەوهەریی لە نێوان رۆژئاوا لە رۆژهەڵاتدا، بەوەی گوایە رۆژئاوا سەرزەمینی عەقڵانیەتێکی قووڵ و مەزنە و رۆژهەڵاتیش سەرزەمینی کاڵفامی و گێلیەتیەکی گەورە.

٢- دۆگمای ئەوەی هەر شتێك کە لە ئیسلامدا روو بدات، دەبێت لە رێگای ئایینی ئیسلامەوە لێکبدرێتەوە و بناسرێت و راڤە بکرێت. لەم دیدەدا ئەم ئایینە جەوهەرێکی نەگۆڕی هەیە و بەرپرسیارە لە سەرجەم ئەو رووداوانەی لەم دنیایەدا روودەدەن، نەك کۆمەڵێك هۆکاری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی.

PDF 4 KURD

٣ـ دۆگمای نیشاندانی بەردەوامی رۆژهەلات وەك گشتێكی هاوشێوە و لێكچوو كە توانای بەرهەمهێنانی هێزی جیاواز و شوناسی جیاواز و كولتووری جیاوازی نییە و ناتوانێت گۆڕانكاریی بە دوا خۆیدا بێنێت. مادامەكی رۆژهەلات رۆژهەلاتە، كەواتە دەبێت بۆ نموونە سلێمانی هیچ جیاوازییەكی لە گەڵ كابول و كابولیش هیچ جیاوازییەكی لە گەڵ بێروت و ئەویش هیچ جیاوازییەكی لە گەڵ تاران دا نەبێت. لەم دیدەوە رۆژهەلات بەمانای وێكچوونێكی سەرتاسەری گەورەیە.

٤ـ دۆگمای نیشاندانی رۆژهەلات وەك سەرزەمینی مەترسی و هەڕەشە و تۆقاندن. شوێنێك بۆ ئەوەی ڕام بكرێت، دەبێ لێكۆڵینەوەی بەردەوامی لەسەر بكرێت و بناسرێت و كۆنتڕۆڵ بكرێت و مادامێكی هەڕەشەكانی هەر بەردەوام بوو، ئینجا داگیر بكرێت.

**The middle east** خاورمیانه **رۆژهەلاتی ناوین**

ئەم زاراوە هەر لە سەرەتاوە مژاوی بووە و تا ئێستا بە ناوچەیەكی جوگرافیایی دیاریكراو كە هەمووان لە سەری كۆك بن پێناسە نەكراوە. پێناسەی جۆراوجۆر لە بارەی ئەم ناوچەوە هەیە كە بە چەن بۆچوونێك ئاماژە ئەكەین:

١ـ رۆژهەلاتی ناوین، بریتییەلە: وڵاتانی ئێران، توركیا، قوبرس، وڵاتانی عەرەبی رۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست، فەلەستین، نیمچە دوورگەی عەرەبستان، ناوچەی دیجلە و فورات، دەراوی نیل (میسر و سوودان) و لیبی. (ساڵنامەی رۆژهەلاتی ناوین و باكووری ئەفریقا ١٩٨٧).

٢ـ ناوچەیەك لە نێوان عەرەبستان و هێندستان كە ناوەندەكەی لە روانگەی ستراتجیستەكانەوە، كەنداوی فارس لە ئەژمار دێت. (بیرنارد لوییس، رۆژهەلاتی ناوین و رۆژاوا).

٣ـ رۆژهەلاتی ناوین واتایەكی دانراو و دڵخوازانەیە كە مەبەست لە سێ وڵاتی گەورەی ئێران و میسر و توركیا و وڵاتانی عەرەبی ئاسیا و ئیسراییل و قوبرسە. (ژان پییر درینیك، رۆژهەلاتی ناوین لە سەدەی بیستەم).

بە گشتی بە لەبەرچاوگرتنی ئەم روانگە و پێناسانە، ئەكرێ بڵێین رۆژهەلاتی ناوین ناوچەیەكە كە ئەم وڵاتانەی خوارەوە لەخۆ دەگرێ:

ئێران، ئەردەن، میرنشینە یەكگرتووەكانی عەرەبی، بەحرەین، توركیا، سووریا، عێراق، عەرەبستانی سەعوودی، عەممان، فەلەستین، قەتەر، كوەیت، لوبنان، میسر و یەمەن. لە دوای هەڵوەشانەوەی یەكیەتی كۆمارییەكانی سۆڤیەت، بە ڕای هەندێ زانا، وڵاتانی موسوڵمانی ئاسیای ناوەندی (ئۆزبەكستان، توركمانستان، قرغیزستان و قازاغستان) و ناوچەی قەفقاز ( ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستان) دەكەونە بەستێنی «رۆژهەلاتی ناوەڕاستی نوێ»وە.

**Intellectuals** روشنفكران **رۆشنبیران**

ئەم زاراوە لە وشەی intellect بە مانای هێزی عەقڵی لە زمانی فەرەنسەوە وەرگیراوە بەڵام یەكەم جار لە

PDF 4 KURD

ساڵی ١٨٦٠ لە سۆڤیەت لە وتارێکی پیساڕۆف، بۆ ناوبردەکردنی لاوانێکی ئەکادیمی بەکارهات کە «خاوەنی ئەندێشەیەکی ڕەخنەگرانە» بن.

بە واتایەکی تری تۆرگنیۆف، «نیهیلیست» بن، واتە ئەو کەسانەی کە بە ناوی عەقڵ و پێشکەوتنەوە هەموو ترادسیۆنێك بخەنە ژێر پرسیارەوە. لە فەرەنسەشدا ئەم وشەیان بە سووکایەتی و تەوسەوە دەرحەق بە دریفووسیەکان بە کار دەهێنا.

لە ئەندێشەی کەسانێکی وەك دۆتۆکویل و مارکسدا چەمکی«ڕۆشنبیر» لە گەڵ چەمکی «چەپ» بە یەك واتا بە کار براون. مارکس لە مانیفێستی کۆمۆنیستدا ڕۆشنبیران بەو بەشە لە بۆرژوازی* دەزانێ کە لە گەڵ چینی کرێکار یەك ئەگرنەوە تاکوو ئەندێشەکانی خۆیان بە پێی ڕەوتی مێژوو پراکتیزە بکەن. ڕۆشنبیریی لە ترایسیۆنی ڕووسیدا پێوەندی ڕاستەوخۆی لە گەڵ «چەپ»دا بەردەوام هێشتەوە و دواتر لێنین، لە ڕێبەرایەتی حیزب و چینی کرێکاردا جێگەیەکی باڵای بە ئەوان بەخشی. بەڵام ئەگەر ڕۆشنبیران بە مانای نوخبە*ی کەلتووری لێك بدەینەوە، ئەندێشە و کردارەکانیان بە تەواوەتی لە گەڵ چەپدا ئاوێتە نییە و زۆربەی ئەم گرووپە لە باڵی ڕاستدا جێگیر دەبن.

بەم حاڵەش زۆرێك لە ڕۆشنبیران حەزیان لە سیاسەت نەکردووە بەڵام چونکا لە ئاخێزگەیەکی مامناوەندییەوە پێگەیشتوون، بە زۆری ناتۆرەی «ڕۆشنبیرانی وردە بورژوا» یان پێوە لکاندون.

هەرچۆنێك بێت، ڕێبازی ڕۆشنبیریی(intellectualism) بەرهەمی شارستانییەتێکە کە لە سەر بایەخەکانی عەقڵ و مرۆڤپەروەری(هیومانیزم)و پێشکەوتن لەنگەر ئەگرێت. کەواتە ڕۆشنبیران پاسەوانانی نەریتی ئەندێشەی ئاڤراندن و ڕەخنەگرتنن لە ئاست نۆرمەکانی کۆمەڵگادا. لە واقیعدا ڕۆشنبیر پتر کەسێکە کە خۆی بەم ناوبانگە دەناسێنێ و لە باسی ڕۆشنبیرانە لە گەڵ ڕۆشنبیرانیتر بەشداری ئەکا و بەم بۆنەوە لە کۆمەڵگادا پێگەیەك بۆ خۆی دەستەبەر ئەکات.

ئیمڕۆکە ڕۆشنبیران بوونەتە چینێکی بەرچاو لە کۆمەڵگادا. چۆنیەتی کاریگەریی ئەم چینە بە سەر «کارکردی مێژوویی» ئەوان (هەرچۆنێك پێناسە بکرێن) ئێستاش هەر گرێیەکی نەکراوەیە.

**ڕەشبینی سیاسی** بدگمانی سیاسی Political Paranoia

نەخۆشیەکی دەروونی و عەقڵیە کە هەر کەسێك تووشی بێت، هەست بە ستەم و چەوساندنەوە دەکات و پێی وایە خەڵکانی تر بۆ لەناوبردنی ئەو نەخشە و پیلان ئەکێشن. ئەم نەخۆشیە حاڵەتێکی کۆمەڵایەتیش لەخۆ دەگرێ کە بەو پێیە گومان دەکرێت کاروبار و ڕووداوە گرنگە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بە دەستی نادیار و پیلانی سیاسەتی بیانی بەڕێوە ئەچێت. هەندێ جار ئەم زاراوە لە گەڵ تیۆری یا *وەهمی پیلان* بە یەك مانا لێکدراوەتەوە.

**ڕەگەز پەرستی** نژاد پرستی Racism

ڕەگەزپەرستی(ڕاسیزم)، بە زمانی فەرەنسی لە وشەی (race) بە مانای ڕەگەز وەرگیراوە.

PDF 4 KURD

رەگەزپەرستی تیۆرییەکی نازانستی و کۆنەپەرستانەیە کە لە نێوان رەگەزە جۆراوجۆرەکان لە باری توانست و توانایی عەقڵی، فەرق دادەنێت. ئەم تیۆرییە پێی وایە کە لە نێوان رەگەزە جۆربەجۆرەکان لە باری جینێتیکی و رەگەزییەوە فەرق و جیاوازی هەیە و ئەم جیاوازییەش دەبێتە هۆی سازبوونی گرفت و کێشەی کەلتووری و مێژوویی کۆمەڵگا و نایەکسانی شارستانییەتەکان. ئەم بیرۆکە وەك ئایدیۆلۆجییەکی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی لە سەدەی نۆزدە و بیست سەری هەڵدا و کاردانەوەیەکی زۆری لە نێوان وڵاتانی جیهاندا بەجێ هێشتووە.

بۆ تێگەیشتن لە چەمکی رەگەزپەرستی، پێویست ئەکات ئەم چەمکە لە پانتایەکی ئابووری، ئایدیۆلۆجیکی، مێژوویی وجوگرافیدا لێك بدرێتەوە. چونکا رەگەزپەرستی لە قۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا بە شێوازی جۆراوجۆر خۆی دەرخستووە و بە پێی هەلومەرجێکی زاڵ هاتۆتە ئاراوە.

سەدەی ١٦ لە بەریتانیا، هاوکات لە گەڵ دەستپێکردنی بازرگانی بە کۆیلە، چەمکی رەگەز مانایەکی ئابووری بە خۆوە گرت. لە لایەکیترەوە ئەم چەمکە زیاتر بە مانای چین یا توێژێکی تایبەتی مرۆڤ یا شتەکان لێکدراوەتەوە و بە هیچ جۆرێك لە باری تایبەتمەندی بایۆلۆجییەوە بەرجەستە نەکراوەتەوە.

بە درێژایی سەدەی ١٧ ئەم چەمکە رەهەندێکی مێژوویی لە خۆ گرتووە و هەندێ لە ئینگلیزییەکان کە لە بنەچەی رەگەزی جێرمەن ناوبردە کراون، ئەم بیرۆکەیان رەواج پێداوە کە دەستدرێژی نۆرماندەکان لە سەدەی ١١ بۆ سەر ئەوان، بۆتە هۆی زاڵبوونی رەگەزێکی بێگانە بە سەر ساکسۆنەکاندا.

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، لە ئەورووپا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرەنجام زاراوەی رەگەز دەلالەتێکی فیزیکی لە خۆ دەگرێ و بەمجۆرە رەشپێستەکان بە رەگەزی سووك و نانەجیب سەیریان ئەکرێت. لە کۆتایی سەدەی نۆزدە، ئایدیۆلۆجی «سووك و نانەجیب» بە سەر خەڵکی خۆماڵی داگیرکراوەکانی بەریتانیا سەپێندرا و رەگەزی بەریتانیاییش وەك رەگەزی باڵادەست پێناسە کرا. ئینجا وردەوردە بە داکشانی ئەم فیکرە، رەگەزپەرستی لە بەریتانیا رواڵەتێکی دژ بە جوولەکەی پەیاکرد. لە ساڵی ١٩٠٥ دەوڵەتی ئەم وڵاتە بە دانانی یاسای چۆنییەتی وەرگرتنی پەنابەران تەگەرەی خستە بەردەم پەنابەرە جوولەکەکان. رەگەزپەرستی لە ساڵانی ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ لە حیزبی نازی ئەڵمانیا بۆتە بنەمای سەرەکی و ئایدیولۆجیای رەسمی ئەو وڵاتە و هیتلەر، بەو پێیە سیاسەتی لەناوبردنی جوولەکەی گرتەبەر. (بروانە جوولەکە قڕان).

لەم چاخەدا و بە گشتی لەدوای شەڕی جیهانی دووهەم، بە هۆی پەرەسەندنی کۆچی خەڵکانی ئاسیایی و رەش پێست بەرەو وڵاتانی رۆژاوایی، باس و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵناسانەی زۆر هاتۆتە ئاراوە. بە هۆی دابەزینی رێژەی ئیش و کاری کرێکاران و لەباو کەوتنی بیرۆکەی *فرەدەنگی کەلتووری* و پێویستی ناردنەوەی ئەم پەنابەرانە بۆ وڵاتەکانی خۆیان، جارێکیتر مەسەلەی *جیاوازی رەگەزایەتی** و وەدەرنانی ئەم کۆچبەرانە هاتۆتەوە ئاراوە.

PDF 4 KURD

**ڕەگەزنامە/ڕاژێری/نەتەوایەتی** تابعیت / ملیت Nationality

بریتیە لەو پێوەندییە سیاسی و مەعنەوییەی کە کەسێك بە دەوڵەتێکی تایبەتەوە گرێ ئەدات. لە ڕاستیدا پێوەندی تاك و دەوڵەت، پێوەندییەکی سیاسییە. ئەو کەسەی کە سەر بە نەتەوەی وڵاتێکی دیاریکراوە پێی ئەگوترێ هاووڵاتی. ئەو کەسەش کە سەر بە هیچ نەتەوەیەك نەبێت پێی ئەگوترێ ئاپاترید*.

لە بابەت ڕەگەزنامەوە، یاسای وڵاتەکان ٣ مەسەلەیان لە بەر چاو گرتووە:

١- هەرکەس ئەبێ ڕەگەزنامەیەکی هەبێت (واتە هاووڵاتی وڵاتێك بێت).

٢- هیچ کەس نابێ زیاتر لە یەك ڕەگەزنامەی هەبێت.

٣- ڕەگەزنامە، شتێکی هەمیشەیی و نەمر و نەگۆڕ نییە.

بەخشینی ڕەگەزنامە لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بە دوو شێوە بە ئەنجام دەگات:

١- سیستەمی خوێن. بەم پێیە ڕەگەزنامە بە هۆی دایك و باوك و خزمایەتیەوە دەدرێتە پاڵ منداڵ واتە هەر کە منداڵ هاتە دنیاوە، ڕەگەزنامەی دایك و بابی پێ ئەدرێت.

٢- سیستەمی خاك. واتە منداڵ لە خاکی هەر وڵاتێك لە دایك ببێ، ڕەگەزنامەی ئەو وڵاتەی پێ ئەدرێت.

**ڕیالیزمی سۆشیالیستی** رئالیسم سوسیالیستی Socislist realism

ستاتیکای(جوانی ناسی) یەکیەتی کۆمارییەکانی سۆڤییەت کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٠ تا ١٩٥٦ ڕەواجی پێدرا. ناوی سیاسەت و تیۆری ڕەسمی حوکمەتی سۆڤییەتە لەمەڕ داهێنانی هونەری. ئەم ڕێبازە لە لایەن ماکسیم گورکی و سیاسەتمەدارانێکی وەك بوخارین و ژادنۆف لە ساڵی ١٩٣٤ لە کۆنگرەی نووسەرانی سۆڤییەت هاتە ئاراوە بەڵام هیچ کاتێك پێناسەیەکی ڕێکوپێکی لێنەکراوە. مەبەست لە داهێنانی ئەم سیاسەتە ڕاکێشکردنی شێوازی ڕیالیستی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە بوو بۆ هونەر و ئەدەب و شانۆ بەرەو لایەنێکی پۆزەتیڤ.

ڕیالیزمی سۆشیالیستی، شەرعییەتی خۆی لە بیرۆکەکەی لێنین لەمەڕ partinost(لایەنگری) و ئەدەب، لەگوێن ڕەنگدانەوەی واقیع لای مارکس و ئینگلس وەردەگرێ. ئەم دوو بیرمەندە وێڕای ئەوەی بۆ ئەدەب ڕۆڵێکی ئایدیۆلۆجیك قایل دەبن، لە سەر پێوەندی نێوان ئەدەب و ئابوور جەخت دەکەن. ئەم ڕێبازە لە سەردەمی ستالین (بڕوانە ستالین خوازی) بە شێوەیەکی بەربڵاو پیادەکرا و هونەری سۆڤییەتی بەرەو دارمان و تێکشکان برد. بە تێکشکان و ڕۆچوونی ستالینیزم، ڕیالیزمی سۆشیالیستیش کەوتە بەر ڕەخنە و لەناوچوو.

**ریفۆرمخوازی/چاکسازی خوازی** اصلاح طلبی/بهبودخواهی reformism

زاراوەیەکی نوێیە کە ئایدیۆلۆجی یان شێوازێکی سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی تایبەت دەستنیشان ئەکات. بەم پێیە ڕیفۆرمخوازی، بڕوا هێنانە بەوەیکە دەکرێ، هێدی هێدی کۆمەڵگا بەرەو گۆڕان و چاك بوو

PDF 4 KURD

ببەیت بێنەوەی دەسکاری پێکهاتەی بنچینەیی کۆمەڵگا بکرێت. ئەم لایەنگرییە تەنیا لەو وڵاتانەدا بەکارە کە بە هۆی سیستەمی پەرلەمانی و هەبوونی ئازادی قانوونی، هەل بۆ بەدەسهێنانی ئاشتیخوازانەی دەسەڵات دەڕەخسێ. لەم گۆشە نیگاوە ریفۆرم خوازی، بە گشتی لە بەرامبەر کۆنەپەرستی* و قایمەکاری یان شۆڕشخوازی دەوەستێتەوە.

**ریڤیژیۆنیزم(پیاچوونەوەگەری)** تجدیدنظرطلبی Revisionism

ئەم زاراوە لە وشەی لاتینی revisere بە مانای حەز بە تازەکردنەوەی دیدار و پیاچوونەوە، وەرگیراوە. پێداچوونەوە، بە بووژانەوەی بن بونیات و کارکردەکانی رێبازێك دەگوترێ (بڕوانە دۆکترین). واتە ئەو کەسەی کە لە بارەی رێباز یان ئایدیۆلۆجیایەك خوازیاری دەسکاری کردن و پێداچوونەوە بێت، پێی دەگوترێ ریڤیژیۆنیست (کەسێك کە دەسکاری شتێك بکات). ئەم بۆچوونە لە لایەن نووسەر و سیاسەتمەدارێکی سۆسیال دیموکراتی ئەڵمانی بە ناوی ئیدوارد برنشتین لە ساڵی ١٨٨٩ خرایەڕوو. ئەم تیۆرییە رەخنەیەکی ئایدیۆلۆجیکی بوو کە لە تیۆری و پێشبینیەکانی ئابووری ـ سیاسی کارڵ مارکس گیرا و بە پێی ئەم خاڵانەی خوارەوە رەخنەی لێ گیرا:

١) بۆچوون و جیهانبینی مارکس دەربارەی کۆمەڵگای سەرمایەداری و گۆڕینی خێرای بۆ کۆمەڵگایەکی پرۆلیتاری، بە خێرایی و پەلە نایەتەدی و هەر بۆیە پێویستە ئەم تیۆرییە پێداچوونەوەی بە سەردا بێت و دەسکاری بکرێت.

٢) خەباتی چینایەتی بەو شێوەی کە مارکس پێشبینی کردبوو، بە ئامانج نەگەیشت و چینی مامناوەندی نەك لە کۆمەڵگا نەسڕدرابۆوە بەڵکوو پەرەی ستاندبوو.

٣) ناوەندگەرێتی پیشەسازیی و سەرمایە، بە پێچەوانەی بۆچوونی مارکس، تووشی وێستان و بێ سەرەوبەرەیی ببوو.

**رێکخراوەی بازرگانی جیهانی** سازمان تجارت جهانی

(World Trade Organization (WTO

ئەم رێکخراوە بە پێی بڕیاری ١٢٤ وڵاتی ئەندامی رێککەوتننامەی گات (رێککەوتننامەی گشتی تاریفە و بازرگانی) دامەزرا و بە شێوەیەکی فەرمی لە رێکەوتی ١٩٩٥/١/١ دەستی بە کار کرد. ئامانجە سەرەکیەکانی رێکخراوەی بازرگانی جیهانی، بە هەمان شێوە کە لە پێشەکی دەقی رێککەوتننامەی گات هاتووە بریتییەلە: بردنەسەرەوەی ئاستی ژیان لە وڵاتانی ئەندام، دابینکردنی هەلومەرجی کار و پیشە، زیادکردنی داهاتی راستەقینە و بازاڕ، کەڵك وەرگرتنی بەجێ لە سەرچاوە جیهانییەکان و پەرەپێدان بە بەرهەمهێنان و بازرگانی نێو دەوڵەتی.

کاروبار و چالاکییەکانی ئەم رێکخراوە بە گشتی لە سەر چوار تەوەری سەرەکی هەڵدەسووڕێت:

PDF 4 KURD

یەکەم، گشتاندن و راپەراندنی بیرۆکەی بەناوبانگی«دەوڵەتی تەواودۆست»*و سڕینەوەی هەر چەشنە جیاوازییەك لە نێوان وڵاتانی هاوپەیمان لە بازرگانی جیهانیدا.

دووهەم، بەرگری لە سنووردارکردن و بەربەستکردنی هەناردە و هاوردەکان.

سێهەم، داشکانی تاریفە گومرگییەکان لە رێی گفتوگۆ و زامنکردنی رێکەوتنەکان.

چوارەم، راوێژکردن لە گەڵ ئەندامەکانیتر لە بابەت سیاسەتە بازرگانیەکان و چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە بازرگانیەکان لە رێی گفتوگۆ.

تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ ژمارەی ئەندامانی ئەم رێکخراوە گەیشتە ١٤٩ وڵات و ٢٨ وڵاتی دیکەش ئامادەیی خۆیان بۆ بە ئەندامبوون لەو رێکخراوەدا راگەیاندووە.

لە رووداوە تیرۆریستیەکەی ١١ی سێپتەمبەر*، کە لە لایەنە رێکخراوی ئەلقاعیدە* بە ئەنجام گەیشت، هەر دوو تاوەرە ئەفسانەییەکانی ئەم رێکخراوە لە ئەمریکا کەوتە بەر هێرش کە تێیدا نزیکەی ٣٠٠٠ کەس گیانیان لە دەست دا.

## رێکخراوەی پەروەردەیی، زانستی و کەلتووری نەتەوە یەکگرتووەکان (یونسکۆ)

سازمان آموزشی، علمی و فرهنگی ملل متحد؛ یونسکو

United Nations Educational, Scientific and Cultural Organization (UNESCO)

دامەزرانی رێکخراوەیەکی پەروەردەیی، زانستی و کەلتووری لە کۆنفرانسی وەزیرانی پەروەردەی هاوپەیمانان لە شەڕی جیهانی دووهەم لە لایەن دەوڵەتی بریتانیا پێشنیاز کرا. ئەم رێکخراوە کە یەکێکە لە ناوەندە پسپۆڕیەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٥ بە مەبەستی هەنگاونان لە پێناو ئاشتی و ئاسایشی جیهان لە رێگای هاریکاری نێونەتەوەیی بە کەڵك وەرگرتن لە پەروەردە و زانست و کەلتوور دامەزراوە، بە چەشنێك کە لە هەموو شوێنێك ستایشی عەداڵەت و سەروەریی قانوون و مافی مرۆڤ و ئازادییە سەرەکییەکان مسۆگەر بکات. ناوەندی یۆنسکۆ لە پاریسە.

چالاکیەکانی یونسکۆ لە ٨ تەوەری سەرەکی پێکهاتووە:

١) پەروەردە، (مەحف کردنەوەی نەخوێندەواری، بردنەسەرەوەی ئاستی پەروەردە، رێزگرتن لە مافی مرۆڤ لە رێی پەروەردە و دابینکردنی زانیاری بۆ گەشەپێدان بە شێوازەکانی پەروەردە).

٢) ) زانستی سرووشتی،(هاوکاری کردنی زانایان و هاندان بۆ ئاسانکاری لە مەڕ فێربوونی زانست).

٣) زانستە کۆمەڵایەتیەکان، (هاندان بۆ ناساندنی کۆسپ و تەگەرە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی بەردەم پەرەسەندن، بۆ وێنە جیاوازی ئایینی و نەژاد پەرستی).

٤) چالاکیە فەرهەنگیەکان، (پەرەپێدان بە دانوستانی کەلتووری لە نێوان ئەندامانی رێکخراوەو رووخستنی ئاسەوارە هونەری و ئەدەبی و فەلسەفییەکان).

PDF 4 KURD

٥) سازدانی پێوەندی نێوان کەسایەتییەکان، (کۆکردنەوەی زانیاری لە بواری دەرفەتی ئیش و کار و خوێندن لە دەرەوە و سەفەری دۆستانە).

٦) پێوەندی گشتی، (ئاگادار کردنەوەی هەمووان لە چالاکیەکانی یونسکۆ و ڕووداوە گرنگەکانی بواری پەروەردە و زانست و کەلتوور و یارمەتی دان بە جەماوەر بۆ فێربوونی زانست).

٧) تازەگەریی،(دابینکردنی پارە و کەلوپەل بۆ کتێبخانە و فێرگەکان و ناوەندە زانستییەکانی ئەو وڵاتانەی لە شەڕدا وێران بوون یان دواکەوتوون).

٨) یارمەتی تەکنۆلۆجی،(دابینکردنی کەسانی پسپۆڕ لە بوارە گرنگەکانی پەروەردە، ڕاهێنانی مامۆستایان، پەروەردەی تەکنۆلۆجیکی و لێکۆڵینەوە و هاوڕایی زانستی لە گەڵ ئەندامانی یونسکۆ بو نەهێشتنەوەی نەخوێندەواریی و دروستکردنی خوێندنگە و ...)

## ڕێکخراوەی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری(ناتۆ)

سازمان پیمان آتلانتیک شمالی (ناتو)

(North Atlantic Treaty Organization (NATO

پەیمانێکی سەربازییە کە لە ٤/٤/ ١٩٤٩ لە نێوان وڵاتانی بەلجیکا، کەنەدا، دانیمارك، فرەنسا، بەریتانیا، ئیسلەندا، ئیتالیا، لۆگزامبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پورتوگال، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یۆنان و تورکیا(١٩٥١)، ئەڵمانیای ڕۆژاوا(١٩٥٥) و ئیسپانیا(١٩٨٢)، مۆرکرا.

بە پێی مادەی پێنجەمی ئەم پەیمانە، هەر چەشنە هێرشێك بۆسەر وڵاتێکی ئەندام بکرێت، هێرش بۆ هەموو ئەندامانی ناتۆ لە قەڵەم ئەدرێ و ناتۆ خۆی بە بەرپرس ئەزانێ لەم وڵاتە پشتیوانی بکات و لە سەری هەڵقڕێ. ناتۆ لە بنەڕەتدا بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی ئەورووپای ڕۆژاوا لە بەرامبەر دەسەڵاتی سەربازی سۆڤیەت و *بلۆکی ڕۆژهەڵات**و بە واتایەکی‌تر بۆ بەربرگری لە پەرەسەندنی کۆمۆنیزم دامەزرا. ئەنجومەنی ئاتلانتیکی باکووری، باڵاترین پلەی ئیداری ناتۆ لە ئەژمار دێت و ئەرکی ڕێکخستن و هاوئاهەنگی لقە بەڕێوەبەرایەتیەکان و کۆمیتەی سەربازی بەرعۆدە گرتووە. لە ساڵی ١٩٦٦ فرەنسا هێزەکانی خۆی لە ناتۆ کێشاوە و لە ئەندامەتی سەرکردایەتی سەربازی هاتە دەرەوە. بەڵام لە بەشەکانی پشتگیری سەربازی و دابینکردنی بوودجە و دەزگاکانی هۆشدار تووشی نسکۆ هات. بەم بۆنەوە بارەگای نێونەتەوەیی ناتۆ لە فرەنساوە بۆ بەلجیکا گواسترایەوە.

دوابەدوای ڕووخانی *دیواری بەرلین**و یەکگرتنەوەی دوو پارچەکەی ئەڵمانیا و هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت، پەیمانی ناتۆ تووشی گۆڕانکاری هات. هەندێ پێیان وایە بە کۆتایی هاتنی *شەڕی سارد** ئیتر، بوونی ناتۆ کەڵکی نامێنێ بەڵام هەندێکیش لە سەر ئەم بڕوایەن کە بە هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت، ئەرکی ناتۆ کۆتایی پێ نەهاتووە و خایلەی سۆڤیەت تاکوو ئێستا هەر لە دڵی دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاواییدا

PDF 4 KURD

ماوەتەوە. بە پێی ئەم بۆچوونە ناتۆ ئەرکێکی بالاتر لە ئەرکی سەربازی هەیە و لەگۆڕێن دەسپێچکێکی سیاسی، شانبەشانی هاوکاری سەربازی و دیپلۆماتیك، زامنکەری هاوکاری ئابووری و کۆمەلایەتیشە.

بۆ ئەم مەبەستە و بە پێی بەرنامەی نوێی ناتۆ لە قەوارەی «هاوبەشێتی لە ئاشتی»دا زنجیرە دانیشتنێك لە ژێر سەردێری«١+١٦» بە ئامادەبوونی ناتۆ و وەزیرانی بەرگریی و دەرەوەی سۆڤیەت پێکهات و سەرەنجام لە مانگی مەی ١٩٩٧، ئەم ولاتە بە مۆرکردنی رێککەوتنێك لە پاریس، بە شێوەیەکی رەسمی ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردن لە گەلْ ناتۆدا راگەیاند.

لە درێژەی بەئەندامبوونی ولاتانی ئەورووپای رۆژهەلات لە ١٢ ی مارسی ١٩٩٩ کۆماری چێك، مەجارستان و پۆلەندا چوونە ناو ریزی ولاتانی ئەندامەوە. لەم سالانەی دواییشدا هەندێ لە ئەندامانی پێشووی پەیمانی وارشەو* هەولیانداوە ببنە ئەندامی ناتۆ، هەر بۆیە لە کۆبوونەوەی رۆژی ٢٠٠٢/١١/٢١ ئەندامانی ناتۆ لە پراگ داوا لە حەوت ولاتی بولگاریا، رۆمانیا، لیتۆنی، ئیستۆنی، لیتوانیا، سلۆڤاکیا و سلۆڤانیا کرا بۆ سالی ٢٠٠٤ ببنە ئەندامی ناتۆ. دواتریش بە ئەندامبوونی ولاتانی دیکەی ئەورووپای رۆژهەلات بەردەوامبوو. ئێستا ئەم رێکخراوە ٢٦ ئەندامی هەیە. ناتۆ لە شەڕی دژە تیرۆر لە ئەفغانستان وەك هێزێکی شەڕکەر لە گەلْ تالیبان دەوری چالاك ئەبینێ.

## رێکخراوەی جیهانی تەندروستی — سازمان جهانی بهداشت

## World Health Organization

رێکخراوەی جیهانی تەندروستی (W. H. O) یەکێکە لە دەزگا پسپۆرییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان کە لە رێکەوتی ٤/٧/ ١٩٤٨ لە سەر پێشنیازی کۆنفرانسی سانفرانسیسکۆ(١٩٤٥) و کۆنفرانسی نێونەتەوەیی تەندروستی لە نیۆیۆرك (١٩٤٦) دامەزرا. پێگەی یاسادانەری رێکخراوەکە «کۆمەلی تەندروستی جیهانی»یە کە سالی جارێك بە ئامادەبوونی هەموو ولاتانی ئەندام دەبەسترێ و پلان و بوودجەی رێکخراوەکە دەست نیشان ئەکات. بۆ«دەستەی کارگێریی»، نوێنەرانی ٢٤ دەولەت ئامادەن تا بریارەکانی کۆمەلْ جێبەجێ بکەن.

رێکخراوەی جیهانی تەندروستی لە رووی بەهێز کردنی باری تەندروستی و داوودەرمان یارمەتی هەموو ولاتانی ئەندام دەدات تا پەتا و نەخۆشیەکان لە سەرانسەری جیهان ریشەکێش بکات. بارەگای ئەم رێکخراوە لە شاری جێنێڤ دایە و کاروبارەکەشی لە ژێر چاوەدێری «بەرێوەبەری گشتی» بەرێوە دەچێت.

## رێکخراوەی جیهانی خاوەنداریەتی مەعنەوی — سازمان جهانی مالکیت معنوی

## World International Property Organization (WIPO)

ئەم رێکخراوە مێژووەکەی ئەگەرێتەوە بۆ کۆنڤانسیۆنی پاریس (١٨٨٣) و بێرن (١٨٨٦) کە بریتی بوون لە یەکیەتی نێونەتەوەیی بۆ پشتگیری خاوەنداریەتی مەعنەوی و یەکیەتی نێونەتەوەیی پشتگیری لە بەرهەمە ئەدەبی و فەرهەنگییەکان. ئەم دوو کۆنڤانسیۆنە لە ١٨٩٣ یەکییان گرت و سەرەنجام لە

PDF 4 KURD

کۆنڤانسیۆنی ستۆکهۆلّم(١٤/٧/ ١٩٦٧) لە ژێر سەردێری ڕێکخراوەی نێونەتەوەیی خاوەندارێەتی مەعنەوی، بوونی خۆی ڕاگەیاند بەلاّم بەشێوەیەکی ڕەسمی لە ٢٦/٤/ ١٩٧٠ پیادە کرا.

بە پێی بەندی ٣ی کۆنڤانسیۆنی ستۆکهۆلّم ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە:

- پەرەپێدان بە پشتگیری لە خاوەندارێەتی مەعنەوی لە هەموو جیهان لە ڕێگای هاوکاری نێودەوڵەتی.

- زامنکردنی هاوکاری ئیداری نێوان یەکیەتییەکان.

بە پێی بەندی چواری ئەم کۆنڤانسیۆنە، ڕێکخراوەکە بە مەبەستی گەیشتن بەو ئامانجانەی سەرەوە، هەڵدەستێ بە ئەنجامی ئەم ئەرکانەی خوارەوە:

- پەرەپێدان بە هەر جۆرە ئاسانکارییەك بە مەبەستی پشتگیری لە خاوەندارێەتی مەعنەوی. جیاواز لەمەش، هاوئاهەنگی یاسا نەتەوەییەکان بەهەند ئەگرێت.

- پیادەکردنی ئەو ڕێککەوتنە نێونەتەوەییانەی کە بۆ ئەم مەبەستە واژۆ دەکرێ.

- وڵاتانی خوازیاری یارمەتی یاسایی و تەکنیکی لە بابەت خاوەندارێەتی مەعنەوی، هاوکاری یەکتر دەکەن.

- هەموو زانیارییەکی پێوەندیدار بە خاوەندارێەتی مەعنەوی کۆدەکرێتەوە و بە توێژینەوە لە سەر ئەم بابەتە پاداش ئەدرێ و ئەنجامی توێژینەوەکان بلاّو دەکرێتەوە.

## ڕێکخراوەی ڕزگاریخوازی فەڵەستین سازمان آزادیبخش فلسطین

## Palestine Liberation Organization (PLO)

ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٦٤بە مەبەستی یەکخستنی گرووپە فەلەستینیە ئاوارەکان لە بەرەیەکی یەکگرتوودا بۆ تێکشکانی دەسەلاّتی زایۆنیستەکان و ستاندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان دامەزراوە و تەواوی وڵاتانی عەرەب و وڵاتانی دوژمنی ئیسرایل، ئەم ڕێکخراوە بە نوێنەری ڕاستەقینەی خەڵکی فەلەستین دەزانن. ڕێکخراو، یاسر عەرەفات بە سەرۆکی خۆی هەڵدەبژێرێ کە ئەودەم سەرۆکی گەورەترین ڕێکخراوی سیاسی فەلەستینیەکان بوو(بڕوانە ئەلفەتح). سەرۆکی ڕێکخراو لە کۆنفرانسەکانی وڵاتانی عەرەب، هاوشانی ڕێبەرانی ئەم دەوڵەتانە بەشداری ئەکات. تا ساڵی ١٩٧٠ ناوەندی ڕێکخراوەکە لە ئەردەن بوو بەلاّم بە هۆی ئەو پێکادانە خوێناوییەی کە لە سێپتەمبەری ئەو ساڵە لە نێوان سوپای ئەو وڵاتە و چەکدارانی فەلەستینی ڕوویدا، فەلەستینیەکان قەلاّچۆکران و ڕێکخراو، ناوەندی چالاکیەکانی خۆی گواستەوە بۆ سوریا و لوبنان.

ساڵی ١٩٨٢ بە هۆی زەبر و زۆری هێزەکانی ئیسرایل بۆ بنکەکانی ڕێکخراوەکە لە لوبنان، ڕێکخراو ناچار بوو ناوەندی چالاکیەکانی خۆی بگوازێتەوە بۆ تونس. لە ساڵی ١٩٨٨ ڕێکخراوەی ڕزگاریخوازی فەلەستین، دەوڵەتی فەلەستینی لە تاراوگە دامەزراند و یاسر عەرەفات بە سەرۆکی ئەم دەوڵەتە هەڵبژێردرا و لە لایەن پەنجا دەوڵەتی ئەو کاتە بە ڕەسمی ناسرا. (بڕوانە: دەوڵەتی تاراوگە)

PDF 4 KURD

دوابەدوای دەستپێکردنی پرۆسەی ئاشتی نێوان عەرەب و ئیسراییل و ڕێککەوتننامەی ئاشتی مەدرید، دەوڵەتی فەلەستین بارگاکەی خۆی گواستەوە بۆ کەرتی غەزە لە خاکی فەلەستین و لە هەڵبژاردنێکی گشتی لە ساڵی ١٩٩٦، جارێکیتر یاسر عەرەفات بە سەرۆکی دەوڵەتی فەلەستینی هەڵبژێردرا. لە یانزەی نۆڤەمبەری ٢٠٠٤ یاسر عەرەفات کۆچی دوایی کرد و سەرۆکایەتی حوکمەتی فەلەستینی لە ٢٠٠٥/١/٩ سپێردرایە مەحموود عەبباس ناسراو بە ئەبوومازن. بەڵام بە هۆی ناکارا بوونی ئەم حوکمەتە (بە ڕێبەرایەتی ئەلفەتح) و نادیاربوونی مافەکان و چارەنووسی فەلەستینیەکان و پەککەوتنی ئابووری لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی ١/١٥/ ٢٠٠٦ ڕێکخراوەی حەماس*(بزاڤی خۆڕاگری ئیسلامی) توانی لە سەرجەم ١٣٢ کورسی ٧٢ کورسی بباتەوە و بەم جۆرە دەوڵەتی نوێی فەلەستینیەکان دابمەزرێنێ. دوابەدوای سەرکەوتنی حەماس، ئیسراییل و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا یارمەتییەکانی خۆیان بۆ خەڵکی فەلەستین ڕاوەستاند و ئیسراییل بۆ پێوەندی گرتن لە گەڵ حوکمەتی فەلەستینی سێ مەرجی دیاری کرد کە بریتی بوون لە:

- دەبێ حەماس لقی چەکداری خۆی لە چەك داماڵێ.
- مادەی «لەناوبردنی ئیسراییل» لە پلاتفۆرمی حەماسدا نەمێنێ.
- هەموو ڕێککەوتنەکانی نێوان حوکمەتی فەلەستینی و ئیسراییل بەهەند بگیرێت.

## ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی — سازمان کنفرانس اسلامی

## Organization of Islamic Conference (OIC)

گەورەترین ڕێکخراوەی وڵاتانی ئیسلامییە کە لە ٥٦ ئەندام پێکهاتووە و بە شێوەی ڕەسمی لە سێپتەمبەری ١٩٦٩ لە کۆنفرانسی سەرۆکی وڵاتانی ئەندام لە ربات(پێتەختی مەغریب) دامەزرا. پاڵنەری سەرەکی بۆ پێکهێنانی ئەم کۆنفرانسە، چارەسەرکردنی ئەو کێشە و گرفتانە بوو کە لە ئەنجامی شکست هێنانی وڵاتانی عەرەبی لە گەڵ ئیسراییل(ژوونی ١٩٦٧) هاتبووە ئاراوە. ئامانجەکانی ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی بریتین لە:

- گەشەپێدانی پێوەندی و هاوکاری و یەکگرتوویی لە نێوان وڵاتانی ئیسلامی لە هەموو بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتووری.
- سڕینەوەی پاکتاوکردنی ڕەگەزی.
- پشتیوانی کردن لە ئاشتی نێودەوڵەتی.
- پشتگیری موسوڵمانان لە خەباتیان بۆ پاراستنی شەرەف و سەربەخۆیی و مافە نەتەوەییەکانیان.

هەرچەندە ئەم ڕێکخراوە لە سەرەتادا هەڵوێستێکی یەکگرتووی دژ بە ئیسراییل و پشتیوانی کردن لە ماف فەلەستینییەکان هەبووە بەڵام بە نزیك بوونەوەی میسر لە ئیسراییل و ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتی لە نێوان ئەم دوو وڵاتە، کۆنفرانس تووشی ناکۆکی هات و یەکەمین ناتەبایی لە ساڵی ١٩٧٨ بە دەرکردنی

PDF 4 KURD

میسر لە ڕێکخراو سەری هەڵدا. بە گشتی ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی لە مەڕ ئەو کێشە و گرفتانەی کە بۆ ولاتانی ئیسلامی هاتۆتە پێش، هەر لە دەستدرێژی یەکیەتی سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستانەوە بگرە تا شەڕی ئێران و عێراق و دوو شەڕەکەی کەنداو و ناکۆکییەکانی باکووری ئەفریقیا، نەیتوانیوە وەك سەرچاوەیەکی شەرعی بێتە مەیدانەوە بەڵکوو زیاتر لە جاران بەرەو بێ هێزی و دەستەوسانی و لەرزۆکی چووە.

لە پەراوێزی ئەم ڕێکخراوەدا چەند کۆمیتەیەك پێکهاتوون کە بریتین لە:

کۆمیتەی کاروباری ئابووری کە بە مەبەستی بەرەو پێشڤەبردنی هاوکاری ئابووری و پاراستنی یەکگرتوویی لە نێوان ولاتانی ئیسلامی دامەزراوە، کۆمیتەی زانستی فێرکاری و فەرهەنگی، ناوەندی لێکۆڵینەوەی مێژوویی، هونەری و فەرهەنگی ئیسلامی و کۆمیتەی نێونەتەوەیی پاراستنی جێماوەی ئیسلامی و لێژنەی وەرزش.

## ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان سازمان ملل متحد

## The United Nations Organization

ئەم ڕێکخراوە دوای تەواوبوونی شەڕی جیهانی دووهەم بۆ بەرگری کردن لە هەڵگیرسانی شەڕ و سەقامگیرکردنی ئاشتی لە جیهان دامەزرا. ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان، لە ڕاستیدا جێگای *کۆمەڵەی نەتەوەکانی* گرتەوە کە لە ساڵی ١٩١٩ پاش کۆتایی هاتنی شەڕی جیهانی یەکەم دامەزرابوو. ئامانجەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان وەك لە بەندی یەکەمی جاڕنامەکەیدا هاتووە بەم شێوەیە:

١ـ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی.

٢ـ پەرەپێدانی پێوەندیی برایانە لە نێوان نەتەوەکان لە سەر بنەمای ڕێزگرتنی بەرامبەر و یەکسانی مافەکان و ماق سەروەری نەتەوەکان.

٣ـ هاوکاری لە پێناو چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتییەکان و یەکخستنی هەوڵەکان لە بواری ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگی و ڕێزگرتن لە ماق مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان بۆ هەموو کەسێك.

٤ـ هاوئاهەنگ کردنی هەوڵەکانی ولاتانی ئەندام بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە ئاماژەیان پێکراوە.

ئەندامبوون لە نەتەوەیەکگرتووەکاندا بۆ هەموو ئەو دەوڵەتە ئاشتی خوازانەی کە دادوەریی ڕێکخراوەکەیان لە مەڕ بریارنامەکاندا قبوول بێت، ئازادە. ژمارەی ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە دەگاتە ١٩١ ولات و چاوەڕوان دەکرێ زیاتریش ببێت. ئەندامانی نوێ لە سەر پێشنیازی ئەنجومەنی ئاسایش و بە پەسند کردنی زۆرینەی ٢/٣ ئەندامانی «کۆمەڵی گشتی» وەردەگیرێن. ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی، چەندین ئەستونی گرینگی هەیە کە بریتین لە:

١ـ کۆمەڵی گشتی، (ئەم کۆمەڵە باس لە هەموو کێشە و بابەتە گشتییەکان دەکات، تەنانەت ئەو بابەتانەی کە پێوەندییان بە کۆمیتە و ئەنجومەنە گشتییەکانەوە هەبێت. )

PDF 4 KURD

٢ـ ئەنجومەنی ئاسایش، (ئەنجومەنی ئاسایش دەسەلاتێکی بەرفراوانی هەیە و سەرپەرشتی هێزی چەکداری نەتەوەیەکرتووەکانە و پاش دەرکردنی بریارەکان جێبەجێیان دەکات و دەوڵەتانی ئەندامیش ناچار بە جێبەجێ کردنیان دەکات. ئەگەر کێشەیەکی گرینگ بخرێتە بەردەستی ئەنجومەنی ئاسایش، بۆ جێبەجێ کردنی، پێویستە ٩ وڵات لە پانزە وڵاتی ئەندام رەزامەندی لە سەر بدەن بەو مەرجەی کە هیچکام لە پێنج ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەن (ئەمریکا، رووسیا، بریتانیا، چین و فەرەنسا) ڤیتۆ*ی نەکات یا دەنگی نەرێنی لەسەر نەدابێت.

٣ـ ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی، ئەنجومەنی ئابووری ٥٤ ئەندامی هەیە کە لە لایەن کۆمەڵی گشتییەوە بۆ ماوەی سێ ساڵ هەڵدەبژێردرێن. ئەم ئەنجومەنە لە هەموو بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکاندا چالاکی دەکات.

٤ـ ئەنجومەنی راسپاردەکان، ئەم ئەنجومەنە چاودێریی ئەو وڵاتانەی دەکرد کە هێشتا سەربەخۆییان وەرنەگرتبوو. ئەم ناوچانەش کە لە پانزە ناوچە پێکهاتبوون تا ساڵی ١٩٩٠ سەربەخۆییان وەدەست هێنا و پاشان ئەرکەکانی ئەنجومەنەکەش کۆتایی پێ هات.

٥ـ دادگای نێونەتەوەیی داد*، ئەم دادگایە پێکهاتووە لە پانزە دادوەر کە دەبێ خەڵکی پانزە وڵاتی جیاواز بن. ناوەندی دادگاکە لە لاهای هۆڵەندایە و لە سەر پێشنیازی ئەنجومەنی ئاسایش و پەسندکردنی کۆمەڵی گشتی دادەنرێن. ئەرکی سەرەکی دادگای لاهای، چارەسەرکردنی گیروگرفتە یاساییە نێودەڵەتییەکانە.

٦ـ سکرتاریەتی گشتی، ئەم کۆڵەکە هەموو ئەرکە کارگێرییەکانی رێکخراوە و هاوئاهەنگ کردنی دامودەزگا جۆراوجۆرەکانی نەتەوەیەکگرتووەکانی لە ئەستۆدایە و زیاتر لە ٢٥هەزار کارمەندی هەیە کە هەڵگری رەگەزنامەی هەموو وڵاتانی ئەندامی نەتەوەیەکگرتووەکانن.

سکرتێری گشتی، ئەرکی بەرێوەبردنی رێکخراوە و جێبەجێکردنی بریاری دەزگا جۆراوجۆرەکان لە ئەستۆ دەگرێ و هەر پێنج ساڵ جارێك لە سەر پێشنیازی ئەنجومەنی ئاسایش و پەسندکردنی ٢/٣ ئەندامانی کۆمەڵی گشتی هەڵدەبژێردرێ. سکرتێری گشتی نابێ هاووڵاتی هیچ کام لە پێنج وڵاتی ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایش بێت. هەڵبژاردنەوەی دووبارەی بۆ ئەم پۆستە، هیچ بەربەستێکی یاسایی نییە.

رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان، جگە لەو شەش ئەستونە سەرەکییە، کۆمەڵێك رێکخراوەی پسپۆریی و دامودەزگای جیاوازی دیکەی هەیە کە گرنگترینیان بریتین لە: ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی*، رێکخراوەی نێونەتەوەیی کار*، بانکی جیهانی*، رێکخراوەی خۆراك و کشتوکاڵی جیهانی، رێکخراوەی پەروەردەیی و زانستی و کەلتوری نەتەوەیەکگرتووەکان* و رێکخراوەی جیهانی تەندروستی* و ...

PDF 4 KURD

بە پێی جاڕنامەی نەتەوەیەگرتووەکان، ئەو زمانانەی کە لە ڕێکخراو بە شێوەیەکی ڕەسمی بەکار دەبرێن بریتین لە: سپانیۆلی، ئینگلیزی، چینی، ڕووسی و فەرەنسی. زمانی عەرەبیش بە زمانە ڕەسمییەکانی کۆمەڵی گشتی، ئەنجومەنی ئاسایش و ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی زیاد کراوە.

لەم ساڵانەی دواییدا نەتەوەیەکگرتووەکان، هەوڵی بەرزکردنەوەی توانای سەربازی خۆی داوە و چالاکییەکانی لە سەر ئاستی جیهانی بەرفراوان کردووە کە ئەمەش بە خاڵێکی سەرەکی گۆڕانکاری لە ڕۆڵی ئەم ڕێکخراوە دادەنرێ. تا ساڵی ١٩٩٥ سەرجەم هێزە چەکدارەکانی ڕێکخراو کە بە کڵاوشینەکان، یا «ئاشتی پارێزەکان» ناوبانگیان دەرکردووە گەیشتە ٧٠ هەزار کەس.

## ڕێکخراوەی نێونەتەوەیی ئاوارەکان        سازمان بین المللی آوارگان

(International Refugee Organization (IRO

ئەم ڕێکخراوە سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانە و لە ئاگۆستی ١٩٤٨ تا دیسەمبەری ١٩٥١ ئەرکی چاودێریی و گەڕاندنەوەی ئاوارەکانی بۆ وڵاتی خۆیانی لە ئەستۆ بووە و ڕاسپاردە و لایەنگری سیاسی و قانوونی ئاوارەکان بووە لەو وڵاتانەی کە وەردەگیران. ئەم ڕێکخراوە ئەودەم کاتی بووە و بە هەڵوەشانەوەی لە ساڵی ١٩٥١ ئەرکەکانی سپێردرایە «ڕاسپاردەی باڵای پەنابەرانی نەتەوەیەکگرتووەکان»*.

## ڕێکخراوەی نێودەوڵەتی کار        سازمان بین المللی کار

International Labour Organization

ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩١٩ وەك پێکهاتەیەکی سەربەخۆ، بەڵام لە ژێر چاوەدێری «کۆمەڵی نەتەوەکان» بە مەبەستی باشترکردنی هەلومەرجی ئیش و کار و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان و پێشخستنی ئابووریی و کۆمەڵایەتی جیهان دامەزرا. لە ساڵی ١٩٤٦ «ڕێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان»، ئەرکەکانی ئەم ڕێکخراوەی لە سەر ئەو بابەتانەی ئاماژەی پێ درا بە ڕەسمی ناساند و لەوە بەدوا وەك یەکێك لە دەزگا پسپۆڕییەکان ناونووس کرا.

ئەرکەکانی ئەم ڕێکخراوە بەوردی بریتیە لە دارشتنی یاسای نێودەوڵەتی کار، وەك ئاستی مووچە و هەقدەست و ماوەی کارکردن و بیمەی بێکاری، تەندروستی شوێنی کار، مەرجەکانی کارکردنی ژنان و مێرمنداڵان، پێشبینی سەردەمی پیری و نەخۆشی و پشتیوانی کردن لەو کرێکارانەی کە لە هەندەران ئیش ئەکەن. ناوەندی ڕێکخراوەکە لە جنێڤ ـە. ١٠ وڵاتی (ئەڵمانیا، ئەمریکا، بەریتانیا، ئیتالیا، چین، ژاپۆن، سۆڤیەت، فەرەنسا، کەنەدا و هیندستان) بە هۆی پێشکەوتن لە پیشەسازیدا ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەرایەتین و ٣٨ ئەندامەکەیتری دەستەی بەڕێوەبەرایەتی هەڵدەبژێرن.

PDF 4 KURD

## ڕێکخراوەی وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت (ئۆپێك)

سازمان کشورهای صادرکنندەی نفت(اوپک)

Organization of Petrolium Exporting Countries **(OPEC)**

ئەم ڕێکخراوە لە دوای هەوڵی زۆر و درێژخایەنی وڵاتانی نێرەری نەوت لە ژانوییەی ١٩٦١ لە کاراکاس (ڤینێزۆئێلا) دامەزرا و سەرەتا وڵاتانی ئێران، عەرەبستانی سەعوودی، عێراق، کوەیت، قەتەر و ڤینزۆئیلا بوونە ئەندام و پاشان، وڵاتانی ئەندونیزیا، لیبی و نایجریا بوون بە ئەندام. ئۆپێك بۆ گەیشتن بەم ئامانجانەی خوارەوە دامەزرا:

١- چەسپاندنی سیاسەتێك بۆ دانانی نرخ و مەزەندەیەکی یەکلاکراو، بەدوور لە هەلاجانی ئابووری وڵاتانی بەرهەمهێنی نەوت.

٢- پاراستنی سەرچاوە و کانە نەوتییەکان.

٣- پاراستنی ئاسایشی نەوتی ڕاگوێزراو.

٤- بەرگری لە زیادبوونی نرخی یەکلاکراو یان هەناردنی نەوتی لە ڕادەبەدەر بە پێچەوانەی بڕیاری زۆرینەی ئەندامان.

وڵاتانی ئەندام لە ئۆپێك، ٤٥٪ نەوتی جیهان بەرهەم دەهێنن و جگە لەوەش داوا لە کۆمپانیا نەوتیەکان دەکەن تا نرخی نەوت و بەرهەمە نەوتیەکان لە ئاستێکی دیاریکراو و یەکسان ڕابگرن، چونکا هەلاجان و هەڵبەز ودابەزی نرخی نەوت بۆ ئەم وڵاتانە دەبێتە هۆی هەلاجانی ئابووری و هەندێ جار گەشەسەندنی ئەم وڵاتانە تووشی زیان ئەکات.

یەکێك لەو هۆکارانەی کە لە دوای دامەزرانی ئۆپێك ناوبەناو بۆتە هۆی هەڵکشانی نرخی نەوت، شەڕ و گۆڕانکارییە ناوچەیی و جیهانییەکان بووە. بۆ وێنە:

- شەڕی ئیسراییل و عەرەبان لە ١٩٧٣ کە بۆ ماوەیەك بووە هۆی ڕاوەستانی ناردنی نەوتی وڵاتانی عەرەبی بۆ ڕۆژاوا و ئەمەش هەڵکشانی نرخی نەوتی لێکەوتەوە.

- شۆڕشی گەلانی ئێران (١٩٧٨) کە بەریانی نەوتی ئەم وڵاتەی بۆ ماوەیەك ڕاوەستاند و ئەمەش بووە هۆی هەڵکشانی بێ وێنەی نرخی نەوت تا ئەو سەردەمە.

- شەڕی ئێران و عێراق(١٩٨٨-١٩٨٠).

- شەڕەکانی کەنداوی فارس کە بریتی بوون لە: شەڕی هاوپەیمانی نێونەتەوەیی بە دژی عێراق لە دوای داگیرکردنی خاکی کوەیت لە لایەن ئەم وڵاتە (١٩٩١-١٩٩٠). شەڕی ئەمریکا و بەریتانیا بە دژی عێراق بە بیانووی چەککردنی ئەم وڵاتە(٢٠٠٣).

- زیادبوونی مەترسی و هەڕەشەی نێونەتەوەیی لە ئێران بە هۆی بەرنامەی ئەتۆمی ئەم وڵاتە لە ساڵەکانی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٨ کە نرخی نەوتی تا نزیکەی ١٣٠ دۆلار هەڵکشاند.

PDF 4 KURD

- سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری جیهانی لە ساڵی ٢٠٠٨ بووە هۆی دابەزینی دووبارەی نرخی نەوت بۆ ٤٠ دۆلار.

**ڕێکخراوەی هاوبەندی ئەمریکای لاتین** سازمان همبستگی آمریکای لاتین

Latin American Solidarity Organization

ئەم ڕێکخراوە لە ژانوییەی ١٩٦٦ لە پەراوێزی «هاوبەندی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئاسیا، ئەفریقا و ئەمریکای لاتین» لە شاری هاڤانا، پێتەختی کووبا دامەزرا. بە دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە سەرکەوتنی کاسترۆ و تیۆری شۆڕشی جووتیارییەکەی بەسەر حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەمریکای لاتین کە تا ساڵی ١٩٦٤ دژایەتییان دەکرد، مسۆگەر بوو.

**ڕێکخراوی هاوکاری و ئاسایشی ئەورووپا** سازمان همکاری و امنیت اروپا

Organization of Security and Cooperation in Europe

کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا لە ساڵی ١٩٩٥، ناوی خۆی بە ڕێکخراوی هاوکاری و ئاسایشی ئەورووپا گۆڕی. بەرنامە و ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتی بوو لە: بەرزڕاگرتنی بایەخە هاوبەشەکان، یەکدەنگی و هاوئاهەنگ کردنی باس و گفتوگۆکان لەمەڕ ئاسایشی ئەورووپا، چەک داماڵین و کۆنترۆڵی چەک، هەنگاونان بۆ چارەسەرکردنی قەیران و شەڕی ناوچەیی بە مەبەستی کەم کردنەوەی کێشە و ناکۆکییەکان.

**ڕێکخراوی هاوکاری و ئاسایشی ڕۆژهەڵاتی ناوین**

سازمان همکاری و امنیت خاورمیانه

Organization of Cooperation and Security in middle East

مالکۆڵم ریفکیند وەزیری دەرەوەی بریتانیا لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٦ لە سەردانێکی خۆی بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوین، دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوەی بە مەبەستی زیادکردنی متمانە لە نێوان وڵاتانی ناوچەکە پێشنیار کرد. بە باوەڕی ریفکیند، ئەو ڕێکخراوانەی کە تا ئەودەم لە ڕۆژهەڵاتی ناوین دامەزراون نەیانتوانیوە بە پێداویستیەکانی ناوچەکە وەڵام بدەنەوە. وێدەچێ کە ئامانجی سەرەکی لە دامەزرانی ئەم ڕێکخراوە پاراستنی دۆخی هەنووکەیی ناوچەکە و ڕازی کردنی عەرەبان بە ئاشت بوونەوە لە گەڵ ئیسراییلدا بێت.

**ڕێکخراوەی یەکگرتنی ئەفریقا** سازمان وحدت افریقا

Organization of African Unity

ئەم ڕێکخراوە لە ٢٥/٥/ ١٩٦٣ لە ئەدیس‌ئابابا پێتەختی ئیتیۆپیا دامەزرا کە ئامانجەکانیشی بریتی بوون لە: ١- هەوڵدان بۆ یەکگرتوویی و تەبایی وڵاتانی ئەفریقایی. ٢- ڕیشەکێشکردنی هەر جۆرێکی ئیست...

PDF 4 KURD

داگیرکاریی لە ئەفریقا. لەم ڕێکخراوەدا ٥٦ دەوڵەت ئەندامن کە نۆزدە دەوڵەتیان بە «هێزەکانی مۆنرۆیا» و ٦ دەوڵەتی دیکەش بە «هێزەکانی کازابلانکا» ناویان دەرکردووە. ئەفریقای باشووری لە ساڵی ١٩٩٤ بوو بە ئەندامی ڕێکخراو.

بە هۆی ناتەبایی و کێشمەکێشی نێوان ئەندامان، زۆربەی نەخشە و بەرنامەکانی ئەم ڕێکخراوە بەرەورووی شکست دەبێتەوە. سەرەنجام لە دوایین دانیشتنی ڕێکخراو لە ئەفریقای باشووری لە ژوویەی ٢٠٠٢، «ڕێکخراوەی یەکگرتنی ئەفریقا» بە شێوەیەکی ڕەسمی هەڵوەشایەوە و جێی خۆی دا بە «یەکیەتی ئەفریقا». هۆی ئەم هەڵوەشانەوە دەگەڕایەوە بۆ دامودەزگای پان و بەرین و زۆر بوونی ژمارەی کارمەندانی کە ٨٠٪ بوودجەی ڕێکخراوەکەی بۆ تەرخان دەکرا و تەنیا ٢٠٪ بوودجەکەی خەرجی بەرنامە ئابوورییەکان دەکرا.

## ڕێکخستن سازماندهی Organizing

دیاریکردنی پێکهاتەی پێوەندی دوولایەنە لە سەر بنەمای هەڵبژاردن و بەرپرسیاریەتی گرووپە ئینسانییەکان بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی دیاریکراو. ڕێکخستن پاڵنەرێکە بۆ هاوبەشی سیاسی چونکا بەم کارە جەماوەر بە ئامانجەوە بەرەو مەبەستێك ڕێنموونی دەکات و ڕێژەی هاوبەشی سیاسی دەباتە سەرەوە. بۆ دەسەڵاتدارانی هەڵبژێردراو، ڕێکخستن بریتییەلە خۆ ڕێکخستن بەڵام بۆ ڕێبەرە شۆڕشگێڕەکان، ڕێکخستن بە واتای خۆڕێکخستنە لە گەڵ جەماوەردا.

## ڕێککەوتننامەی جەزایر قرارداد الجزاير Algery Agreement

ئەم ڕێککەوتنە لە ٦/٣/ ١٩٧٥ لە شاری ئەلجەزیرە(پێتەختی جەزایر) لە لایەن محەمەد ڕەزا شای ئێران و سەدام حوسێن(کە ئەودەم جێگری سەرۆك کۆماری عێراق بوو) ئیمزا کرا. بە پێی ئەم ڕێککەوتنە، ئەو خاڵانەی کە دوو لایەن کۆك بوون لە سەری بریتی بوون لە:

١ـ سنوورەکانی خۆیان بە پێی پرۆتۆکۆلی ئەسکەندەرون (١٩١٣) و بڕیارنامەی دیاریکردنی سنوور (١٩١٤) دەست نیشان بکەن.

٢. ئێران و عێراق کۆتایی بە ناکۆکی مێژوویی خۆیان دەهێنن لەمەڕ ماف کەشتیوانی هەر دوو وڵات بە سەر ڕووباری شەتولعەرەب و سنوورە ئاوییەکانی خۆیان بە پێی هێڵی تالوگ دیاری دەکەن.

٣ـ بەم کارە دوو وڵاتەکە، ئاسایش و متمانەی دوو لایەنە بۆ یەکتر مسۆگەر ئەکەن و سنوورە هاوبەشەکانی خۆیان ئەپارێزن بۆ بنبڕکردنی هەر جۆرە دزەکردنێکی دوژمنکارانە لە لایەن ئەویدیکەوە.

٤ـ هەر دوولایەن، ڕێککەوتن لە سەر ئەوەیکە ئەم بڕیارانەی سەرەوە فەکتەرێکی هەمیشەیی بن بۆ چارەسەرییەکی گشتی و شکاندنەوەی هەرکام لەم ڕێکەوتنانە، لە گەڵ ڕۆحی ڕێکەوتنی ئەلجەزیرەدا دژایەتی هەبێت.

PDF 4 KURD

سێ مانگ پاش ئەم ڕێککەوتنە، هەر دوو وڵات پەیمانی نوێی سنووری نێوان ئێران و عێراقیان ئیمزا کرد. ئەم پەیمانە کاریگەرییەکی خراپی لە سەر شۆڕشی ئەیلوول دانا و لە ڕاستیدا ئامانجێکی سەرەکی هەر دوو لا، لە باربردنی شۆڕشی کوردستانی باشوور بوو.

**ڕێککەوتننامەی سایکس ـ پیکۆ(١٩١٦)** موافقت‌نامۀ سایکس ـ پیکو (۱۹۱۶)
Sykes-Picot Agreement (1916)

ڕێککەوتنێکی نهێنییە کە لە ١٩١٦/٥/١٦ لە نێوان بەریتانیا و فەرەنسا و لە لایەن «سێرمارك سایکس»ی بەریتانی و «جۆرج پیکۆ»ی فەرەنسی بە مەبەستی دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئیمزا کرا. سەرلەبەری ناوەرۆکی ڕێککەوتننامەکە بە پێچەوانەی ئەو وەعدە و بەڵێنانە بوو کە لۆرێنس لە عەرەبستان بە ناوی ڕێزگرتن لە ماف خەڵکانی عەرەبی ناوچەکانی ژێر قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دابووی. بە پێی ئەم ڕێککەوتننامە بەشێکی زۆری خاکی ڕۆژهەڵاتی ناوین بە دوو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا و فەرەنسا دابەش کرا. ناوچەی ژێردەسەڵاتی بەریتانیا بریتی بوو لە: شاری خانەقین لە کوردستانی خواروو، باشووری سووریا، بەغدا، بەسرە، باکووری فەلەستین و بەشێکی کوێت. بەشی فەرەنساش بریتی بوو لە: بەشی زۆری سووریا، لوبنان، ئەنەدۆڵ(باکووری کوردستان) و موسڵ. پاشان ڕووسیاش تێیدا بەشدار بووە و بە باڵیۆزی ڕووسیا ڕاگەیاندرا کە ئەگەر بڕیار لەسەر ئەم پەیمانە بدات، ئەوا ناوچەی باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا بە خاکی ڕووسیاوە ئەلکێندرێ. لایەنێکی گرنگی ئەم پەیمانە بۆ گەلی کورد ئەوەیە کە جارێکی دیکەش کوردستان لە لایەن وڵاتانی داگیرکەرەوە پارچە پارچە کرا.

**ڕێککەوتننامەی کەمپ دەیڤید** توافق‌نامه کمپ دیوید Kamp David Agreement

کەمپ دەیڤید، هاوینەهەواری سەرۆك کۆماری ئەمریکایە کە لە دەوروبەری شاری واشنتۆن هەڵکەوتووە. ئەم شوێنە پتر بە هۆی ئەو گفتوگۆیانەوە ناوبانگی دەرکرد کە لە ساڵی ١٩٧٨ لە نێوان کارتەر، سەرۆك کۆماری ئەوسای ئەمریکا و ئەنوەر سادات، سەرۆك کۆماری میسر و مناخم بگین، سەرۆك وەزیرانی ئیسراییل ئیمزا کرا. لە ئاکامی ئەم گفتوگۆیانە لە ١٩٧٨/٩/١٧ ڕێککەوتنی ئاشتی نێوان میسر و ئیسراییل ئیمزا کرا کە میسر لە بەرامبەر دان پێدانانی فەرمی بە ئیسراییل، سەرزەوییە داگیرکراوەکانی خۆی لە بیابانی سینا لە ئیسراییل وەرگرتەوە بەڵام ئەم کردەوەی میسر بووە هۆی ئەوە کە لە جیهانی عەرەب و ئیسلامیدا گوشەگیر بکرێت. ئەنوەر سادات سەرۆك کۆماری میسر بە هۆی ئیمزاکردنی ئەم ڕێککەوتننامە لە ١٩٨١/١٠/٦ لە لایەن ئەفسەرێکی توندڕەوی ئیسلامگەراوە تیرۆر کرا.

**ڕێککەوتننامەی واشنتۆن** توافق‌نامه واشنگتون Washington Agreement

پاش ڕوودانی چەندین شەڕی ناخۆیی لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکیەتی نیشتمانی

PDF 4 KURD

کوردستان (عێراق) کە لە ١٩٩٤/٥/١ دەستی پێکردبوو، (ئەم شەڕە بە شەڕی براکوژی ناوی دەرکرد) چەندین ڕێککەوتننامە(وەك ڕێککەوتننامەکانی پاریس، ئانقەرە و درۆگیدا) لە لایەن هەر دوولا ئیمزا کرا بەڵام هەردوو لایەن نەگەیشتنە ڕێککەوتنی یەکجارەکی و کۆتایی هێنان بە شەڕ. سەرەنجام لە ١٩٩٨/٩/١٧ بە چاودێری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، زەمینەیەکی لەبار بۆ ڕێککەوتنی هەردوولا ڕەخسا و لە لایەن پارتییەوە مەسعود بارزانی و لە لایەن یەکیەتییەوە جەلال تاڵەبانی و لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا، دەیڤید وڵش، بریکاری وەزیری دەرەوە ڕێککەوتننامەکەیان ئیمزا کرد.

بە پێی ئەم ڕێککەوتننامە هەردوولا، ئیدانەی شەڕی ناوخۆییان کرد و بەڵێنیان دا بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانیان، ئیدی پەنا نەبەنە بەر توندوتیژی یا دەستێوەردانی دەرەکی دژ بە یەکتر. هەروا بەڵێنیان دا کەشوهەوایەکی ئارام بۆ ڕێزگرتن لە ئاگربەس و ئاسانکاری هاتوچۆی هاووڵاتیان لە سەرانسەری هەرێمی کوردستاندا بخەنە گەڕ. جگە لەوەش بەڵێنیان دا بە ئاساییکردنەوەی ڕەوشی هەولێر و سلێمانی و دهۆك و دامەزراندنەوەی ئیدارە و پەرلەمانی یەکگرتوو لە سەر بنەمای هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢ و پاشان زەمینە بۆ هەڵبژاردنێکی نوێ خۆش بکرێت. ئەم ڕێککەوتننامە بۆ جێبەجێکردنی هەنگاو بە هەنگاوی بڕیارەکان، خشتەیەکی زەمنیشی لە خۆ دەگرت. سەرەنجام دانیشتنی ٢٠٠٢/١٠/٤ی پەرلەمانی یەکگرتووی کوردستان، بە هەنگاوێکی گەورە دادەنرێ بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامە و گێڕانەوەی ئاشتی بۆ هەرێمی کوردستان.

## ڕێککەوتننامەی یانزەی ئازار ١٩٧٠ — توافق‌نامه ١١ مارس ١٩٧٠

## Mars. 1970 Agreement –١١

ئەم ڕێککەوتننامە لە ١٩٧٠/٣/١١ لە نێوان بزاڤی ڕزگاریخوازی گەلی کورد بە سەرۆکایەتی مەلامستەفا بارزانی و حوکمەتی عێراق ئیمزا کرا و لە ١٥ مادە پێکهاتووە کە مافەکانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دەستەبەر ئەکات. مادەی ١٠ی ڕێککەوتننامەکە زۆر گرینگە و داوا دەکات کە دەستووری کاتیی عێراق بەم شێوەی خوارەوە هەموار بکرێت:

١- گەلی عێراق لە دوو نەتەوەی سەرەکی کورد و عەرەب پێك دێت و ئەم دەستوورە دان دەنێت بە مافی نەتەوەیی گەلی کورد و کەمینەکانی دیکە لە چوارچێوەی عێراقێکی یەکپارچەدا.

٢- داوا ئەکات ئەم برگەیە بە مادەی چواری دەستوور زیاد بکرێ: «زمانی کوردی لە پاڵ زمانی عەرەبی بە زمانی فەرمی ناوچە کوردنشینەکان دادەنرێت».

٣- ئەم خاڵەی سەرەوە لە دەستووری هەمیشەییدا جێگیر دەکرێت.

ئیمزاکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە کۆتایی بە جەنگی نێوان هەر دوولا هێنا و بە هەموار کردنی کابینەی عێراق، جێگرێکی سەرۆك کۆمار و چوار وەزیری کورد ـ کە هەموویان ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون ـ چوونە ناو کابینەی حوکمەتی عێراق بەڵام ئەو کۆمیتەی کە لە دەقی ڕێککەوتنەکەدا ئاماژەی پێ

PDF 4 KURD

لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی تووشی گرفت هات. بۆ نموونە ئەو دەڤەرانەی کە دەکەونە بەرنامەی ئۆتۆنۆمی یا ماف و جیاوگەکانی دامودەزگا ئۆتۆنۆمییەکان و ڕێژەی ئەو بوودجەی کە دەبێت بۆ ناوچەکە تەرخان بکرێت.

هێدی هێدی رژێمی عێراق لە بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز بۆوە و لە ١٩٧٤/٣/٢٧ هێرشی ئاشکرا و ڕاستەوخۆی کردە سەر ناوچەکانی کوردستان و بە ڕاگەیاندنی یەك لایەنەی پڕۆژەی ئۆتۆنۆمی سنووردار، بە کردەوە ڕێککەوتنەکەی هەڵوەشاندەوە و لەباری برد.

بەندی یەکەمی ئەم ڕێککەوتننامە دان بە بوونی ڕەوای گەلی کورد لە عێراقدا دەنێت و لە بەندەکانی دیکەش چەند خاڵێکی گرینگ لەبەرچاو گیراون، بۆ نموونە: کردنەوەی زانکۆی سلێمانی و کۆڕی زانیاری کورد و داننان بە هەموو مافە فەرهەنگییەکانی گەلی کورد و خوێندن بە زمانی کوردی لە هەموو قوتابخانە و پەیمانگە و زانکۆکان، داننان بە پاراستنی کەلتووری نەتەوەیی و جەژنە نەتەوەییەکان و بە ڕەسمی ناساندنی جەژنی نەورۆز وەك جەژنێکی نەتەوەیی لە کۆماری عێراق و ...

PDF 4 KURD

# ز

## زایـۆنیزم — صهیونیســـم — Zionism

ڕێبازێك كە پەرەی دا بە دامەزرانی ڕژێمێكی زایۆنیستی لە خاكی فەلەستین. پاش وێرانكردنی ئۆرشەلیم لە ساڵی ٧٠ی زایینی لە لایەن ڕۆمییەكان، جوولەكانی ئەم وڵاتە بە تەواوی جیهاندا بڵاو بوونەوە. بەم حاڵەش یەكییەتی ئایینی و كەلتووری لە نێوانیان نەپسا و لە ناو نەتەوەكانی دیكەدا نەتوانەوە. بە درێژایی مێژوو لە لایەن خاچپەرستەكانەوە وەك كەمینەیەك سەیریان ئەكرا و زۆر جاریش تووشی ئازار و ئەشكنجە دەبوون. بۆیە هەر ئارەزووی گەڕانەوە بۆ «ئەرزی مەوعوود»یان لە دڵدا مابۆوە.

لە سەدەكانی ١٦ و ١٧ هەندێ لە جوولەكەكان، هەوڵیان دا بگەڕێنەوە بۆ فەلەستین. بزووتنەوەی زایۆنیزم لە میانەی سەدەی نۆزدە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ناوەندیەوە دەستی پێكرد و ناوەكەی خۆشی لە دۆڵێكی فەلەستین بە ناوی «زایۆن» وەرگرتووە. لە ساڵی ١٨٩٧ ڕۆژنامەنووسێكی نەمسایی بە ناوی تیۆدۆر هێرتزێل، یەكەمین كۆنگرەی زایۆنیستەكانی لە بازێلی سویسرا بەڕێوە برد و داوای كرد هەموو جوولەكەكان بگەڕێنەوە بۆ فەلەستین.

ئەگەرچی عوسمانییەكان بەم كارە ڕازی نەبوون، بەڵام دوای ڕووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی، بەریتانیاییەكان بەم كارە هەستان و سەرەتا لە ساڵی ١٩٠٣ حوكمەتی بەریتانیا، پێشنیازی كرد كە بەشێك لە خاكی ئۆگاندا بۆ نیشتەجێكردنی جوولەكان تەرخان بكرێت كەچی زایۆنیستەكان ڕازی نەبوون.

بەیاننامەی بالفۆر كە لە ساڵی ١٩١٧، لە لایەن ئارتۆر جەیمز بالفۆر وەزیری دەرەوەی بەریتانیا بڵاو كرایەوە، بەریتانیای بە دامەزرانی ڕژێمێكی زایۆنی لە خاكی فەلەستین پێمل كرد. لە ساڵانی دوای شەڕی جیهانی یەكەم، بزوتنەوەی زایۆن، پەنابەرە جوولەكەكانی لە شار و دێهاتەكانی فەلەستین جێگیر كرد و هەندێ دامودەزگای سەربەخۆی لەوێ دامەزراند. حەشیمەتی جوولەكەكان كە لە ساڵی ١٩٢٥ زیاتر لە ١٠٨ هەزار كەس بوون، لە ساڵی ١٩٣٣ گەیشتە ٢٢٠ هەزار كەس. لە میانەی دوو شەڕی جیهانی و بە تایبەت شەڕی دووهەم، بە هۆی سیاسەتی دژ بە جوولەكەی نازیسم، جوولەكەكان دەستەدەستە بەرەو فەلەستین گلۆر بوونەوە و خۆیان گەیاندەوە ئەم سەرزەمینە.

زۆربەی عەرەبە فەلەستینییەكان هەر لە سەرەتاوە، زایۆنیستەكانیان وەك مەترسییەك لە قەڵەم دا و كەوتنە جموجووڵ بۆ سەركوت كردنیان. ئەم مەسەلە بووە هۆی دامەزرانی سپای خوفییەی جوولەكەكان لە ساڵی ١٩٢٠ كە بە ناوی هاگانا بە مانای بەرگری ناوی دەركرد. دوای شەڕی جیهانی دووهەم، ڕێكخراوەی نەتەوە یەكگرتووەكان بە دابەشبوونی فەلەستین و دامەزرانی دەوڵەتێك بۆ جوولەكەكان ڕازی بوو. بەرەبەرە زەمینە بۆ شەڕی گەورەی جوولەكە و عەرەبان خۆش بوو. لەم شەڕەدا جوولەكەكان بە زۆری سەركەوتنیا

PDF 4 KURD

بەدەس ئەهێنا و خاکێکی زۆرتریان داگیر ئەکرد. لە شەڕەکانی دواتریش (١٩٧٣،١٩٦٧،١٩٥٦) دەوڵەتانی عەرەبیش هاتنە مەیدانی شەڕەکە و ماڵ وێرانی و ئاوارەییەکی زۆری لێکەوتەوە. «ڕێکخراوەی ئازادی فەلەستین»* و چەندین گرووپی گریلایی دژ بە جوولەکەکان دامەزرا کە تا ئێستاش ئەم ناوچە ڕواڵەتی ئاشتی و ئارامی بە خۆوە نەدیوەتەوە.

**زستانی ئەتۆمی** زمستان هستەای Nuclear Winter

ئەم زاراوە ئاماژە ئەکات بە کارەساتێکی ژینگەیی کە لە دوای شەڕی ئەتۆمی ڕوو ئەدات. بەو پێیە، دوابەدوای تەقینەوە ئەتۆمییەکان، بۆ ماوەی پتر لە ساڵێك، گەرما و تیشکی هەتاو ناگاتە گۆی زەوی و ئەمەش دەبێتە هۆی سەرما و سۆڵێکی سەخت و زەوی دەگەڕێتەوە بۆ دۆخەکانی بەر لە مێژوو (چاخی سەهۆڵبەندان).

**زل هێز** ابرقدرت Superpower

هێزێك کە لە هێزەکانی‌تر بەهێزتر بێت. لە زاراوەی سیاسیدا «زلهێز» بە وڵاتێك ئەگوترێ کە لە بواری هێزی پیشەسازیی و سەربازییەوە لە وڵاتەکانی‌تر بەهێزترە و بە سەر گۆڕەپانی سیاسەتی نێونەتەوەیی‌دا دەسەڵاتدارییەتی ئەکات. ئەم زاراوە بە تایبەت بۆ ناوبرەکردنی ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەت (پێشوو)، بە کار دێت کە لە بواری بەرهەمهێنانی سنعەتی و هێزی سەربازی و وزەی ئەتۆمی و بەرفراوانی خاکی ولات و سەرچاوەی سروشتی و ڕادەی حەشیمەت، لە وڵاتەکانی دیکە لەپێشترن. هەروەها ئیمکانی مناوەرەی سیاسی و سەربازی ئەوان لە ئاستی نێونەتەوەیی‌دا لەوانی‌تر زیاترە و وەك دوو هاودژی سەرەکی لە گۆڕەپانی سیاسی و سەربازی لە ئەژمار دێن.

**زمانکوژی** زبانکشی Linguicide

بریتییە لە لەناوبردن و ریشەکێشکردنی زمان. قت کردنی زمانی زگماکی ناوچەکان لە سیستەمی پەروەردەیی وڵاتێك کە دەرەنجامی ئەم کارەش ئەگاتە سڕینەوەی فەرهەنگی کەمینە ئەتنیکییەکان. نموونەی ئەم قت کردنە، سیاسەتی زمانی وڵاتانی تورکیا و. . . سوریایە بە نیسبەت زمانی کوردی.

**زۆرداریی/ تیرانی** دژسالاری/جباریّت Tyranny

بە گشتی بە مانای حوکمەتی ستەمکار و چەوسێنەرە. لەم جۆرە حوکمەتەدا دەسەڵاتی وڵات بەدەست یەك یا چەند کەسێکە و ئەمانیش بە سەر گیان و ماڵی خەڵکدا دەسەڵاتێکی ڕەها و بێ سنووریان هەیە.

PDF 4 KURD

ئەم زاراوە بۆ ئەو حوکمەتانە بەکار ئەبرێ کە بە شێوازی ئیستبدادی و تیرۆر* دەسەلات بەڕێوە دەبەن. هەندێجار دیموکراسیش مانای زۆردارانە لە خۆ دەگرێ ئەویش ئەو کاتەیە کە زۆرینە* بە شێوەیەکی ڕەها و ستەمکارانە بەسەر کەمینەیەك حوکمەت دەکات.

## زۆرینە اکثریت Majority

هەر وڵاتێك، پێکهاتووە لە چەن گرووپی جیاوازی خەڵك. گرووپێك کە زۆرترین ژمارەی دانیشتوانی لە خۆ گرتبێت، پێی ئەگوترێ زۆرینە. کۆمەڵگا ئینسانیەکان لە لایەنی جۆراوجۆرەوە(سیاسی، ئابووری، ئاینی و زمانی و...) بە زۆرینە و کەمینە دابەش ئەکرێن.

لە سیستەمی پەرلەمانی نوێدا بنەڕەتی «حوکمەتی زۆرینە» وەك بنەمای بڕیاردانی یاسایی پەسند کراوە. واتە هەر بابەتێك کە زیاتر لە پەنجا لە سەدی دەنگەکان بێنێت، یاساییە و دبێ بەڕێوەبچێت. ئەگەریش بە ڕێوە نەچوو، یاسا فەشەل ئەهێنێت. چونکا مەفرووزە کە بڕیاری زۆرینە، بڕیارێکی عەقڵی و ڕاستە و ڕەنگدانەوەی «ئیرادەی گشتی»یە. بەڵام واش نییە کە «زۆرینە» هەمیشە نەگۆڕ بێت چونکا ڕەگەزەکانی دەگۆڕێن و هیچ زۆرینەیەکیش بۆی نییە کە خۆی بە خاوەن حەقێکی پاوانخوازانە بزانێ و هەمیشە سەروەر بێت.

هەبوونی ئازادی بیر و ڕا و کۆبوونەوە و لێبوردەیی سیاسی و ئایینی لەم سیستەمانەدا و سنوورداری خولەکانی پەرلەمان، بۆ ئەوەیە کە دەرفەت بدرێتە کەمینە سیاسییەکان تاکوو بە تەبلیغی ڕێبازەکانیان، بتوانن هاوڕایەتی کەسانی تریش بە دەس بێنن و لە کەمینەوە ببنە زۆرینە و سەرەنجام فیکرە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی خۆیان پیادە بکەن. بەم پێیە ڕەنگامەیی حیزب و گرووپە سیاسیەکان و ئازادی کۆبوونەوە و تەبلیغ، یەکێك لە ئەستوونەکانی سیستەمی پەرلەمانی ڕاستەقینەیە(بڕوانە ئازادیخوازی).

زۆرینەی تەواو، کاتێك دێتە کایەوە کە لانیکەم نیوە لەسەر یەکی دەنگەکانی وەدەست هێنابێ.

زۆرینەی ڕێژەیی، ئەوەیە کە هەندێ لە دەنگەکان لەوانی دیکە زیاتر بێت، بێئەوەی زۆرینەی موتڵەق بەدەس هاتبێ. (بۆ وێنە،ڕێژەی ٤٠٪ بە سەر ٣٠٪ یان ٢٠ ٪ )

## زیندانی سیاسی زندانی سیاسی Political prisoner

لە سیستەمە یاساییەکاندا زیندانی سیاسی بە کەسێك دەگوترێ کە بە هۆی بەزاندنی سنوورە یاساییەکانی دیاریکراو بۆ ئازادییە سیاسیەکان ـ کە لە دەستووری بنچینەیی دا دیاری کراوە ـ هەروا خستنە ژێر پێی سنووری دەسەلات و حاکمییەتی دەوڵەت، بڕیاری زیندانی کردنی بۆ دەرئەچێ. گەورەترین تاوانی سیاسی کە لە یاساکانی سزاداندا بە «تاوانی باڵا» ناوبردە کراوە، پیلان گێڕان بە دژی یەکپارچەیی خاکی وڵات و شەڕی چەکداری بە مەبەستی ڕووخانی ڕژێمی سیاسی وڵاتێکە.

PDF 4 KURD

لە لایەکی‌ترەوە، دیل کردنی هەر تاکێك بە هۆی ئەو تاوانانەی سەرەوە، بە پێشێلکردنی جاڕنامەی جیهانی ماڤی مرۆڤ دادەنرێ چونکە ئەم جاڕنامە لە بەندی نۆزدەهەمدا دەڵێ: هەموو کەسێك ماڤی ئازادی بیر و باوەڕ و ڕادەربڕینی هەیە و ئەم مافەش بریتییە لەوەیکە بە هۆی بیر و باوەڕیەوە تووشی ترس و خۆف نەبێت و لە پێناو وەرگرتنی زانیاری و ئەندێشە و بڵاوکردنەوەیان، بە ئامرازی گونجاو بێ ڕەچاوکردنی هیچ بەربەستێك، ئازاد بێت( بڕوانە مافەکانی مرۆڤ).

ئەو کەسانەی کە لە روانگەی ڕێکخراوە مرۆڤ پارێزەکانەوە بە زیندانی سیاسی لە قەڵەم ئەدرێن، زۆربەی دەوڵەتان بە تێکدەر و تیرۆریست و ئاژاوەگێڕ و ناحەز ناونووسیان دەکەن و ئەندامبوونیان لە گرووپە نایاساییەکان دژ بەو پێناسەیە دەزانن کە بۆ زیندانی سیاسی کراوە.

لە یاساکانی سزادان، ئەغڵەب تاوانی سیاسی لە تاوانە ئاساییەکان جیا دەکەنەوە و بۆ تاوانبارانی سیاسی هەندێ مەرج و ئاسانکاری تایبەت لە بەرچاو دەگرن. بۆ وێنە ئامادەبوونی «ئەنجومەنی چاودێران» و ماڤی جیاکردنەوەی زیندانی سیاسی لە زیندانی ئاسایی لە ناو بەندیخانەکاندا.

PDF 4 KURD

# ژ

## ژاکۆبنیزم — ژاکوبنیسم — Jacobinism

بزاوتی توندڕەوانەی سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسە (١٧٨٩) کە پێوەندی هەیە بە ڕوبسپیر و ئەندامانی «یانەی ژاکۆبن». مەبەستی سەرەکی ئەم بزاوتە پەیجۆری کردنی ئامانجە شۆڕشگێڕییەکانە بە هەر جۆرێك بێت و خۆپاراستن لە هەر چەشنە سازشکارییەك. هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی ژاکۆبنیزم بریتییەلە: سووکایەتی کردن بە خواستی زۆرینە، لایەنگری لە دیکتاتۆری گرووپێکی نەبەزی شۆڕشگێڕ و دامەزرانی کۆمیتەی ئاسایشی گشتی وەك بنکەیەك بۆ تیرۆر. لێنین، ڕێبەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری سەوڤیەت، لایەنگرەکانی خۆی بە ژاکۆبنەکانی پەیوەست بە چینی کرێکار ناوبردە ئەکرد.

## ژێرخان — زیرساخت — Infrastraucture

لە جیهانبینی مارکسیدا و بە پێی تیۆری «مەتریالیزمی مێژوویی»*، لە ناو هەموو پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا، پێوەندییە مادی و بەرهەمهێنەرەکان بە پێوەندی سەرەکی و چارەنووس‌ساز دادەنرێن. ژێرخانی هەر کۆمەڵگایەك بریتییە لە کۆی ئەو پێوەندییە بەرهەمهێنەرانەی کە پەیکەری ئابووری کۆمەڵگا پێك دێنن (واتە سیستەمی ئابووری، هێزە بەرهەمهێنەکان، پێوەندی چینایەتی و شێوازەکانی خاوەنداریەتی).

لە بەرامبەر ژێرخاندا سەرخان دێتە ئاراوە کە ئەویش بریتییە لە سەرجەم دەزگا کۆمەڵایەتی ـ سیاسی و کەلتوورییەکانی کۆمەڵگا. ئەم سەرخانە لە دوو ڕواڵەت پێك دێت: یەکەم، شێوازە یاسایی و ڕێکخراوەیی‌یە کۆمەڵایەتییەکان، واتە دەوڵەت و دەزگای دادپەروەری و سیاسی. دووهەم، ئایدیۆلۆجی* واتە کۆی بڕوا و ئەندێشە ئەخلاقی و سیاسی و ئایینی و فەلسەفییەکان کە ئەبێتە پاڵپشتی سیستەمی خاوەنداریەتی و شێوازی دابەشکردنی بەرهەمەکان. بە بڕوای مارکس، لە نێوان ژێرخان و سەرخان، پێوەندییەکی یەك لایەنە لە ئارادا هەیە و هەر چەشنە گۆڕانێك بە سەر ژێرخاندا بێت، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە سەرخانیشدا.

ژینۆساید: بڕوانە کۆمەڵکوژی.

PDF 4 KURD

# س

**سابوتاژ / گێرەشێوێنی** سابوتاژ/خرابکاری Sabotage

ئەم زاراوە لە وشەی فەرەنسی saboter بە واتای دەنگ دەرهێنان لە جۆرە پێڵاوێکی دارینە بە ناوی sabots وەرگیراوە کە لە ساڵی ١٨٤٢ لە لایەن کرێکارانی فەرەنسییەوە بە کار براوە. هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە یەکەمین بزاڤی کرێکاری فەرەنسە، کرێکاران بۆ دەربڕینی ناڕەزایەتی، پێڵاوە دارینەکانی خۆیان لە پێ دائەکەند و بە پێکدادانییان و دروستکردنی هەراهەرا و دەنگەدەنگ، بەربەستیان لە بەردەم کرێکارەکانی دیکە ساز ئەکرد. بە واتایەکی تر لە ساڵانی دوور، هەندێ لە کرێکارە ئەورووپییەکان بە مەبەستی دەربڕینی ناڕەزایەتی و گێرەشێوێنی، پێڵاوە دارینەکانی خۆیان دەخستە بەینی چەرخی کارگەکان و کارەکەیان رادەوەستان. سابوتاژ لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە ئەنجامی کاری تێکدەرانە لە رێکخراوە و دەزگا دەوڵەتی و گشتیەکان بە مەبەستی ئاستەنگی نانەوە و گێرەشێوێنی.

**ساتیاگراها** ساتیاگراها Satyagraha

ساتیاگراها وشەیەکی سانسکریتیە و بە مانای «هێزی رۆح و حەقیقەت» یان پێداگرتن لەسەر راستییە. ئەم گوزارە بەشێکە لە ئەندێشەی فەلسەفی و تیۆرییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی گاندی رێبەری بزاڤی نەتەوەیی و سەربەخۆیی خوازانەی خەڵکی نیمچە کیشوەری هیندستان. لەم فەلسەفەدا بۆ ئەنجامی چالاکی کۆمەڵایەتی، کاریگەریی هێزی دەروونی زیاترە لە هۆکارە ماددییەکان. شێوازی گاندی بۆ بەکارهێنانی هێزی رۆحی و پارێزکردن لە بەکارهێنانی هێزی ماددی، «نەرمکێشی» و هێوریی بوو. گاندی بە پشت بەستن بەم تیۆرییە، توانی راستی و خۆشەویستی بکاتە بناغەی کارەکانی خۆی و بە هاوبەندی و یەکپارچەیی هەموو چین و توێژەکان، لە خەباتی خۆی دژ بە کۆلۆنیالیستەکان بەردەوام بێت.

**سارك (یەکیەتی هاریکاری ناوچەیی ئاسیای باشوور)**

سارك(اتحادیه جنوب آسیا برای همکاری منطقه‌ای)

SAARC (South Asian Association for Regional Cooperation)

سارك ناوی رێکخراوەیەکە پێکهاتووە لە حەوت وڵاتی بەنگلادیش، بووتان، پاکستان، سریلانکا، مالدیف، نیپاڵ و هێندستان کە لە ١٩٨٥/١٢/٨ لە داکا پێتەختی بەنگلادیش بوونی خۆی راگەیاند. ئامانجی دامەزراندنی ئەم یەکیەتیە زیادکردنی هاریکاری ئابووری دوولایەنە لە نێوان ئەندامانی ناوبراو و

PDF 4 KURD

هاوکاریکردنی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانە لەم بەستێنەدا. نووسینگەی هەمیشەیی سارك لە کاتماندۆ پێتەختی نیپاڵ ـە و لە بەرواری ١٦ /١/ ١٩٨٧ بە شێوەیەکی فەرمی کراوەتەوە.

**سالت** سالت Salt

ئەم زاراوە کورتکراوەی دەستەواژەی (Strategic Arms Limitation Talks ـ گفتوگۆ لەمەڕ بەربەستکردنی چەکە ستراتیژیکەکان)ـە کە لە ساڵی ١٩٦٩ لە نێوان ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤیەت دەستی پێکرد و لە ٢٦ /٥/ ١٩٧٢ بوو بە هوی ئیمزاکردنی یەکەمین پەیمانی بەربەستکردنی چەکە ستراتیجیکەکان.

خولی یەکەمی ئەم گفتوگۆیانە و ئەو پەیمانەش کە لە دواییدا مۆر کرا، بە سالتی ١ ناوی دەرکردووە و خولی دووهەم کە لە ساڵی ١٩٧٩ پەیمانێکی تازەی لێکەوتەوە، بە سالتی ٢ ناونووس کراوە. بەڵام لە دوای هێرشی سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان لە مانگی دیسەمبەری ١٩٧٩، پەیمانەکە لە (١٩٨٠) لە کۆنگریس پەسند نەکرا و پێشبڕکێی خۆ پڕ چەك کردن لە نێوان ئەمریکا و سۆڤیەت بەردەوام بۆوە. لە ساڵی ١٩٨٢ دوو وڵاتی ناوبراو زنجیرە گفتوگۆیەکی تازەیان بە ناوی ستارت (START) هەر لەو بابەتەوە دەستپێکردەوە. پەیمانی ١٩٧٢ بە یەکەمین هەنگاوی گرینگ بەرەو کەمکردنەوەی چەکە ناوەکییەکان لە جیهان لە ئەژمار دێت.

**سانسۆڕ** سانسور Censor/Censorship

ئەم زاراوە لە وشەی لاتینی censere بە مانای حوکم کردن و بایەخ دانان وەرگیراوە بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە بەرگری کردن لە بڵاوکردنەوە و دەربڕینی هەر مەرام و بەرهەمێك (ئەدەبی، هونەری، سیاسی، ئایینی و فەلسەفی) کە لە ڕوانگەی سیستەمی سیاسی یا ئەخلاقی ـ کە دەسەڵاتی حاکم پشتیوانی لێ ئەکات ـ زیانبار و مەترسیدار لە قەڵەم بدرێت. سانسۆڕ ڕابردوویەکی دوور و درێژی هەیە بەڵام بەکاربردن و بەرجەستە بوونەوەی ئەم دیاردە ئەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی پاش داهێنانی چاپ.

کڵێسەی کاتۆلیك لە سەدەی ١٦ ی زایینی، یەکەمین لیستی کتێبی قەدەغەکراوی ڕاگەیاند و پڕۆتستانەکانیش لە سەردەمی «ڕیفۆرمی ئایینی» لە سانسۆڕ کەڵکیان وەرگرتووە.

سانسۆڕ لەم چاخەدا بە دوو جۆر ئەنجام ئەدرێ:

یەکەم، سانسۆڕی هۆشیارکەرەوە (ناڕاستەوخۆ) واتە لە پێش چاپ و بڵاوکردنەوە، بەر بە دەربڕینی مەرام یا بڵاوکردنەوەی بەرهەمێك دەگیرێت. لەم جۆرە سانسۆڕەدا خاوەنی دەزگاکانی بڵاوکردنەوە ناچار دەکرێن ئەو بابەتانە بڵاو نەکرێنەوە کە لە بەرژەوەندی سیستەمی فەرمانڕەوادا نین یا خود ناچاریان دەکەن بە پێچەوانەی ویستی خۆیان، هەندێ بابەت بۆ پیاهەڵدان و ستایشی حوکمەت بڵاوبکەنەوە. لەم وڵاتانەدا لەبەر ئەوەی نووسەران تووشی گێچەڵ نەبن، ناچار دەبن بە پارێزەوە شت بنووسن و لە ڕاستیدا خۆ سانسۆڕ دەکەنەوە (auto-censor).

PDF 4 KURD

دووهەم، سانسۆڕی سزادەر (ڕاستەوخۆ)، کە بە پێی یاسا و بە فەرمانی دادگا بەڕێوە دەچێ. سانسۆڕ بە گشتی تایبەتی وڵاتانی ئیستبدادی و تۆتالیتەری*یە بەڵام لە وڵاتانی دیموکراتیش تا رادەیەك سانسۆڕ چێ دەکرێت. لەم وڵاتانەدا کاتێك قۆناغێکی نائاسایی و هەستیار (بۆ وێنە کاتی شەڕ) دێتە پێشەوە، سانسۆڕ بەکار دەبرێت. هەروەها لە هەموو وڵاتێك، یاسایەك دەرئەچێت تاکوو لە بڵاوبوونەوەی ئەو بەرهەمانەی کە «دژی دەروون پاکی و ئەخلاقی گشتی» بێت، بەرگری بکات.

**سایبر دیموکراسی** سیبر دموکراسی Cyberdemocracy

ئەم زاراوە لەم دواییانەدا بۆ ئاماژەکردن بە پیادەکردنی دیموکراسی ڕاستەوخۆ لە ڕێگای تەکنولۆجیای نوێی کۆمپیتەری و ئەنتەرنێت بۆ نموونە بەشداری کردن لە هەڵبژاردنەکان، کەمکردنەوەی خەرج وبەرجی هەڵبژاردن، بڵاوکردنەوەی خێرای زانیاری سیاسی.

**دەروونناسی سیاسی**/سایکۆلۆجی سیاسی روانشناسی سیاسی Political psychology

لە ساڵەکانی ١٩١٠ بەملاوە، والتێر لیپمەن، ڕۆژنامەنووسی ئەمریکی(١٨٨٩-١٩٧٤) وتی: گەورەترین هەڵەی ئەندێشەی سیاسی ئێمە ئەوەیە کە بێ ڕەچاو کردنی«مرۆڤ»، دەم لە سیاسەتەوە بەین.

بابەتی سایکۆلۆجی سیاسی، لێکدانەوەی کاریگەریی کەسایەتی جەماوەرە بە سەر سیاسەتدا بە تایبەت گرنگایەتی سایکۆلۆجی لە بریارە سیاسییەکاندا سەرنجی پێدراوە. بەم حاڵەش جۆراوجۆری قوتابخانە سایکۆلۆجییەکان بۆتە هۆی فرەچەشنی سایکۆلۆجی سیاسی. بۆ وێنە جەخت کردن لە سەر سایکۆلۆجی فرۆید، سایکۆلۆجییەکی سیاسی جیاوازیش دێنێتە ئاراوە.

سایکۆلۆجی سیاسی، خۆی بە تایبەتمەندییە دەروونییەکانی ئەکتەرە سیاسییەکان سەرقاڵ ئەکات. متمانە کردن بە خۆ، هەست کردن بە گوناهباری، هەست بە ئاسایش یا نائەمنی، خودشەیدایی، ئیگۆی لاواز یان بەهێز و... لە جوملەی بابەتەکانی توێژینەوەی سایکۆلۆجی سیاسی لە ئەژمار دێن. بەڕای هەندێ لە پسپۆڕانی ئەم زانستە، سیاسەت بۆ ئەو کەسایەتییانە دڵڕفێنە کە لە قۆناغی منداڵی یا هەرزەکارییان تووشی شکست و سووکایەتی و ناموڕادی بوبێتن. وەها کەسانێك ئەیانهەوێت بە وەدەسهێنانی دەسەڵات، ئەم کەموکوڕییانەی ژیان قەرەبوو بکەنەوە.

بەم پێیە سایکۆلۆجی ڕێبەرە سیاسییەکان، بەم سێ شتەوە پەیوەستە: یەکەم ناسینی پاڵنەرەکانی کەسایەتی، دووهەم چۆنییەتی بە سیاسی کردنی ئەم پاڵنەرانە و سێهەم پاساودانیان بە پێی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان. لەم ڕوانگەوە ڕەفتاری سیاسی ڕێبەران بریتییە لە دیتنەوە و ئاشکرا کردنی پاڵنەرە دەروونییەکان و گرفتە شەخسییەکانی تاق منداڵی ئەوان.

PDF 4 KURD

**سپاردنی دەسەڵات** تفویض قدرت Delegation of power

سپاردنی دەسەڵات بە مانای ئەوەیە کە کەسێك یان ئەنجومەنێکی خاوەن دەسەڵاتی یاسایی یان سیاسی، بەشێك یا تەواوی دەسەڵاتی خۆی بسپێرێتە کەسێك یان جەماعەتێکی ژێردەستی خۆی. ڕەنگە دەسەڵاتی نوێنەرێك بە ڕێژەی دەسەڵاتی پەرلەمانتارێك جیاوازی بەرچاوی هەبێت.

**ستالین سڕینەوە:** *بڕوانە ستالین خوازی.*

**ستالین خوازی** استالینیسم Stalinism

بە سەرجەم سیاسەت و شێوازی حوکمەتی ژۆزێف ستالین(١٨٧٩-١٩٥٣)، سەرەك وەزیر و فەرماندەی گشتیی هێزەکان و سکرتێری حیزبی کۆمۆنیست و دیکتاتۆری یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو دەگوترێ. ئەم زاراوە، ئایدیۆلۆجیایەکی تایبەت نییە بەڵکوو شێوازی پیادەکردنی «مارکسیزم ــ لێنینیزم» ــە لە سەردەمی‌حوکمەتی ستالین و هەندێ شرۆڤەی ئەم تیۆرییانە و ڕادەی سازدانیان لە گەڵ واقیعدا. ئەم شێوازانە بریتی بوون لە تیرۆریزم و بوروکراتیزم و ملدانی زۆرەکی بە دەستووره ڕەهاکانی ستالین لە بزووتنەوەی کۆمۆنیستیدا جا چ لە سۆڤیەت بێ و چ لە نێوان حیزبەکان یان وڵاتە کۆمۆنیستەکانی جیهان.

ستالین خوازی، لەو کاتەوە سەری هەڵدا کە ستالین ڕەقیبەکانی خۆی بەتایبەت ترۆتسکی(بڕوانە ترۆتسکیزم) لە مەیدان بەدەر کرد و بوو بە جێنشینیی لێنین(١٩٢٤). سیاسەتی ستالین ناسراو بە (سۆشیالیزم لە یەك وڵاتدا) بریتی بوو لە هاوبەشێتی زۆرەملەیی کشتوکاڵ و پیشەسازی کردنی خێرای یەکیەتی سۆڤیەت. ستالین بۆ گەیشتن بەم ئامانجە،خەڵکی خستە ژێر کۆنترۆڵێکی پۆلیسی و لەم ڕێگەوە شێوازێکی بێڕەحمانەی زۆری بەکارهێنا و پۆلیسی نهێنی(کاگێبێ) و نەریتی ڕژێمە تۆتالیتەرەکانی لە گەڵ تاك پەرستی تێکەڵ کرد.

فرۆفیشاڵی ستالین‌پەرستانە وایکرد، ئەو وەك فەرمانڕەوایەکی خێرخواز بناسرێت کە بە بلیمەتی و ئاوەزمەندییەوە توانیویەتی گەلانی خۆشبەخت و ئاسوودەی وڵاتەکەی لە فیتنەی «کاپیتالیزم»(بڕوانە سەرمایەداری). ڕزگار بکات. تەواوی دەزگا تەبلیغاتییەکانی دەوڵەتی سۆڤیەت و سەرچاوەکانی هەواڵ و ئەمنیی و «ڕیالیزمی سۆشیالیستی»* لە ئەدەب و تەنانەت دەسکاریکردنی مێژووشی خستبووە گەڕ بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم فیکرە لە ناوخۆ ودەرەوەدا. سەرکەوتنی سۆڤیەت لە شەڕی جیهانی دووهەم و بەربڵاوکردنی دەسەڵاتی خۆی لە پاش ئەم شەڕە، بە مانای سەرکەوتنی مێژوویی و بە موراد گەیشتنی ستالینیزم لە جیهاندا لە ئەژمار ئەهات.

کۆمۆنیستەکان تا ئەو کاتەی ستالین مابوو، ئەویان بە گەورەترین شرۆڤەگەری مارکسیزم و باڵاترین سەرچاوەی تیۆری بزووتنەوەی نێونەتەوەیی کۆمۆنیزم لە قەڵەم ئەدا بەڵام پاش مەرگی لە کۆنگرەی بیستەمدا خرۆشچۆف، سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست بیلانێکی لە تاوانەکانی ستالین بڵاوکردەوە و لە کۆنگرەی بیست ودوهەم ئەم تاوانانە زیاتر لێکدرانەوە. ئینجا ستالینیزم بە سەرپێچی کردن لە فەرمانەکان

PDF 4 KURD

لینین زانرا و بە تاوانبار دەرچوو. لەمەودوا ناوهێنانی ستالین و بیروڕاکانی لە باو کەوت و ستالینیزم، بە زوڵم و زۆر و تاك پەرستی و دیکتاتۆرییەت و ڕژێمی پۆلیسی لێك درایەوە.

لە جووڵانەوەی نێونەتەوەیی بە دژی کۆمۆنیزم، حیزبی کۆمۆنیستی یوگۆسلاڤیا یەکەم حیزبێك بوو کە بەدژی ستالینیزم و پێدرێژیی ستەمکارانەی سۆڤیەت بۆ سەر حیزب و وڵاتە کۆمۆنیستەکان، ڕاپەڕی و ئەم کارەی بە لادان لە مارکسیزم ـ لێنینیزم لە قەڵەم دا.

یەکێك لە بەناوبانگترین شرۆڤەکانی ستالین کە لە تیۆرییەکانی مارکسیست ـ لێنینیست کردبووی، تیۆری «دەوڵەتی سەرەمەرگ» و «ئینتەرناسیۆنالیزم» بوو. ئەو لە وەڵامی ئەو کەسانەی بە ڕەخنە گرتن لە مارکسیزم پاش نەهێشتنەوەی چینی چەوساوە، (بە بڕوای ستالین ئەم چینە لە سۆڤیەت نەمابوو) مەسەلەی لەناوچوونی دەوڵەتیان باس ئەکرد دەڵێ: دەوڵەت بە لاوازکردن، تووشی مەرگی کاوەخۆ نابێت بەڵکوو زیاتر، بە بەهێزبوونی دەفەوتێ. لە بابەت ئینتەرناسیۆنالیزمیش دەڵێ: «ئینتەرناسیۆنال، کەسێکە بە گیان و بەدڵ بۆ پاراستنی یەکییەتی سۆڤیەت لە خۆی ببورێ ... چونکا هەرکەس گومان بکات کە بێ یەکییەتی سۆڤیەت دەتوانێ لە خەبات و شۆڕشی جیهانی داکۆکی بکات، لە ڕاستیدا بە دژی شۆڕش وەستاوە و دەکەوێتە ناو بازنەی دوژمنانی شۆڕشەوە». بەم پێیە ستالین، ستراتیجی* و تەکتیك*ی حیزبە کۆمۆنیستەکانی بە شێوازێکی ڕەها ئەبەستەوە بە سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت. بەڵام ئەم تیۆرییە لە پاش مەرگی ستالین تا ڕادەیەکی زۆر ڕەتکراوە و بە تایبەت پاش سەرهەڵدانی پرۆسەی ستالین‌سڕینەوە، کە بە گوزارشە پەنامەکیەکەی خرۆشچۆف(١٩٦٥)دەستی پێکرد و تێیدا پەرستشی تاك مەحکووم کرابوو، باڵادەستی و مەرجەعییەتی سۆڤیەت لە جووڵانەوەی نێونەتەوەیی کۆمۆنیزم، تووشی نسکۆ هات. ئینجا، شەڕی ئایدیۆلۆجیکی چین و سۆڤیەت و لە پاشان، لادانی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای ڕۆژاوا ــ کە لە گەڵ حیزبە کۆمۆنیستەکانی فەرەنسە و ئیتالیا و ئیسپانیا، بەرەیەکی نوێیان بە ناوی «کۆمۆنیزمی ئەورووپی» پێکهێنابوو ــ لانیکەم، سێ بەرەی تری لێ جیا بۆوە. هەوڵدان بۆ جیاکردنەوەی ستالینیزم لە مارکسیزم ـ لینینیزم و سڕینەوەی شێوازی ستالینی پاش بێدەس مانەوەی خرۆشچۆف لە دەسەڵات لە سۆڤیەتدا هەرەسی هێنا کەچی فەرمانڕەوایانی دواتر، بێئەوەی ناوێك لە ستالین بێنن، هەندێ دەزگا و دۆگمای ستالینی‌یان لەو وڵاتەدا زیندوو هێشتەوە.

لەم چەن ساڵەی دواییدا لە لایەن هەندێ دەزگای ناحکومییەوە، سەرلەنوێ لایەنگری لە ستالین ــ وەك ڕێبەرێکی بەتوانا بۆ ئیدارەی حوکمەتی سۆڤیەت ــ سەری هەڵداوە، تا ئەو ڕادەی کە چەندەها پەیکەری ستالین، نوێ کراوەتەوە و لە مۆزەخانەی تایبەت ڕێزی لێدەگیرێت.

**ستراتیجی** استراتژی / راهبرد Strategy

ئەم زاراوە لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی سەربازییە و بە مانای هەڵسەنگاندنی وەزعی خۆت و دوژمنەکەت یان دانانی پیلانی جەنگ و فەرمانداریی هێزی سەربازی لێکدراوەتەوە. لە سیاسەتدا بە مانای خستنە گەڕی

PDF 4 KURD

سەرجەم تواناییەکان و گۆڕینی باشتری هەلومەرجەکانە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی سیاسی. کەواتە ئەتوانین خستنەگەڕی تەواوی وزە ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دوورمەودای نەتەوەیی وەك، بە پیشەسازیکردنی وڵات یان گەیاندنی ئاستی بەهرەداری و دەسەڵاتی نەتەوەیی بە سنورێکی دیاریکراو، بە ستراتیجی ناوبردە بکەین. بەم پێیە ستراتیجی، هاوسەنگە لە گەڵ مێتۆدێکی گشتی بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی‌گشتی.

ڕەنگە ستراتیجی، هەمیشە بە ئامانجە سەرەکییەکەی نەگات یان لە مەیداندا ( چ سەربازی چ سیاسی) سەرکەوتوو نەبێت بەڵام هەوڵی ستراتیجی زانەکان ئەوەیە کە تووشی کەمترین شکست بێن.

بەڵام بۆ گەیشتن بە هەر ئامانجێکی گشتی ئەبێ لە چەن قۆناغ تێپەڕین. بە چۆنییەتی تێپەڕبوون لەم قۆناغانە و هەموارکردنی ڕێگا، تەکتیك دەگوترێ. چۆن لە جەنگێکدا گرتنەوەی گردێکی دیاریکراو بایەخێکی تەکتیکی هەیە، لە سیاسەتیشدا بە دەسهێنانی دڵی چینی مامناوەندی بۆ ئەوەیکە لە هەڵبژاردندا بە حیزبێکی چەپی دەنگ بدات، تەکتیك* لە ئەژمار دێت.

دەوڵەتەکان، لە پرۆسەی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا ناچارن لە ئاست سیاسەتی دەرەکی، دیدێکی ستراتیجیکی بە کار بێنن. لەم بۆچوونەدا ڕەنگە سیاسەتێك سەرکەوتن بەدەس بهێنێت کە پەسندی هەمووان نەبێت.

**ستراتیجی نەتەوەیی**    استراتژی ملی/راهبرد ملی    National Strategy

١ــ پەرەپێدانی هاوسان و هاوئاهەنگ بە هێزە سیاسی و کەلتووری و ئەخلاقی و ئابووری و سەربازییەکانی نەتەوە و وەگەڕخستنی ئەم هێزانە.

٢ـ زانست و تەکنۆلۆجیای بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کەلتووری و سەربازی وڵاتێك لە کاتی ئاشتی و شەڕ بۆ گەیشتن بە ئامانجە نەتەوەییەکان.

**سروودی نەتەوەیی/نیشتمانی**    سرود ملی    National Hymn

١ـ سروودێکی ڕەسمییە کە بالاًنوێنی ڕۆحی نەتەوە و کەلتوور و داب ونەریت و مێژووی وڵاتێکە.

٢ـ ئاوازێکی نیشتمانیپەروەرانە و ئایدیالییە کە لە کاتی فەرمیدا بۆ ڕێزگرتن لە وڵاتێك تۆمار ئەکرێت.

**سڕینەوەی مرۆڤایەتی**    انسانیت زدایی    Dehumanization

بەربەست کردن یان نەلێکردنی ئەندێشە و کەیفییەتی ئەو چالاکییانەی کە تایبەتی مرۆڤ بن. سڕینەوەی مرۆڤایەتی، زیاتر لەخۆ بێگانەبوونە وەك لەوەیکە بێگانە لە سیستەم یان ستراکتوورێکی دەرەکی بێت. مارکس ئەم حاڵەتەی بە ڕەگەزێکی تێکتەنراوی بێگانەبوونێکی گشتی لە ئیش و کار ناوبردە ئەکرد کە لە هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتیدا سەرهەڵئەدا و کرێکار ناچار ئەکات زیاتر لەوەیکە بۆ گەشە و نەشەی [illegible]

PDF 4 KURD

یان کەسایەتییەکەی کار بکات، تەنیا بۆ پاراستن و هێشتنەوە و مانەوەی خۆی مل ئەداتە کار. ئیمڕۆکە ئەم زاراوە بە گشتی بۆ ئەو ئەرکە ماشینی و دووپاتیانەی بەشی مۆنتاژ بە کار ئەبرێ کە بەردەستەکانی تاکوو ئاستی کەرتێکی ماشینی دائەبەزێنێ.

**سزاریزم:** بڕوانە قەیسەرگەرێتی.

**سکۆلاریزم** سکولاریسم Secularism

سکولار لە ریشەی لاتینی saeculum بە مانای کاروباری ئەم دنیا وەرگیراوە واتە جیهان پەرستی، ئەو شتەی کە پێوەندی بەم جیهانە خاکییەوە هەبێت. لە زاراوەی سیاسی و فەلسەفیدا بریتییە لە بڕواهێنان بە ڕاگواستنی سەرچاوە لە دەزگا ئایینیەکانەوە بۆ کەسان یا ڕێکخراوەی نائایینی. واتە گوێ بە ئایین نەدان و لە ئایین دابڕان، جیا کردنەوەی ئایین لە کاروباری حوکمەت و جیهان بە تایبەتی پەروەردەو فێرکردنی قوتابیان. بە پێی ئەم تیۆرییە، ئەو شتەی کە لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا ڕەسەن لە ئەژمار دێت، سیاسەتە نەك ئایین، چونکا ئایین شتێکی تاکەکەسی و شەخسییە. سکۆلاریزم بە واتای دنیا پەرستی و ڕەتکردنەوەی هەموو شتێك جگە لە دنیا و بە ئەسڵ دانانی دنیا ڕاڤە دەکرێت کەوابوو ڕەتکردنەوەی ئایینیش دەگرێتەوە.

بیرۆکەی پێویستی جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشمەکێش و ناکۆکییانەی کە لە تێکەڵکردنی شتە ڕۆحی و دەروونییەکان لە گەڵ شتە دنیایی و مادییەکان هاتبووە ئاراوە. ئەمیش سەرەتا لە کۆمەڵگای مەسیحییەکان و ڕۆما خۆی نیشان دا. ئەمان بۆ پاساوی بیر و بۆچوونەکەیان پشتیان بەم گوتەیەی عیسا پێغەمبەر بەستبوو کە دەڵێ: «ماڵی قەیسەر بۆ قەیسەر و ماڵی مەسیح بۆ مەسیح» واتە عیسا بە دینی خۆی و مووسا بە دینی خۆی!

لە سەدەکانی پاش چاخی ڕۆشنگەری و پاش سەرهەڵدانی فەلسەفەکانی لیبرالیزم و دیموکراسی، ئەندێشەی جیاوازی ئایین لە سیاسەت بە کردەوە پیادە کرا تا ڕادەیەك کە ئەمێستا ئەم بیرۆکە وەك بەشێکی سەرەکی دەستووری بنچینەیی وڵاتانی ڕۆژاوایی لێ دەرهاتووە.

**سکولاستیکیزم** فلسفە مدرسی/اسکولاستیسیسم Scholasticism

ئەم زاراوە لە ریشەی لاتینی scholastica بە واتای «وانە قوتابخانەییەکان» وەرگیراوە. لە سەدەکانی ناوەڕاست باس و گفتوگۆ زانستی و فەلسەفیەکان پتر لە ناو قوتابخانە و کڵێسا و پەرستگەکان ئەنجام دەدران هەر بۆیە باسە زانستیەکانی ئەو سەردەمە بە زانستی سکولاستیك ناوبانگیان دەرکردبوو. لایەنگرانی ئەم قوتابخانەیە ئیمانیان بەلاوە گرنگتر بوو لە ئەقڵ و ئاوەز و پێیان وابوو کە ئەبێ لە پێشدا بڕوا و ئیمانمان هەبێ ئینجا بابەتەکان بفامێنین. بەڕای ئەمان، ئایین لە لایەن خوداوە بە مرۆڤ عەتا کراوە و ئەقڵ ناتوانێ لە بەرامبەریدا ملهوڕیی بکات و ڕەتی بکاتەوە. باوەڕمەندانی ئەم ڕێبازە لە گەڵ هەر چەشنە سەربەخۆیی

PDF 4 KURD

فیکریدا نەیارن و تەنیا بە نووسراوەکانی کتێبی پیرۆز و بنەما فیکریەکانی ئایینی مەسیح پشت ئەبەستن.

ئەم فەلسەفە ئەگەرچی پشتی بە ئایینی مەسیح بەستبوو، بەڵام لە راستیدا جۆرێك گەڕانەوە بوو بۆ قوتابخانەکانی یۆنانی کۆن و لە ژێر کاریگەریی نیشتمانی خەیاڵی و ئایدیالی پلاتۆدا بوو. پاش سەرهەڵدانی رێنسانس لە ئەوروپا و پەیدابوونی هزرڤانان و بیرمەندانێك کە بنەماکانی سکولاستیکیان خستەبەر گومان، هەندێ ریفۆرم بە سەر ئایینی مەسیحدا هات و رێگا بەم قوتابخانە لێژ کراو و جێگای خۆی دا بە رێبازی راسیۆنالیزم.

## سۆسیال ئیمپریالیزم سوسیال امپریالیسم Social Imperialism

یەکەم جار، لێنین، ئەم زاراوەی لە ساڵی ۱۹۱٦ بۆ بەرپەرچدانەوەی کائۆتسکی و رێبەرانی دیکەی سۆسیال دیموکراسی ئەڵمانیا بەکار هێناوە و مەبەستی ئەوە بووە کە بە زمان لایەنگری سۆشیالیزمە و بە کردەوەش، سیاسەتی ئیمپریالیستی پیادە ئەکات.

دوابەدوای دەرکەوتنی ناکۆکی و کێشەی ئایدیۆلۆجیکی لە نێوان چین و سۆڤیەت، چینی یەکان ئەم زاراوەیان وەك ناتۆرە، بە سۆڤیەتیەکانەوە لکاند. ئەوان پێیان وابوو کە سۆڤیەتیش زلهێزێکی ئیمپریالیستیە کە دەخوازێت لە ژێر ناوی سۆشیالیزم، وێڕای دەسەڵاتدارییەتی بە سەر وڵاتانی دیکە، دەسەڵاتی سیاسی خۆی بەسەریان داسەپێنێ و لە سەرچاوە سرووشتی و ئینسانییەکانی ئەم وڵاتانە کەڵك وەربگرێت. بە واتایەکی‌تر، چینی یەکان لەو باوەڕەدا بوون کە سۆڤیەتیش وڵاتێکی ئیمپریالیستیە بەس تەنیا جیاوازییەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ سیستەمی ئابوورییەکەی کە لەبری ئەوەی سەرمایەداری تایبەتی بێت، سەرمایەداری دەوڵەتیە. لایەنگرانی سۆسیال ئیمپریالیزم، ئیمپریالیزمی تازەپێگەیشتووی سۆڤیەتیان، لە ئیمپریالیزمی ئەمریکا و رۆژاوا بە مەترسیدارتر دەزانی.

## سۆسیال داروینیزم سوسیال داروینیسم Social Darwinism

لە میانەی سەدەی ۱۹ بۆچوونە ژینگەناسیەکانی چارلز داروین لە سەر تیۆرییە سیاسیەکان کاریگەرییان دانا. گریمانەکانی داروین لە سەر لایەنە جۆراوجۆرەکانی ململانێ تەئکیدیان دەکرد و پێوەبوون کۆنتڕۆڵی سیاسی لە لایەن کەمینەیەکی سیاسی و سیستەمێکی ئابووری سەرمایەداری پاساو بدەن.

سپێنسر و گراهام سامنر، وەك پێشەنگی سوسیال داروینیزم، شەڕی مان و نەمان یان لە دۆخ دەدا (واتە کردوکۆشی گیانلەبەران بۆ زاڵبوون بەسەر دوژمن و بارودۆخی وادا کە بیانخاتە مەترسی لەناوچوونەوە) بەڵام لە لایەکی‌ترەوە بیرمەندانێکی وەك پارسۆنز و گامپلۆڤیچ و سیاسەتمەدارانێکی وەك بیسمارك، چەمبرلێن و رۆزڤێلت جیاوازی رەگەزی و زایەند و پەرەسەندنی ئیستیعمار و شەڕیان بەهەند ئەگرت و بە هۆکاری ململانێ و کێشمەکێشی نێوان نەتەوە و گرووپەکانیان دەزانی.

PDF 4 KURD

**سۆسیال دیموکراسی** سوسیال دموکراسی Democratic Socialism

لقێکی سۆشیالیزم و بزاوتی کرێکاری لە ئەژمار دێت کە جەخت ئەکات لە سەر بنەمای دیموکراسی بۆ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان و بڕوای بە ریفۆرم(چاکسازی) هەیە نەك شۆڕش. لە باری مێژووییەوە، سۆسیال دیموکراسی لە پاش ئینتەرناسیۆنالی یەکەم بەدیهات. لەو کاتەدا زۆربەی حیزبە سۆسیالیستەکان کە دواتر لە «ئینتەرناسیۆنال سۆسیالیست» کۆمەڵیان بەست، کەمتاکورتێك لە گەڵ ژیانی سیاسی وڵاتانی خۆیان یەکپارچە بوون و یەکیان گرتەوە.

لە باری تیۆرییەوە لە ئەوروپا بزاڤی سۆسیال دیموکراسی تا رادەیەکی زۆر دەرەنجامی پیاچوونەوە بە مارکسیزم و دەست بەردان لە دۆگماتیزمی تیۆری بوو. دوابەدوای سەرکەوتنی بولشویزم* لە سۆڤیەت، ریفۆرمخوازە سۆسیال دیموکراتیەکان بە یەکجاری لێك جیا بوونەوە و تەنانەت بەدژی یەکتر راوەستان. دوای شەڕی جیهانی دووهەم، سۆسیال دیموکراتەکان هەیمەنەی خۆیان لە ئەوروپای رۆژاوا بە دەست هێنایەوە بەڵام لە ئەوروپای رۆژهەڵات سەرکوت کران. سیاسەتی حیزبە دەسەڵاتدارەکانی سۆسیال دیموکراتی ئەوروپای رۆژاوا لە روانگەی هەندێ لە ئەندامانی ئەم حیزبانەوە سازشکارانە بوو، بەم بۆنەوە لە نێوان باڵی راست و چەپی ئەوان، کێشە درووست بوو.

ئینتەر ناسیۆنال سۆسیالیست لە ساڵی ١٩٥١، گرنگترین ئامانجەکانی بزاوتی سۆسیال دیموکراسی بەم جۆرە پێناسە ئەکات:

سۆشیالیزم، خوازیاری جێگیربوونی سیستەمێکە لە بری سەرمایەداری* کە تێیدا قازانجی گشتی بە سەر قازانج و بەرژەوەندی تاکەکەسی زاڵ بێت. بۆ گەیشتن بەم ئامانجەش دەبێ بەرنامەیەکی وا بۆ بەرهەمهێنان دابڕێژرێت کە قازانجی هەموان لە بەرچاو بگرێت. ئەم بەرنامەش بە کۆجێکردنی دەسەڵاتی ئابووری لە دەستی کەمینەیەك سەرناگرێت بەڵکوو پێویستیەکەی چاودێریەکی دیموکراتیانە و کاریگەرە بە سەر ئابووردا. کەواتە سۆسیال دیموکراسی، لە گەڵ پلاندانانی سەرمایەداری و هەر چەشنە بەرنامەیەکی تۆتالیتەری بە توندی دژایەتی دەکات چونکا هەردوکیان لە بەردەم چاودێریی گشتی بە سەر بەرهەمهێنان و دابەشکردنی یەکسانی بەرهەمەکان تەگەرە سازدەکەن. جاڕنامەی ئینتەرناسیۆنال سۆسیالیست، بانگەشەی ئەوە دەکات کە سۆشیالیزم بەدەر لە دیموکراسی بەدی نایە و بە «سۆسیالیست» ناوبردە کردنی هەندێ لەو وڵاتانەی کە بە سیستەمی تۆتالیتەری ئیدارە ئەکرێن، بە هەڵە دەزانێ. سۆسیالیستەکان بۆ پێشقەبردنی دیموکراسیەت لە پیشەسازیی و ئاستەنگکردنی بورۆکراسی، بەهێز کردنی یەکیەتییە کرێکارییەکان و بەڕێوەبەرانی کارگەکان بە پێویست دەزانن.

بە درێژایی سەدەی بیستەم، چ لە لایەن بیردۆزان و چ جەماوەرەوە، سۆشیالیزم بە واتای بەربڵاوی حوکمەتکردن بە سەر خۆدا هاوپێوەند لە گەڵ دیموکراسی لە قەڵەم دراوە. بەڵام لە میانەی ئەم سەدەوە تا هەڵوەشانەوەی سیستەمی کۆمۆنیستی کە لە ١٩٨٩ دەستی پێکرد، سۆشیالیزم و دیموکراسی بە گشتی وەك هاودژی یەکتر ناوبردە کراون. هۆکاری سەرەکی ئەم گۆڕانە فیکریەش ئەگەڕێتەوە بۆ هەڵسوکەوت

PDF 4 KURD

دیکتاتۆریانەی دەوڵەتانی سۆشیالیستی و تێکەڵ بوونی کۆنەپەرستانەی دەزگا سیاسیەکانی لیبراڵ ـ دیموکراسی لە گەڵ ئابووری سەرمایەداری لە وڵاتانی سەرمایەدار.

**دیموکراسی کۆمەڵایەتی** یان سۆسیال دیموکراسی لە سەرەتای سەدەی بیستەم، لە لایەن ئیدوارد برێنختاین، یەکێك لە مارکسیە ئەڵمانیەکان هاتە ئاراوە. برێنختاین، رایگەیاند کە پێشبینییەکانی مارکس دەربارەی مەرگی سەرمایەداری و دواتر بەدەسەڵات گەیشتنی چینی کرێکار ـ کە ئەودەم نوقڵانەیەکی زانستی لە قەڵەم درابوو ـ هەڵە و نادروستن. دەرکەوتنی ئەم ناڕاستییە بووە هۆی سەرهەڵدانی بزاوتێك کە بە ناخی سۆشیالیزمدا بچێتەوە و بە کەڵك وەرگرتن لە پەرلەمان و شێوازی ریفۆرمخوازانە، وەرچەرخانێك بە رێبازەکە بێنێت کە لەم ناوەدا دیموکراسی کۆمەڵایەتی، وەك ئاستێکی ناوەنجی سۆشیالیزم و لیبرالیزم پەسند بکات.

دیموکراسی کۆمەڵایەتی، سیاسەتێکی یەکسانخوازانەیە کە بڕوایەکی بەهێزی بە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی نوێ هەیە و بە ئەرکی سەرشانی دەوڵەت ئەزانێ کە سەرلەنوێ داراییەکان دابەش بکاتەوە. سۆسیال دیموکراسی، بنەما ئازادیخوازییەکان لە بابەت دیموکراسی نوێنەرایەتی و ئابووری تایبەتی و دەوڵەتی پەسند ئەکات و سەرنج ئەداتە ریفۆرمی سیاسی و وەفاداری خۆیان بە ئارمانجی ئەخلاقی عەداڵەتی کۆمەڵایەتی رائەگەیەنن.

بە باوەڕی مارکسییەکان، دیموکراسی رۆژاوا دیموکراسی بۆرژوازییە کە لە خزمەت چینی سەرمایەداردایە. ئەوان پێیان وایە کە باشترین شێوازی دیموکراسی، دیموکراسی سۆشیالیستیە چونکا لە خزمەت زۆرینەی هەرەزۆری رەنجدەرانە و بەرژەوەندییەکانیان بە باشی ئەپارێزێ و ژێرخانە ئابوورییەکەشی، موڵکداریەتی گشتییە لە پێناو کەرەستەی بەرهەمهێناندا.

بە پێی ئەم مەرامە، لە سیستەمی سۆشیالیستیدا، عەداڵەتی راستەقینەی تاکەکان بێ رەچاوکردنی رەگەز و نەتەوە و ئایین و زایەند لە هەموو بوارەکان دابین ئەکرێت

**سوسیال فاشیزم** سوسیال فاشیسم Social Fascism

ئەم زاراوە لە لایەن کۆمۆنیستە نەیارەکانی مۆسکۆ بە رۆڵی یەکیەتی سۆڤیەت لەو وڵاتە دەگوترا. بەڵگەی لایەنگرانی ئەم روانگە ئەوە بوو کە بە گۆڕانی سۆڤیەت لە دۆخی سۆشیالیزمەوە بۆ هێزێکی سۆسیال ئیمپریالیستی چینێکی بورژوا دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتووە و بوونەتە هۆی پەرەسەندنی فاشیزم لەم وڵاتەدا.

**سۆسیال کاتۆلیسیزم** سوسیال کاتولیسیسم Social Catholicism

بریتیە لە بزاوتێکی فیکری کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ دەستی پێکردووە. ئەم رێبازە خەباتی خۆی بە دژی سنعاتیبوون بە شێوازی لیبرالیستی و هاوڕێ لە گەڵ قوتابخانەی تاکگەرایانە هێورتر کرد.

PDF 4 KURD

لایەنگرانی ئەم ڕێبازە وێڕای بایەخدانان بە باوەڕە ئایینیەکانی خۆیان، بە بنەمای ریفۆرمی کۆمەلایەتیش بڕوایان هەیە. ئەو کاتۆلیکانەی کە خۆیان بە سۆسیال دەزانن، لە سەدەی نۆزدەوە بە دژی تاکگەرێتی بێسەروبەری کۆمەلگای لیبرالی و ئابووری لیبرالی دەست بەکار بوون. ئەم بزاوتە خەباتی خۆی کێشاوەتە ناو کۆمەلە کرێکارییەکان و بە شێوازی تیۆریك درێژە بە خەبات بەدژی تاکگەرێتی و بێباوەڕی ئەدات.

## سۆشیالیزم سوسیالیسم Socialism

سۆشیالیزم لە ریشەی لاتینی sociare بە واتای یەکگرتن و پەیوەست بوون پێکەوە، وەرگیراوە. سۆشیالیزم مانای زۆری هەیە بەلام واتای گشتی زاراوەکە بریتیەلە: «تیۆری یان سیاسەتێك کە ئامانجەکەی خاوەنداریەتیکردن یا چاودێری کۆمەلگایە بە سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان (سەرمایە، خاك، دارایی، تەکنۆلۆجی ) و وەگەڕخستنی ئەم شتانە بە قازانجی هەمووان. » بەم حالەش مانایەکی یەکلاکراو بۆ ئەم زاراوە لە ئارادا نییە چونکا چەمکی«خاوەنداریەتی و چاودێری گشتی» وەك هەویرێکن کە ئاو زۆر ئەکێشن. گرنگترین رەگەزی هاوبەشی تیۆرییە سۆشیالیستیەکان جەخت کردنە لە سەر بالادەستیی کۆمەلگا و قازانجی گشتی بە سەر تاك و قازانجی تاکدا. لە روانگەی مێژوویەوە، سۆشیالیزم هەلبڕینی دەنگە بە دژی تاك باوەڕی و لیبرالیزمی ئابووری هاوچەرخ.

ئەگەرچی وشەی سۆشیالیزم وشەیەکی نوێیە و بەرهەمی ڕووداوەکانی سەدەی هەژدەیە بەلام هەندێ پێیان وایە کە پێشینەی ئەم چەمکە دەگەڕێتەوە بۆ سەروبەندی ئەشکەوتنشینی مرۆڤ کە ئەودەم ئینسان ناچار بوو بە شێوەی کۆمەلەکی بژی. بەم جۆرە سۆشیالیزمە دەگوترێ «سۆشیالیزمی سرووشتی».

بەکارهێنانی وشەی سۆشیالیزم ئەگەڕێتەوە بۆ جیاوازییەك کە لە نێوان شۆڕشی سیاسی و شۆڕشی کۆمەلایەتی بەرچاو دەکەوێت کە مێژووی ئەم جیاوازییەش لە سەرەتاکانی ١٨٠٠ بەملاوە دەست پێئەکات. زاراوەی سۆشیالیزم یەکەم جار لە فێوریەی ١٨٣٢ لە رۆژنامەی سەن سیمۆن بلاو کراوەتەوە. هەندێ لە نووسەران لە سەر ئەم باوەڕەن کە شکست هێنانی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا و رۆچوون بە هەناوی دیکتاتۆری ناپیلئۆندا دەرەنجامی ئەم راستیە بوو کە شۆڕشەکە تەنیا شۆڕشێکی سیاسی بووە و لە رووکاری دامودەزگای دەولەتیدا قەتیس ماوە و شۆڕشی کۆمەلایەتی (بە مانا سۆشیالیستیەکەی) لە ئەندێشە و شێوە ژیانی جەماوەر لە ئارادا نەبووە. ئەم شرۆڤە دەگەڕێتەوە بۆ مارکس کە پێی وابوو شۆڕشی فەرەنسا کردەیەکی سیاسی بورژوازانە بووە.

خالێکی گرنگ کە دەبێ روون بکرێتەوە ئەمەیە کە شتێکی تۆکمە و یەکدەست بە ناوی سۆشیالیزم لە ئارادا نییە، بەلکوو دەبێ باس لە سوسیالیزمی جۆراوجۆر بکرێت کە زۆربەیان لە گەلْ ئایدیۆلۆجیاکانی دیکە تێهەلکێش بوون. لەم بابەتەوە دوکترینێکی سەربەخۆ لە ئارادا نییە و دەبێ بە شێنەیی لە گەلیدا هەلسوکەوت بکرێت چونکا هەلوێستی زالی مارکسیزم لە مێژووی بزاوتی سوسیالیستیدا بۆتە هۆی ئەوە کە ئەغلەب جار سۆشیالیزم بە چاوی مارکسیزم سەیر بکرێت. مارکسیزم، سۆشیالیزمی حەقیقی نییە بەلکو

PDF 4 KURD

یەکێکە لە رەگەزەکانی سۆشیالیزم.

زۆربەی لێکۆڵەرانی سۆشیالیزم، یەکسانی، بە بایەخی سەرەکی سۆشیالیزم ناوبردە ئەکەن و گوتراوە کە هەر سۆشیالیستیك دەبێ زیا لە هەموو شتێك یەکسان خواز بێت کەچی بە پێچەوانەوە هیچ باسێك لە ئازادی نەکراوە. لەم رووەوە داکۆکی کردنی لەڕادەبەدەر لە یەکسانی، بە واتای رەتکردنەوەی ئیمکانی ئازادی لێك دراوەتەوە. بۆیە دەڵێن سۆسیالیستەکان ناتوانن لایەنگری لە ئازادی بکەن.

هەندێ جار گومان دەکرێت کە هەموو سۆسیالیستەکان دەوڵەتخواز بن و بە جۆرێکی جیاواز لە چەمکی دەوڵەت تێگەیشتبن کەچی ئەمانە هەڵەیە. وێناکردنی سۆشیالیزمی لایەنگری دەوڵەت، هاوواتای کۆمەڵخوازی دێتەوە. کۆمەڵخوازی تەنیا مێتودێك نییە بۆ هەڵکشانی سۆشیالیزم بەڵکوو خاوەنی ستراتیجی بەهێزە کە زۆربەی سۆسیالیستەکان رەتیان کردۆتەوە. لە لایەکیترەوە ئەغڵەب مارکسیزم لەگوێن رێبازێکی دەوڵەتخواز سەیر کراوە و وەك نموونەیەکی ئایدیالی دەوڵەتی سۆشیالیستی ناوەندخواز سەیر نەکرێت کەچی لە نووسراوەکانی مارکس و ئینگڵس، روانگەیەکی پۆزەتیڤ دەربارەی دەوڵەت بەدی ناکرێت و ئەوەی کە دیارە شرۆڤەیەکی یەکجار نیگەتیڤە.

سەرهەڵدانی مارکسیزم لە میانەی سەدەی نۆزدە، وەرچەرخانێکی گەورە بوو لە ئەندێشەی سۆشیالیستیدا چونکا لەم قۆناغە بەدواوە، کەمتاکورتێك هەموو بزاوتە سۆشیالیستیەکان کەوتنە ژێر کاریگەری ئەم ئایدیۆلوجیاوە. مارکسیزم، خۆی بە «سۆشیالیزمی زانستی» پێناسە کرد چونکا ساعەی رێبازەکەی لە سەر شیکاریی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و دۆزینەوەی «یاسا جەبرییەکانی» مێژوو دانابوو.

سەرهەڵدانی بولشویزم لە سۆڤیەت و سەرکەوتنی لە ١٩١٧ قۆناغێکی دیکەی مێژووی وەرچەرخانی سۆشیالیزمە چونکا لە دوای ئەم قۆناغە بوو (لە ١٩٢٠) بزاڤی سۆشیالیستی بە دوو لقی سەرەکی کۆمۆنیزم و سۆشیالیزم دابەش کرا. تایبەتمەندی کۆمۆنیزم، جەخت کردن بوو لە سەر ماهییەتی شۆڕشگێڕانەی مارکسیزم و بەدیهاتنی سۆشیالیزم کەچی سۆسیالیستەکان هێدیهێدی لە خەسڵەتی شۆڕشگێڕانە و زانستیانەی مارکسیزمەوە بایانداوە بەرەو خەسڵەتی ئەخلاقی سۆشیالیزم و نەریتەکانی دیموکراسی رۆژاوایی. بەم جۆرە، بزاوتی سۆشیالیستی دوو باڵی شۆڕشگێڕانە و ریفۆرمخواز*ی لێ جیا بۆوە و ریفۆرمخوازەکانیش، دواتر بە «سۆسیال دیموکرات» ناویان دەرکرد. نووکە، پێناسەی «سۆسیالیست» بە دەگمەن بۆ کۆمۆنیستەکان بەکار دەبرێت.

سۆشیالیزم لە گەڵ هەر چەشنە پێناسەیەکی بنبڕکراودا نەیارە، چونکا بە پێی بۆچوونی مارکس شێوازی سۆشیالیزم پێوەندی هەیە بە هەلوومەرجی مێژوویی و کۆمەڵایەتیەوە. کەواتە رەنگە سۆشیالیزم دەوڵەتی بێت یان لایەنگری ئازادی تاکەکەس، مارکسی بێت یان لیبرال، شۆڕشگێڕ بێت یا لایەنگری ئینتەرناسیۆنال*. بەڵام لە سەر ئامانجەکانی سۆشیالیزم رێککەوتنێك هەیە ئەویش بریتیەلە کۆمەڵگایەکی بەدەر لە چینایەتی لە سەر بناغەی خۆماڵیکردنی دارایی و ناوەندە سەرەکییەکانی بەرهەمهێنان. خەونی جیهانگیربوونی برایەتی، مرۆڤایەتی و ئازادی لە نێوان هەموو قوتابخانە فیکرییەکانی سۆشیالیزم

PDF 4 KURD

هاوبەشە.

خاڵێکی جیاواز کە دەکرێ ئاماژەی پێ بدرێت ئەوەیە کە سۆسیال دیموکراسی، تێدەکۆشێ بە شێوازێکی دیموکراتیانە دەست بە سەر دەوڵەتدا بگرێت بەڵام سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕانە لە شوێن سڕینەوەی دەوڵەتی هەنووکە و دامەزرانی دەوڵەتێکی نوێیە لە ڕێی دیکتاتۆری پرۆلتاریا (مارکسیزم*، لینینیزم*، کۆمۆنیزم*).

بێ گومان تیۆری و ئاریشە گرنگەکان، بە پێی زەمەن و لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازییان هەیە. سۆشیالیزم لە ڕاستیدا بزاڤێکە بۆ برەوپێدانی خۆشبەختی و خۆشبژێوی هەموو کەسێك. ئەم بزاوتە بە شوێن «گەورەترین شادی و خۆشحاڵی بۆ زۆرترین ڕادەی خەڵك» ـە، نەك بۆ بوونەوەرێکی میتافیزیکی وەك دەوڵەت کە تەنیا بۆ بەدیهاتنی خواستی هەندێ کەس هاتبێتە کایەوە.

دوای هەندێ گۆڕان بە سەر بنەماکانی سۆشیالیزم، واتاکانی سۆشیالیزمیش گۆڕانی بە سەردا هاتووە و چەندەها لقی جوراوجۆری لێ بۆتەوە. بە گوتەی گریفیس نووسەری بریتانیایی، نزیکەی ٢٦١ جۆری سۆشیالیزم هاتۆتە ئاراوە کە هەرکامیان پێناسەی خۆی هەیە بەڵام وەك ئاماژەی پێدرا ڕەگەزی هاوبەشی تیۆرییە سۆشیالیستیەکان داکۆکی کردنە لە سەر باڵادەستیی کۆمەڵگا و قازانجی گشتی بە سەر تاك و قازانجی تاکەکەسدا. نموونەکانی ئەم سۆشیالیزمانە بریتین لە: سۆشیالیزمی پەرەسەندووانە، سۆشیالیزمی زانستی، سۆشیالیزمی فابیان، سۆشیالیزمی پیشەیی، سۆشیالیزمی مارکسی، سۆشیالیزمی لیبرال، سۆشیالیزمی پەرلەمانی و. . .

### سۆشیالیزمی پیشەیی — سوسیالیسم صنفی — Guild Socialism

لقێکی بزاوتی ڕادیکالیزمی ئەورووپییە کە لە ساڵی ١٩٠٦ دامەزراوە. ئەم بزاوتە خوازیاری گەڕانەوەیە بۆ سیستەمی پیشەیی سەدەکانی ناوەڕاست. لایەنگرانی ئەم بزاڤە چالاکییەکانی خۆیان لە ناو یەکیەتی و ئەنجومەنەکاندا کۆ دەکەنەوە و قازانج و بەرژەوەندی کرێکاران تەنیا لە ڕێگەی کارگە و دامودەزگاکاندا دەبینن و بڕوایان بە دروستکردنی یەکیەتی پیشەیی هەیە. بەم بۆنەوە یەکیەتی کرێکاری ڕێك ئەخەن و بە شێوەیەکی پیشەیی و ئەنجومەنی، پیشەسازییەکان بەڕێوە دەبەن. ئەم بزاوتە ڕادیکاڵیستیە لە ١٩٢٥، دوابەدوای هەڵوەشانەوەی «کۆمەڵەی یەکیەتییە نەتەوەییەکان» لەناو چووە و زۆربەی ئەندامەکانی چوونە ناو ڕیزی ئەندامانی حیزبی نوێباوی کۆمۆنیستی بریتانیا و ئێستاش نەریتەکانی لە حیزبی کرێکاری بریتانیادا پیادە ئەکرێت.

### سۆشیالیزمی خزۆك — سوسیالیسم خزنده — Creeping Socialism

دەستێوەردانی بەکاوەخۆی دەوڵەت لە کاروباری کەرتی تایبەتی ئابوور، بە سۆشیالیزمی خزۆك پێناسە

PDF 4 KURD

کراوە. ئەم شتە لەو وڵاتانە روونەدات کە دەوڵەت وردەوردە دەزگا ئابووریەکان، خۆماڵی دەکات و دەست و باڵی کەرتی تایبەتی لە ئابووردا ببەستێتەوە و خۆی زیاتر بە کاروباری ئابووری سەرقاڵ بکات.

**سۆشیالیزمی خەیاڵی** سوسیالیسم تخیلی Utopian Socialism

ئەم زاراوە کە لە روانگەی مارکسیەکانەوە پەرچەکردارێك بوو لە بەرامبەر سیابەختی و بێعەداڵەتیەکانی کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدە، هەڵگری بیرۆکە و تیۆریگەلێکن کە لە لایەن ناودارانێکی وەك سەن سیمۆن، فۆریە، بوشە، کابە و لوٚیی بلان ئاراستە کرابوون. سۆشیالیزمی خەیاڵی، ناوێك بوو کە کارۆڵ مارکس، بۆ پێناسەکردنی هەموو ئەو بزاوت و رێبازە مژاوییانەی کە پێشتر لە ئارادا بوون بەکاری هێنابوو.

**سۆشیالیزمی زانستی** سوسیالیسم علمی Scientific Socialism

بە باوەری کارۆڵ مارکس (١٨١٨ـ١٨٨٣) سۆشیالیزم، لێکۆڵینەوەی زانستیانەی کۆمەڵگا و هەلومەرجی ئابووری و تەکنیکی بە پێویست دەزانێ تاکوو بەم بۆنەوە واقیعەکانی کۆمەڵگا و یاساکانی داسەپاو بەسەریا بناسرێن و بەسەر ئاریشەکانی سەرمایەداری*دا زاڵ بین. سۆشیالیزمی زانستی لە لایەن هەر دوو رێبازی مارکسیزم و کۆمۆنیزم پەسند کراوە بەڵام دەرەنجامی توێژینەوەکانی هەندێ لە سۆسیالیستەکان ئەم راستییە دەرئەخات کە سۆشیالیزم یا تەنانەت مارکسیزمیش، دیاردەیەکی زانستی نییە چونکا پێیان وایە کە هێشتا کۆمەڵناسی نەیتوانیوە بە پلە و پێگەی زانستی بگات و وەك زانست ناوبردە بکرێت. جگە لەمەش هەندێ لە رووداوەکان و واقیعەکانی هاوچەرخ، پێشبینییە ـ بە رواڵەت زانستی ـ یەکانی مارکسیان بەدرۆ کردۆتەوە. کەواتە بە واتایەك، باسکردن لە سۆشیالیزمی زانستی بانگەشەیەکی نازانستیانەیە.

**سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕانە** سوسالیسم انقلابی Revolutionary Socialism

ئەم جۆرە سۆشیالیزمە کەمتاکورتێك مارکسیزم* پەسند ئەکات بەڵام هەموو جۆرە مێژوویەکی رژێمی کۆمۆنیستی رەت ئەکاتەوە و قایل نابێت بە رێبەرایەتی کردنی جیهانی لە لایەن سۆڤیەت یان هەر وڵاتێکی هاوشێوە کە لە سەرووی حیزبە کۆمۆنیستیەکانەوە بێت. دەکرێ بڵێین ئەو مارکسیانەش کە دژی لینین و ستالین بوون، سەر بە سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕانە بوون. لە ترۆتسکی و تیتۆ و رۆزا لۆکزامبۆرگ و جیلاس ـە وە بگرە تا ئەو گرووپە جۆراوجۆرانەی کە لەم دواییانە لە کۆمۆنیزم جودا بوونەوە، هەموو بە سۆشیالیزمی شۆڕشگێڕ پێناسە دەکرێن.

**سۆشیالیزمی مارکسی** سوسیالیسم مارکسی Marxian Socialism

بە پێی بۆچوونەکانی مارکس، سۆشیالیزمی مارکسی بریتییەلە سۆشیالیزمی زانستی یان کۆمۆنیزم کە

PDF 4 KURD

بەو پێیە پرۆژەی رزگاریبەخش و شۆڕشگێڕانە و رووخێنەری سەرمایەداری بە ئەنجام ئەگەیەنێت. ئەم جۆرە سۆشیالیزمە لە رەوتی بەدیهاتنی مێژوویی خۆیدا چەند لقێکی وەك سۆشیالیزمی رووسی و سۆشیالیزمی چینی لێکەوتەوە کە ئەوانیش بە پێی مەرام و رێبازی رێبەرەکانی بە چەند لقێکیتر دابەش بوون. تیۆری مارکسیستی سۆشیالیزم، لە سەدەی بیستەمدا زاڵترین رێبازی سۆشیالیستی بووە کە بە خەملاندنی ئەم تیۆرییە لە لایەن لینین و مائۆ تسەتۆنگ لە ئەزموونی شۆڕشی چین، لە زۆربەی ناوچەکان و وڵاتانی جیهان گرنگایەتی پێدراوە.

مارکس و لایەنگرانی، سۆسیالیستەکانی بەر لە خۆیان بە سۆشیالیستی خەیاڵی لە ناو سیستەمێکی سەرمایەداری ناوبردە ئەکەن کە تێیدا ئابووری وڵات لە سەر بناغەی خاوەندارێتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بنیات نراوە بەڵام لە سۆشیالیزمی مارکسیدا خاوەندارێتی کارگە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان دەدرێ بە رەنجدەران و زەحمەت کێشان.

## سۆشیالیزمی مەسیحی	سوسیالیسم مسیحی	Christian Socialism

ئەم بزاوتە لە ئاوێتە کردنی چەمکی ئەخلاقی مەسیحیەت و چەمکی کۆمەڵایەتی سۆشیالیزم پێکهاتووەو وەڵامدانەوەیەك بوو بەو ناکۆکیە زانستیانەی کە لە هەناوی کۆمەڵگای سەرمایەداری پیشەسازیی و ئامانجەکانی سەری هەڵدا. سۆشیالیزمی مەسیحی پێی وایە کە ئامۆژگاریەکانی ئینجیل دەتوانێ لەم بارودۆخە دژوارەدا کێشەکانی مرۆڤ چارەسەر بکات و بۆ گرفتە ئابووریەکانی کۆمەڵگا وەك بێکاریی و هەژاریی خەڵك، رێگاچارە بدۆزێتەوە.

ئەم بزاوتە لە دەوروبەری ساڵی ١٨٠٠ لە بەریتانیا دەستی پێکرد و لایەنگرەکانی، بە دژی دەستەنگی و نەداری چینی کرێکار دەنگیان هەڵبڕی و دەیانویست ژیانی ئەم چینە هەژارە بە پێی ئایینی مەسیحیەت بیووژێنەوە. سۆشیالیزمی مەسیحی بە پێچەوانەی سۆشیالیزمی خەیاڵی* بەرنامەکانی خۆی لە سەر رێبازێکی روون و ئاشکرای ئایینی دامەزراندبوو. لە دوای شەڕی جیهانی دووهەم، چەندەها حیزبی سیاسی لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژاوا دامەزران کە سەر بە ئایدیۆلۆجیای سۆشیالیستی بوون و بە شێوازی جۆراوجۆریش لایەنگری مەسیحیەت بوون. بەهاکانی سۆشیالیزمی مەسیحی بریتین لە: یەکسانی، هاوبەشێتی، ئاشتی، برایەتی، لابردنی ناتەبایی و دژایەتی لە گەڵ هایراکی کۆمەڵایەتی.

## سەربازی نەناسراو(سەربازی ون)	سرباز گمنام	Unknown Soldier

لە زۆربەی وڵاتان بووەتە باو کە تەرمی سەربازێکی نەناسراو وەك نوێنەر و سیمبۆلی هەموو کوژراوانی شەڕ لە شوێنێکی تایبەت بنێژن و لە گۆڕەکەی رێز بگرن. دیاردەی سەربازی نەناسراو یا سەربازی ون، یەکەم جار لە بریتانیا داهات تاکوو هەرکەس لە شەڕدا کەسێکی لە دەست دابێت، تەرمی گۆڕی سەربازی نەناسراو بە شەهیدی خۆی بزانێت.

PDF 4 KURD

**سەربەخۆیی سیاسی** استقلال سیاسی Politicol Independence

بریتییە لە: دەسەڵاتی دەوڵەتێك لە مەڕ بەڕێوەبەرایەتی و راپەڕاندنی کاروباری ناوخۆیی و دەرەکی وڵاتەکەی خۆی، بە بێ راگرتنی دڵی دەوڵەتێکی تر یان گرینگی نەدان بە رازی بوونی دەوڵەتێکی بێگانە.

**سەرپەرشتی** سرپرستی / قیمومت Trusteeship

دەزگایەکی نێونەتەوەیی‌یە کە بەو پێیە دەوڵەتانێك، لە ژێر چاودێری رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان، لەگوێن سەرپەرشت، ئیدارەکردنی سەرزەمینێکی دیاریکراو بەرعۆدە ئەگرن تاکوو ئەم سەرزەمینە «بەرەو خودموختاری یا سەربەخۆیی» راپێچ بکەن. دەوڵەتی پێ سپێردراو، ماف لکاندنی ئەو سەرزەمینەی بە خاکی خۆیەوە نییە.

ئەم سەرزەمینانە، داگیرکراوی دەوڵەتانی تێکشکاوی شەڕی یەکەمی جیهانی بوون کە لە لایەن دەوڵەتانی سەرکەوتوو لە شەڕدا لەجیاتی لکاندن بە خاکی خۆیان، سپێردرانە دەوڵەتانی سەرپەرشتکار. (بۆ وێنە سەرپەرشتی کردنی فەلەستین لە لایەن بریتانیا، پاش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی)

ئەو سەرزەمینانەی سەرپەرشتی دەکرێن، رەنگە ستراتیجیکی نەبن. هەڵبەت ئەم دابەشکاریە زۆر روون نەکراوەتەوە و تەنیا یەك سەرزەمین «ستراتیجیك» ناوبردە کراوە ئەویش «کۆمەڵە دورگەی پاسیفیك»ـە کە لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە سەرپەرشتی دەکرێت.

ئەم ئەرکە لە رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا وەك یەکێك لە ئەستوونەکانی رێکخراو، بە ئەنجومەنی راسپاردەکان سپێردراوە کە ئەویش لە ساڵی ١٩٩٠ بەملاوە و لە دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی کۆمەڵە دورگەی میکۆنزی کۆتایی پێ هات.

**سەرمایە** سرمایه Capital

لە روانگەی ئابووری کلاسیکدا سەرمایە بریتییە لە هۆکاری بەرهەمهێنانی سەروەت و سامان بە یارمەتی هۆکارگەلێکی وەك مرۆڤ، سرووشت و ئامرازی کار. لە روانگەی ئابووری سۆشیالیستی، سەرمایە یەکێك لە مەرجەکانی کارە و خۆبەخۆ لە رەوتی فراژووبوونی بەرهەمهێناندا نرخی نییە بەڵکوو کوتومت بۆ کاڵای بەرهەمهێنراو رائەگوێزرێت. چەن جۆر سەرمایە لە ئارادایە کە بریتین لە: سەرمایەی ماڵی(دراڤ)، سەرمایەی تەکنیکی(ئامرازی ماددی بەرهەمهێنان)، سەرمایەی ناودار (بەشداری بەناو لە کۆمپانیاکان)، سەرمایەی یاسایی(ماف خاوەنەکەی دەپارێزێ).

سەرمایە (کاپیتال)، هەروەها ناوی کتێبێکی کارۆڵ مارکس (١٨١٨ـ١٨٨٣)، فەیلەسوف ئەڵمانییە کە تێیدا رژێمی سەرمایەداری*خستۆتە بەر رەخنە. بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە لە کاتی ژیانی خۆیدا لە ساڵی ١٨٦٧ بڵاو کرایەوە بەڵام دوو بەرگەکەی تری کە کۆتایی پێ نەهاتبوو لە لایەن ئینگلسەوە تەواو کرا و دوای

PDF 4 KURD

مەرگی مارکس لە سالانی ١٨٨٥ و ١٨٩٤ بلاو کرایەوە. ئەم کتێبە بە «ئینجیلی کۆمۆنیزم» ناوبانگی دەرکردووە.

## سەرمایەداری سرمایەداری Capitalism

سەرمایەداری (کاپیتالیزم) لە وشەی capital بە واتای سەرمایە وەرگیراوە بەلام لە زاراوەدا بەو سیستەمە ئابوورییە دەگوترێ کە لە پێشدا لە سەردەمی شۆرشی پیشەسازیی لە ئەورووپای رۆژاوا و ئەمریکا سەری هەلدا و دواتر، ولاتانی رۆژهەلاتیشی گرتەوە. لەم سیستەمەدا لە بواری ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لەبری ئەوەی بۆ بەرهەمهێنانی ئاسایی، لە هێزی ئینسانی و ئاژەل کەلك وەرگیرێت، کەرەستەی میکانیکی(مەکینە) بۆ بەرهەمهێنانی باشتر بەکار دێت.

لە باری مێژوویەوە، سەرمایەداری وەك بەشێکی بزاوتی تاك باوەری لە ئەژمار دێت. لە بەستێنی ئاییندا ئەم سیستەمە هەندێ ریفۆرمی بە دوا خۆیدا هێنا. لە زانست و پەروەردەدا بووە هۆی گەشەسەندنی زانستی فیزیا، لە پێوەندیە ئینسانیەکاندا زانستە کۆمەلایەتیەکانی لێ کەوتەوە، لە زەمینەی سیاسەت، بناخەدانەری حوکمەتە دیموکراتیەکان بووە و لە ئابووریشدا سیستەمی سەرمایەداری هێنایە گۆرێ. لەم رووەوە گریمانەی «شارستانیەتی سەرمایەداری» بە گریمانەیەکی راست و رەوا دەرئەچێت. ئەم گریمانە بانگەشەی ئەوە دەکات کە سەرمایەداری، تەنیا سیستەمێکی ئابووری تایبەت نییە، بەلکوو سیستەمێکی کۆمەلایەتی تۆکمەش لە ئەژمار دێت.

زاراوەی سەرمایەداری، زیاتر لە لایەن سۆسیالیستەکان ـ بە تایبەت مارکسیەکان ـ برەوی پەیدا کرد ئەویش سیستەمێکە تێیدا خاوەندارێتی تایبەتی سەرمایە، مەرجی سەرەکیە بۆ سیمای ئابووری و سیاسی و ئەم رەوتەش بەدی هێنەری جۆرێك تەکوزی کۆمەلایەتی تایبەتە کە تێیدا چینی دەسەلاتدار (کە پێی دەگوترێ سەرمایەدار یان بورژوا) لە هێزی بەرهەمهێنی کۆمەلگا بە قازانجی خۆی کەلك وەردەگرێ.

یەکێك لە بنەماکانی سەرمایەداری، ئابووری بازارە. لە سەردەمی پێش سەرمایەداریدا بە گشتی ئابوور، خۆمالی و سەرپشك بووە. خێزان خۆی پێداویستیەکانی خۆی بە شێوەی ئالوگۆرکردنی شمەك دابین ئەکرد. دابەشکردنی ئیش و کار لە گۆرێدا نەبووە و هەر خێزانێك ناچار بوو چەندەها کار و ئەرکی جیاواز بە ئەنجام بگەیەنێت. بەلام لە ئابووری بازاری سیستەمی سەرمایەداریدا کار و تەوزیم بە پێی لێهاتوویی و کارزانی دابەش ئەکرێت و هەر کەسە تەنیا دەتوانێ بەشێکی هەرە بچووك لە پێداویستیەکانی خۆی، بە پێی لێهاتوویی و شارەزایی خۆی دابین بکات.

یەکێکیتر لە بنەماکانی ئابووری بازاری سەرمایەداری، ململانێیە. لە ئابووری مۆدێرن بۆ بەرهەمهێنانی کالا و خزمەتگوزاریەکان، ئالتەرناتیڤی ململانێ چ بە شێوەی مۆنۆپۆلکردنی تایبەتی یان مۆنۆپۆلی یاسایی، لە ژێر دەستی دەولەتدایە. یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی سەرمایەداری، بنەرەتی قازانجە. ئابووری سەرمایەداری زێدەتر لە هەر سیستەمێکی ئابووری دیکە دەرفەت بۆ وەچنگ هێنا

PDF 4 KURD

قازانج ئەرەخسێنێ. ئەم جۆرە ئابوورییە ئازادی بازرگانیکردن و پیشە و ئازادی ماڵ و دارایی و ڕێککەوتن زەمانەت دەکات.

گەشەی سەرمایەداری هاوبەندە بە گەشەی بازرگانی کە تێیدا سەرمایەداری گەورە، بە سەر دانوستاندا شارەزا دەبن. پاش سەرهەڵدانی شۆڕشی پیشەسازیی قۆناغی سەرمایەداری دەست پێئەکات. لەم سەروبەندەدا خاوەنی کۆمپانیا گەورەکان و ڕێکخراوە ئابوورییەکان، دەست ئەگرن بە سەر پرۆسەی بەرهەمهێناندا.

سەرەنجام قۆناغی سەرمایەداری (دارایی) دێتە کایەوە. لەم قۆناغەدا دەسەڵاتی ئابووری هێدی هێدی دەکەوێتە دەست خاوەن بانکەکان و پارەدارە قەبەکان، ئەمانیش بە پارەی بەردەستیان هەموو کۆمپانیا پیشەسازییەکان مۆنۆپۆل دەکەن. بەم حاڵە دوابەدوای هەر قۆناغێك، سەردەمەکەی پێشوو ناسڕدرێتەوە و هیچکام لەم قۆناغانە ناتوانن بە سەر هەموو پانتای ئابووری وڵاتێکدا بە تەواوەتی زاڵ بن.

هەندێ جار باس لە قۆناغی چوارەمیش ئەکرێت کە ئەویش پێی دەڵێن «سەرمایەداری دەوڵەتی». ئەم زاراوە بۆ هەر جۆرە سیستەمێکی ئابووری دەوڵەتی بە کار ئەبرێت. جاری واش هەیە بە تەوس و ڕەخنەوە بۆ سیستەمی ئابووری وڵاتانی کۆمۆنیستی بە کار ئەبرێت.

**سەرمایەداری دەوڵەتی**: بڕوانە سەرمایەداری.

**سەرمایەی کۆمەڵایەتی** سرمایه اجتماعی Social Capital

ئەم زاراوە بە واتای نوێ، پێکهاتەی کەلتووری کۆمەڵگای مۆدێرنەیە کە لە چاخی ڕۆشنگەرییەوە لە سەر بنەمای عەقڵانییەت و حوکمەتی قانوون دامەزراوە. لەم ساڵانەدا چەمکی سەرمایەی کۆمەڵایەتی لە لایەن بیرمەندانێکی وەك بۆردیو(١٩٧٩)، کالمەن(١٩٨٨) و پۆتنام(١٩٩٣) شرۆڤە کراوە. فۆکۆیاما، سەرمایەی کۆمەڵایەتی بە ڕێبازێکی نارەسمی دەزانێ کە هاریکاری نێوان دوو یا چەند کەس مسۆگەر دەکات. ئەو ڕێبازەی کە سەرمایەی کۆمەڵایەتی پێکدێنێت، لە هاریکاری دوو قۆڵییەوە بگرە تا ئایین و ئاهەنگی ڕێکوپێك و ئاڵۆز (وەك مەسیحییەت و ئیسلام) هەمەچەشن و جۆربەجۆرن. بە باوەڕی فۆکۆیاما، دەوڵەتەکان ئەتوانن هەم ڕێژەی سەرمایەی کۆمەڵایەتی ببەنە سەرەوە هەم نەهێڵن کورت و کوێر ببێتەوە. هەڵبەت دەوڵەتەکان ئامرازی بەدیهێنانی شێوازە جۆراوجۆرەکانی سەرمایەی کۆمەڵایەتییان بەدەستەوە نییە. چونکا سەرمایەی کۆمەڵایەتی بەرهەمی ئایین، نەریتی کۆن، ئەزموونی هاوبەشی مێژوویی و کۆمەڵێ هۆکاری بەدەر لە کۆنترۆڵی دەوڵەتە. لە لایەکیترەوە تەنیا شوێنێك کە دەوڵەتەکان دەتوانن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەسەر سەرمایەی کۆمەڵایەتی کاریگەری دابنێت، پەروەردەیە.

**سەرۆك/پێشەوا** رهبر / لیدر Leader

بە واتای ڕێبەر، پێشەوا، سەرکردە و فەرماندە یە. سەرۆك، بریتییە لە کەسایەتییەك کە بەهۆی توان

PDF 4 KURD

لێوەشاوەییەکی تایبەتەوە دەبێتە خاوەن پێگە و مەقامێکی بەرز بۆ ڕێبەرایەتی و سەرۆکایەتی کردنی لایەنگران و خەڵکانی ژێردەستی. سەرۆك، بە ئاوێتەکردنی توانایی و لێهاتوویی لایەنگرانی لەگەڵ توانستەکانی خۆی، ڕێبازێکی نوێژەن ئەدۆزێتەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. سەرۆکێك کە لووتکەی خەبات و پێشەنگی مێژوویی بێت، دەتوانێت ڕەوتی ڕووداوە مێژووییەکان و گەیشتن بە ئامانجەکان خێراتر یان هێواشتر بکات. ڕێبەران، لەم حاڵەتەدا دەتوانن دەوری پێشەنگی کاروان بگێڕن یان ببنە هۆی دواکەوتوویی نەتەوەیەك.

هەر سەرۆکێك لە پاش تێپەڕکردنی چوار قۆناغ، بڕیار دەردەکات: پلاندانان، ڕێکخستن، ڕێبەرایەتی و کۆنترۆڵ (چاودێری). لەم ڕێگەدا هەتا ڕێکار زیاتر بێت، بڕیاردان دژوارتر دەبێت. سەرۆکی لێهاتوو بە هۆی ئەم چەن خاڵە سەرکەوتوو دەبێت: بڕیارەکانی هەمیشەیی و بڕەوی بێت، وەگەڕخستنی خێرا و بەجێی ئەندامان و دەروون پاکی لە دەسەڵاتداریدا.

لە رابردوودا هێزی جەستەیی، توانایی دۆست ڕاگرتن، وشیاری و زیرەکی و ناسینەوەی مەترسییەکان، گرنگترین تایبەتمەندی سەرۆك بووە بەڵام ئیمڕۆکە زانست و مەعریفە، توانایی بەڕێوەبردن و ڕاپەڕاندن، پاراستنی بەرژەوەندی ئەندامان و دامەزراندنی بەجێ و شیاوی ئەندامان، فەکتەری گرینگ لەئەژمار دێن.

**سەرۆك کۆماریی** ریاست جمهوری Presidency

بریتییە لە: پلە و پایە و ئەرك و تەوزیمی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی دەوڵەتی هەڵبژێردراو لە وڵاتێکی کۆماریدا. بە پێی ماهییەتی پلە و پایەی سەرۆك کۆماریی لە سیستەمی کۆماریدا دوو شێوازی سەرۆکایەتی ئەبیندرێ: لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و کۆمارییەکانی ئەمریکای لاتین، کاری «سەرۆکی وڵات» و سەرۆکی حوکمەت یەکێکە و هەموو ئەرك و کارکردەکان لە پلە و پایەی سەرۆك کۆماریدا کۆبۆتەوە. بەڵام لە وڵاتانێکی وەك کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا و هیندستان و ئیتالیا و زۆربەی کۆمارییەکانی دیکە سەرۆك کۆمار، تەنیا سەرۆکایەتی وڵاتی لە ئەستۆیە و کاری بەڕێوەبەرایەتی حوکمەت لە ئەستۆی راوێژکار یان سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیراندایە. جیاوازییەکی دیکەش لە نێوان ئەم جۆرە حوکمەتانەدا هەیە ئەویش ئەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی پەرلەمان. لە وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەمریکای لاتین سەرۆکی وڵات و بەرپرسی بەڕێوەبەرایەتی، یەك کەسە (سەرۆك کۆمار) کە ئەویش سەربەخۆ لە ئەنجومەنی یاسادانان و بە دەنگی راستەوخۆی خەڵك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو هەڵدەبژێردرێت. بەڵام لە حوکمەتی پەرلەمانیدا هەڵبژاردنی بەڕێوەبەری وڵات یا ئەنجومەنی وەزیران، لە ئەستۆی پەرلەماندایە و تا ئەو کاتە لە پۆستی سەرۆکایەتی دەبێت کە دەنگی متمانەی زۆرینەی پەرلەمانی بردبێتەوە.

**سەلەفییەت** سلفیّت salafiyyat

سەلەفییەت، ڕێچکەیەکی ئایینی ئیسلامییە کە بڕوای بە گەڕانەوە هەیە بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە، واتە ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەر. پێڕۆکەی ئەم ڕێچکەیە لە لایەن کەسانێکی وەك سید قوتب( ١٩٦٦-

PDF 4 KURD

حسن البناء (١٩٤٩ـ١٩٠٦) لە وڵاتی میسر دارێژرا. سەلەفییەت لە هەمان سەرەتاوە بە هۆی دۆگما فیکرییە کوشندەکانییەوە تووشی نسکۆ دەبێ و ئەمەش دەبێتە هۆی دووبەرەکی لە ڕێبازەکە و بۆیە دوو گرووپی جیاوازی لێ دەکەوێتەوە:یەکەم، گرووپی سەلەفی تەبلیغی بە ڕێبەرایەتی ناسرالدین ئاڵبانی (١٩٩٩ـ١٩١٤) ناسراو بە شێخ محەمەد ناسر ئاڵبانی کە یەکێك لە شارحە ئایینییەکانە و خاوەنی دەیان کتێب و نووسراوەی ئیسلامییە. گرووپەکەی دیکە، واتە سەلەفی جیهادی لە سەر ئەم بڕوایە لەنگەر ئەگرێت کە ئەگەر بێتوو بڕوامان هەبێ بە ئیسلامی سەردەمی پێغەمبەر، دەبێ هەموو ئەرك و فرمانە ئیسلامییەکان بە تەواوەتی جێبەجێ بکرێن و ئەرکی جیهادیش لە جوملەی ئەرکە سەرەکییەکان (واجبات) لە قەڵەم دەدەن. کێشەی نێوان سەلەفی جیهادی و سەلەفی تەبلیغیش لە سەر ئەم چەمکەیە.

سەلەفی تەبلیغی پێی وایە کە جێبەجێ کردنی ئەرکی جیهاد، پێویستی بە کەشوهەوا و هەلومەرجی تایبەتە و کاتێك ئەم فەرزە ئایینییە دەبێتە ئەرکی سەرشان کە دوژمنێکی بیانی لە وڵاتی کافرانەوە هێرش بکاتە وڵاتی موسوڵمانان ئینجا موسوڵمانان بۆیان هەیە لە خۆیان بەرگری بکەن و لە گەڵیان بکەونە شەڕەوە. بەڵام سەلەفی جیهادی، پێی وایە کە موسوڵمانان نابێ چاوەڕوانی هێرشی کافرەکان بمێننەوە بەڵکوو دەبێ هەمیشە هێرش بکەنە سەریان بەشکم بە زەبری شمشێر داوەتی ئیسلامیان بکەن و بیانخەنە سەر ڕێگەی ڕاست. لە دیدی ئەمانەوە ڕادەی ئیمانداری ڕاستەقینە لە ئەنگوستەکانی دەست وپێ تێناپەڕێت و بەم بۆنەوە هەموو جیهان تەنانەت وڵاتانی ئیسلامیش بە شیاوی کوشتن دەزانن. سەلەفی جیهادی بۆ پێوەندی نێودەوڵەتی بڕوای بە دیپلۆماسی* و وزەی قەڵەم نییە بەڵکوو تەنیا بیر لە تەقاندنەوە و تیرۆر و کوشتن و بڕین دەکات. حوکمەتی ڕاستەقینە لە جیهاندا لای ئەمانە، تەنیا حوکمەتی تاڵیبانە کە لە ساڵی ٢٠٠١ لە لایەن هێزەکانی فرە نەتەوە لە ئەفغانستان ڕووخێندرا. سەلەفی جیهادی لە ناو کوردستانیش خاوەنی پێگەیەکی بالقوەیە و لە ناوچەی هەورامان و هەڵەبجە توانیویەتی لەو کەش و هوا ئازادەدا سوودی خۆی وەربگرێ و ببێتە ملۆزمێك بۆ حوکمەتی هەرێم*.

**سەنترالیزم:** بڕوانە ناوەندگەرێتی.

**سەنترالیزمی دیموکراتی** سانترالیسم دموکراتیک Democratic Centralism

وشەکە بە مانای ناوەندێتی دیموکراسیە بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا یەکێکە لە ڕەگەزەکانی ڕێبازی لینینیزم و وەك بنەمایەك بۆ ڕێکخستن لە هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکاندا بە کار دێت. لە واقیعدا بریتیە لەوەی تەواوی ئۆرگانە حیزبییەکان لە ڕێی هەڵبژاردنەوە بێنە مەیدانی سیاسەت. بە پێی ئەم بنەمایە ئازادی بیروڕا لە ناو حیزب و هەڵبژاردنی ئازادانەی ڕێبەرانی حیزبی، دەبێ لە گەڵ پێگەی حیزبی و ڕێوشوێنێکی گونجاو بۆ ئەو بڕیارانەی کە بە شێوازێکی دیموکراسی دەردەکرێن ئاوێتە بێت.

لە ڕوانگەی مارکسیەکانەوە، ناوەندێتی و دیموکراسی دوو ڕەهەندی یەك دیاردە لە ئەژمار دە

PDF 4 KURD

دوابەدوای جێگیر بوونی سۆشیالیزم لە هەندێ لە ولاتان، سەنترالیزمی دیموکراتیك بووە هۆی فراژووتنی دەسەلاتی دەولەتی نوێ و لایەنگرانی مائۆ باوەڕیان وایە کە دیکتاتۆری پرۆلتاریا بە پیادەکردنی ئەم ڕێبازە بە هێزتر ئەکات. لە ڕوانگەی سەنترالیزمی دیموکراتیەوە دەبێ بیر و بڕوای ڕاست و دروست کۆ بکرێتەوە و سیاسەتی کایە کردن یەکلایەن بکرێتەوە. زۆرینەی سەنترالیزمە دیموکراتیەکان، بۆتە هۆی زاڵبوونی یەك یا چەند کەس بە سەر حیزبەکەدا.

سەنترالیزم لە لایەن حیزبە مارکسیەکان بەم جۆرە پێناسە دەکرێت:

١ـ حیزب خاوەنی بەرنامەیەکی ناوازەیە.

٢ـ خاوەنی یەك ڕێبەرایەتیە.

٣ـ هەموو بنکە و ئۆرگانەکان ملکەچی ناوەندی حیزبەکەن.

دیموکراسیش بریتیە لە:

١ـ هەموو ئۆرگانە حیزبیەکان بە هەڵبژاردن دێنە مەیدانەوە.

٢ـ ئۆرگانەکان ڕاپۆرت ئەنێرن بۆ مەقاماتی سەرتر لە خۆیان.

٣ـ مەسەلە گەورەکانی حیزب لە ناو حیزبدا باسیان لێدەکرێت.

## سەندوقی گەشەی ژنانی نەتەوە یەکگرتووەکان

صندوق توسعه زنان ملل متحد

United Nations Development Fund for Women

ئەم سەندوقە لە ساڵی ١٩٧٦ بە شێوەیەکی ئارەزومەندانە بۆ ماوەی دە ساڵ بۆ ژنان دامەزرا بەلام دواتر لە ساڵی ١٩٨٥ ناوی گۆڕا بە سەندوقی گەشەی ژنانی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەم سەندوقە بە ژنانی دەستەنگ و کەمداهاتی ولاتانی ڕووەوگەشەسەندن یارمەتی دەگەیەنێت و ناوەندەکەشی لە شاری نیۆیۆرکی سەر بە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

## سەندوقی نێونەتەوەیی دراو

صندوق بین المللی پول

(International Monetary Fund (IMF

سەندوقی نێودەوڵەتی دراو، بەشێك لە سیستەمی برێتۆن ڤودز بوو کە لە ساڵی ١٩٤٤ لە ئەمریکا دامەزرا و دواتر بوو بە ڕێکخراوەیەکی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان و بە شێوەیەکی ڕەسمی لە ساڵی ١٩٤٥ دەست بەکار بوو. ئەم سەندوقە لە گەڵ بانکی جیهانی گرنگترین دامودەزگای پێوەندی ئابووری قۆناغی دوا شەڕی جیهانی لە ئەژماردێن. ئامانجەکانی ئەم سەندوقە بریتین لە: پەرەپێدانی هاوکاری پێویست لەناو ولاتان، دروستکردنی سیستەمێکی دراویی، پەرەپێدانی بازرگانی نێودەوڵەتی، سپاردنی سەرمایە بە سەندوق، بەرزکردنەوەی ئاستی بەرهەمهێنان و. . .

PDF 4 KURD

هەر ئەندامێك دەبێ ساڵانە ئابوونەی ئەندامێتی بدات كە بەشێكی زێڕ یا دۆلارە و پاشماوەكەی دراوی ناوخۆیی ئەو وڵاتەیە. هەر وڵاتێكی ئەندام پاش پەسندبوونی لە لایەن دەستەی كارگێڕی سەندوق، دەتوانێ بۆ چارەسەركردنی گرفتە داراییەكانی خۆی قەرزی كورتخایەن لە سەندوقەكە وەربگرێ بە مەرجێك كە بڕی قەرزەكە لە ٢٥٪ مافی ئەندامێتی زیاتر نەبێت. دەستەی كارگێڕی كە لە دوازدە ئەندام پێكهاتووە كاروباری گشتی سەندوق بەڕێوە دەبات. پێنج كەس لە ئەندامانی دەستەی كارگێڕی لە لایەن ئەو پێنج وڵاتەوە دەبێ كە زۆرترین پشكیان لە سەندوقدا هەیە و حەوت كەسەكەی دیكە لە لایەن ئەنجومەنی گشتییەوە هەڵدەبژێردرێن. بەڕێوەبەرایەتی و كۆنترۆڵی سەندوق لە لایەن وڵاتانێكی وەك ئەمریكا و وڵاتانی پێشكەوتووی ئەوروپاوەیە كە زیاترین دارایی و ئابوونەی ئەندامەتیان هەیە. ئەنجومەنی گشتی كۆبوونەوەی ساڵانەی هەیە و دەسەڵاتی خۆی بە دەستەی كارگێڕی دەسپێرێ. ناوەندی سەندوق لە شاری واشنتۆن پێتەختی ئەمریكایە.

**سەندیكالیزم** سندیكالیسم Syndicalism

سەندیكالیزم لە وشەی لاتینی syndicus بە واتای یەكێتی وەرگیراوە بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بزاڤێكی كرێكاری بوو كە لە ١٨٩٠ لە فرەنسا سەری هەڵدا بە مەبەستی رادەستكردنی كۆنترۆڵ و خاوەندارییەتی كەرەستەی بەرهەمهێنان لە دەوڵەتەوە بۆ یەكێتیە پیشەییەكان. سەندیكالیزم، سیاسەت وەلا دەنێت و بۆ خەباتی چینایەتیش وەك «كردەوەیەكی پیشەسازییانە» دەڕوانێ و بە شتێكی كارامەی دەزانێ. سەندیكالیستەكان بە چاوی گومانەوە دەیانڕوانییە ڕۆشنبیرانی سۆسیالیست و یەكگرتنی كرێكارانیان بە مەرجی سەرەكی سەركەوتن لە هەر چالاكییەكی پیشەیی دەزانی.

سەندیكالیزم لە ١٩٠٧ لە بەریتانیا برەوی پەیدا كرد. بزاڤی كرێكاری توندڕەوی بەریتانیا، بەم دروشمە دەیهەویست خاوەندارێتی ئامرازی بەرهەمهێنان و دابەشكردن لە چنگی خاوەنداران دەربكێشێ و رادەستی یەكێتییەكانی بكات.

سەندیكالیزم بزاڤێكە بە دژی سەرمایەداری كە داواكاری خودموختارییە بۆ گروپە كرێكارییەكان و لە هەر چالاكییەكی ڕاستەوخۆی پیشەسازی بۆ ڕووخانی سیستەمی سەرمایەداری پشتگیری دەكات. كەواتە سەندیكالیستەكان لە گەڵ سۆسیالیستەكان كە دەیانهەوێت لە ڕێی پەرلەمان یا شۆڕش دەست بگرن بە سەر حوكمەتدا جیاوازییان هەیە. سەندیكالیستەكان وەك ئانارشیستەكان، دەوڵەت بە ستەمكار دەزانن و بۆ گەیشتن بە ئامانجەكانیان كاری تێكدەرانە و مانگرتنی گشتی و ئاژاوە ئەنجام دەدەن. بە گشتی ئەم ڕێبازە، كرێكاران بە كۆڵەكەی سەرەكی كۆمەڵگا دەزانێ و دەبێ كرێكارانی هەر پیشەیەك سەندیكای تایبەت بە خۆیان دروست بكەن و ئامرازەكانی بەرهەمهێنان و دابەشكردن بە دەستەوە بگرن و دەست وەردەنە هەموو كاروبارێكی ئابووری و كۆمەڵایەتییەوە. لەم ڕوانگەوە كۆمەڵگا پێویستی بە دەوڵەت نییە.

لە دوای شەڕی جیهانی یەكەم و شۆڕشی ١٩١٧ لە سۆڤیەت، سەندیكالیزم برەوی نەما و لایەنگرەكان

PDF 4 KURD

یان رووبانکرده کۆمۆنیزمی شۆڕشگێرانەی سۆڤیەت یان کەوتنە ژێر رکێفی دەسەلاتی دیموکراسی رۆژاوا بۆ بڕەو پێدانی باری کۆمەلایەتی و ئابووری لە ڕێی بلاوبوونەوە لە یەکیەتی پیشەسازی و چالاکی پەرلەمانی.

**سیا** سیا Central Intelligence Agency (C. I. A)

ناوی کورتکراوی «ئاژانسی ناوەندی زانیاری و سیخوڕی» ئەمریکایە کە لە ساڵی ١٩٤٧ لە کاتی سەرکۆماریی ترۆمەن بە مەبەستی هاوئاهەنگ کردنی کاروباری سیخوڕیی دەوڵەت و ڕێنموونی کردنی سەرکۆمار و«ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی»دامەزراوە. دانانی بەرپرسی ئاژانس دوای پەسند کردنی سینا (ئەنجومەنی پیران) لە لایەن سەرکۆمارەوە بە ئەنجام ئەگات و ئاژانس تەنیا لە بەرامبەر سەرکۆمار بەرپرسیارە. ئەم رێکخراوە لە چوار بەشی سەرەکی پێکهاتووە کە بریتین لە:

١ـ زانست و تەکنۆلۆژی.

٢ـ لۆجیستیکی(جیٚ بە جیٚکردن).

٣ـ زانیاری.

٤ـ نەخشە و پلان.

جگە لەمانە ئاژانس، سێ لقی سەربەخۆی هەیە:

١ـ بەشی هەواڵگیری دەرەوە.

٢ـ بەشی کاروباری دژە سیخوڕی و دژە زانیاری.

٣ـ بەشی دەستێوەردانی پەنامەکی لە وڵاتانی دەرەکی.

**سیاسەت/ رامیاریی** سیاست Politics/Policy

ئەم زاراوە لە زمانی فرەنسا لە ریشەی politique وەرگیراوە کە ئەویش لە ریشەی یۆنانی politikos و ریشەی polis بە مانای شار وەرگیراوە. لەو سەردەمەدا politikos بە واتای «هونەر و هەڵسوکەوتی حوکمەت لە وڵات» یان دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنان لێك دراوەتەوە.

سیاسەت بە گشتی بریتییە لە ستراتیجی*یان مێتۆد* و ڕێبازێك بۆ بەڕێوەبردن یان باشتر بەڕێوەچوونی هەر کارێك چ کارێکی شەخسی بێت چ کۆمەلایەتی. بەلام مانایەکی تایبەتیش بۆ ئەم زاراوە لێکدراوەتەوە کە ئەویش بریتییە لە لێکدانەوە و توێژینەوەی رەهەندە سیاسییەکانی دیاردە کۆمەلایەتییەکان. بۆ وێنە دەسەلات، دەوڵەت، رەفتاری سیاسی، بڕیاردانی سیاسی و بەڕێوەبردنی کاروباری گشتی.

سیاسەت بە یەکێك لە کۆنترین بەشەکانی زانستە کۆمەلایەتییەکان دادەنرێ و کتێبی «کۆماری» پلاتۆ، یەکەم بەرهەمە کە لەم بارەوە نووسراوە و تێیدا باس لە چۆنیەتی حوکمەتی شارەکانی یۆنانی کۆن دەکات. لەم کتێبەدا پلاتۆ حوکمەتی نوخبە*کان پێشنیاز دەکات. پاش پلاتۆ، ئەرەستۆ توێژینەوەیەکی قووڵتری لەمەڕ زانستی سیاسەت و شێوازی حوکمەت کردووە کە نووسینەکانی ئەو لەو بوارەدا بنچینەی زانستی

PDF 4 KURD

رامیاری لە قەڵەم ئەدرێن. دواتر لە سەردەمی ڕێنسانس، نیکۆلۆ ماکیاڤێلی نووسەر و سیاسەتمەداری ئیتالی کتێبێکی بە ناوی «میر» نووسیوە کە تێیدا شێوازەکانی حوکمەتکردنی ڕاڤە کردووە. (بڕوانە ماکیاڤیلیزم) ئەم کتێبە بووە هۆی ئەوە کە زۆربەی پادشایان و دەسەڵاتدارانی سەدەی هەژدە لە ئەورووپا پەیڕەوی بیر و بۆچوونەکانی بکەن.

بەڵام پێشینەی هەوڵدان بۆ بەدیهێنانی سیاسەت وەك زانستێك، دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانەی پۆزەتیڤیزمی ئاگۆست کۆنت (١٧٩٨ـ ١٨٥٧) لە سەدەی نۆزدە. پۆزەتیڤیستەکان، پێشکەوتنی زانستە سرووشتییەکانیان بە دەرەنجامی ملنەدان بە کۆت و بەندە میتافیزیکیەکان دەزانی و خوازیاری بەکارهێنانی مێتۆدەکانی زانستی سرووشتی بوون لە توێژینەوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا. بەم بۆنەوە کۆنت لە کتێبەکەی خۆی بە ناوی «زانستی سیاسەت» ئەم ڕاستییەی سەلماندووە کە زانستی سیاسەت بە بەراوردکردن لە گەڵ زانستی فیزیا، زانستی فیزیای کۆمەڵایەتی لە ئەژمار دێت و بە هەمان شێوەی فیزیا لە گەڵ دیاردەگەلی دینامیك و ستاتیك سەروکاری هەیە.

زانستی سیاسەت بە دوو چەمك دابەش کراوە: یەکەم، بە مانای سیستەمی سیاسی یا حوکمەت و دەزگا حوکومییەکان و سیاسەتی ڕاپەڕاندن و شێوەی دەسەڵاتداریەتی و ئیدارەی کۆمەڵگایە. دووهەم، زانستێك کە لە گەڵ بونیادە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکانی دەزگا حوکومییەکان، زەمینە کۆمەڵایەتییەکانی دەسەڵاتی سیاسی و هێز بە مانای گشتی، مان و نەمانی حوکمەتەکان، پێوەندی نێوان دەوڵەتان و فەلسەفەی سیاسی، پێوەندی کۆمەڵگای مەدەنی لە گەڵ ژیانی سیاسی و کەلتووری سیاسی و ئابووری و مێژووی سیاسی و ... سەروکاری هەیە.

سیاسەت و گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە سەر هەموو ژیانی مرۆڤایەتی کاریگەری دائەنێت. چونکا جاری وا هەیە بڕیارێکی نابەجێی سیاسی ئەبێتە هۆی بەرپابوونی شەڕ و پێکدادان یا شۆڕش و کودەتا* کە ئەمانەش هەموو بەستێنە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری و ئایینی و فیکرییەکان تووشی وەرچەرخان دەکات. ئەگەرچی هەندێ لە نووسەران چەقی توێژینەوەکانی زانستی سیاسەت بە دەوڵەت* یان حوکمەت* لە قەڵەم ئەدەن بەڵام هەندێکیتر لە سەر ئەم بڕوایەن کە سیاسەت، سەنتەر و ناوەندێکی تاقانەی نییە چونکا وەك زۆربەی زانستەکانی دیکە زانستێکی فرەناوەندە. دیاریکردنی بابەتی ناوەندی وەك بابەتی سەرەکی زانستی سیاسەت، ئەگەڕێتەوە بۆ حەز و تاسەی زانایانی سیاسی و کێشە گرنگەکانی سەردەم و کاریگەری زانستەکانی دەوروبەر.

## سیاسەتمەدار سیاستمدار Politician

بە کەسێك دەگوترێ کە لە کاروباری سیاسی، شارەزا و سەردەرچوو بێت و سیاسەت بۆی بووبێتە پیشە. سیاسەتمەدار بریتییە لە کەسێك کە خەبات ئەکات بۆ گەیشتن بە حوکمەت و دەسەڵات. سەرکەوتن لەم بوارەشدا ئەگەڕێتەوە بۆ لێهاتوویی و زیرەکی ئەو لە بەکارهێنانی سێ بنەمای هاندان، گفتوگۆ و سازش

PDF 4 KURD

بە گشتی مانای ئەم زاراوە لە قەبارەی ماهییەتی سیستەمی سیاسیدا دەرئەکەوێت بۆ وێنە لە بریتانیا، ئەو خەباتەی کە سیاسەتمەدار تێوەی گلاوە، پڕیەتی لە ململانێ و کاتێك سەرکەوتن وەدەست دێت کە کەسێك بتوانێت کەسی دیکە یان گرووپێك (پاشا، پەرلەمان و حیزب) پێمل بکات بە بانگەشە و دروشمەکانی خۆی. لەم گۆشە نیگاوە، سیاسەتمەدار بە کەسێك دەڵێن کە لێوەشاوەیی خۆی بۆ ڕاگیرکردنی بیروڕای خەڵکی سەلماندبێت. ئەم واتایە لە نزمترین ئاستی خۆیدا بە چەواشەکاری لێك دراوەتەوە: شکسپییەر گوتەنی، «سەیری سیاسەتمەدار بکە ... کە تەنانەت خواوەندیش فریو ئەدات»!

**سیاسەتی ئاو** سیاست آب Hydropolitics

ئەم زاراوە لە گەڵ دیپلۆماسی ئاو Hydrodiplomacy هاوواتایە و بە مەبەستی سیاسەتە جیهانییەکان لەمەڕ کێشەی ئاوی شیرین بەکار براوە. لەبەرئەوەی لە داهاتوودا ئاو دەبێتە دەسپێچکێکی سیاسی و ڕەنگە مایەی کێشەی نێودەوڵەتی بێت. ئەگەرچی ٧٠٪ گۆی زەوی پڕیەتی لە ئاو بەڵام تەنیا ١٪ ئەم ئاوە ڕاستەوخۆ کەڵکی لێ وەردەگیرێت. لە لایەکی‌ترەوە بە هۆی گرنگی ئاو بۆ پەرەسەندنی ئابووری، هەبوونی چەم و ڕووباری گەورەی هاوبەش لە نێوان چەند وڵاتدا لەم دواییانە زاراوەی دیپلۆماسی ئاو ڕەواجی پەیدا کردووە. هەر بەم بۆنەوە لە نەتەوەیەکگرتووەکانیش ئەنجومەنێکی ناحوکوومی لە ساڵی ١٩٩٥ بۆ باسکردن لە کێشەی ئاو دامەزراوە و یەکەم دانیشتنی خۆی لە کەنەدا بەڕێوەبردوە.

**سیاسەتی دەرگای کراوە** سیاست درهای باز Open door policy

ئەم زاراوە یەکەم جار لە لایەن جۆن های، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە سێپتەمبەری ١٨٩٩ بە مەبەستی پەرەسەندنی ئابووری وڵاتی چین و پاراستنی سەربەخۆیی ئەم وڵاتە بەکار براوە. بەڵام ئێستا مەبەست لەم زاراوە ئازادبوونی چالاکی بازرگانی و سەرمایەدانانی وڵاتانی دەرەکییە لە وڵاتێکدا لە سەر بنەمای یەکسانی مافەکان. سەرچاوەی ئەم سیاسەتە ئەگەڕێتەوە بۆ بنەماکانی لیبرالیزمی ئابووری.

**سیاسەتی دەرەوە** سیاست خارجی Foreign Policy

بریتییە لە ستراتیجی* یان زنجیرە کردارێکی داڕێژراو لە لایەن دەسەڵاتدارانی حوکمەتێك بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی. ئەم سیاسەتە بریتییە لە دیاریکردن، ڕاپەڕاندن و دابینکردنی بەرژەوەندی و ئامانجە نەتەوەییەکان کە لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا لە لایەن دەوڵەتەکان بەڕێوە دەچێت. سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان لە هەمان کاتدا کە هەندێ پرەنسیپی نەگۆڕ لەخۆ دەگرێ، ئەبێ گۆڕانکارییە نێودەوڵەتییەکانیش لەبەرچاو بگرێت. هونەری داڕشتنی سیاسەتی دەرەکی لەوەدایە کە ئەم دوو خاڵە پێکەوە گرێ بدات چونکا هەر چەندە پێوەندی دەرەکی وڵاتان بەربڵاوتر بێت، گرنگی ئەم سیاسەتە زیاتر هەست پێ دەکرێت.

PDF 4 KURD

سیاسەتی دەرەوەی هەر وڵاتێك، دەوامەی سیاسەتی ناوخۆیی هەمان وڵات لە ئەژمار دێت، بە واتایەکیتر پێکهاتەکانی سیستەمێکی سیاسی لە ناوخۆ، دەتوانن دەوری کاریگەر بگێڕن لە دیاریکردنی ستراتیجی و بەرژەوەندییەکانی ئەو وڵاتە لە ئاستی نێودەوڵەتیدا. سیاسەتی دەرەکی هەر وڵاتێك لە گەڵ سیاسەتی ناوخۆیی پێوەندی نەپساوە و راستەوخۆی هەیە. ئەم دوو سیاسەتە ئەگەرچی لە رواڵەتدا جیاوازن بەڵام ماهییەتێکی هاوبەش و یەکسانیان هەیە و لە راستیدا ئەکرێ بڵێین سیاسەتی دەرەوە، رەنگدانەوەی سیاسەتی ناوخۆیە.

سیاسەتی دەرەوە بەشێك لە سیاسەتی نێودەوڵەتیش لە ئەژمار دێت و هەر لە یەکەمین پێوەندییەکانی کۆمەڵگا سەرەتاییەکانەوە هەبووە. بەڵام بە شێوازی نوێ، ئەگەڕێتەوە بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتە ئەورووپییەکان لە سەدەی حەڤدە. ئیمرۆکە سیاسەتی دەرەوە ئاوێتەیە لە گەڵ «دەوڵەتی نەتەوەیی»دا. لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا بەدواوە کە نەتەوەپەرستی، هێدی هێدی هەموو رەگەزەکانی دەوڵەتمەداری و دەوڵەتە نەتەوەییەکانی پێکەوە بەستەوە، سیاسەتی دەرەوەش لە گەڵ هەست و خوستی نەتەوەیی زیاتر ئاوێتە بووە.

پاش سەدەی نۆزدە جەماوەرێکی زۆرتر لە خەڵك خۆیان بە سیاسەتی دەرەوە سەرقاڵ کرد. ئەم رەوتە پێبەپێی پرۆسەی فراژووتنی دەوڵەتی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم* گەشە ئەکات. توێژینەوەکان روونی ئەکەنەوە کە سیاسەتی دەرەکی لە سەدەی بیستەمدا زیاتر بەرەو دیموکراسییەت هەنگاوی ناوە. ئەم گۆڕانکارییەش بە هۆی گرینگی پێدان بە رای گشتی*یەوە بووە. لە سەروبەندی جیهانی دوو جەمسەریی و ململانێی جیهانی سەرمایەداری لە بەرامبەر جیهانی کۆمۆنیستی و هەروەها جیهانی سێهەم، «سیاسەتی دەرەوە» بە تایبەت لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بەرەو ئاڵۆزی دەڕوا و لە نەریتەکانی پێشووی دوور ئەکەوێتەوە.

## سیاسەتی زمان    سیاست زبانی    Politics of Language

زمان، ئامرازی سەرەکی کەلتوورە و پێناسەیەکی گرینگە بۆ شوناسی نەتەوەیی. خاوەنی زمان بوون بە واتای بەهرەمەندبوون لە مەعریفەیە. هەندێ لە رۆشنبیرە ئەڵمانیەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدە بڕوایان وابوو کە پێوەندی سێقۆڵی نێوان زمان و مەعریفە و نیشتمانە کە کەسێك دەکاتە ئەڵمانیایی و کەسێکی دیکەش بە ئینگلیزی. لەبەرئەوەی لە زۆربەی وڵاتەکان بە یەك زمانی تایبەت ئاخاوتن ناکرێت کەواتە زمان بۆتە هۆی بەرپابوونی کێشەیەکی سیاسی گرینگ. پێوەندی زمان بە سیاسەت، وەك پێوەندی ئۆکسیجن بە هەوا لێکدراوەتەوە. رەنگە هەڵبژاردنی هەر وشەیەك لە هەر گوتار(discourse) رێکدا هەنگاوێکی سیاسی لە قەڵەم بدرێت.

سیاسەتی زمان، لە لای حوکمەتەکان زۆر پەنامەکی و شاراوەیە. هەر حوکمەتێك خاوەنی سیاسەتێکی زمانییە کە هەندێ جار جێگای پەسندی هەموانە و هەندێ جاریش بە زۆرەملی دائەسەپێ. هیچ حوکمەت

PDF 4 KURD

چاوی بینینی کەمینە*ی نییە و ئارەزووی گەورەی دەسەڵاتداران تیاچوونی نەیارانە. لە بواری بەکارهێنانی سیاسەتی زمانی، وڵاتی فەرەنسا بە نموونە دەهێنینەوە: سیاسەتی یەکیەتی نەتەوەیی لەم وڵاتەدا کە هەر لە سەرەتای حوکمەتی پاشایەتییەوە پەیرەو کراوە، هەمیشە لەدووی «یەکگرتوویی زمان» بووە کە لە بەرامبەر زمانەکانی دیکە نەرمیی نیشان نەداوە. بۆ وێنە تا پێش شەڕی جیهانی دووهەمیش ئەگەر لاوانی بەریتانی لە قوتابخانە بە نەژگاقییەوە تەنیا یەك وشەی زکماکیان بە زاردا بهاتایە، فەلاقەیان دەکردن. یان زمانی باسکی تەنیا لە ناو خێزانەکان بە زاردا دێت.

**سیاسەتی فرەکەلتووری** سیاست چندفرهنگی Multiculturalism

ئەم زاراوە دەرەنجامی هەوڵ و تێکۆشانێکە کە لە زۆربەی وڵاتان بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکی نێوان فەرهەنگی *زۆرینە*و فەرهەنگی کەمینە*بە ئەنجامیان گەیاندووە. بە پێی ئەم سیاسەتە، کەلتوورە جیاجیاکان وەك نەخش ونیگاری موزاییك لەپاڵ یەکدا جێگیر ئەبن بە چەشنێك کە هیچ کەمینەیەك ناچار نابێت رەگەزە فەرهەنگییەکانی خۆی وەلا بنێت یان فەرامۆشیان بکات.

ئەم سیاسەتە لە بەرامبەر سیاسەتی یەك کەلتووری بەرجەستە بۆتەوە. بە پێی ئەم سیاسەتە، هەندێ لەو وڵاتانەی کە خاوەنی چەند فەرهەنگێکی جیاوازی ئەتنیکی و نەتەوەیی بن، بێ رەچاوکردنی ئەم جیاوازییانە هەوڵ ئەدەن لە ئیدارەی کۆمەڵگادا سیاسەتێکی یەکدەست و یەکپارچە جێبەجێ بکەن کە ئاکامی وەها سیاسەتێك جگە لە تواندنەوەو دەمج بوونی کەلتوورە جیاوازەکانیتر شتێکی تر نییە. نموونەی بەرچاوی ئەم سیاسەتە، رەفتارەکانی دەوڵەتی تورکیایە لە بەرامبەر کەلتووری کوردەکانی ئەم وڵاتە.

**سیاسەتی گۆپاڵی گەورە** سیاست چماق بزرگ Big stick policy

ئەم زاراوە لە لایەن رۆزڤێلت (١٨٨٢ـ ١٩٤٥) سەرکۆماری ئەمریکا بە مەبەستی بەکارهێنانی زەبر و زەنگ بۆ مەسەلە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بەکار براوە. دەڵێن لە کاتی خۆیدا گوتوویە: «هەرکاتێك گۆپاڵێکی گەورەت بە دەستەوە بوو، ئینجا بە هێمنی و لەسەر خۆ گفتوگۆ بکە».

**سیخوڕ/جاسوس** جاسوس spy

کەسێك کە بە شێوەیەکی پەنامەکی و شاراوە لە ناو ئۆپەراسیۆنی وڵاتی دوژمن، هەواڵ و زانیاری و نهێنی کۆبکاتەوە بۆ گەیاندن بە لایەنی بەرامبەر. ئەگەر سیخوڕێك دەسگیر بکرێت، ماف ئەوەی نییە وەك دیلێکی جەنگی لە گەڵیا هەڵسوکەوت بکرێت بەڵام بۆی هەیە لە دادگایەکی دادپەروەرانە بەهرەمەند بێت. سزای سیخوڕ لە کاتی شەڕدا بە چاوپۆشی کردن لەوەیکە، لە راگواستنی زانیاری و رازبەری سەرکەوتوو بووبێت یان نا، مەرگە. سیخوڕی کردن لە کاتی ئاشتیدا لە یاسا نێونەتەوەییەکان پێڕەوی ناکات بەڵکوو بە پێی یاسای ناوخۆیی وڵاتەکان لە گەڵی رەفتار ئەکرێت.

PDF 4 KURD

## سیستەمی سیاسی — نظام سیاسی — Political system

سیستەم لە وشەی یۆنانی sustema بە واتای «بە کۆمەڵ» وەرگیراوە. ئەم وشە لە زۆربەی زانستە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان، بە واتای جیاواز بەکار براوە. لە زاراوەی سیاسیدا سیستەمی سیاسی بریتییە لە کۆمەڵێ دامودەزگا و پاڵنەری ئاشکرا کە پێکهاتەکانی دەسەڵات بەدی ئەهێنن. لە پێناسەیەکی تردا سیستەمی سیاسی بۆ دەرخستنی تایبەتمەندییە لۆژیکییەکانی هاوپێوەند لە گەڵ هەر چەشنە ژیانێکی سیاسی ئاراستە کراوە. کەواتە سیستەم، بە ناچاری لە قەبارەی هەر تیۆرییەك بیچم بگرێت، ئاشکرا و ئاراستەی ئەکات.

سیستەمی سیاسی لە گەڵ رژێمی سیاسی کە شێوازی حوکمەت کردنە، جیاوازییان هەیە. بۆ وێنە سیستەمی «کۆماریی» سیستەمێکی دیاریکراوە بەڵام هەر وڵاتێك، بە پێی رادەی دەسەڵاتی سەرکۆمار رژێمێکی تایبەت بەو قەوارە دائەمەزرێنێت. بە گشتی دەوڵەت وەك پێکهاتەی سەرەکی سیستەمی سیاسی لە قەڵەم دراوە و لەبەر ئەوەش کە هێزی سزادانی بە دەستەوەیە، هەندێجار هاوواتای سیستەمی سیاسی مانا کراوەتەوە. نموونەی سیستەمە سیاسیەکان وەك، سیستەمی فیئۆدالی، سەرمایەداری، پەرلەمانی، تۆتالیتەری و ...

مێتۆدی لێکدانەوەی سیستەمە سیاسییەکان، لە ١٩٥٠ بەملاوە لە رۆژاوا رەواجی پەیدا کرد و ئامانجەکەشی، بەدەستەوەدانی تیۆرییەکی گشتی بوو بۆ شرۆڤەی هەموو رەهەندەکانی ژیانی سیاسی لە سەرجەم سیستەمە سیاسییەکاندا. مەسەلەی سەرەکی بۆ لێکدانەوەی سیستەمە سیاسییەکان، چۆنییەتی سەرهەڵدان و دەوام و وەرچەرخان و لەناوچوونی ئەم سیستەمانەیە. لەم روانگەوە سیاسەت لە هەموو سووچ و قوژبنێکی ژیانی کۆمەڵایەتیدا جێی خۆی کردۆتەوە و بۆ تێگەیشتن لە سیستەمی سیاسی، دەبێ پێچەڵپووچی و ئاڵۆزییەکانی ناخی پێوەندییە سیاسییەکان لەناو ژیانی کۆمەڵایەتیدا سادە بکرێتەوە و لێك بدرێتەوە. سیستەمی سیاسی، وەك مەداری سیاسەت و حوکمەت، سیستەمێکە کە داتاکانی لە دەوروبەری خۆی وەردەگرێ و لە پرۆسەی پێکهاتە سیاسییەکاندا دەیخەمڵێنێ و ئینجا لە قەوارەی سیاسەتەکان ئەیداتەوە بە کۆمەڵگا.

## سیستەمی فرە حیزبی — نظام چند حزبی — Multiparty System

سیستەمێك کە تێیدا رێژەیەکی زۆر لە حیزبە سیاسیەکان بە شێوەی هاوبەش بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵات هەوڵ ئەدەن، کاتێکیش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بە هاوکاری یەکتر بەرنامە و پلانی هاوبەش بۆ بەرێوەبردنی حوکمەت ئاراستە دەکەن. بۆ وێنە لە وڵاتانی ئەورووپیدا سیستەمی فرە حیزبی بۆتە باو. لە فەرەنسا کاتی خۆی ژمارەی ئەم حیزبانە گەیشتۆتە ٢٠ حیزب. لە ئەڵمانیا، ئیتالیا و سویسرا ئەم سیستەمە دەور ئەبینێت. یان ئەو دۆخەی کە لە عێراقی دوای رووخانی رژێمی سەدام حسەین لە ساڵی ٢٠٠٦ هاتە کایەوە.

هەبوونی سیستەمی فرە حیزبی لە وڵاتێك، بنەمایەکە بۆ بەراوردکردنی رێژەی دیموکراسی لەو وڵاتە

PDF 4 KURD

لە پرۆسەی بەدیموکراسیکردندا ئەغلەب جار حیزبی بچووك بچووك سەرهەڵئەدەن. هەر کاتێك دیموکراسی پاوەجێ ببێت، ئەم حیزبە بچووکانەش لە ناو سیستەمێك سەقامگیر دەبن کە بە سیستەمی فرەحیزبی ناوبردە ئەکرێت. لە سیستەمی فرە حیزبی، بە پێچەوانەی سیستەمی تاك حیزبی ـ کە تێیدا تەنیا یەك حیزب چالاکە و حیزبەکانی‌تر سەرکوت ئەکرێن ـ هاوبەشی سیاسی، لە گەڵ ململانێ و کێبەرکێی سیاسی ئاوێتە بووە. لەم سیستەمەدا ئەنجومەنی وەزیران بە شێوەی ئیئتلاف و هاوپەیمانی هەڵئەبژێردرێت.

## سیستەمی نوێی جیهانی نظم نوین جهانی New World Order

ئەم زاراوە لە میانەی ساڵی ١٩٨٩ پاش گۆڕانکارییەکانی بلۆکی رۆژهەڵات هاتۆتە زاراوەی سیاسیەوە. رووخانی دیواری بەرلین* لە دیسەمبەری ١٩٨٩ سەرەتایەك بوو بۆ کۆتایی هاتنی سیستەمی کۆنی پێوەندییە نێونەتەوەییەکان. دەسەڵاتدارانی پێشووی جیهان، هەر لە مۆنرۆوە بگرە تا لینین و لە هیتلێرەوە تا بۆش، هەرکامیان بە هەوای خۆیان بانگەشەی بنیاتنانی سیستەمی نوێی جیهانییان کردووە.

بەڵام سیستەمی نوێ بە مانای ئیمرۆیی ئەوەیە کە یەکەم جار لە لایەن جۆرج بۆش(باوك) سەرکۆماری ئەمریکا، لە ١١/٩/ ١٩٩٠ لە بەردەم نوێنەرانی کۆنگرێس، راگەیەندرا. بۆش، بانگاشەی جیهانێکی کرد کە تێیدا سەروەری یاسا، جێی قانوونی جەنگەڵ بگرێت و جیهانێك کە تێیدا هەموو وڵاتان بەرپرسیاریەتی هاوبەش بۆ ئازادی و یەکسانی بە رەسمییەت بناسن. جیهانێك کە تێیدا زۆرداران، ماف زۆرلێکراوان بپارێزن. بۆش، رێبەرایەتی ئەمریکا و سەروەری بایەخەکانی ئەم وڵاتەی بۆ دروستبوونی وەها جیهانێك بە پێویست باس کرد و گوتی: سیستەمی نوێی جیهانی نیازی بە رێبەرایەتی و هەژمۆنی* بایەخەکانی ئەمریکایە لە جیهاندا.

سیستەمی نوێی جیهانی، هەر لە سەرەتاوە لە لایەن بیرمەندان و سیاسەتمەدارانی جیهان بەرەورووی رەخنە بۆتەوە. بۆ وێنە نۆئام چۆمسکی، زمانەوانی ناودار و رەخنەگری بەرجەستەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دەڵێ: «سیستەمی نوێی جیهانی، دەسپێچکێکە بۆ چەواشەکردنی خەڵکی جیهان و هێشتنەوەی بێعەداڵەتی و ناوێکی تازەیە بۆ پاساوی زۆرداری و دروستکردنی جیهانێکی بێ رەقیب بۆ ئەمریکا». تۆنی بێن، سیاسەتمەداری بەریتانیش پێی وایە، سیستەمی نوێی جیهانی گەڕانەوەیە بۆ ئیمپراتۆرییە زۆردارەکانی رابردوو.

## سێکتاریزم/تیرەگەری سکتاریسم/ فرقه گرایی Sectarism

ئەم زاراوە لە ریشەی لاتینی secta بە مانای تیرە و گرووپی بچووك وەرگیراوە. لە کەلتووری کۆمۆنیستەکان بە واتای دابڕان لە جەماوەر و گۆشەگیرییە. لایەنگرانی ئەم رێبازە بە حەز و ئارەزوویەکی تایبەتەوە بیر لە بابەتە ئایینی و فەلسەفیەکانی خۆیان دەکەنەوە و گرنگی بە بابەتە گرنگەکانی کۆمەڵگا نادەن.

PDF 4 KURD

بە گشتی سێکتاریزم بۆ تیرەگەری و عەشیرەگەری لە ناو حیزب و لایەنە سیاسیەکاندا بەکاردێت کە پتر لە ناو حیزب و گرووپە چەپیەکاندا باوە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوە کە ئەم گرووپانە لق و پۆپی جۆراوجۆریان لێ ببێتەوە. تیرەگەری لە ناو حیزبە سیاسیەکان هەمیشە ناگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بیروڕا بەڵکوو هەندێ جار لە ناکۆکی و ململانێی تایبەتی و زێدەخوازی رامیارییەوە سەرچاوە دەگرێ.

PDF 4 KURD

# ش

**شارستانییەت/ژیار** تمدن Civilization

مەبەست لەم زاراوە، شێوە ژیانی شارستانییانەیە لە کۆمەڵگایەکی شاریی کە سێ واتای لێدەبێتەوە:

- بەرەوپیری ئەقڵ و مرۆڤایەتی چوون.
- ئەنجامدانی بەرێوجێی کاروباری ژیان.
- هەنگاونان بەرەو ئاکار و ئەخلاقی شاریی.

شارستانییەت لە زاراوەی سیاسیدا «بە کۆمەڵێك دەزگا و رێکخراوەی کۆمەلایەتی، پێوەندی ئابووری و کۆمەلایەتی، ئایینی، هونەری و ئەدەبی و بەرهەمهێنان لە کۆمەڵگایەکی پەرەسەندوو» دەگوترێ. بە واتایەکیتر، شارستانییەت بە کۆمەڵێك پاشکەوتی مادی و مەعنەوی مرۆ لە کۆمەڵگایەکی پەرەسەندوو دەوترێ. شارستانییەت لە زانستی مرۆناسیدا وەك پاژێك لە کەلتوور لە قەڵەم دراوە.

**شانتاج** شانتاژ/ هوچیگری Chantage

ئەم وشە بە مانای گۆرانی گوتن و تێچریکاندنە بەلام لە زاراوەی سیاسیدا بریتییەلە: هەر کات کەسێك یان گرووپێك بە دەسەلاتی بالاترەوە بخوازێت لە کەسێك یان گرووپێکی دیکە سوودی نابەجێ ببات و لایەنی بەرامبەر پێمل بکات بە پێچەوانەی روانگەی خۆی رەفتار بکات. بە واتایەکیتر ئەو کەسەی شانتاج ئەکات، هەوڵ ئەدات بە تۆقاندن و هەرەشە و بلاوکردنەوەی هەواڵی درۆ، کەسێك ملکەچی خۆی بکات یان بێدەنگی بکات یان باجی لێ بسەنێت.

**شمشێری دامۆکلێس** شمشیر داموکلس Sword of Damocles

دامۆکلێس لە ئەفسانەکانی یۆناندا یەکێك لە دەست و پێوەندە ماستاوکەرەکانی دیۆنیسۆس، پاشای ستەمگەری سیراکۆز بووە کە هەمیشە بەسەر بەختەوەری و مەزنایەتی پاشادا هەڵیگوتووە و ستایشی کردووە. دیۆنیسۆسیش بۆ ئەوەی ئەدەبی بکات و پێی بسەلمێنێ کە بەختەوەرییەکەی ناتوانێ بەردەوام بێت، رۆژێك بۆ میوانداریيەکی پرشکۆ لێی دەگێرێتەوە و شمشێرێکی تیژ و قورسی بە مووی ئەسپ لە ژوور سەرییەوە هەڵدەواسێ کە بە کەمترین جووڵەی دامۆکلێس بە سەر سەریدا دەکەوت و دەیکوشت.

لە زاراوەی سیاسیدا مەبەست لەم زاراوە، ئەوەیە کە هەمیشە مەترسییەکی گەورە و چاوەروانەنەکراو لە کەمیندا هەیە و دەوڵەتی ستەمگەر بۆ بەرگریکردن لە ئازادیخوازی خەڵك، شمشێری دامۆکلێس بەکار

PDF 4 KURD

دەهێنێ کە هەمان سەرکوت و دەسبەسەری و ئازار و ئەشکەنجەیە تاکوو دەرفەتی دەربڕینی ئازادانەی بیروڕا بە خەڵك نەدات.

## شۆڕش انقلاب Revolution

وشەکە بە مانای گۆڕان لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی ترە. ئەم زاراوە یەکەم جار لە لایەن کۆپرنیك بە مانای جموجۆڵی ئەستێرەکان و هەتاو لە زانستی ئەستێرەناسیدا بەکار براوە(شۆڕشی زستانی و شۆڕشی هاوینی). دواتر لە سەدەی ١٧ لە ئەوروپا، واتایەکی تازەی بە خۆوەگرت و بە مانای ڕابوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی مانا کراوەتەوە. ئینجا بە واتای سووڕانێکی بنەڕەتی لە: شێوازی بەرهەمهێنان (وەك شۆڕشی پیشەسازیی و شۆڕشی تەکنۆلۆجی) یان وەرچەرخانێکی بنیاتنەری کۆمەڵایەتی و سیاسی(وەك شۆڕشەکانی فەڕەنسە و سۆڤیەت و ئێران) وە یان لایەنێك لە ژیانی کەلتووری و فیکری (وەك شۆڕشی زانستی و شۆڕشی کەلتووری) لێك دراوەتەوە.

بەڵام ئەوەیکە بۆتە بابەتی ڕێبازە شۆڕشگێرییەکان و دەرکی مانای کۆمەڵایەتی شۆڕشەکان، ئەو وەرچەرخانە گورج و کوتوپڕانەن کە لە ئەنجامی شۆڕش لە ستراکتووری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگادا ڕوویداوە. باس و بابەتی ئەم تیۆرییانە نەك هەر مەسەلەی گۆڕینی دەسەڵاتداران بە هۆی شۆڕشەوەیە بەڵکوو گۆڕینی چینی فەرمانڕەوایان و چۆنیەتی فەرمانکردن و گۆڕینی دەزگا کۆمەڵایەتییەکان و جەوهەری شەڕ و ئاژاوە و کردەوەی شۆڕشگێرانەیە کە وەها گۆڕانکارییگەلێکی بە دواوەیە.

لە سەدەی نۆزدەوە فەیلەسوفان و لێکۆڵەرانی کۆمەڵایەتی ئەوروپا لە بارەی دەوری کۆمەڵایەتی و مێژوویی شۆڕش و هەلومەرجی ئەم دیاردەیە بیروڕای جۆراوجۆریان گۆڕیوەتەوە. بە گشتی ئەو تیۆرییانەی کە لە ڕوانگەی سیاسییەوە ـ نەك کۆمەڵناسی ـ سەیری مەسەلەکە ئەکەن، دوو جۆرن: یەکەم، بۆچوونی چەپی و گەشبینانەیە لە شۆڕش کە ئێستاش هەر لەسەر بنەمای مارکسی و دیموکراسییەتی توندڕەوی دەسەڵاتدار ڕاوەستاوە. بە پێی ئەم تیۆرییانە، شۆڕشە سیاسی و کۆمەڵایەتییە گەورەکان، کەرستەیەکی«جەبری» بوون بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەك کە تێیدا ئازادی و ئۆتۆنۆمی و هاوتەرازیی کۆمەڵایەتی و یەکسانی پیادە بکرێت. لەم زەمینەدا قوتابخانە «پێشڕەو»ەکان، بە دوو گرووپ دابەش ئەکرێن: ١- ئەوانەی کە پێشخستنی «یەکسانی» بە گرنگترین نیشانەی پێشکەوتن دەزانن و بۆ گەیشتن بەم ئامانجە تەنانەت نەریتی دیکتاتۆریش بە کار ئەبەن (وەك لینینزم*). ٢- ئەو بیرمەندە ئازادیخوازانەی کە یاخیبوون و ڕەنازەنای جەماوەر لە شۆڕشە ڕەسەنەکاندا بەدژی ئیستبداد و بە ئامانجی پەرەدان بە دیموکراسییەت دەزانن و بە ڕەوای نابینن کە دیموکراسی سیاسی، فیدای عەداڵەتی ئابووری و کۆمەڵایەتی بێت.

لە بەرامبەر چەپییە گەشبینەکاندا، ڕاستڕەوە ڕەشبینەکان خۆ ئەنوێنن. نوێنەرانی ئەم قوتابخانە کە هەم لە پاش و هەم لە پێش شۆڕشی فەرەنسەوە هەبوون، بریتی بوون لە: لایەنگرانی ئاریستۆکراسی

PDF 4 KURD

کۆنەپارێزیی، شاپەرستەکان و لایەنگرانی کڵێسە. بە درێژایی نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدە، کەسانێك وەك نیتچە(فەیلەسوفی ئەڵمانی) و گۆستاو لۆبۆن(دەروون ـ کۆمەڵناسی فەرەنسی)، شۆڕشیان بە تەقینەوەی سۆزی وەحشییانە و بەرەڵڵا و رووخێنەری جەماوەر زانیوە. دەروونناسە هاوچەرخەکان کە لەسەر داینەمۆی دەروونی موتاڵا دەکەن، هەندێ جار شۆڕش بە نومایشێکی «دەروون جڤاتی» لە قەڵەم ئەدەن و ئەمە لە گەڵ «گەڕانەوە» بۆ زەینییەتی سەرەتایی بەراورد ئەکەن کە لە حاڵاتی پەرێشانی دەروونی لە تاکدا خۆی ئەنوێنێ.

لە روانگەی کۆمەڵناسی سیاسییەوە تیۆرییەکانی شۆڕش، بە پێنج رێباز دابەش ئەکرێن کە هەر کامیان لەمەڕ چۆنیەتی سەرهەڵدانی شۆڕشەکان، هەڵگری شێوازی بەڵگاندن و خوێندنەوەیەکی جیاوازن. مارکس، وەك پێشەنگی تیوری مارکسی لە جوملەی گرینگترین شرۆڤەکارانی شۆڕش ناونووس دەکرێ. مارکس لەسەر «ناعیلاجی» یان پێویستیی شۆڕش، بە تەئکید پێداگری ئەکرد. ئەو پێی وابوو کە هۆکاری شۆڕش ئەگەڕێتەوە بۆ فراژبوونی هێزە بەرهەمهێنەکانی کۆمەڵگا. ئینجا لە ناکۆکی ئەم هێزانە لە گەڵ پێوەندی و سیستەمە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئێستادایە کە شۆڕش دێتە کایەوە. کاتێ ئەم سیستەم و پێوەندییانە بەر بە گەشەی بەرهەمهێنان ئەگرن، مەسەلەکە قووڵ ئەبێتەوە و سەردەمی شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکان دەس‌پێئەکات. چینە سەردەستەکان حەز ناکەن پێگەی خۆیان لە دەست بدەن و چینە ژێردەستەکانیش ناخوازن لەو دۆخەی کە تێیدان بمێننەوە. ئەم پێکدادانە، شۆڕشی خوێناوی بەدوا خۆیدا ئەهێنێت. مارکس شۆڕش بە هۆکاری ناعیلاجانەی «پێشکەوتن» و «شەمەندەفەری مێژوو» ناوبردە ئەکات. (بڕوانە مارکسیزم).

تیۆرییەکی تر کە لەسەر شۆڕش ئاراستە کراوە تیوری دەروونناسانەیە کە لە لایەن دۆتۆکویلی فەرەنسیەوە شیکراوەتەوە. بەپێی ئەم بیرۆکە دیاردەی نارەزایەتی ئەبێ لە دەروونی تاکەوە سۆراغی بگیردرێ. بە واتایەکی‌تر نارەزایەتی ئەگەڕێتەوە بۆ سەرکوتکردنی نیازەکانی تاك یان باشتربوونی ژیان یا دژواربوونێکی کورتخایەن لە دوای ماوەیەکی درێژی خۆشگوزەرانی و کاردانەوەی ئەم رووداوانە بەسەر زەینی تاکدا.

تیۆری سێهەم، ئەگەڕێتەوە بۆ دۆرکهایم کە رێبازەکەی خۆی بە ناوی فانکشنالیزم و کۆمەڵگەی جڤاتی لێك ئەداتەوە. دۆرکهایم بە پێچەوانەی مارکس پێی وایە کە ئەندامانی کۆمەڵگا بەهۆی فاماندن یا ویژدانی کۆمەڵەکی و هاوبەش پێکەوە یەکگرتوویيان هەیە. ئاڵۆزبوونی رۆژانەی کۆمەڵایەتی و دابەشکردنی کار ئەم یەکگرتوویی و ویژدانە کۆمەڵەکییە ئەخاتە مەترسییەوە. ئینجا ئەم دۆخە لە کۆنترۆڵ دەرئەچێ و کێشمەکێشی کۆمەڵایەتی دەس پێئەکات.

دوو کەسی تر کە ئەوانیش بە نۆبەی خۆیان لە ئاراستە کردنی تیۆرییەکانی شۆڕش دەوریان بووە، بریتی بوون لە ماکس ڤێبەری ئەڵمانی و ویلبێرتۆ پارێتۆی ئیتالی. لە راونگەی ڤێبەرەوە، رەفتاری جڤاتی و هەرەوەزیی جەماوەر ئەگەڕێتەوە بۆ وەفاداری بە سیستەمێکی فیکری کە پێناسەیەکی نوێ لە واقیع و جیهان ئەدا بە لایەنگرانی خۆی. ئەم پێناسە هەمان چەمکی کاریزمایە لە مێژوودا. بەڕای ڤێبەر کاتێك دەست

PDF 4 KURD

دەست هێزە کۆنباوەکانەوە بێت هاوکێشە بەرقەرارە بەڵام دوو هێز ئەم هاوکێشەیە تووشی مەترسی دەکەن: یەکەم هێزی عەقڵانی و دووهەم، هێزی کاریزمایی.

بە باوەڕی پارێتۆ کە روانگەیەکی ریالیستی لە ئەژمار دێت، سەرهەڵدانی شۆڕش و هەرەوەزیی سیاسی دوایین قۆناغی لاوازبوونی دەزگا سەرکوتکەرەکانی حوکمەتە. ئەم لاوازییە ئەبێتە دەسپێچکێك بۆ رێکخراوە دەسەڵات خوازەکان و ئەوانیش لە هەر چەشنە نارەزایەتییەك بۆ هێنانە سەرشەقامی جەماوەر کەڵك وەردەگرن.

**شۆڕشگێڕی** انقلاب خواهی Revolutionism

هەر جۆرە کردار، شێواز یان تیۆرییەك کە خوازیاری پشتگیری لە گۆڕینی بنەڕەتی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری یان کەلتووری بێت، شۆڕشگێڕی لە قەڵەم ئەدرێت. شۆڕشگێڕان، بەدژی کۆنەپەرستین و تەنانەت ریفۆرم خوازەکانیش بە سازشکاری لە گەڵ رژێم و سستی لە کردەوەدا تاوانبار ئەکەن.

**شۆڕشی ئیداری** انقلاب مدیریت(اداری) Managerial revolution

جێبەجێکردنی چاودێریی لە سەرمایەدارانەوە بۆ بەڕێوەبەرانی دەزگا حکومی و ناحکومییەکان. هەنووکە، زۆربەی کۆمەڵناسان و زانایانی سیاسەت لەسەر ئەم بڕوایەن کە لە سیستەمە پیشەسازییە پێشکەوتووەکاندا (سەرمایەداری و سۆشیالیستی) دەسەڵاتی راستەقینە بە دەست بەڕێوەبەرانی دەزگا ئابووری و ئیداری و سەربازی و بورۆکراتییەکانە بە تایبەت، ئەو توێژە باڵایەی کە چەرخی هەموو دەزگاکان هەڵئەسووڕێنێ. ئەمانە لە راستیدا چینێکی دەسەڵاتداری تازە پیاکەوتوون کە دەبنە خاوەنی بەشی زۆریی داهات و بەرهەمهێنانی وڵاتەکەیان. ئەم بیرۆکە لە لایەن جەیمز بێرنام کۆمەڵناسی ئەمەریکی، لە کتێبی شۆڕشی ئیداری(١٩٤١) لە ئەمریکادا هاتە ئاراوە.

**شۆڕشی کەلتووری** انقلاب فرهنگی Cultural revolutio

راپەڕینی سیاسی و کۆمەڵایەتی چین لە ساڵەکانی ١٩٦٦ تا ١٩٦٩ بە رێبەرایەتی مائۆتسەدۆن بەدژی بۆروکراسی*حیزبی کە رێبەرەکەی لیوشائۆچی بوو. ئامانجی ئەم راپەڕینە، وەرچەرخانی بنەڕەتی لە کۆمەڵگای چین و بەرجەستە کردنەوەی رێبەرایەتی مائۆ بوو. بۆ ئەم مەبەستە مائۆ، لاوانی«گاردی سوور»ی بەدژی کادێرانی حیزبی و سەربازی هەڵخراند تاکوو هەردووکیان بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە. ئامانجی شۆڕشی کەلتووری لە چین، نەك هەر گۆڕینی ستراکتووری دەسەڵات، بەڵکوو گۆڕینی هاندەر و پاڵنەری کردەوەکانی خەڵکی چین لەمەڕ عەداڵەت خوازیش بوو. ئەم راپەڕینە لە لایەن گاردی سوورەوە بەرەورووی شەڕەنگێزی و پەرەستشی مائۆ بۆوە و سەرەنجام بووە هۆی هاتنە مەیدانی تۆڕێك لە ئەرتەش و گا...

PDF 4 KURD

سوور. بەڵام خەونەکانی شۆڕشی کەلتووری وەك پرۆژەی «بازدانی گەورە بۆ پێشەوە» بەتاڵ بۆوە و گاردی سووریش کۆنترۆڵ کرا و راپەرینەکە لە ساڵی ٩-١٩٦٨ خاو بۆوە و هێمنی کەوتەوە وڵات. دوایین قۆناغی شۆڕشی کەلتووری لە ساڵی ١٩٧١ پاش روخانی لین پیائۆ- وەزیری بەرگری و جێنشینی مائۆ - کۆتایی پێهات.

**شۆڤینیزم** شوونیسم/ناسیونالیسم افراطی Chauvinism

نەتەوەپەرستی توندڕەوانە و ناماقووڵ کە تێکەڵ بە رق و کین بێت بەرامبەر بە نەتەوەکانی دیکە. وشەکە لە ناوی نیکۆلا شۆڤێن، کە سەربازێکی فەڕەنسی و فیداییەکی ناپلیۆن بووە، وەرگیراوە. پاشان بۆ ئەو کەسانە بە کار هاتووە کە بە حەز و ئارەزوویەکی بێپایان وڵاتی خۆیان خۆش ویستووە. لە راستیدا شۆڤینیزم فیکرەیەکی دواکەوتووانەیە کە مەبەستەکەی شانازی کردن بە گەلی خۆت و سووکایەتیکردن بە گەلانی دیکە و بەکۆیلەکردنی نەتەوەکانیترە. سیاسەتی رەگەزپەرستی هیتلەر و فاشیستەکان لەسەر بنەماکانی شۆڤینیزم بنیات نرابوون. ئەمڕۆش هەندێ دەوڵەت و گرووپی کۆنەپەرست، بە کەڵك وەرگرتن لە شۆڤینیزم، هەوڵی پێشێلکردنی مافەکانی خەڵك و گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەدەن. مامۆستا شوکور مستەفا، بلیمەتی گەورەی کورد، لەمەڕ ئەم زاراوە چەن رستەیەکی بەنرخی گوتووە کە لێرەدا دەیهێنمەوە:

«بەڕاستی، مەسەلەی نەژاد و رەگەزان مەسەلەیەکی ئایدیۆلۆژیك و سیاسی فرە توند و تیژە. بیرمەندانی کۆنەپەرستی دنیای سەرمایەداری دە هەڵپەی ئەوەدا بوون کە بە هۆی رامانەی نەژادییەوە، دەسەڵاتی سەرمایەداری بەسەر گەلاندا سەپاندن پاساو بدەن. ئەمانە پروپاگاندەی ئەوەیان بڵاو کردەوە کە گۆیا یەژێ، هەندێ لە تیرەی مرۆڤ لە هەندێکی دیکەیان رەسەنتر و باشترن.

هەروەها لاف ئەویشیانە لێداوە کە ئەورووپا هەمیشە بنیادەمەکانی لەگەڵ بنیادەمەکانی ئاسیا و ئەفریقیادا جیاوازن. شۆڤینیستانی عارەب و عەجەم و تورك هەر لە هەروگیڤی ئەوەدان، نەتەوە بەزۆر لکێندراوەکانیان، وەك وە نموونە، کورد، گۆیە بەچکەی جنۆکەن، لە دێو و درنجن و ئیتر لەم قسە قۆڕەیلە وە با بدەن. بەڵام ئەمڕۆ زانست ئەم قسە بێتامانەی سەر لەبەر پووچاندووەتەوە و کەم کەس باوەڕیان پێ دەکەن».

**شوناس** هویت Identity

ئەم زاراوە لە وشەی identitas وەرگیراوە و بە دوو مانای بەڕواڵەت هاودژ شرۆڤە دەکرێت: ١)هاوسانی و تەبایی رەها. ٢) جیاوازی هەمیشەیی. بەگشتی شوناس، پرسیارە لە *مەبوونی کەسێك*. پرسیار بکەیت: ئەو کەسە کێیە؟ چ تایبەتمەندییەکی تاکی و کۆمەڵەکی هەیە؟

ئەو رەگەزانەی کە هەوێنی پرسیار لە شوناسی کەسێك پێك دێنن، بریتینلە: نیشتمان، مێژوو، زمان، ئەدەب، ئایین، پێکهاتە و ستراکتووری سیاسی، کولتوور و هونەری هاوبەش. چەمکی شوناس

PDF 4 KURD

کێشمەکێشی تیۆری نێوان دوو زانستی سایکۆلۆجی و کۆمەڵناسی بووە لەمەڕ توێژینەوەی لایەنی تاکەکەسی و لایەنی کۆمەڵایەتی ئەم چەمکە. ڕەهەندی تاکەکەسی شوناس، بریتییە لە هەستی ئێمە دەربارەی ئەو شتانەی کە هەر تاکێك لە ئەویدی* جیادەکاتەوە کە ئەویش، دەرك و ناسینێکە لە «من». هەست کردن بە شوناسی تاکەکەس، دەرەنجامی دایەلیکتیکیی نێوان تاك و کۆمەڵگایە و لە هەست و خۆست و بۆچوونەکانی تاکدا خۆی نیشان ئەدات. ڕەهەندی شوناسی کۆمەڵایەتی بریتییە لە وێکچوواندن و گونجانی«ئێمە» لە گەڵ ئەوانیدی. ئەم شوناسە ڕوونکەرەوەی چەمکی«ئێمە»یە.

شوناس، بە کەس نابەخشرێت بەڵکوو لە ڕێگای دانوستان و مامەڵە لە گەڵ *ئەوانیدی*، دێتە بەرهەم. لەم ڕوانگەوە دەکرێ شوناس بە پرۆسەیەکی درێژخایەن لە قەڵەم بدرێ کە هەمیشە لە حاڵی گۆڕاندایە. بۆ نموونە شوناسی نەتەوەیی و ئەتنیکی مرۆڤی کورد بە پێی کات و شوێن دەگۆڕێ. ڕەنگە *کوردبوون* لە هۆڵەندا لە گەڵ کوردبوون لە کوردستان دوو شتی جیاواز بن یا *کوردبوونی* ٢٠٠٩ لە گەڵ *کوردبوونی* ١٩٢٠ جیاوازیان هەبێت.

شوناس بابەتێکی فرە ڕەهەندە. هەرکامێك لە ئێمە خاوەنی چەند شوناسێکە کە لایەنە بەرجەستەکەی لە پێوەندی لە گەڵ بارودۆخی ژیانمان تووشی گۆڕان دەبێت. کەسێك کە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەژی لە کاتی باسکردن لە سیاسەتی نێونەتەوەیی شوناسی ئەمریکی بەخۆ دەگرێ. لە بەرەبەیانی یەکشەممەدا خۆی بە کاسۆلیك لە قەڵەم ئەدات، کاتێکیش سەیری یارییەکی فۆتبۆڵی جیهانی دەکات، دەکەوێتەوە بیری باووباپیرانی لە هۆڵەندا.

## شوناسی نەتەوەیی — هویت ملی — National Identity

شوناسی نەتەوەیی ئەو کاتە لە دایك بوو کە چەمکی نەتەوە بە مانا ئەمڕۆییەکەی هاتە ئاراوە. شوناسی نەتەوەیی، دیاردەیەکی مۆدێرنە کە لەسەر گریمانەی هەبوونی بڕاوتێکی ناسیۆنالیستی و وشیاری نەتەوەیی دامەزراوە. دوای سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم*، شوناسەکان بە قەبارەی نەتەوەیی پێناسە دەکرێن. کەواتە بۆ بەدیهاتنی شوناسی نەتەوەیی، ئەبێ ئەندامانی نەتەوەیەك خۆیان بە دامەزرێنەرانی نەتەوە و دواتر شوناسێکی هاوبەش بزانن.

(ئێرنێست ڕینان گوتەنی)، شوناسی نەتەوەیی، لەسەر بنەمای نیشتمانی هاوبەش، زمان و کولتووری هاوبەش، ئایینی هاوبەش، مێژووی هاوبەش، ویستی هاوبەش و پرەنسیپی سیاسی و یاسایی هاوبەش پێناسە دەکرێت. بەڵام هەروا کە شوناسە نەتەوەییەکانی وڵاتانی فرەکەلتوور یان نەتەوە بێدەوڵەتەکان نیشانی داوە، هیچکام لەم تایبەتمەندییانە ماکی دانەبڕاوی شوناسی نەتەوەیی نین. کەواتە شوناسی نەتەوەیی دیاردەیەکی فرەڕەهەندە. جیاواز لەمەش، دەکرێ شوناسی نەتەوەیی لە ڕوانگەی مەدەنی یا ئەتنیکیش پێناسە بکرێت. کاتێك پێوانەکانی ئەندامەتی ـ لە شوناسێکدا ـ مەدەنی بێت، نەتەوایەتی لە گەڵ شارۆمەندیدا هاوواتا دەبن و لە ڕاستیدا شوناس دەبێتە پرەنسیپێکی سیاسی و یاسایی. شوناس

PDF 4 KURD

نەتەوەیی بە پێناسەیەکی مەدەنی، بۆی هەیە ئەندامی نوێ ـ کە سەر بە کەلتوور یا ئەتنیکێکی‌تر بێت ـ وەربگرێت و لە خۆیدا جێی بکاتەوە. کەواتە کەسێکی ئەمریکایی دەتوانێ ببێتە فەرەنسی یا ئینگلیزی چونکا سنوورەکانی شوناسی نەتەوەیی تا رادەیەك کراوەیە و هەرکەسێك بۆی هەیە رەگەزنامەی خۆی هەڵبژێرێت. بەڵام بە پێچەوانەوە کاتێك پێوانەکان تەنیا ئەندامەتی بێت، نەتەوایەتی تەنیا بریتی دەبێ لە ماف شوێنی لەدایکبوون کە ئەویش شتێکی نەگۆڕە. لەم دۆخەدا ئیدی ئاخاوتن بە زمانی زگماکی یا وەدەستهێنانی ماف شارۆمەندی نابێتە ئاریشە، بەڵکوو هەموو ئەو کەسانەی کە نەتەوە پێك دەهێنن بنەما سەرەکییەکانی شوناسی خۆیان لەم ئەندامەتییەوە دەستەبەر دەکەن.

## شەڕ/جەنگ جنگ War /Warfare

بە هەموو جۆرە کردەوەیەکی قەهری و جەبری دەگوترێ کە دەوڵەتێك بەرامبەر دەوڵەتێکی‌تر بە ئەنجامی ئەگەیێنێ تاکوو ئیرادە و ویستی خۆی بەسەرا داسەپێنێ. بەڕای کلاوزویتز، تیۆری داڕێژی بەناوبانگ،«شەڕ دەوامەی سیاسەتە بە ئامرازێکی تر».

لە روانگەی کۆمەڵناسیەوە، شەڕ بەرەنگارییەکی بێ‌رەحمی رێکوپێکە کە لە بەینی دوو یان چەند کۆمەڵی سەربەخۆ روو ئەدات. شەڕ لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە هۆکارگەلێکی وەك غەنیمەت و تالانی و ترس لە بێگانە و خۆنواندن و تۆڵەسەندنەوە هەڵگیرساوە بەڵام لە ئێستادا شەڕ دەرەنجامی هۆکاری تیۆری و پراکتیکی ئاڵۆزە. چۆنیەتی شەڕ پێوەندیەکی زۆری هەیە بە ئاستی تەکنۆلۆجییەوە. لەم چاخەدا شەڕ مەترسییەکی گەورەی بۆ مرۆڤ بەدی هێناوە چونکا چەك و تەقەمەنییەکان، هێزێکی خاپوورکەری سەرسوڕهێنەریان هەیە و لەوانەیە شەڕێکی بچووك ببێتە هۆی تێوەگلانی چەن وڵاتێکی‌تریش.

شەڕ بە چەن شێوە دێتە کایەوە کە بریتین لە: شەڕی ئاسایی (کە تێیدا لە چەکی ئەتۆمی کەڵك وەرناگیرێ). شەڕی ئەتۆمی(ئەم جۆرە شەڕە تاکوو ئێستا بێجگە لە هێرشی ئەتۆمی ئەمریکا بۆ سەر ژاپۆن لە کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی، زیاتر وەك مەترسیەك ناوبردە کراوە). شەڕی کیمیاوی (لەم شەڕەدا دوو لایەن، بە مادەی جۆراوجۆری کیمیاوی هێرش ئەکەنە سەر یەکتر. شەڕی بایۆلۆجیکی(ژینگەیی)، لەم شەڕەدا بە بڵاو کردنەوەی ڤایرۆس و میکرۆب هێرش ئەکرێتە سەر دوژمن. شەڕی گریلایی یان چریکی(لەم شەڕەدا رێوشوێنێکی رێکوپێك لە ئارادا نییە و لە ناوخۆی دەوڵەتێك بە مەبەستی رووخانی رژێم هەڵئەگیرسێ). شەڕی سایکۆلۆجی(دەروونی) لەم شەڕەدا بۆ شکاندنی ورەی دوژمن لە پرۆپاگەندە کەڵك وەردەگیرێ. شەڕی رێکخراو (منظم) لەم شەڕەدا سوپای دوو لایەنی شەڕ بە شێوەیەکی رەسمی و راستەوخۆ چەکی قورس بەدژی یەکتر بەکار دەهێنن. شەڕی سارد*(ئەم شەڕە دوژمنایەتیەکی نێو نەتەوەییە کە تێیدا لە هەموو شتێك بێجگە لە توند و تیژی و پێکدادان کەڵك وەرئەگیرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجی نەتەوەیی).

### تایبەتمەندییەکانی شەڕ

١ـ شەڕ دەبێتە هۆی «خەباتی چەکدارانە لە نێوان وڵاتەکان»دا. بە پێچەوانەی شەڕی ناوخۆ و شەڕ بەدە

PDF 4 KURD

ئاژاوەگێڕ و دز و جەردە، لە شەڕدا ئەبێ ململانێی گشتی و بگرەوبەردە بێتە کایەوە. ئەندێشەی جەنگ، لە مێشکی بیرمەندانێکی وەك رۆسۆ لە کتێبی *پەیمانی کۆمەڵایەتی*(١٧٦٢) شرۆڤە و پێناسە کراوە. ئەو دەنووسێ: شەڕ بە هیچ لەونێك پێوەندی ئینسانێك نییە لە گەڵ ئینسانێکی‌تردا بەڵکوو ئەمە پێوەندی وڵاتێکە لە گەڵ مەملەکەتێکی‌تر. لە شەڕا ئینسانەکان تەنیا بە رێکەوت وەك هاووڵاتییەك بەرەورووی یەکتر دەبنەوە و کەس وەك پارێزەر و هاونیشتمانییەك لە گەڵ کەسی‌تردا نابێتە دوژمن.

٢- جاری وا هەیە شەڕ بە پێی مافە نێونەتەوەییەکان هەڵئەگیرسێ. لەم رووەوە شەڕ شتێکی مەرجدارە واتە بە هەڵگیرسانی شەڕ کۆمەڵێك رێسا ومافی دیاریکراو لە هەمبەر دوو لایەنی تێوەگلاوی شەڕەکە دێتە کایەوە کە دەبێ هەر دوو لایەن بەرعۆدەی بن. شەڕ لە وەها کەشێکدا ئەبێتە کردەوەیەکی مافپەروەرانە.

٣- شەڕ بە مەبەستی سەلماندنی ئامانجێکی سیاسی یان «مەبەستێکی نەتەوەیی».

## شەڕی ئایدیۆلۆجیکی  جنگ عقیدتی  Ideological warfare

١- تەکتیکێك کە لە سەردەمی شەڕی سارد لە لایەن دوو بلۆکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بە مەبەستی بانگەشەی شێوەی ژیان و گوزەرانی سەرمایەداری یان سۆشیالیستی لە ناوخۆ و دەرەوە بەکار برا.

٢- جۆرە ململانەیەکە لە گەڵ سیستەمی بەهاکانی رەقیب کە هەوڵئەدات بۆ گۆڕینی بیروڕای جەماوەر. شەڕی ئایدیۆلۆجیکی بە پرۆپاگەندە و بەرنامەی کەلتووری و پەروەردە و هونەری و دانوستانی زانستی و یارمەتی وڵاتانی بێگانە و... بە ئەنجام ئەگات. گرینگترین شەڕی ئایدیۆلۆژیکی سەدەی بیستەم لە نێوان کۆمۆنیزم و سەرمایەداری رووی دا.

## شەڕی ئێران و عێراق  جنگ ایران و عراق  Iran-Iraq War(1980-1988)

ئەم شەڕە بە شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق دەگوترێ کە تێیدا عێراق ٦٢٧ جار دەستدرێژی بە خاکی ئێران کرد. ئەم شەڕە دوای شکاندنی رێکەوتنامەی ١٩٧٥ی جەزایر* لە لایەن سەدام حسەینەوە بە شێوەیەکی یەکلایەنە دەستی پێکرد. لە کاتژمێر ١٤ی رۆژی ٢١ی خەرمانانی ١٣٥٩ی هەتاوی( ٢٢ی سێپتەمبەری ١٩٨٠) هێزی ئاسمانی عێراق بە دەیان فرۆکەی جەنگییەوە هەڵیان کوتایە سەر ئاسمانی شارەکانی ئێران و دەستیان کرد بە بۆمباران کردنی ئەم شارانە. هاوکات هێزی لەشکری ئەم وڵاتە چەندەها شاری تریشی دایە بەر ئاگری تۆپخانە.

هێزەکانی سوپای عێراق پاش بەزاندنی سنووری هاوبەش بە پەلە هاتنە ناو خاکی ئێران و زۆربەی شارەکانی لێواری رۆژاوای ئێرانی گرت و بە وادەی ٢ مانگ نزیکەی ١٤هەزار ك. م چوارگۆشەی لە خاکی ئێران داگیر کرد. ئەم خاکە داگیرکراوانە تاکوو ٢١ مانگ لە ژێر دەسەڵاتی عێراق مایەوە بەڵام لەوە بەدوا هێزەکانی سپای ئێران کەوتنە سەرەوە و دەستیان کرد بە راونانی سوپای عێراق.

PDF 4 KURD

ئەم شەڕە هەر دەوامەی بوو تاکوو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕێکەوتی ٢٩ی پووشپەڕی ١٣٦٦هـ (١٩٨٧)، بڕیارنامەی ٥٩٨ ی دەرکرد. لەم بڕیارنامەدا لە دوو لایەنی شەڕ داوا کراوە ئاگربەس بکەن و دەسپێکەری شەڕ دیاری بکرێت. بڕیارنامەکە تاکوو ساڵی دواتر(٢٦ی پووشپەڕی ١٣٦٧) لە لایەن ئێرانەوە پەسند نەکرا. سەرەنجام لە ٢٩ی گەلاوێژی ١٣٦٧ بە شێوەیەکی ڕەسمی ئاگربەس پەسند کرا.

لە ساڵی ١٩٩١ سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕاپۆرتەکەی خۆی بە ئەنجومەنی ئاسایش ڕایگەیاند کە عێراق بەرپرسی دەسپێکردنی شەڕ بەدژی ئێران بووە. لەم شەڕەدا کە ٨ ساڵی خایاند زیانێکی گیانی و ماڵی زۆر بە هەر دوو وڵاتەکە گەیشت. بە پێی ڕاگەیاندنی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕادەی زیان و خەسارەتەکانی شەڕەکە بەم چەشنەی خوارەوە بووە.

- ڕادەی زیانی ڕاستەوخۆ ٩٧/٢ ملیارد دۆلار.
- ڕادەی زیانی ناڕاستەوخۆ ٣٤/٥٣٥ ملیارد دۆلار.
- ئێران ئەم ڕادەیە بە ١٠٠٠ ملیارد دۆلار بەراورد ئەکات.

## شەڕی دووهەمی جیهانی (١٩٤٥-١٩٣٩) جنگ جهانی دوم world war II

لە فێورییەی ساڵی ١٩٣٨ ئادۆلف هیتلەر، بوو بە ڕێبەری ئەڵمانی نازییەت و فەرماندەیی گشتی هێزەکانی ئەڵمانی بەدەس هێنا و هەموو مەقام و مەنسەبە دەوڵەتییەکانی بە نازییەکانی نەمسا بەخشی. ڕۆژی ١٢ی مارس، هێزەکانی ئەڵمانیا نەمسایان گرتەوە و ڕۆژی دواتر خاکی ئەم وڵاتە بە ئەڵمانیا لکێندرا.

هیتلەر سوور بوو لە سەر ئەوەیکە بە یارمەتی ٣ ملوێن ئەلمانیاییزمانی دانیشتووی ویلایەتی سودەتی چێك، ئەم وڵاتەش بلکێنی بە خاکی ئەڵمانەوە. لە مانگی مارسی ١٩٣٩ هێرشی بردە سەر ئەم وڵاتە و بە تەواوەتی داگیری کرد. دوای داگیر کردنی ئەم دوو وڵاتە ئینجا کەوتە هەڕەشە کردن لە پۆڵەندا. لە مانگی ئاگۆستی ١٩٣٩ پەیمانی پاراستنی سنووریی لە نێوان ئەڵمانیا و سۆڤیەت مۆرکرا.

ڕۆژی ١ی سێپتەمبەری ١٩٣٩ ئەگەرچی خەڵکی پۆلەندا خۆڕاگرییەکی شێرانەیان لە خۆیان نیشان دا بەڵام ئەڵمانیا بە هێزی مەکینەیی و بە پشتیوانی هێزی ئاسمانی، توانی لە ماوەی مانگێکدا ئەم وڵاتەش داگیر بکات. ڕۆژی پێنجەمی ژووەنی ١٩٤٠ هێزەکانی ئەڵمانی نازی هێڵە بەرگرییەکانی سپای فەرەنسەی تێك شکاند و بە پەلە خۆی گەیاندە باشوور. لە ڕۆژی ١٠ی ژووەن ئیتالیای فاشیست، شەڕەکەی کێشایە فەرەنسە. ئەڵمانییەکان دوای گرتنەوەی پاریس لە ٢٢ی ژووەنی ١٩٤٠، مەرجەکانی خۆیان بۆ ئاشتی لە گەڵ فەرەنسە بە کاربەدەستان ڕاگەیاند کە بەو پێیە فەرەنسە دەبووە دوو بەش. بەشێکیان ئەکەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیا و ئەویدیکە بە ناوەندییەتی شاری ویشی، ئەکەوتەوە دەستی فەرەنسییەکان. بەڵام بەشەکەی فەرەنسەش لە ساڵی ١٩٤٢ لە لایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە داگیر کرا.

PDF 4 KURD

لە ٩ی ئاڤریلی ١٩٤١، هێزەکانی ئەڵمانیا هێرشیان بردە سەر خاکی دانیمارك و ئەم وڵاتەشیان داگیرکرد. ئینجا هێرش کرایە سەر نەرویج. لەم کاتەدا هێزەکانی فەرەنسە و بەریتانیا هاتنە فریای نەرویج بەڵام تا ١٠ی ژوونن توانییان خۆڕابگرن و سەرەنجام ئەم وڵاتەش بەدەستی هێزەکانی ئەڵمانیا داگیرکرا. دواتر لە رۆژی ١٠ی مانگی مەی، ئەڵمانیەکان هەڵیان کوتایە سەر نەمسا و بەلجیکا و لۆکزامبۆرگ و ئەم وڵاتانەشیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. لە ٢٢ی ژووەنی ١٩٤١ هێزەکانی نازی چەن هێرشێکی بەربڵاویان بردە سەر خاکی سۆڤیەت. بەڵام خۆڕاگری خەڵکی ئەم وڵاتە بە تایبەت لە ستالینگراد بووە هۆی دامرکانەوەی شەڕەکە.

لە ٧ی دیسەمبەری ١٩٤١ بەرەیەکی‌تری شەڕی جیهانی دووهەم، لە نێوان هێزەکانی ژاپۆن و ئەمریکا کرایەوە. لەم رۆژەدا فرۆکەکانی ژاپۆن هێرشیان کردە سەر پاپۆرە جەنگییەکانی ئەمریکا و بارانەی بۆمبیان بە سەردا باراندن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ بەریتانیەکان بەگورجی بەرپەرچێکی هێزەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیایان دایەوە و توانیان ئەم هێزانە لە باکووری ئەفریقا راو بنێن. لە ساڵی ١٩٤٣ هێزە یەکگرتووەکانی دژ بە نازیسم و فاشیزم، پەلامارێکی بەربڵاویان بردنێ و دوای سەرنگوونی مۆسۆلینی(رێبەری فاشیزمی ئیتاڵی)، لە ژانوییەی ١٩٤٤ هێزەکانی خۆیان لە نزیك رووم دابەزاند.

لە رێکەوتی ٦ی ژووەنی ١٩٤٤ چەن سوپایەکی گەورە لە هێزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و کەنەدا لە لێواری نۆرماندی کە بەدەست ئەڵمانییەکانەوە بوو دابەزین. لە ئۆپەراسیۆنی نۆرماندی‌دا هێزە یەکگرتووەکان، دامودەزگای جەنگیی ئەڵمانیان لە کار خست و زەبرێکی کارییان پێ گەیاند. دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر هێزەکانی ئەڵمانیا بەرەو دواوە پاشەکشەیان کرد و لە رۆژی ١٥ی ئاگۆستی ١٩٤٤ هێزەیەکگرتووەکان لە باشووری فەرەنسە دابەزین.

بە هاتنەمەیدانی هێزەکانی ئەمریکا بۆ پشتیوانی کردن لە پاریس و خۆڕاگری خەڵکی ئەم شارە لە بەرامبەر ئەڵمانیەکان، هێزەکانی ئەڵمانیا تەنگیان پێ هەڵچنرا و بەم جۆرە پاش چوار ساڵ شاری پاریس لە چنگی دوژمن دەرهات. لە ٣ی سێپتەمبەر هێزەکانی بەریتانیا بەلجیکیان رزگار کرد و هێزە چەتربازەکانیش لە نەمسا نیشتنەوە تاکوو لێرەوە هێرش بەرنە سەر ئەڵمانیا. سەرەنجام لە مانگی فێورییەی ١٩٤٥ هێڵی زیگفرید دەشکێنن و لە رووباری راین ـەوە دەچنە ناو خاکی ئەڵمانەوە. لە ژانوییەی ١٩٤٥ سۆڤیەت هێزەکانی ئەڵمانیا راودەنێ و لە رۆژهەڵاتەوە بەرەو ئەڵمانیا پێشرەوی ئەکات. هێزی هاوبەشی بەریتانیا و ئەمریکاش لە رۆژاواوە خۆیان بۆ هێرش بردن بۆ پێتەختی ئەڵمانیا ئامادە دەکەن.

رۆژی ٢٤ی ئاوریلی ١٩٤٥ هێزەکانی سۆڤیەت، بەرلین رزگار ئەکەن و لە چەمی ئالب لە گەڵ هێزەکانی ئەمریکا یەك ئەگرنەوە. سەرەنجام سپای ئەڵمانیا خۆی تەسلیم ئەکات و ئەم شەڕە خوێناوییەی ئەورووپا لە ٨ی مانگی مەی ١٩٤٥ کۆتایی پێ دێت و هیتلەریش چەن رۆژ دوای کۆتایی شەڕەکە خۆی کوشت.

لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی ئەمریکا سەری تەسلیم بە ژاپۆن دابخات، لە ٦ی ئاگۆستی ١٩٤٥ بە فرۆکەی بۆمب هاوێژ بۆمبێکی ئەتۆمی هاویشتە شاری هیرۆشیما کە لە ئەنجامدا ٧٨ هەزار کەس کوژران و ٧٠ هەزار کەسی دیکەش بە توندی بریندار بوون و زۆربەی شارەکەی وێران کرد. دەوڵەتی ژاپۆن خۆی نەدا

PDF 4 KURD

دەستەوە و تەسلیم نەبوو. بۆیە ئەمریکا جارێکیتر لە ڕۆژی ٢ی سێپتەمبەر بۆمبێکیتری هاویشتە سەر شاری ناگازاکی و لە ئاکامی تەقینەوەی ئەم بۆمبەش هەزاران کەسیتر کوژران وبریندار بوون و ماڵوێرانییەکی زۆری لێکەوتەوە. ئینجا ژاپۆن خۆی تەسلیم کرد و شەڕی جیهانی دووهەم بە تەواوەتی کۆتایی پێهات.

## شەڕی یەکەمی جیهانی جنگ جهانی اول World war

شەڕی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٤هەڵگیرسا و سەرچاوەکەشی ئەگەڕێتەوە بۆ ململانێ و کێبەرکێی دەوڵەتە گەورەکان لە سەر ئیستیعمار و کێشەی سەربازی و نەتەوەیی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم. ئەم شەڕە بە بیانووی کوشتنی فرانسوا فێردیناند شازادەی نەمسا لە ٢٨/٦/ ١٩١٤ لە ویلایەتی سارایەۆو لە بوسنی دەستی پێکرد. خەڵکی ئەم ویلایەتە حەزیان ئەکرد بە سێربستانەوە پەیوەست ببن بەڵام دەوڵەتی نەمسا دژایەتی ئەکرد. کاربەدەستانی نەمسا دەوڵەتی سێربستانیان بە بەرپرسی ئەم کوشتنە ناوبردە کرد. دەوڵەتی نەمسا چونکا سوور ئەیزانی ئەڵمانیا پشتیوانی لێئەکات، کەوتە فشارهێنان و هەڕەشەکردن لە سێربستان بەڵام ئەم هاشوهووشە سەمەربەخش نەبوو. بەم بۆنەوە دەوڵەتی نەمسا، شەڕی خۆی بەم وڵاتە ڕاگەیاند. لەم ناوەدا سۆڤیەت پشتیوانی خۆی لە سێربستان دەربڕی.

شەڕفرۆشی نەمسا بە سێربستان بووە هۆی ئەوە کە ئەندامانی سێکوچکەی هاوپەیمان(بەریتانیا و فەرەنسە و سۆڤیەت) لە گەڵ سێکوچکەی یەکگرتوو(ئەڵمانیا و نەمسا و ئیتالیا)، شەڕی خۆیان بە یەکتر ڕاگەیەنن. ئەمریکا لە ساڵی ١٩١٧ هاتە ناو ڕیزی هاوپەیمانان(بەریتانیا و...) و دۆخەکەی بە قازانجی خۆیان گۆڕی. ئەم شەڕە کە ٤ ساڵی خایاند زۆربەی ئەورووپا و ئەمریکا و ژاپۆنیشی گرتەوە و فەرەنسەش بووە گەورەترین مەیدانی شەڕەکە. ساڵی ١٩١٨ ئەڵمانیەکان لە بەرامبەر فەرەنسە و بەریتانیا و سۆڤیەت، شکستیان هێنا و سەرەنجام لە ١١ی نۆڤەمبەری هەمان ساڵ شەڕ کۆتایی پێهات.

## شەڕی دووهەمی کەنداوی فارس جنگ دوم خلیج فارس The second persian gulf war

بە شەڕی ٤٢ ڕۆژەی هاوپەیمانانی ڕۆژاوایی بە ڕێبەرایەتی ئەمەریکا ئەگوترێ بۆ ڕزگار کردنی خاکی کوەیت لە دەست سوپای عێراق کە لە ٢ی ئاگوستی ١٩٩٠ داگیر کرابوو. بەم بۆنەوە ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە دەرکردنی بڕیارنامەیەك داوای لە عێراق کرد هەرچی زووتر هێزەکانی خۆی لە خاکی کوەیت بکێشێتەوە دوواوە. هاوپەیمانانیش تاکوو ١٥ی ژانویەی ١٩٩١ مۆڵەتیان دا بە عێراق کە پاشەکشە بکات و بڕیارنامەکەی ئەنجومەنی ئاسایش جێبەجێ بکات. ئەم مۆڵەتە کە نزیکەی ١١مانگی خایاند، کۆتایی پێهات بەڵام عێراق هەر لە خاکی کوەیت مایەوە.

PDF 4 KURD

سەرەنجام لە کاژمێر ٢٢/٣ بەکاتی گرینڤیچ، لە ڕۆژی ١٦ی ژانویەی ١٩٩١ ئۆپەراسیۆنی ***زریانی سەحرا*** بە ڕێبەرایەتی جێنێراڵ شوارتسکۆف دەستی پێکرد. لە ماوەی یەك حەوتوودا هێزەکانی هاوپەیمانان، سەرجەم ١٢هەزار جار بەسەر خاکی عێراقدا هەڵفڕین و بۆمبارانیان کرد. ئۆپەراسیۆنی ئاسمانی ٣٨ ڕۆژ درێژەی خایاند. ئینجا ئۆپەراسیۆنی زەوی بەناوی شمشێری سەحرا بۆ دەرکردنی هێزەکانی عێراق لە کوەیت دەستی پێکرد و لە دوای ٤ ڕۆژ (٢٨ی فیوریە) هێزەکانی عێراقی بە ئاگربەس پێمل کرد.

لەم شەڕەدا عێراق بۆ وەڵامدانەوەی هێرشەکانی هاوپەیمانان چەن جارێك مووشەکی هاویشتە ئیسراییل و عەرەبستان بەڵام زۆر کاریگەر نەبوون. ئەم شەڕە بووە هۆی ڕاپەڕینی کورد و شیعە بەدژی دەوڵەتی سەدام حسەین. ئینجا ڕژێمی عێراق دەستی کرد بە سەرکوتکردنی هەرچی زیاتری ئەو ناوچانەی کە کورد و شیعەی تیا دەژیان.

لە ڕاستیدا هێرشی سەدام بە کوەیت و شکست هێنانی لەم شەڕەدا بۆ کورد ـ بە تایبەت ـ هەلێکی مێژوویی و زێڕینی ڕەخساند. هێزەکانی پێشمەرگە بە ڕێبەرایەتی دوو پارتی سەرەکی ـ یەکیەتی نیشتمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان ـ خۆدەکەون و هێرشەکانی خۆیان لەناو کوردستاندا بۆ سەر بنکە سەربازییەکانی ڕژێمی *بەعس** زیاتر دەکەن. لە ٤ی مارسی ١٩٩١ بێ ئۆقرەیی و بێ ئارامی خەڵکی ڕانیە سەرڕێژ ئەبێ و لە چەن ڕۆژدا ئەم حاڵەتە ئەبێتە ڕاپەڕینێکی گشتی و شارەکانی دهۆك و هەولێر و سلێمانیش ئەگرێتەوە و لە دەستی هێزەکانی بەعس ڕزگار دەبن.

لەم قۆناغەدا ماوەی ئازادی خەڵکی کورد زۆری نەخایاند چونکە ڕژێم هەڕەشەکانی خۆی بە دژی ئەم ناوچانە بەئەنجام گەیاند و لە ١٣ تا ٢٨ی مارس کە زانی کەرکووکیش خەریکە لە دەستی دەردێت، بە یارمەتی فڕۆکە و چەکی قورس و دەبابە هێرشی هێنایەوە کوردستان و خەڵکی ئەم ناوچانەی بەرەو ئێران و تورکیا ڕاونا. لەم کۆچەگەلەدا خەڵقێکی مەدەنی زۆر کوژرا و ئاوارەبوونێکی گەورە بۆ کورد بەجێما. لە دوای ئەوەیکە سەدام کەشێکی نائەمنی خستە ناوچەکە و فشارێکی زۆری هێنا بۆ دانیشتوانی کوردستان، هاوپەیمانان، «ناوچەیەکی ئەمن»یان لە ناو عێراق ڕاگەیاند. ئەم پلانە لە ١٨ی ئاوریلی ١٩٩١ لە نێوان نەتەوە یەکگرتووەکان و دەوڵەتی عێراق مۆرکرا. بە پێی ئەم ڕێکەوتننامە عێراق، نەدەبوا لە خولگەی ٣٦ دەرەجەی باکووری ئەم وڵاتە (ناوچە کورد نشینەکان) فڕۆکەکانی بخاتە ئاسمانەوە. ئەم ماوەو دواتریش ئەگەرچی پڕ بووە لە سەختی و گەمارۆی ئابووری و نائەمنی بەڵام سەردەمێکی ڕەخساند کە بەدوا خۆیدا گەڵاڵەی ڕزگاری و ئازادی کوردی ئەم ناوچانەی دارشت.

شەڕی دووهەمی کەنداو چەن دەرەنجامێکی لێکەوتەوە کە دەکرێ بە سێدانە ئاماژە بدەین:

١ـ جێگیر بوونی هێزە سەربازییەکانی ڕۆژاوا لە عەرەبستان و ناوچەی کەنداو.

٢ـ فرۆشتنی بێوێنەی چەك و تەقەمەنی وڵاتانی ڕۆژاوایی بە عەرەبان.

٣ـ دابەشکردنی عێراق بە سێ ناوچەی کوردستان، ناوەندی و شیعەنشین.

PDF 4 KURD

## شەڕی سارد (١٩٩٠ـ ١٩٤٥) جنگ سرد Cold war

بە سەردەمی دوای شەڕی جیهانی دووهەم ئەوترێ کە لە بەینی دوو *زلهێز*ی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا سەری هەڵدا و نزیکەی ٤٥ ساڵی خایاند. ئەم شەڕە لە سێ قۆناغی جیاواز پێکهاتووە:

قۆناغی یەکەم، لە ١٩٤٥ تا ١٩٥٣ واتە ڕۆژی مردنی ستالین. لەم قۆناغەدا گرینگترین ئەندێشەی ستالین، پاراستن و پیادە کردنی دەسکەوتەکانی خۆی واتە دەسگرتن بەسەر ئەورووپای ناوین بوو بێئەوەی خۆی لە گەڵ ئەمەریکا ڕووبەروو ببێتەوە. ڕۆژاوا لەم ساڵانەدا هەڵوێستێکی بەرگری کارانەی بووە و ئەمریکا، هێزە سەربازییەکانی لە خواروی ڕۆژهەڵاتی ژاپۆن و ئەڵمانیا (ڕۆژاوا) لە ئوراسیا، هێشتەوە.

دوای مەرگی ستالین و کۆتایی هاتنی قۆناغی یەکەمی شەڕی سارد هەر دوولا ئامادەی خۆ سازدانەوە بوون. زیاکردنی بەرنامەکانی *ڕادیۆی ئەورووپای ئازاد* بۆ وڵاتانی ئەقماری، زیاکردنی پشتگیری ماڵی لە چالاکیە سیاسیەکانی پەنابەرانی سۆڤیەتی و ئەورووپای ڕۆژهەڵات کە لە ڕۆژاوا گیرسابوونەوە و هەوڵی بێ وچان بۆ پشتیوانی کردن لە گرووپە نادیارەکانی دژ بە سۆڤیەت، لە جوملەی تایبەتمەندیەکانی ئەم قۆناغە بوون.

قۆناغی دووهەمی شەڕی سارد، لە ١٩٥٣ تاکوو ١٩٧٠ ئەخایێنێت. لەم ماوەدا بڕیار وابوو سۆڤیەت لە باری ئابووریەوە ئەمریکا ببەزێنێ و جیهانی کۆمۆنیستیش لەم بابەتەوە لە جیهانی سەرمایەداری پێشکەوتووتر بێت. لەم قۆناغەدا ئەمریکا و سۆڤیەت دوو جار بە تەرزێکی جیددی ڕوبەڕوی یەك بوونەوە. یەکەم جار لە بابەت بەرلین و جاری دووهەمیش لە سەر کووبا کە هەردوو جارەکە سۆڤیەت خۆی بە زل زانیوە و قەیرانی ساز کردبوو. ئەگەرچی کەس بەدژی دروسکردنی دیواری بەرلین لە لایەن سۆڤیەتەوە هەڵنەستا بەڵام ئەم کارە بووە هۆی مەهارکردنی ئەلمانیای ڕۆژهەڵات و جێخۆشکردن لە ئەورووپای ناویندا. هێنانە دەرەوەی مووشەکەکانی سۆڤیەت لە کووبا سەروساختێك بوو کە دەوڵەتی کێنێدی(١٩٦٣-١٩٦١) پێمل کرد سیستەمێکی لایەنگری سۆڤیەت لەم وڵاتەدا (کووبا) زەمانەت بکات.

قۆناغی سێهەمی شەڕی سارد لە ساڵی ١٩٧٠ دەستی پێکرد. لەم سەردەمەدا گوشاری سۆڤیەت بەوپەڕی خۆی گەیشت. ئەمریکا لە شەڕی ڤێتنام هیلاك بووە و ڕۆژاواش تامەزرۆی هێورکردنەوەی دۆخەکە و کردنەوەی پێوەندی نێوان ئەمریکا و چینە. سۆڤیەت بەپێزتر لە جاران هێرشی کردۆتە کووبا و ئیتیۆپیا و ڤێتنام و یەمەن و ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوین. ئامادەکردنی مووشەکی ئێس‌ئێس٢٠ کە بەرەو ژاپۆن و ئەورووپای ڕۆژاوا دابەستبوو، ڕەقیبی تۆقاندبوو. بەڵام دەرەنجامی ئەم ڕەوتە بە پێچەوانەوە بە زیانی سۆڤیەت تەواو بوو.

هێرشکردنی سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان لە مانگی دیسەمبەری ١٩٧٩، ئەمریکای والێکرد لە باری جوگرافییەوە سیاسەتی پشتیوانی کردن لە موجاهیدینی ئەفغان بکاتە پیشەی خۆی و لە گەڵ وڵاتانی پاکستان و چین و عەرەبستان و میسر و بەریتانیا بەرەیەك بەدژی سۆڤیەت ساز بکات.

PDF 4 KURD

هاتنە سەرکاری گۆرباچۆڤ لە ساڵی ١٩٨٥ و دەسپێکردنی هەندێ ریفۆرمی بەپەلە و بێ‌ریشوێن، ئەوەك عومرێکی دووبارەی بە سۆڤیەت نەبەخشیەوە بەڵکوو ئاریشەکانی زیاتر کرد. زیادەرۆیی لە کێبەرکێی چەك و تەقەمەنی، ئابووری ئەم وڵاتەی ئیفلیج کرد و سەرەنجام بەرەو سەرنگوونی ئەبرد.

لە ساڵی ١٩٨٩ گۆرباچۆڤ، لە دووڕیانەیکدا مابۆوە! یان ئەبوا بۆ هێشتنەوەی دەسەڵاتی پێشوو دەستی بکردایە بە خوێن رشتن و شەڕی ناوخۆیی و ئاژاوە کە ئەم ڕێگایە زەمینەی دەستێوەردانی ئەمریکای خۆش ئەکرد یان ئەوەیکە خۆی تەسلیم بکات. گۆرباچۆڤ، ڕێگەی دووهەمی هەڵبژارد و سەرەنجام پاشاگەردانی کەوتە وڵات و ئەورووپای ڕۆژهەڵات و ناوین و لە راستیدا بلۆکی کۆمۆنیستی تێك شکا و لە دێسەمبەری ساڵی ١٩٩١ بە شێوەیەکی رەسمی یەکیەتی کۆمارییەکانی سۆڤیەت لێك هەڵوەشا.

## شەڕی عێراق     جنگ عراق     Iraq War

هێرشی سەربازی و لەشکری لە زەوی و دەریا و ئاسمان لە لایەن ئەمریکا و بریتانیا و هاوپەیمانەکانیان (ئوسترالیا، ئیسپانیا، ئیتالیا، پورتوغال و ...) بۆ سەر خاکی عێراق کە لە ڕێکەوتی ٢٠٠٣/٣/٢٠ دەستی پێکرد و لە ماوەی کەمتر لە مانگێك بە رووخانی رژێمی سەدام حسەین کۆتایی پێهات. ئەم شەڕە کە لە راستیدا بێ ئیجازەی ئەنجومەنی ئاسایش*ی نەتەوە یەککگرتووەکان هەڵگیرسا، لە لایەن هاوپەیمانانەوە بە ***شەڕی ئازادیی عێراق*** پێناسە کراوە و نەیارانیش بە شەڕی نەوت ناوبردەی دەکەن(عێراق زیاتر لە ١١٢ ملیارد بەرمیل نەوتی هەیە). هۆی سەرەکی و پاڵنەری بەهێز بۆ هێرشکردنە سەر عێراق لە لایەن ئەمریکا و هاوپەیمانان، بریتی بوو لە بەرگری‌کردن لە پەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژ (ئەتۆمی، کیمیایی، بایۆلۆجی و ...) لە لایەن رژێمی سەدام و شەڕ لەگەڵ تیرۆریزمی بونیادگەرای ئیسلامی و پاراستنی ماڤ مرۆڤ و ئازادی عێراق.

پاش تێپەڕبوونی ٣ ساڵ بەسەر رووخانی رژێمی سەدام حسەین، رۆژێك نەبووە عێراق، بە تایبەت ناوەراست و باشووری ئەم وڵاتە ئارامی بە خۆیەوە ببینێت. لەم ماوەدا هەزاران هێرشی تیرۆریستی و خۆکوژیانە کراوەتە سەر هێزەکانی هاوپەیمانان، بە تایبەت ئەمریکییەکان و بە هەزاران خەڵکی مەدەنی و سەربازیش کوژران و بریندار بوون. دەستووری هەمیشەیی عێراق لە لایەن جەماوەری ئەم وڵاتە پەسند کرا و بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کوردێك (جەلال تاڵەبانی) بووە سەرکۆمار و ئەنجومەنی نیشتمانی دامەزرا و دەوڵەتی نوێ پێکهات. سەدام حسەین و حەوت کەس لە دەستوپێوەنەکانی لە دادگایەك بە سەرۆکایەتی قازییەکی کورد، دادگایی کران. حوکمی سێدارە بۆ سەدام و چەن کەس لە دەستوپێوەنەکانی بێ ئەوەی دادگاییەکەیان بە ئەنجام بگات، برایەوە و لەبارەیانەوە بەڕێوە چوو.

پاش هەڵبژاردنی باراك ئۆباما بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٩، ئۆباما پاش پیاچوونەوە بە سیاسەتەکانی ئەم وڵاتە بەرامبەر بە عێراق و ئەفغانستان، بڕیاری دا کە لە ماوەی ١٦ مانگدا هێزەکانی خۆی لە عێراق بکێشێتەوە و باری ئەمنی و ئاسایشی ئەم وڵاتە بداتەوە دەست هێزەکانی عێراق.

PDF 4 KURD

**شەڕی گریلایی** جنگ چریکی Guerilla warfare

ئەم وشە لە زمانی سپانیاییەوە هاتووە و بە مانای شەڕێکی بەربلاوە کە لە لایەن خودی هێز و لقەکان فەرمەندەیی ئەکرێت. لە زاراوەی سەربازیدا بریتییەلە: «سوپایەك کە فێری ڕێوشوێنی شەڕکردن نەکرابێت، لە خێڵ و عەشیرەتی شار و دێهاتەوە دێنە مەیدانی شەڕ و بە کۆتایی هاتنی شەڕ ئەگەڕێنەوە ناو ماڵ و خێزانی خۆیان». ئەم جۆرە شەڕە لە مێژینەیە بەڵام لە سەدەی بیستەمەوە یارمەتیدەر و ڕێخۆشکەری سەرکەوتنی شۆڕش بووە.

شەڕی گریلایی هاوشێوەیە لە گەڵ شەڕی پێشمەرگە لە کوردستان، بەم جیاوازییە کە پێشمەرگە بە تەواو بوونی شەڕ دەست لە چەك هەڵناگرێ بەڵکوو دوای سەرکەوتن، دەبێتە هێزی سەربازی و پاراستن و بەرگری هەرێم.

**شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی** شیوه تولید آسیایی

**Asiatic Mode of Production**

زاراوەی *شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی*، یەکەم جار لە لایەن جۆن ستوارت میل بیرمەندی ئینگلیزی بۆ پێناسەکردنی سیستەمی ئابووری وڵاتانی ئاسیایی هاتە ئاراوە. دواتر لە لایەن بیرمەندانێکی وەك کارۆڵ مارکس بە تێروتەسەلی شرۆڤە کراوە. ئەو بۆ ناساندنی وڵاتانی چین و رووسیە و هێندستان، کۆمەڵێ تایبەتمەندی یەکسان دەبینێت کە بە گشتی بە شێوازی بەرهەمهێنانی ئاسیایی ناوبردە کراوە. بە باوەڕی مارکس، بارودۆخ و کەشوهەوای هەرێمەکانی وڵاتانی رۆژهەڵات، بە هۆی کەمبوونی ئاو پێویستی بە هێنانە مەیدانی جەماوەر و هەرەوەزی ئینسانییە بۆ کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکانی ئاو. بەم بۆنەوە دەسەڵاتی سیاسی و دەوڵەتەکان بە شێوەیەکی بەرچاو، دەست ئەگرن بەسەر سەرچاوەکانی ئاودا و لەم ڕێگاوە زەبر و زاکونی خۆیان بەسەر خەڵکی ئەم وڵاتانە خاڵی ئەکەنەوە. بەمجۆرە شێوازێکی تایبەتی بەرهەمهێنان لە وڵاتانی ئاسیایی دێتە ئاراوە کە ڕێگا خۆش ئەکات بۆ ئیستبداد و ستەمکاری لەم وڵاتانە.

PDF 4 KURD

## ع

**عەدالەت/داد** عدالت/ عدل Justice

**١- چاکە و رەوشت پاکییەك کە بەو پێیە دەبێ بە هەر کەس ئەو شتەی کە مافی خۆیەتی بدرێت.**

**٢- گەیشتنی حەق بە حەقدار دەبێ لەسەر بنەمای یەکسانی و لە بەرامبەر یاسا و رێزگرتن لە مافی هەمووان بێت.**

**٣- پاراستنی هاوسەنگی قانوونی لە نێوان بەرژەوەندییەکاندا.**

ئەگەرچی بەستێنی ئەخلاق بەرفراوانترە لە بەستێنی عەدالەت بەڵام زۆربەی فەیلەسوفان، بۆ وێنە ئەرەستۆ عەداڵەتیان بە گرینگترین بەشی ئەخلاق ناوبردە کردووە. تیۆرییەکانی عەداڵەت وەڵامی ئەم پرسیارە فەلسەفیە ئەدەنەوە کە *عەداڵەت* چییە؟ چەمکی عەداڵەت لە سەردەمی سوکرات و کتێبی کۆماریی ئەفلاتوون لە سەدەی چوارەمی (پ.ز) تا سەردەمی جۆن راڵز، فەیلەسوفی هاوچەرخی ئەمریکا گرنگییەکی بێوێنەی لە فەلسەفەی ئەخلاق و فەلسەفەی سیاسی بەخۆوە دیوە. سوکرات دەیگوت عەداڵەت لەسەر هەر چەمکێکی ژیانی باش دەورێکی بونیادی ئەگێرێ و ژیان بە پێوانەی عەداڵەت گرانبەهایە. راڵزیش دەڵێت عەداڵەت یەکەمین چاکەی پێویستە بۆ دەزگا کۆمەڵایەتییەکان.

چەمکی عەداڵەت هەرچی وردبینانەتر پێناسە بکرێت، سوودمەندترە. دوو جیاوازی بنەرەتی سەبارەت بە عەداڵەت یارمەتیمان دەدات کە بەستێنی مانایی ئەم چەمکە سنووردارتر بکەین. یەکەمین جیاوازی ئەو جیاکارییەیە کە ئەرەستۆ لە نێوان عەداڵەتی «تەوزیعی» و عەداڵەتی «جوبرانی» قایل بووە. عەداڵەتی تەوزیعی، بریتییەلە دابەشکردنی دارایی لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵێك. ئەو پێی وایە کە ئەم دابەشکارییە دەبێ بە پێی لێهاتوویی و توانستی کەسەکان بێت. عەداڵەتی جوبرانی، باسی مامەڵەی نێوان خەڵك و دانوستانی دوولایەنە دەکات.

پێزانین و چاکەکردن لە بەرامبەر چاکەدا لایەنەکانی ئەم جۆرە عەداڵەتە لە ئەژمار دێن. دووهەمین جیاوازی باس لە «بابەتی» عەداڵەت دەکات. عەداڵەت یان لە پێوەند لەگەڵ خەڵك (وەك فەزیلەت و چاکەیەکی تاکەکەسی) یان لەبابەت دەزگا کۆمەڵایەتییەکان (بۆ وێنە لە ئاست پێکهاتەی بنەرەتی کۆمەڵگا و دەزگا کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەکان) چێ دەکرێت.

جۆن راڵز، فەیلەسوفی سیاسی هاوچەرخ لە کتێبی ***تیۆرییەك دەربارەی عەداڵەت*** (١٩٧١) دوو بنەرەتی سەرەکی لەمەڕ عەداڵەت چێ دەکات: یەکەم، باسی بەرژەوەندییە سیاسیەکانە بە تایبەت دابەشکردنی ئازادی و مافە سەرەکییەکان. بەو پێیە، دەبێ هەرکەس مافی ئەوەی هەبێت لە هەموو ئازادییەك بەهرەمەند بێت تاکوو بتوانێ ئازادی بۆ هەمووان دابین بکات. دووهەم، بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان بە

PDF 4 KURD

تایبەت دابەشکردنی داهات و دارایی و هەل و دەرفەت. بەم پێیە، نابەرابەری و بێعەدالەتییە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان دەبێ بە جۆرێك رێك بخرێن کە زۆرترین قازانج بەو کەسانە بگات کە لە کەمترین رادەی خۆشگوزەرانی بەهرەوەر نەبن.

PDF 4 KURD

# ف

**فابیانیزم** فابیانیسم Fabianism

زاراوەی فابیانیزم لە ناوی فابیۆس سەرکردەی رۆمی وەرگیراوە کە دوو سەدە پێش زایین ژیاوە و توانی بە زیرەکی و لەسەرخۆ، شکست بهێنێ بە هانیبالی دوژمنی. لە زاراوەی سیاسیدا ناوی بزاڤێکی سۆشیالیستییە کە لە بریتانیا سەری هەڵدا و لایەنگرەکانی لە ١٨٨٤ لە «کۆمەڵەی فابیان» کۆ بوونەوە و توانی سەرنجی هەموو رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە (بۆ وێنە جۆرج بێرنارد شاو و گراهام والاس) بەرەو لای خۆی رابکێشێ. بەگشتی ئەم رێبازە پێی وایە کە سۆشیالیزمی جیهانی دەبێت بە ئارامی و بەکاوەخۆ و بە شێوەیەکی زانستییانە لەسەر بیر و هزری جەماوەر کاریگەریی دابنێت. کۆمەڵەی فابیان لەسەر ئەم باوەڕەن کە دەکرێت لە رێگای ئاشتیانە و گونجاو لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی و کاریگەریی لەسەر بیروبۆچوونی بەرپرسان، کۆمەڵگایەکی سۆشیالیستی بنیات بنرێت. پاش دامەزرانی حیزبی کرێکاری بریتانیا کۆمەڵەی فابیان چوونە ریزی ئەم حیزبەوە بەڵام سەربەخۆیی خۆیان پاراست و دواتریش وەك گرووپێکی رۆشنبیر دەستیان دایە توێژینەوە و راگەیاندن لەناو حیزبدا. ئەم گرووپە چەند وتارێکیان بەدژی فەلسەفەی مارکس بڵاوکردەوە و لەم بارەوە بەم شێوە بیریان دەکردەوە:

١ــ چاکسازی* کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی خۆڕسك، کامڵبوونی سرووشتی بەدی ئەهێنا و بارودۆخی ئابووری کرێکاری بەرەو باشتربوون دەبرد و پێویستی بە شۆڕش و توندوتیژی نەدەکرد.

٢ــ بۆ پێشڤەبردنی کۆمەڵایەتی، ململانێی چینایەتی پێویست نەبوو.

**فاشیزم** فاشیسم Fascism

فاشیزم لە سەرەتادا بە مانای سێندیکالیزم*ی دەوڵەتی واتە رێکخستنی ئابووری کۆمەڵگا لە سەرەوە بەدەستی دەوڵەت و پشتگیری لە موڵکداریەتی تایبەتی لێکدراوەتەوە بەڵام دواتر مانایەکی بەرفراوانتر لەخۆ دەگرێ و بۆ پێناسەکردنی جۆرێك لە رژێمی سیاسی تۆتالیتەر بەکار براوە. فاشیزم لە گوێن لاگیرییەکی گشتی لە سیاسەتدا دەربارەی ئەو بزاوتە توندڕەوانە (راستی دەسەڵاتخواز، دژی سەرمایەداری مەزن، دژی دیموکراسییەت و لیبراڵ، دژی مۆدێرنیتی و سۆشیالیزم و دژی ئانارشیزم و مارکسیزم) بەکاربراوە کە سەرەنجامەکەیان بە دامەزرانی سیستەمێکی دەسەڵاتخواز دەبرایەوە.

فاشیزم بە مانا مێژووییەکەی، وەك ئەو شتەی کە لە نێوان دوو شەڕی جیهانی کە زۆربەی وڵاتە ئەورووپییەکانی تەنییەوە، ئاوێتەیەکە لە ناسیۆنالیزمی توندڕەو، ئیمپریالیزم، دژایەتی لە گەڵ نەریتی عەقڵی و رووناکبیری، پراگماتیزم، ستایشی دەوڵەت و نەژادپەرستی.

PDF 4 KURD

ئەم زاراوە بەگشتی بۆ پێناسە کردنی جۆرێك ئایدیۆلۆجی و بزاوتی نەتەوەپەرستانە و دەسەلات خوازانەی ئەو رژێمانە بەکارئەبرێت کە لە ساڵەکانی نێوان دوو شەڕی جیهانی تاکوو شکستهێنانی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٤٥ بەسەر ئەورووپادا فەرمانڕەواییان ئەکرد. مانای تایبەتی فاشیزم ئەگەڕێتەوە بۆ «بزاوتی فاشیستی» کە لە ساڵی ١٩١٩، مۆسۆلینی لە ئیتالیا بە دەسەلات گەیاند( ١٩٢٢ـ ١٩٤٥). وشەکە لە زمانی ئیتالیایی بە مانای چەن مێڵەیە کە بەدەوری کلکە تەورێك لە بەردەم کونسوولی رۆمیدا بە نیشانەی دەسەلاتی دەوڵەت نومایش ئەکرا. لە لایەکیترەوە «فاشیست» لە لایەن کۆمۆنیستەکانەوە بۆ سووکایەتی بە نەیاران و سۆسیال دیموکراتەکان لەگوێن زاراوەیەکی سووکایەتیئامێز بەکاربراوە تاکوو ببێتە هاندەرێك بۆ رێکخستنی بەرەی دژە فاشیست.

فاشیزم، بەرهەمی قەیرانێکی قووڵی کۆمەلایەتی و ئابووری بوو کە لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم لە ئەورووپا هاتە ئاراوە. ئەم ئایدیۆلۆجیایە خۆبەخۆ هیچ جۆرە سیستەمێکی تێك تەنراوی فیکری ساز نەکرد بەڵکوو رەنگدانەوەی هەمان بنەمای نەتەوەیی ئەو ولاتانە بوو کە تێیدا پەرەی سەند. ئامانجی فاشیزم، هێنانە کایەی دەوڵەتێکی بەهێزە کە تێیدا تەنیا حیزبێك ـ حیزبی فاشیست ـ دەسەلات مۆنۆپۆل بکات و سەرۆکێکی کاریزماش بە قەوارەیەکی دیکتاتۆرییەوە بەسەریا حوکمەت بکات. خاڵی هاوبەشی هەموو بزاوتێکی فاشیستی، پەرستشی زۆرداری و بەپیرۆزکردنی شەڕ و گەیشتن بە دەسەلاتە. فاشییەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا، بە تەواوەتی لە پڕۆپاگەندە*ی مێگەل پەروەر و تیرۆر* کەڵکیان وەردەگرت بەلام هەر کە دەستیان بە دەسەلات گەیشت ئینجا لە دەسەلاتی دەوڵەت بۆ لەناوبردنی نەیاران و سیستەمی قانوونی سوودیان وەرگرت.

بنەما سەرەکییەکانی فاشیزم لە لایەن مۆسۆلینی (١٨٨٣-١٩٤٥) لە بەرگی چواردەهەمی ئینسکلۆپیدیای ئیتالیا، لە ساڵی ١٩٣٢ بەمجۆرە لێك دراوەتەوە:

١ـ فاشیزم، بڕوای نییە بە ئاشتی هەمیشەیی و سوودێکیش لەم شتەدا نابینێت. ئاشتی ئەفسانەیەکی زیانبارە.

٢ـ فاشیزم، لە گەڵ مارکسیزم و شێوازەکانیتری ئەندێشەی سۆشیالیستیدا نەیارە.

بۆ لێکدانەوەی فاشیزم، شرۆڤەی ناائایدیۆلۆجیکی ئاراستە کراوە کە لە پێنج سەرباسدا گونجاوە: مارکسی، سایکۆلۆجیکی، ئایینی و ئەخلاقی، مێژوویی و کۆمەڵناسی و سەرەنجام سیاسی.

لە روانگەی مارکسییەوە، فاشیزم، بەپێی رێسا ئابوورییەکان و لۆژیکی سەرمایەداری لێك ئەدرێتەوە. بە واتایەکیتر فاشیزم بەشێکە لە قەیرانی سەرمایەداری پاوانخواز.

لە روانگەی سایکۆلۆژییەوە، شیکردنەوەی دیاردەی فاشیزم پێویستی بە روونکردنەوەی لاسەنگییەکانی قۆناغی منداڵی کەسایەتییەکان هەیە. چونکا لەم سەروبەندەدایە کە ستراکتوری ئەندێشەی منداڵ بە قووڵی بیچم دەبەستێ.

PDF 4 KURD

لە روانگەی ئایینی و ئەخلاقییەوە سەرهەڵدانی فاشیزم، هێمایەکە بۆ قەیرانی ئەخلاقی و ئایینی لە شارستانییەتی رۆژاوادا. لایەنگرانی ئەم رامانە نائایدیۆلۆجیەی فاشیزم، پێیان وایە کە حوکمەتی ئیستبدادی و فاشیزم تەنیا لە نێو خەڵکانی گەندەڵ و گەنیودا دەوام ئەهێنێت.

لە روانگەی مێژوویی و کۆمەڵناسیەوە فاشیزم، بەرهەمی پەرەسەندنی خێرای مودێرنیتی یان شێوازێکی تایبەتی پیشەسازیبوونی هەندێ لە وڵاتان بووە.

دوایین بۆچوون دەربارەی فاشیزم، لە روانگەی سیاسییەوە شیکراوەتەوە کە ئەویش شێوازی بەڵگاندنی فاشیستەکان ئەخاتە روو. بەم پێیە فاشیستەکان بەم قەناعەتە گەیشتبوون کە دیموکراسی پەرلەمانی تووشی شکست بووە. فاشیزم، جگە لەوەی فەلسەفە یا ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی بێت، شێوازێکی دەسەڵاتدارییە کە لەسەر سێ بنەمای حوکمەتی تاکەکەسی، دەسەڵات و سەروەری دەوڵەت و ناسیۆنالیزمێکی توندڕەوانە بنیات نراوە. لەم جۆرە حوکمەتانەدا دەوڵەت بە پشت بەستن بە دەسەڵاتی سەربازی و گرووپی فشاری سیاسی و ئامرازەکانی پرۆپاگەندە، ئازادییەکانی تاک سنووردار ئەکات و هەموو بزووتنەوەیەکی بەرهەڵستکارانە سەرکوت ئەکات.

فاشیزم لە سەرەتادا وەك هێزێکی نیگەتیڤ لە ئەورووپا خۆی نیشان دا. فاشییەت زۆربەی ئایدیۆلۆژی و دامەزراوەکان بەدژی بەرژەوەندییەکانی نەتەوە دەزانێ. لەم سۆنگەوە کە فاشییەکان رایانگەیاندووە ئەو چارەسەرییانەی بۆ دەرمانی نەخۆشییەکانی کۆمەڵگا پێشنیازیان کردووە، بۆ قازانجی نەتەوە بووە، ئەکرێ ئەمانە وەك ناسیۆنالیست بە مانای خودی زاراوەی ناسیۆنالیزم لە قەڵەم بدرێن. بەمحاڵەش ئەو ناسیۆنالیزمەی کە فاشیزمی بەدیهێناوە جیاواز بووە.

فاشیزم، هێزێك دروستی دەکات لە خۆی رادەبینێت تەواوی کۆمەڵگا بخاتە دوای دروشمەکانی خۆی، لە هەستکردن بە هێزەوە سەرچاوە دەگرێت، هێزێك بە شێوەیەك لە غرووری خۆیدا نوقمە کە پێی وایە پێویستی بە هیچ جۆرە ژیانێك لە گەڵ هێزەکانی تردا نییە. لەم روانگەوە فاشییەت، لە هەر شوێن و کاتێکدا بێت، هاورێی سێ دەرکەوتەی سەرەکییە کە بریتین لە:

١- دیاردەی مێگەل دروستکردن.

٢-دروستکردنی کەمایەتییەکی گوناهبار.

٣- مۆنۆپۆلکردنی راگەیاندن.

**فاکسیۆنالیزم:** بروانە حیزبایەتی.

**فالانژ / فالانژیسم** فالانژ / فالانژیسم Falange / Falangism

ئەم زاراوە ریشەکەی لاتینییە و بە درێژایی مێژوو مانای جیاوازی لەخۆ گرتووە. بۆ نموونە لە یۆنانی کۆندا «فالانژی ساکار» بەشێکی هێزی سەربازی یۆنان بووە کە بریتیبووە لە سەربازی پیادە بە چەك

PDF 4 KURD

سووك و چەكی قورسەوە و ... لە ساڵی ١٦٠٠ زایینی، ئەم زاراوە بە كۆمەڵێكی خەڵكیی گوتراوە كە بە شێوەیەكی رێكخراوەیی پێكەوە كۆ دەبنەوە و بۆ گەیشتن بە ئامانجێكی هاوبەش بەرەیەكی یەكگرتوو ساز دەكەن. لە سەدەی پێشوودا فالانژ، ناوی حیزب و ئایدیۆلۆژیایەكی فاشیستی وڵاتی ئیسپانیا بووە كە بە ئیسپانیایی پێی دەڵێن *فالانخە*. ئەم حیزبە لە ١٩٣٣/١١/٢٩ لە لایەن كەسێك بەناوی خۆزە ئانتۆنیۆ پریمۆدێریڤا لە مەدرید دامەزرا و گەشەی پێدراوە. هەرچەندە لە سەرەتاوە بایەخێكی ئەوتۆی نەبوو بەڵام بەرەبەرە پەرەی سەند و سەرنجی خەڵكانێكی زۆری بەرەو لای خۆی راكێشا و بە یەكگرتن لەگەڵ لایەنە فاشیستەكانی دیكە توانی «فالانخە ئیسپانیۆلا»دامەزرێنێت. بەرنامەی فالانژ، بریتیبوو لە راكێشكردنی چینی كرێكار بۆ هەناوی ناسیۆنالیزمێكی توندڕەوانەی كۆمەڵایەتی (بە مەبەستی خۆماڵی كردنی سەرمایە، چاكسازی زەوی وزار، پەرەپێدان و رێكخستنەوەی سوپا و هەڵوەشاندنەوەی حیزبە سیاسییەكان و شێوازی شۆڕشگێڕانە بۆ گەیشتن بە ئامانج).

فالانژیستەكان لە سەردەمی شەڕی ناوخۆ (١٩٣٦ تا ١٩٣٨) بە توندی رووبەڕووی حیزبە كۆمۆنیست و ئانارشیست و میانەڕەوەكان بوونەوە و هەوڵیان دا حیزبەكەی خۆیان سەقامگیر بكەن. جیاوازی نێوان فاشیزمی ئیسپانیا لە گەڵ فاشیزمی ئەڵمانیا و ئیتالیا، لەوەدا بوو كە لە ئیسپانیا سوننەتی نەتەوەیی و بە تایبەت نەریتی پادشایی و مەسیحی، بایەخ و گرنگی زیاتری پێ ئەدرا. ئیمڕۆكە زاراوەی فالانژ، لە وڵاتانی دیكە بەو گرووپە راستە توندڕەوانە دەگوترێ كە لە بەرامبەر باڵی چەپدا دژایەتی و گێرەشێوێنی دەكەن، بۆ نموونە فالانژەكانی لوبنان.

**فاناتیسیزم:** بڕوانە كوێرباوەڕی.

**فراكسیۆن/كوتلە** فراكسیون Fraction

فراكسیۆن لە وشەی لاتینی fracito و fractum بە واتای وردكراو وەرگیراوە و لە رووی زمانزانییەوە بە واتای پاژێك یا كەرتێكی بچووك لە گشتێك هاتووە. لە زاراوەی سیاسیدا بە گرووپێك یا باڵێك دەڵێن كە لەناو رێكخراوە یا حیزبێكی سیاسی یا پەرلەمان، چالاكی دەكات و ئەندامەكانی پێكەوە لە بابەت چۆنییەتی جێبەجێكردنی بەرنامە و پلانەكانیان راوێژ و گفتوگۆ دەكەن. فراكسیۆنر fractionnaire بە كەسێك دەگوترێ كە لە بەرامبەر رێبازی گشتی رێكخراوەیەك، تیۆری و بیروڕای جیاواز ئاراستە دەكات.

**فراماسۆنری/ماسۆنی** فراماسونری Freemasonary

ئەم زاراوە لە وشەی فرانماسۆن وەرگیراوە كە لە زمانی فەرەنسیدا بە واتای *وەستای خانوو* مانا كراوەتەوە. لە سەدەكانی ناوەڕاست كە لە ئەوروپا بیناكردنی كڵێسە شتێكی باو بووە، وەستای خانووەكان لە شارەوانی و دەسەڵاتدارانی ئەوكات داوایان ئەكرد زۆردارانی كۆمەڵگای فیۆدالی بێ شەرت وبەرات كاریان پێ نەكەن و بۆ ئەوەی داواكارییەكەیان بچەسپێنن، رێكخراوەیەكیان بە ناوی فراماسۆن (وەستای ئازاد

PDF 4 KURD

بەننایەك كە بێ حەقدەست و مووچە كار ناكات) پێكهێنا. لەم ڕێكخراوەدا جگە لە ڕاهێنانی وەستای خانووەكان، هەوڵیان دەدا نهێنییە پیشەییەكانی خۆیان بشارنەوە و كەس تێیان نەگات. پاش سەرهەڵدانی ڕێنسانس دروستكردنی كڵێسە كۆتایی پێ هات و فراماسۆنری لەباو كەوت.

ئینجا لە سەدەی ١٨، كەسانێك كە هیچ پێوەندییەكیان بە وەستای خانوو نەبوو، دەزگای فراماسۆنیان سەرلەنوێ زیندوو كردەوە كە پێیان وابوو ئەم ڕێكخراوە بۆ پتەوكردنی بنەما ئەخلاقییەكان و تەبایی و برایەتی دامەزراوە. یەكەم ژووری فراماسۆنری لە ساڵی ١٧١٧ لە بریتانیا بە مەبەستی گوێڕایەڵی موتڵەقی فەرمانڕەواكان و پاراستنی نهێنییەكان پێكهات. ئینجا داگیركەرانی بەریتانی، ڕێكخراوەی فراماسۆنرییان هێنایە خزمەت سیاسەتی داگیركارانە و پەرەپێدان بە قەڵەمڕەوی ئیمپراتۆریەتی خۆیان لە خاكی وڵاتانی ژێردەست و لە هەركام لەم وڵاتانە لقێكی ئەم ڕێكخراوەیان دامەزراند. ڕێبازی سەرەكی فراماسۆنرەكان لە وڵاتانی ژێردەست و دواكەوتوو بریتی بوو لە دواخستنی گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەكان و هێوركردنەوەی ڕەوتی فراژووتن و بە لاڕێ بردن و لەباربردنی بزاڤە سیاسی و كۆمەڵایەتییەكان بۆ دابینكردنی بەرژەوەندییەكانی خۆیان.

فراماسۆنری دەورێكی كاریگەری هەبووە لە هێنانە سەركاری حوكمەتگەلی دیكتاتۆری لە ژێر لەفافەی دیموكراسی و سەقامگیری ئابووری لە وڵاتانی دواكەوتوودا. ڕێكخراوەی فراماسۆنری، نزیكەی ٦ ملیۆن كەس ئەندامی هەیە كە لەم ڕادە چوار ملیۆن كەس لە وڵاتەیەكگرتووەكانی ئەمریكایە و یەك ملیۆن لە دوورگەكانی بریتانیا و پاشماوەكەشی لە وڵاتانی دیكەی جیهاندا بڵاو بوونەتەوە.

## فرانشیز/ ماف دەنگدان — فرانشیز/حق رای — Franchise

فرانشیز لە وشەی franc بە واتای قسەلەڕوو(لەڕوو دانەماو)، كەسێك كە بیروڕای خۆی نەشارێتەوە وەرگیراوە. زاراوەی فرانشیز بە واتای زێدەماف(امتیاز)، ماف ئازادكردن و ماف دەنگدان بە تایبەت بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی بەكار براوە. فرانشیز لە سەدەكانی ناوەڕاستدا بەو یاسایە دەگوترا كە بەو پێیە كۆیلەی بەردەستی میران، دەیانتوانی بە ئازادی و بێهیچ گرفتێك لە ژێر ركیفیان دەربچن و بۆ هەر جێگایەك كە دەیانویست بڕۆن. نامەی فرانشیز، لەمەڕ ئازادی كۆیلەكان لە سەدەی یازدە لە ئیتالیای باكوور، ئەڵمانیا و باكووری فەرەنسا نەریتێكی باو بووە. دەرەنجامی ئەم ڕەوتە پێوەندییەكی ڕاستەوخۆی هەبوو لەگەڵ پێشكەوتنی ئابووری شارەكان لە سەدەی ١١و١٢ ی زایینی. لە سەدەكانی ناوەڕاستدا زاراوەی فرانشیز لە یاساكانی بریتانیا بەكاردەهات كە بریتیبوو لەو زێدەمافە كە پادشا بە یەكێك لە هاوڵاتیانی خۆی دەبەخشی. ئەم زاراوە لە یاسا نێودەوڵەتییەكاندا بە واتای پارێزراویی بەكاردێت بە تایبەت پاراستنی دیپلۆمات و نوێنەرانی سیاسی وڵاتەكان و باج و گومرگ: بۆ نموونە فرانشیزی نیشتەجێ بوون (واتە پاراستنی شوێنی ژیانی دیپلۆمات) یا فرانشیزی باج (واتە لێخۆشبوون لە باج) یا فرانشیزی دەنگدان (واتە ئازادی ماف دەنگدان).

PDF 4 KURD

**فرەجەمسەریی** چند قطبیت multipolarity

لە دوای سەرهەڵدانی چین و ژاپۆن و ئەورووپای رۆژاوا وەك هێزێکی جیهانی و دەرکەوتنیان لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا مۆدێلی دوو جەمسەری سیاسەتی جیهانی کە بنەمای سیاسەتەکانی ئەمریکا لە ساڵەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ بوو، جێگای خۆی دا بە مۆدێلێکیتر کە بە فرەجەمسەری ناوی دەرکردووە. تاکوو پێش کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، دوو زلهێزی ئەمریکا و سۆڤیەت نەبێ کە خاوەنی هێزی ئەتۆمی بوون، ئەم چەن هێزەیتر، زیاتر وەك دەسەڵاتێکی ئابووری و سیاسی ناویان دەرکردبوو ئەمێستا دوای شەڕی سارد و لاوازبوونی رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، جیهان بەرەو دۆخێکی *تاك جەمسەری** مەیل ئەکات.

**فرەدەنگی سیاسی** کثرت گرائی سیاسی Political Pluralism

١ـ هەبوونی دەنگی جۆراوجۆر و بە رەسمییەت ناسینی گرووپی سیاسی، کۆمەڵایەتی، کولتووری و ئابووری جۆربەجۆر لە کۆمەڵگا یان کەشوهەوایەك کە تێیدا هیچ گرووپێکی سیاسی، کەلتووری، ئایینی و ئەتنیکی تایبەت، دەسەڵات قۆرخ نەکات.

٢ـ بڕوا هێنان بەوەی تاك، خاوەنی حەز و عیلاقاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئایینی جۆربەجۆرە و دەبێ لە لایەن حوکمەتەوە بەهەند بگیردرێ و دەسەڵات لە نێوان بۆچوون و لایەنە سیاسییەکان دابەش بکرێت. ئەم قوتابخانە لە سەربەخۆیی دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کۆمەڵگا لە بەرامبەر دەسەڵاتی حوکمەت پشتگیری دەکات تاکوو حوکمەت نەبێتە دەسەڵاتێکی رەها و دوور لە بەرپرسایەتی.

٣ـ فەلسەفەیەکی سیاسی کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە لایەن لیبراڵ و سۆسیالیستە ئینگلیزییەکان ئاراستەکرا کە پێی وایە دەبێ دەسەڵات لە نێوان لایەن و دەزگا کۆمەڵایەتییەکان دابەش بکرێت و کۆمەڵگا بە تەواوەتی نەچێتە ژێر رکێفی چین یان یەکەیەکی سیاسی تایبەتەوە.

**فۆرماسیۆن:** بڕوانە پێکهاتن.

**فۆرمالیزم/روکەش پەرستی** فورمالیسم/ ظاهرپرستی Formalism

ئەم زاراوە کە بە باوەڕی مارکسیەکان لە بەرامبەر ریالیستی سۆشیالیستیدا بەکار براوە، ئاماژەیە بۆ سەرنجی لەڕادەبەدەر بە شکڵ و شێواز یا بڕوایەکی قووڵ بە پاراستنی رواڵەتی شتەکان لە بواری ئایینی و ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا. فۆرمالیزم یا روکەش پەرستی، شێوازی ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە گرنگی بە رواڵەتی رووداوەکان و لایەنی تەشریفاتی کارەکان دەدەن و هەوڵ ئەدەن تا کێشە و بابەتەکان لە رووی رواڵەت و نەریتەوە بە شێوازێکی لەبار و گونجاو بخەنە بەرچاو.

PDF 4 KURD

لە بواری سیاسییەوە فۆرماڵیست بەو کەسانە دەگوترێ کە بایەخ بە ناوەرۆکی بابەتەکان نادەن و رواڵەتپارێزی و تەشریفاتی کارگێڕیی و یاسایی لەسەرووی هەموو شتێکەوە دادەنێن. زاراوەی فۆرمالیزم، هەنووکە پتر لە کاروباری ئایینی و کۆمەڵایەتیدا بەکاردێت و بە تایبەت زاراوەیەکی ئەدەبی لە ئەژماردێت.

**فەتح** الفتح Fatah / Fath

گەورەترین رێکخراوەی نەتەوەیی فەلەستینییە. ئەم وشە کە واتای سەرکەوتن دەبەخشێ، لە خوێندنەوەی پێچەوانەی پیتی یەکەمی دێڕی (حركة التحرير الوطني الفلسطيني) پێکهاتووە. بیرۆکەی دروستبوونی ئەم رێکخراوە پاش هێرشی ئیسراییل بۆ سەر غەززە لە ١٩٥٥/٢/١٧ هاتە ئاراوە. فەتح تا سەرەتای ساڵی ١٩٦٥ هەر بە نهێنی مایەوە و لەم ساڵەدا باڵی چەکداریی خۆی بەناوی (العاصفه) بە دەرکردنی بەیاننامەیەک ئاشکراکرد. هێزە چەکدارەکانی فەتح بەزۆری لەو فەلەستینیانەی وڵاتە عەرەبەکان و ئاوارەکانی ئۆردووگای ئەردەن و سووریا پێکهاتبوون. ئەم رێکخراوە لەرێی کۆمیتەیەکی نهانییەوە خەریکی سیخوڕی و تیرۆر بەدژی ئیسراییل و تۆڵەستاندنەوە لە رەقیبە عەرەبەکانی بوو. فەتح پاش جەنگی الكرامه لە ١٩٦٨/٣/٢١ متمانەی خۆی بە یاسر عەرەفات (ابو عمار) وەك گوتەبێژی رێکخراو بەخشی و بە بەشداریکردنی فەتح لە ئەنجومەنی فەلەستینی، عەرەفات بوو بە سەرۆکی دەستەی راپەڕاندنی *رێکخراوی رزگاری‌خوازی فەلەستین**.

پاش جەنگی شەش رۆژەی ساڵی ١٩٦٧ی عەرەب ـ ئیسراییل کە لە ئەنجامدا عەرەبان تێکشکان و ئیسراییل لێواری رۆژاوای رووباری ئەردەنی داگیر کرد، فەتح بۆ ناو سنوورەکانی ئەردەن پاشەکشەی کرد و لە ساڵی ١٩٦٩ هێرشی کردە سەر ئیسراییل. فەتح داوای دامەزراندنی دەوڵەتی دیموکراتی فەلەستینی دەکرد بە جۆرێك پاش لەناوبردنی ئیسراییل، هەموو هاووڵاتیان بێ جیاوازی رەنگ و رەگەز و ئایین تێیدا یەکسان بژین.

فەلەستینییەکان لە ساڵی ١٩٧٠ هەوڵیان دا شاحسەین (شای ئوردون) لەسەر کار لابەرن بەڵام ئوردون لە سێپتەمەری ئەوساڵەدا کە بە سێپتەمەری رەش ناوی دەرکرد، هەستا بە سەرکوتکردن و دەرکردنی فەلەستینیەکان لەو وڵاتە و بزووتنەوەی فەتح بەناچار پەنای بردە بەر لوبنان و لەوێ درێژەی دا بە چالاکییەکانی خۆی. لە ساڵی ١٩٧٢ فەتح هەستا بە تیرۆر کردنی یاریزانەکانی تیپی ئۆلەمپی ئیسراییل لە مونیخی ئەڵمانیا، هەروا چالاکییەکانی خۆشی دژ بە ئیسراییل بەردەوام کرد.

فەتح پاش رێککەوتنی ئاشتی ئۆسلۆ لە ساڵی ١٩٩٣ لەگەڵ ئیسراییل و زنجیرەیەك هەوڵ و کۆششی نێودەوڵەتی، ئێستا رازی بووە بە دامەزراندنی دەوڵەتی فەلەستینی لە کەرتی غەززە و کەناری رۆژاوای رووباری ئوردون لە بەرامبەر داننانی بە ئیسراییلدا. بەڵام کێشەکانی نێوانیان هەر بە هەڵپەسێردراوی ماوەتەوە و یەکلا نەبۆتەوە. پاش کۆچی دوایی یاسر عەرەفات لە ٢٠٠٤/١١/١١، لە هەڵبژاردنی ٢٠٠٥/١/٩ مەحمود عەبباس (ابومازن) کرایە سەرۆکی فەلەستین و سەرۆکی فەتح. بەڵام بە هۆی ناکارا بوون...

PDF 4 KURD

حوکمەتە و نادیاربوونی مافەکان و چارەنووسی فەلەستینیەکان و پەککەوتنی ئابووری لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا لە هەڵبژاردنە گشتییەکانی ۲۰۰٦/۱/۱٥ ڕێکخراوەی حەماس* (بزاڤی خۆڕاگری ئیسلامی) توانی لە سەرجەم ۱۳۲ کورسی پەرلەمان، ۷۲ کورسی بباتەوە و بەم جۆرە دەوڵەتی نوێی فەلەستینیەکان دابمەزرێنێ. دوابەدوای سەرکەوتنی حەماس، ئیسراییل و وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ـ بە هۆی ماهییەتی تیرۆریستی ئەم ڕێکخراوە ـ یارمەتییەکانی خۆیان بۆ خەڵکی فەلەستین ڕاگرت و ئیسراییل بۆ پێوەندی گرتن لە گەڵ حوکمەتی نوێی فەلەستینی، سێ مەرجی دیاری کرد کە بریتیبوون لە:

- دەبێ لقی چەکداری حەماس خۆی لە چەك داماڵێ.
- مادەی «لەناوبردنی ئیسراییل» لە پلاتفۆرمی حەماسدا نەمێنێ.
- هەموو ڕێککەوتنەکانی نێوان حوکمەتی فەلەستینی و ئیسراییل بەهەند بگرێت.

## فەرمانڕەوایی/سەروەریی — حاکمیت — Sovereignty

فەرمانڕەوایی لە تیۆری سیاسی کلاسیکدا بە مانای باڵاترین دەسەڵاتی دەوڵەتە کە ڕەنگە لە کەسێکدا(وەك پادشایەکی ڕەها) یان کۆمەڵێکی خەڵکیی(وەك پەرلەمان) کۆببێتەوە. ئەم فەرمانڕەواییە بە واتای یاسادانەر و بەڕێوەبەرە و دەسەڵاتێکی باڵاتر لەوە نییە. فەرمانڕەوایی بریتییە لە: ۱) ئازادی یاسادانان و کلك و گوێ قرتاندنی یاساکان بە پێی سیستەمی یاسایی وڵات(چاکسازی). ۲) دەسەڵاتی سیاسی و ئەخلاقی دەوڵەت، لەم ڕووەوە کە لە قەڵەمڕەوی خۆیدا وەك «دەسەڵاتی یاسایی» لە ئەژمار دێت.
۳) سەربەخۆیی سیاسی و دادپەروەرانەی کۆمەڵگایەك.

لە کۆمارییەکان، فەرمانڕەوایی بە شتێکی خەڵکی ناوبردە ئەکرێ. سەروەریی وڵاتێك لە ناو سنوورەکانی خۆیدا جێبەجێ ئەکرێت. فەرمانڕەوایی، هێمایێکە بۆ بڕیاردانی سەربەخۆی نەتەوەکان. کەواتە فەرمانڕەوایی لە گەڵ شێوازی چەقبەستووی ڕێکخراوەیەکی حوکومی جیهانیدا جیاوازە.

فەرمانڕەوایی بە دوو جۆر لە ئارادایە: ناوخۆیی و دەرەکی. فەرمانڕەوایی ناوخۆیی بریتییە لەو دەسەڵاتەی کە هەر دەوڵەتێك بەسەر هاووڵاتییەکانی خۆی یان خەڵکی بێگانە کە لەو وڵاتە بژین و ناو پاپۆڕەکانی لە دەریای ئازاد پیادەی ئەکات. ئەم جۆرە فەرمانڕەواییە خۆی دوو لقی لێئەبێتەوە: سیاسی و دادپەروەری. فەرمانڕەوایی سیاسی، باڵاترین هێز و دەسەڵاتێکە کە لە کۆمەڵگادا باڵادەستە. فەرمانڕەوایی دادپەروەرانە، هێزێکی چالاکە بۆ چاودێریی کردن بە سەر دادگاکانا.

فەرمانڕەوایی دەرەکی، بریتییە لە مافی پێوەندی گرتن لە گەڵ دەوڵەتانی دیکە یان مۆرکردنی ڕێککەوتنامە و ڕاگەیاندنی شەڕ.

ئێستاکە فەرمانڕەوایی هیچ دەوڵەتێك بە تەشکێکی ڕەها لە ئارادا نییە. چونکا هەندێ یاسا و مافی نێونەتەوەیی، بۆ وێنە مافەکانی مرۆڤ پەسند کراون کە فەرمانڕەوایی دەوڵەتەکان بەربەست ئەکات بەڵام بەپێی نەریتی نێونەتەوەیی، دوو بنەڕەتی فەرمانڕەوایی نەتەوەیی و دەست نەبردنە ناو خاکی ئەوی‌ت

PDF 4 KURD

قەڵەمڕەوی یەکتر، وەك پرەنسیپێکی ئەخلاقی و سیاسی پەسند کراوە. فەرمانڕەوایی نەتەوەیی بە مانای ماف گرووپێکی نەتەوەیی یا نەتەوەیەك بۆ بەدەستهێنانی خودموختاری* و هەڵبژاردنی سەربەستانەی دەوڵەت بۆ خۆیانە.

**فەلسەفەی سیاسی** فلسفەی سیاسی Political philosophy

فەلسەفەی سیاسی، نەك بە واتای مێژووی ئەندێشە سیاسییەکان بەڵکوو بە مانای بیرکردنەوە لە سیاسەت بە شێوەیەکی فەلسەفی بریتییە لە تێگەیشتن و روونکردنەوەی ماهییەت و سروشتی حوکم کردن و فەرمانکردن، پەیڕەوبوون و ملکەچکردن، پێویستیی و غایەتی دەوڵەت و کۆمەڵگا، هۆی وجوودیی دەوڵەت و باشترین شێوازی رێخستنی ژیانی سیاسی مرۆڤ بە مەبەستی دابینکردنی ئامانجە سەرەکییەکان واتە عەداڵەت و ئازادی. هەر کام لە قوتابخانە سیاسییەکان، بە رێبازی تایبەتی خۆیانەوە خەریکی روونکردنەوەی ئەم مەسەلانە بوون. بۆ وێنە لەنگەرگرتن لەسەر بەڵگاندنیی ئەقڵی لە فەلسەفەی سیاسی ئەرەستۆ، بەڵگاندنی لۆژیکی و ئینتزاعی لە فەلسەفەی سیاسی تۆماس هۆبز، ئەقڵی سەلیم و مافەسروشتییەکان لە فەلسەفەی سیاسی جۆن لاك و جەخت کردن لە سەر ئەقڵی گشتی لە فەلسەفەی سیاسی هێگڵ لە جوملەی مێتۆدە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی لەئەژمار دێن.

فەلسەفەی سیاسی، سەرقاڵی وەڵامدانەوە بە پرسیارگەلێکە لە بارەی حوکمەت، هاوولاتی(شارۆمەند) و دەوڵەت و زۆر ناچێتە ناو ناخی حوکمەتێکی تایبەت و خۆی لە شێوازەکانی فەرمانڕەوایەتی نادات. ئەو پرسیارانەی کە فەلسەفەی سیاسی وەڵامیان ئەداتەوە، بریتین لە: بۆچی مرۆڤ ئەبێ پەیڕەوی حاکمییەتی وڵاتەکەی خۆی بێت؟ ئایا جگە لە ترس، هۆکارێکیتر هەیە بۆ ئەم پەیڕەوکردنە؟ ئایا ئێمە پێویستمان بە دەوڵەتەکان هەیە، یان بە بێ ئەوان دۆخێکی باشترمان ئەبێت؟ ئازادی چییە؟ هاوولاتیان، ئەبێ تا چ رادەیەك لە ئازادی بەهرەوەر بن؟ یەکسانی و *عەداڵەت** چییە و ئایا شتێکی پەسند کراوە؟

فەلسەفەی سیاسی، لە سەر بنەمای ئەم گریمانە سروشتییانەی ئینسان دارێژراوە کە چوار تەوەر لە خۆ دەگرێ: یەکەم، ئایا مرۆ خۆبەخۆ، بوونەوەرێکی تاکباوەڕە یان باوەڕی بە کۆمەڵە؟ دووهەم، ئایا مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسی(مەدەنی)یە یا ناسیاسی و غەیرەمەدەنی؟ سێهەم، ئایا مرۆڤ خۆبەخۆ بوونەوەرێکی ئەقڵانی و سەربەستە یان بێئاوەز و مەجبوورە؟ چوارەم، ئایا لە راستیدا مرۆڤ رووەو فراژوتنە یان بەرەو پووکانەوە و تیاچوون؟

فەلسەفەی سیاسی، باسەکانی ماهییەت و سەرچاوەی دەوڵەت گرێ ئەداتەوە بە بایەخ و غایەتەکانی ژیانی سیاسی مرۆڤ و باشترین شێوازی حوکمەت. لەم روانگەوە تێڕامان لە بارەی باشترین شێوازی حوکمەتکردن ئەبێتە گرینگترین مەسەلەی فەلسەفەی سیاسی.

لەبارەی بەنرخترین بەرهەمەکانی بواری فەلسەفەی سیاسی، ئەکرێ ئاماژە بدەین بە کتێبی **کۆمەڵگای** کراوە و دوژمنەکانی کە لە لایەن کارڵ پۆپێر لە کاتی شەڕی جیهانی دووهەم، (١٩٤٥) نووسرا،

PDF 4 KURD

کتێبەدا ئەندێشەکانی چوار فەیلەسوفی گەورەی سیاسی واتە پلاتۆ، ئەرەستۆ، هێگل و مارکس کەوتوونەتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. کتێبێکی‌تر لەم بابەتە، کتێبی **تیۆرییەك دەربارەی عەدالەت**، نووسینی جۆن ڕاڵزە کە لە ساڵی ١٩٧٢، بڵاو کرایەوە. ڕاڵز، تیۆرییە سیاسییەکەی خۆی لە سەر دوو بنەما ئاراستە دەکات: یەکەم، ئەوەیکە ئەبێ هەمووان بە باشترین شێوە لە ئازادییە سەرەکییەکان بەهرەوەر بن. دووهەم، جیاوازی سەروەت و دارایی تا شوێنێك چاوپۆشی لێئەکرێ کە بە قازانجی هەژارترین توێژی کۆمەڵگا تەواو بێت.

بەگشتی ئەکرێ بڵێین، گرێ کوێرەی فەیلەسووفانی سیاسی، پەیجۆری و بنگیری بنەمایێك بووە بۆ عەدالەت یان قانوونێکی یەکسان بۆ کۆمەڵگا. کێشەی فیلسووفانی سیاسی لە سەر چەمکی عەدالەت ئەگەڕێتەوە بۆ سێ مانای جیاواز کە لێی بۆتەوە. هەندێك عەدالەتیان بە یەکسانی لە قەڵەم داوە و هەندێ لەبەرچاوگرتن و ڕەچاوکردنی لێهاتوویی و شایستەبوون بە مەرجی عەدالەت ناوبردە ئەکەن، هەندێکیش دابینکردنی پێداویستییەکان بە پێودانگی عەدالەت ئەژمێرن.

## فیدراسیۆنی جیهانی یەکێتییە کرێکارییەکان

فدراسیون جهانی اتحادیه‌های کارگری

(World Federation of trade Unions (WFTO

ئەم فیدراسیۆنە یەکێك لە گەورەترین ڕێکخراوەکانی کرێکاری جیهانە کە لە ساڵی ١٩٤٥ لە لایەن یەکێتییە کرێکارییەکانی ٥٤ وڵاتی جیهان بۆ وێنە ئەمریکا و بریتانیا و یەکێتی سۆڤیەت لە پاریس دامەزراوە. بەڵام هەندێ لە یەکێتییە کرێکارییەکانی ئەمریکا بەو بیانووەی کە لە یەکێتییە کرێکارییەکانی سۆڤیەتدا ئازادی ڕاستەقینە لەبەرچاو ناگیردرێ، لەم فیدراسیۆنەدا بەشدارییان نەکرد.

بەهۆی دروستبوونی ناکۆکی ئایدیۆلۆجیایی لە نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و بلۆکی ڕۆژاوا لە ژانوییەی ١٩٤٩، یەکێتییە کرێکارییەکانی ئەمریکا و بریتانیا و چەند وڵاتێکی‌تر بە تەواوەتی لەم فیدراسیۆنە وازیان هێنا و هەر لەو ساڵەدا «کۆنفیدراسیۆنی نێودەوڵەتی کرێکاری ئازاد»یان پێكهێنا کە زۆربەی یەکێتییە کرێکارییەکانی وڵاتانی ناکۆمۆنیست تێیدا بوون بە ئەندام.

## فیدرالیزم فدرالیسم Federalism

ئەم زاراوە لە وشەی لاتینی foedus بە واتای «یەکگرتن» وەرگیراوە و لە زاراوەی سیاسیدا پێناسەی جۆراوجۆری لەسەر کراوە بەڵام بەکورتی دەتوانین بەم چەشنە پێناسەی بکەین:

ڕێکخستنێکی سیاسی و دەستووریی ناوخۆیی‌یە کە بەو پێیە دەوڵەتانی ئەندام یا هەرێمەکان، بەشێك لە حاکمییەت (سەروەریی) خۆیان بە مەبەستی دامەزرانی وڵاتێکی بەهێز دەسپێرنە یەکەیەکی ناوەندی و بەمجۆرە دەبنە پەیڕەوی دەوڵەتی فیدراڵ. ئەم ڕێکخستنەش دوو ڕەهەند لەخۆ دەگرێ: ڕەهەندی دەرەکی کە دەوڵەتی فیدراڵی وەك یەك دەوڵەت لە بواری سەروەری دەرەکیدا بە دیاردەکەوێ و ڕەهەندی ناوخۆیی کە

PDF 4 KURD

بریتییەلە چەند کیانێکی دەستووری و حوکمەتی فیدرالیش لە پراکتیزەکردنی سەروەری ناوخۆییدا بەشداری دەکات.

لە پێناسەیەکی‌تردا فیدرالیزم، بریتییەلە یەکگرتن و رێکخستنێکی سیاسی کە بەو پێیە کۆمەڵێك یەکەی سیاسی لێك جودای ناو سیستەمێکی گردوکۆ، پێکەوە گرێ ئەدا و بە هەرکامێك لەو یەکە سیاسییانە مەجال ئەدات، یەکپارچەیی و هەمەگییەتی خۆیان بپارێزن. هەروەها دەکرێ فیدرالیزم بە دابەش‌کردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای یاسا لە رێگای سیستەمێك کە ئۆتۆنۆمی*و سەروەریی هاوبەش گرێبەست دەکات، پێناسە بکرێت.

لە سیستەمی فیدرالیدا رێبازە سەرەکییەکان لە رێگای گفتوگۆ دائەرێژرێن پاشان جێبەجێ دەکرێن تاکوو هەموو ئەندامانی گۆمەڵگا لە دەرکردنی بڕیارەکان و پیادەکردنیان، بەشدار بن. «دامەزرێنەرانی ولاتە یەکگرتووەکان» کە دەستووری بنچینەیی ئەم ولاتەیان لە ساڵی ۱۷۸۷ پێشنیاز کرد، ئەم شێوازەیان بە فیدراسیۆن داهێنا. تا ئەو کاتە پێناسەی پەسندکراوی فیدرالیزم، هەمان پێناسەیەك بوو کە ئیمڕۆکە پێی دەگوترێ *کۆنفدراسیۆن*. دواتر چوارچێوەی ئەم سیستەمە هەموو بەشەکانی‌تری ئەم ولاتە پان وبەرینەی گرتەوە و بەپێی ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە دواتر هاتەدی، ئەو سیستەمە فیدرالییە پێکهات کە ئێستا پەنجا ئەیالەتی لەخۆ گرتووە. سیستەمی فیدرالی، وەك فۆرمێکی سیاسی گونجاو بەرەبەرە لە هەندێ لە ولاتانی دیکەش هاتە ئاراوە. ئەم سیستەمە لە ساڵی ۱۸٤۸ لە سویسرا و لە ساڵی ۱۸٦۷ لە کەنەدا و دواتریش لە ۱۸۹۷ لە ئوسترالیا پیادە کراوە. ئیمڕۆکە فیدرالیزم شێوازێکی باوە بۆ رێکخستنی سیاسی. لە ساڵی ۱۹۹۳ بەملاوە، لانیکەم ۱۹ ولات بە شێوەی فیدرالی ئیدارە دەکرێ و ۲۱ ولاتی دیکەش لە بنەماکانی فیدرالی کەڵکیان وەرگرتووە و بەرەو سڕینەوەی چەقی سیاسی و لابردنی ناوەندێتی ئیداری هەنگاویان ناوە. لەم رووەوە فیدرالیزم وەك «دایکی دیموکراسی» لە قەڵەم دراوە. بە پێی ئەو ئەزموونانەی کە لە ئارادایە سیستەمی فیدرالی بە دوو جۆر دروست دەبێ کە بریتین لە:

۱ـ فیدرالی بەکۆمبوون یا پێکەوە لکان. لەم شێوازەدا چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ یەکدەگرن یا پێکەوە دەلکێن و یەك دەوڵەت لە سەرووی دەوڵەتانی ئەندامەوە درووست دەکەن. نموونەی ئەم شێوازە فیدرالییە، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سویسرا، کەنەدا و ئەفریقای باشوورییە.

۲ـ فیدرالی بە دابەشبوون. لەم شێوازەدا دەوڵەتی ئاسایی یا یەکبوو، بەسەر چەند دەوڵەت یا هەرێمێك دابەش دەکرێت و دەبێتە دەوڵەتێکی لێکدراو. بۆ نموونە ولاتانی یەکیەتی سۆڤیەتی(پێشوو)، بەرازیل، ئەرجەنتین، مەکزیك، هیندستان و مالیزیا. دەوڵەتی فیدرالی، جگە لەو شێوازە گشتیانەی کە دەبنە هۆی کۆتایی هاتنی دەوڵەت، بەم دوو شێوازەی خوارەوەش کۆتایی پێ دێت:

۱ـ جیابوونەوەی هەر یەك لە هەرێمەکان و بوونیان بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

۲ـ گۆڕینی دەوڵەتی فیدرالی بە دەوڵەتێکی یەکبووی سادە.

بنەماکانی سیستەمی فیدرالی، لەم ٦ خاڵەی خوارەوەدا بەرجەستە دەبێت:

PDF 4 KURD

١ـ دەسەلات لە نێوان هەرێمەکان و حوکمەتی یەکگرتوو دابەش دەبێت.

٢ـ بەرەو دیموکراسی دەڕۆن. ٣ـ لە ڕێگەی گفتوگۆی ئاشکراوە رەفتار دەکەن.

٤ـ دەستووری نووسراویان هەیە. ٥ـ سەقامگیریی یەکەکانی دەسەلات بەپێی دەستوور لە حوکمەتدا پاوەجێ دەبێت.

٦ـ دەستوور، بالادەستە و دادگای دەستووریش پێویستە.

لە سیستەمی فیدرالیدا دادگایەکی بالا بۆ شرۆڤە و لیکدانەوەی یاساکان و چارەسەرکردنی کێشەی هەرێمەکان لە دەوڵەتی ناوەندیدا دابین کراوە. لەم دەوڵەت ـ وڵاتەدا گۆڕینی دەستووری بنچینەیی، دەبێ بە رەزامەندی زۆرینەی هەرێمەکان بە ئەنجام بگات. ئەم سیستەمە لەو وڵاتانەی کە خاوەنی نەتەوە و زمان و ئاینی جیاوازن، لەگوێن باشترین سیستەمی فەرمانڕەوایی و حوکمەتداری لە ئەژمار دێت. پانتایی و رووبەری خاکی وڵاتەکانیش لە ڕێکخستنی دەوڵەت ـ وڵاتی فیدرالیدا دەور دەبینێت. بۆ وێنە وڵاتانێکی وەك ئەمریکا، رووسیا، بەرازیل و هیندستان خاوەنی ئەم تایبەتمەندییەن. بەلام ئەم هۆکارە بۆ گشتاندن نابێت، چونکوو وڵاتانێکی بچووکی وەك نەمسا و سویسرا کە بە شێوەی فیدرالی ئیدارە دەکرێت، ناگرێتەوە.

**فیزیۆکراسی** فیزیو کراسی /مکتب طبیعیون Phisiocracy

زاراوەکە بە واتای لایەنگری کردن لە دەسەلاتی سروشتییە. بەلام وەك قوتابخانەیەك دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدە کە لە لایەن هەندێ زانا و نووسەری فەڕەنسی بنیات نراوە. لایەنگرانی ئەم قوتابخانە لەگەڵ دەستێوەردانی حوکمەت لە کاروباری ئابووری و سروشتیدا دژایەتی دەکەن و ئەم کارە بە زیانبەخش دەزانن. هەروا لەو باوەڕەدان کە هەندێ ڕێسای شایستە لە ناو سروشتی ئابووریدا هەیە کە دەوڵەت و دەسەلاتی یاسادانان نابێ پێشێلی بکەن و پێش بە پەرەسەندنی بگرن چوونکە دەوڵەمەندی و سامان، زادەی سروشت و بنەما کشتوکاڵییەکانە و سەپاندنی هەر جۆرە یاسایەك لەم بارەوە نابەجێ و زیانبەخشە.

**فێمینیزم/مێخوازی** فمینیسم/جنبش آزادی زنان Feminism

فێمینیزم لە وشەی فەرەنسی femme بە واتای ژن وەرگیراوە و مانای لایەنگری کردن لە ژن دەبەخشێ و ناوی بزاڤێکە کە بۆ یەکسانی مافە سیاسی و کەلتووری و ئابووری و کۆمەلایەتییەکانی ژنان و پیاوان هەوڵ دەدات. لە بابەت ئاخێزگەی فێمینیزم لەگوێن ئایدیۆلۆجیایەك، چوار تەوەر لە ئارادایە:

لە سێ تەوەردا مانا پێشتر لە وشەکەیە. ئەم بۆچوونە پێی وایە کە مێژووی فێمینیزم، لە سپێدەی وشیاری مرۆڤەوە دەست پێئەکات. لەم روانگەوە «ئاریشە»ی ژن هیچ کات لێمان جیا نەبۆتەوە و هەندێ کەس پێیان وایە کە جۆری نێرینە، لەباری توانستی ئیکۆلۆژییەوە بالادەست بووە و مێژووی مرۆڤایەتیش بە هۆی بالادەستی پیاوان، بە قەدەر کارەساتێك ڕێگامان لێ ون دەکات.

PDF 4 KURD

بۆچوونی دووهەم و سێیهەم، ئاخێزگەی فێمینیزم دەگەڕێنێتەوە بۆ سەدەی پانزدە و حەڤدە. سەرەنجام بۆچوونی چوارەم کە رەنگە لە هەمووان راستگۆیانەتر بێت، پێشینەی فێمینیزم دەگەڕێنێتەوە بۆ کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە بە تایبەت دوای شۆڕشی مەزنی فرەنسا. گرنگترین رووداو لە مێژووی ئەندێشەی فێمینیستی لە قۆناغی شۆڕشدا بلاوکردنەوەی کتێبی «ماری ڤۆلستۆن کرافت» بوو لە ساڵی ١٧٩٢ بە ناوی ***سەلماندنی مافەکانی ژنان***. میریام کرام، لەم بارەوە دەڵێت: ڤۆلستۆن یەکەمین فێمینیستی گەورەیە و کتێبی سەلماندنی مافەکانی ژن، وەك جاڕنامەی سەربەخۆیی فێمینیزم لە ئەژمار دێت.

نووسراوە فێمینیستیەکان، دوو شەپۆل بۆ رەوتی پێشڤەچوونی ئەم رێبازە ناوبردە دەکەن: شەپۆلی یەکەم (١٨٣٠ تا ١٩٢٠). تایبەتمەندی ئەم شەپۆلە خەبات و تێکۆشانی ژنانە بۆ بە دەست هێنانی ماڤ دەنگدان و یەکسانی ماڤ ژنان لە گەڵ پیاواندا. شەپۆلی دووهەم لە ١٩٦٠ تاکوو ئێستا دەگرێتەوە. خاڵی بەرچاوی ئەم شەپۆلە بریتیەلە پەرەسەندنی پەروەردەی باڵای ژنان لە سەرانسەری ئەوروپا و ئەمریکا و زیادبوونی رێژەی ژنان لە پیشە و کاری جۆراوجۆر و داواکاری بۆ یەکسانی مووچەی ژنان لە گەڵ پیاواندا. بەلام ساڵەکانی نێوان ١٩٢٠ تا ١٩٦٠ بە قۆناغی راوەستان ناونووس کراوە. هەڵبەت هەندێ لە نووسەرانی ئەم دواییانە شەپۆلی سێیهەم، بە فێمینیزمی پۆست مۆدێرنە پێناسە دەکەن. ئەم شەپۆلە کە لە دەیەی ١٩٨٠ دەستی پێکردووە بۆ بزاوتی فێمینیستی، قۆناغی گواستنەوەیە لە بابەتە سیاسی و ئابوورییەکانەوە بەرەو بابەتی کەلتووری و سایکۆلۆژی و زمانەوانی.

فێمینیزم، وەك هەموو ئایدیۆلۆژیایەك دەکەوێتە ژێر کاریگەریی سوننەتە مێژووییەکان و لە گەڵ هەندێ لەم ئایدیۆلۆژیانەدا تێهەڵکێش بووە. ئەزموونی شۆڕشی فرەنسا و گوتارە بەهێزەکەی لە بابەت مافە دیموکراتییەکان، بۆ سەرهەڵدانی بیرۆکەی فێمینستی گەلێك پێویست بووە. کاریگەریی پرۆتستانیزم لەمەڕ هاندانی ژنان بۆ چالاکی کۆمەلایەتی و تێوەگلان لە بابەتە سیاسی و کۆمەلایەتییەکان و کاریگەریی سۆسیالیستە خەیاڵییەکان، بۆ وێنە لایەنگرانی سەن سیمۆن و شاڕۆڵ فۆریە، لەم رێچکەوە ئاو دەخواتەوە.

بزاوتی فێمینیزم، ئێستا وەك بزاڤێکی جیهانی لێ دەرهاتووە. لایەنگرانی ئەم بزاڤە لەسەر ئەم باوەڕەن کە ژنان تەنها بە هۆی «ژن بوون»یان لەو کۆمەڵگایانەی کە لە خزمەت بەرژەوەندی پیاواندایە، تووشی بێعەداڵەتی و نایەکسانی هاتوون. هەر بۆیە بزاوتی لایەنگری لە ماڤ ژنان چەند رێچکەیەکی لێ بۆتەوە کە بە کورتی بریتین لە:

١ـ لایەنگرانی لیبرالی مافەکانی ژنان. ئەمانە بێعەداڵەتی مەدەنی و دەرفەتە پەروەردەییەکان بە سەرچاوەی زۆر و ستەم بەسەر ژنان دەزانن و خەبات لە پێناو بەدەست هێنانی ئازادییەکانی تاکەکسی ژنان، بە مەبەستی خۆیان ناوبردە ئەکەن.

٢ـ لایەنگرانی رادیکالی مافەکانی ژنان. ئەمانە پێیان وایە کە هەرچی زۆر و ستەم بەسەر ژنان دێت، دەگەڕێتەوە بۆ خۆبەزل زانی و بالادەستی پیاوان و لەم رێگەدا هەوڵ ئەدەن کۆمەڵگای پیاو- مەزنایەتی بگوازنەوە بۆ کۆمەڵگایەکی ژن - مەزنایەتی.

PDF 4 KURD

٣ـ لایەنگرانی مارکسیستی مافەکانی ژنان. ئەمانیش هۆی ئەو کۆت و بەندانەی کە لە ملی ژناندایە، دەگەڕێننەوە بۆ شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و جیاکردنەوەی ئیش و کار لە ماڵەوە کە بۆتە هۆی دابەشکاریی سێکسی. ڕێگاچارەی ئەم گرفتەش گۆڕینی ئابووری زاڵ بەسەر کۆمەڵگا دەزانن.

٤ـ لایەنگرانی سۆشیالیستی مافەکانی ژنان. ئەم ڕێچکە، ڕیشەی زۆر و ستەم بەسەر ژناندا لە سیستەمی ئابووری سەرمایەداری دەبینێ کە بۆ مانەوەی خۆی، کرێکارەکان بە تایبەت ژنان وەبەردەهێنێ. لەم ڕوانگەوە، هەم خاوەندارێتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و هەم شێوازی ژیانی کۆمەڵایەتی پێویستی بە گۆڕانی بنەڕەتی هەیە.

## فیۆدالیزم/دەرەبەگایەتی فئودالیسم/ملوك‌الطوايفی Feudalism

ئەم زاراوە لە راستیدا قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووی وڵاتانی ئەوروپییە (سەدەی ٩ تا ١٣ زایینی). فیۆدالیزم، سیستەمێکی کۆمەڵایەتییە کە تێیدا دەسەڵاتی سیاسی لەنێوان موڵکدارە گەورەکان دابەش بووە و بنەماکانی ئەم سیستەمە بەسەر ئابووری گوندیی و پێوەندی ئاغا و رەعیەت دامەزراوە. ئەرباب یا فیۆدال بە تەواوەتی بەسەر موڵك و زەوی وزار و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی رەعیەتەکاندا زاڵ بوو. ئەم زەوی وزارانەش بەزۆری لە لایەن پادشای ئەو سەردەمەوە بە فیۆدالەکان دەدرا ئەمانیش لە بەرامبەر سوود وەرگرتن لەم زەوییانە ناچاربوون لە کاتی پێویست بۆ پاراستنی وڵات و کاروباری سەربازی لەناو رەعیەتەکانی خۆیاندا کۆمەڵێك جەنگاوەر بۆ پادشا دابین بکەن. فیۆدالەکان لە چوارچێوەی کاری خۆیاندا دەسەڵاتێکی بەرفراوانیان بووە و لە کاروباری ئابووری و رامیاریدا سەربەخۆیی تەواویان هەبووە. جگە لەوەش لایەنگرییان لە رەعیەتەکانی خۆیان دەکرد.

سەرهەڵدانی فیۆدالیزم لە ئەوروپا ئەگەڕێتەوە بو پاش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری شارلمانی لە ٨١١ تا ٧٤٢. پاشان هێزە ناوچەییەکان بە دەسەڵات گەیشتن، خەڵکی شار و دێهاتەکان کە لە بەرامبەر هێرشی بێگانە دۆژ دامابوون، تەنیا ڕێگەچارەیان ئەوە بوو کە پەنا ببەنە بەردەم زۆرداران و فەرمانڕەوای ناوچەیی و خۆماڵی. بەم پێیە ئەربابی ئەو ناوچانە، بوونە تەنیا پارێزەری ئەوان و ئەمەش بووە هۆی پاوەجێ‌بوونی سیستەمی فیۆدالی لە ئەوروپای رۆژاوا بۆ ماوەی پتر لە ٣ سەدە.

زۆربەی توێژەران پێیان وایە کە ئەم سیستەمە تەنیا تایبەتە بەو قۆناغە مێژووییەی ئەوروپا و نابێ بۆ لێکدانەوەی کۆمەڵگاکانی‌ترکەڵکی لێ وەربگیردرێت. بەڵام هەندێکیش لەسەر ئەم باوەڕەن کە بەهۆی وێکچوویی و هاوشێوەیی هەندێ لە هۆکارەکان (بۆ وێنە پرژوبڵاوبوونی دەسەلات و هاتنەکایەی دەرەبەگ و ئەربابی ناوچەیی)، دەکرێ زاراوەی فیۆدالیزم بۆ ئەم وڵاتانەش بەکار ببرێ.

مێژووی فیۆدالیزم نیشانی داوە هەرکاتێك لە کۆمەڵگایەکدا ئەم مەرجانەی خوارەوە ئامادە بن، فیۆدالیزم بە ئاسانی لەو وڵاتەدا گەشە دەکات:

١ـ شێوازی سەرەکی بەرهەمهێنان، کشتوکاڵی بێت.

PDF 4 KURD

٢ـ کۆمەڵگا لە نێوان هۆز و عەشیرەی جۆراوجۆر دابەش بووبێت، بە چەشنێك کە پێوەندی ئابووری و کەلتووری و مێژوویی نێوانیان سست بێت.

٣ـ پێوەندی نێوان هەرێمە جۆراوجۆرەکانی وڵات بە هۆی جوگرافی یا ... سەخت و دژوار بێت.

٤ـ یەکیەتی ئابووری وڵات تووشی ترازان بێت یا بە هۆی نەبوونی یەکیەتی ئابووری، یەکیەتی سیاسی وڵات لێك بترازێت.

٥ـ حوکمەتی ناوەندی نەتوانێ هاووڵاتیانی خۆی لە بەرامبەر هێرشی دوژمنانی ناوخۆیی و دەرەکی بپارێزێت. ئابوور و کەلتوور و سیاسەت و مێژووی نێوانیان سست بێت و لێك بترازێت.

**فێورالیستەکان** فورالیست‌ها Fevralists

ئەم زاراوە لە وڵاتانی کۆمۆنیستی‌دا بەو گرووپە دەگوترا کە لایەنگری ڕۆژاوا بووە و خۆی بە لایەنگری «شۆڕشی فێوریە»دەزانی و«شۆڕشی سۆشیالیستی» و دەسکەوتەکانی ڕەت ئەکردەوە. لە ساڵی ١٩١٧ دوو گۆڕانکاری لە سۆڤیەت، ڕووی دا: یەکەمیان،«شۆڕشی فێوریە» بووە و دووهەم،«شۆڕشی ئۆکتۆبەر». کۆمۆنیستەکان شۆڕشی فێوریە بە «شۆڕشی بورژوا دیموکراتیك» دەزانن و شۆڕشی ئۆکتۆبەریش بە «شۆڕشی سۆشیالیستی» لە قەلەم دەدەن.

PDF 4 KURD

# ڤ

**ڤاتیکان** واتیکان Vatican

ڤاتیکان یا وڵاتی ڤاتیکان کە بە ئیتالیایی پێی دەڵێن vatican citidel . ڕووبەرەکەی دەگاتە ٤٠٠ هەزار مەتری چوارگۆشە لە باکووری ڕۆژاوای شاری ڕۆما پێتەختی ئیتالیا هەڵکەوتووە کە گرنگترین بارەگا و ناوەندی دەسەڵاتداری پاپا، ڕێبەری کاسۆلیکەکانی جیهانە. حوکمەتی پاپا بچووکترین حکومەتی سەربەخۆی ئەوروپایە و ئەم سەربەخۆییە بەپێی پەیمانی لاتران (کە ناوی کەلیسایەکە) لە ساڵی ١٩٢٩ لەلایەن دەوڵەتی ئەوکاتەی ئیتالیاوە درا بە پاپا.

ڤاتیکان، پۆلیس و پۆست و پارە و وێستگەی ڕادیۆیی تایبەت بە خۆی هەیە کە بە ٢٣ زمان بەرنامە بڵاو دەکاتەوە. نزیکەی ٥٠٠ کارمەندی هەیە و هەر سێ دەسەڵاتی ڕاپەڕاندن و یاسادانان و دادوەری لەژێر دەسەڵاتی پاپادایە. بەڕێوەبردنی وڵاتی ڤاتیکان لە دەست فەرماندار و ئەنجومەنێکدایە کە لە بەرامبەر پاپادا بەرپرسن. ڤاتیکان لە سەرانسەری جیهاندا خاوەنی دارایی و سەرمایەیەکی زۆرە و لە پتر لە سەد وڵات باڵیۆزخانەی هەیە. سیاسەتی ڤاتیکان بە پلەی یەکەم، بریتییەلە پەرەپێدانی ئایینی کاسۆلیک لە جیهاندا و دژایەتی سەرسەختانەی بیروباوەڕی کۆمۆنیزم* دەکات.

**ڤیتۆ** وتو Veto

ڤیتۆ وشەیەکی لاتینییە کە لە ڕیشەی vetare وەرگیراوە و واتای (من دژم) دەدات. ڤیتۆ بەرگریکردن لە کارێکە و «ماف ڤیتۆ» توانایی یا ماف بەرگریکردنە. ئەم زاراوە لە پرۆسەی یاسادانانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، مانایەکی تایبەت لەخۆ دەگرێ. لەم بوارەدا ماف ڤیتۆ بە واتای ماف ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشە بۆ بەرگریکردن لە پەسند کردنی قانوونێك لە لایەن ئەندامانی دیکەی ڕێکخراوەکە.

لە یاسای گشتی وڵاتاندا ڤیتۆ، مافێکە بە سەرۆکی وڵات یا دەوڵەت دەدرێ تا بتوانێ لە جێبەجێکردنی یاسا پەسندکراوەکان بەرگری بکات. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بە ئەمریکا و بریتانیا بکەین. پادشای بریتانیا بۆی هەیە هەندێك لە یاسا پەسندکراوەکان ڤیتۆ بکات بەڵام هەرگیز لەم مافە کەڵکی وەرنەگرتووە. کەچی سەرکۆماری ئەمریکا، دەتوانێ یاسا پەسندکراوەکانی کۆنگرێس ڤیتۆ بکات، مەگەر ئەوەی کۆنگرێس دووبارە بە ٢/٣ زۆرینەی دەنگەکان پەسندی بکاتەوە.

**ڤیزە/ گوزەرنامە** ویزا / رواديد Visa

لە ڕیشەی لاتینی visum بە مانای دیتن وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە وەرگرتنی ئیجازەی

PDF 4 KURD

ڕەسمی لە لایەن کارمەندانی بڕواپێکراوی وڵاتێك بۆ ڕێ پێدان بۆ هاتنە ناوەوە یا دەرچوون لە وڵاتێك. ئەم ئیجازە پێدانە لە سەر پەڕەکانی پاسپۆرت یا شوناسی تایبەت مۆر دەکرێت. ڤیزە بە پێی ناوەرۆکی سەفەر بە چەند جۆر دابەش ئەکرێت کە بریتین لە:

ڤیزەی گەشتیاری، بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ گەشت و گوزار دەچنە وڵاتێکی دەرەکی.

ڤیزەی هاتنە ناوەوە، تایبەتی ئەو کەسانەی کە بۆ کاروباری بازرگانی یا کارێکی تایبەت دەچنە وڵاتێك.

ڤیزەی ڕاگوزاری، بۆ ئەو کەسانەی کە بۆ گەیشتن بە وڵاتی مەبەست، لە وڵاتێکی سەرەڕێ ڕادەبرن.

ڤیزەی سیاسی (دیپلۆماتیك)، تایبەتی کارمەند و ڕاسپاردە سیاسیەکانە.

PDF 4 KURD

# ق

**قاچاخ** قاچاق Contraband

بە کەسێك یا شتێك دەڵێن کە بەپێی دەستوور لە وڵاتێك یاساغ بێت. ئەم زاراوە هەروەها بە واتای «قاچاخی جەنگ»یش لێکدراوەتەوە کە بریتییە لە شمەك و تفاقی شەڕ کە نابێ لە لایەن وڵاتانی بێلایەنەوە بگاتە دەستی لایەنێکی شەڕەکە. لەم رووەوە هەرکام لە لایەنەکانی شەڕ دەتوانن پاپۆڕەکانی وڵاتانی بێلایەن بۆ پشکنینی شمەکی قاچاخ بگەڕێن. لە سەرەتادا قاچاخ بریتی بوو لە چەك و تەقەمەنی و تفاقی شەڕ بەڵام دواتر ئەسپ و هەموو چوارپێیەکی بارهەڵگریش بەو لیستە زیاد کرا.

**قاچاخی جەنگ**: بڕوانە قاچاخ.

**قوتابخانەی سیاسی** مکتب سیاسی Political school

قوتابخانەی سیاسی بەو تیۆرییانە دەگوترێ کە دەربارەی دەوڵەت، حوکمەت و شێوەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لێکۆڵینەوە دەکات. قوتابخانە سیاسییەکان بەو مانایەی کە ئیمڕۆکە مەبەستمانە مێژوویەکی دوور و درێژیان نییە بەڵکوو بەرهەمی گۆڕانکارییە فیکرییەکەی سەردەمی ڕێنسانسی ئەورووپایە بە تایبەت سەروبەندی شۆڕشی مەزنی فەرەنسا کە بزاوتە سیاسییەکان بە ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتەوە هاتنە مەیدانەوە. لە باری مێژووییەوە، ڕەوتی پەیابوونی قوتابخانە سیاسییەکان وابووە کە سەرەتا ئەندێشەی ئازادیخوازانە (لیبرالیزم) و تاك باوەڕانە (تاك پەروەری) سەری هەڵداوە. دواتر، پاش رووخانی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان و هاتنە ئارای مەسەلەی نوێی کۆمەڵایەتی و ئابووری، ڕێبازی کۆمەڵ خوازی و سۆشیالیستی بەدیهاتوون.

ئەم قوتابخانانە هەندێ جار وەك لیبرالیزم (بڕوانە ئازادیخوازی) یا فاشیزم* ژێرخانێکی فەلسەفییان نییە بەڵام هەندێکی تر لەم قوتابخانانە وێڕای خستنەڕووی تیۆری دەربارەی حوکمەت، بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات بە ئامرازێك دەزانن بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە ئەمانە لە ڕاستیدا بە ئایدیۆلۆژیا لە قەڵەم دەدرێن. بۆ وێنە کۆمۆنیزم و سۆشیالیزم کە ریشەی هەردووکیان دەگەڕێتەوە بۆ مارکسیزم.

**قوتابخانەی فرانکفۆرت**: بڕوانە مارکسیزمی نوێ.

PDF 4 KURD

**قەیرانی دیموکراسی** بحران دموکراسی Crisis of Democracy

هەندێ زاراوە کە لە گوتار(discourse)ی سیاسیدا بەکار دەبرێن، ئەغلەب جار بە دوو مانا شرۆڤە کراون: یەکەم، واتای فەرهەنگی. دووهەم، مانایەك کە لە جەنگێکی ئایدیۆلۆژیکی بەکار دەبرێت. زاراوەی دیموکراسی* یەکێك لەو چەمکانەیە کە لە فەرهەنگی زاراوەدا بە مانای کۆمەڵگایەکی خەڵکییە کە ئەندامانی دەتوانن لە کاروباری کۆمەڵگا هاوبەش بن و لە دانانی بڕیارەکاندا دەوریان هەبێت. مانایەکی‌تری کۆمەڵگای دیموکراتیك، ناوەڕۆکێکی ئایدیۆلۆژیکی هەیە، واتە کۆمەڵگایەك کە لە ژێر دەسەڵاتی توێژێکی نوخبە و بازرگان و کاسبکاردایە و کۆمەڵی خەڵك تەنیا دەوری بینەر ببینن. هەربۆیە بە باوەڕی هەندێ لە بیرمەندانی سیاسی ڕۆژاوا ئەگەر جەماوەری خەڵك، بەڕاستی بخوازن لە کاروباری کۆمەڵگادا بەشداری بکەن، کەشێکی وا دێتە کایەوە کە بە *قەیرانی دیموکراسی* ناوبردە کراوە. قەیرانی دیموکراسی کاتێك کۆنترۆڵ دەکرێت کە جەماوەر لەمەڕ بەشداری و هاوبەشی لە کاروباری کۆمەڵگا بێ‌مەیل بکرێت و هان بدرێت کە بگەڕێتەوە بۆ پێگە و شوێنی خۆی.

**قەیرانی سۆشیالیزم** بحران سوسیالیسم Crisis of Socialism

ئەم زاراوە داتاشراوی لایەنگرانی سەرمایەدارییە بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە: یەکەم، پێشبینی مارکسییەکان لەهەمبەر ڕۆوخانی سەرمایەداری لە هەناوی خۆیدا نەهاتە دی و لە ڕاستیدا وڵاتانی سەرمایەداری ڕەوتی پێشکەوتنی گەشاوەی ئابووری و پیشەسازی خۆیان بە سەرکەوتوویی پێکاوە و بوونەتە مەکۆی شارستانییەتی پێشکەوتن‌خواز. دووهەم، وڵاتانی سۆشیالیستی نەك هەر نەیانتوانیوە گەشە بدەن بە ئابووری خۆیان بەڵکوو پێویستییان، بە مادەی خۆراکی و تەکنۆلۆژی وڵاتانی سەرمایەداری ڕۆژاوا هەر بەردەوامە. هەندێکیش دوابەدوای گۆڕانکارییە سیاسییەکانی ساڵی ١٩٨٩ ئەورووپای ڕۆژهەڵات و هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت (لە ساڵی ١٩٩١)، مەرگی ناوەختی کۆمۆنیزمیان هێنایە ئاراوە.

**قەیرانی سەرمایەداری** بحران سرمایەداری Crisis of Capitalism

ئەم زاراوە لە لایەن مارکس و زۆرینەی مارکسییەکان بۆ ئاماژە بەو کێشە و ناتەباییانە بەکاربراوە کە سیستەمی سەرمایەداری تووشی قەیران و ئارێشەی قووڵی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی کردووە. بە باوەڕی ئەوان، ناتەبایی سەرەکی کۆمەڵگای سەرمایەداری لەوەدایە کە بەرهەم و سەمەرەی کۆمەڵایەتی، دەکەوێتە بەردەستی سەرمایەداری تایبەتی و قازانجی هەرەزۆری ئەم بەرهەمە مەکینەییە دەچێتە گیرفانی سەرمایەدارەکانەوە. ئەم ئارێشە لە نێوان خەسڵەتی کۆمەڵەکی بەرهەمهێنان و شێوازی تایبەتی موڵکدارییەتی، قەیرانی سەرەکی سەرمایەداری سازکردووە. دەرەنجامێکی ئەم ئارێشە، دابەزینی توانایی کڕینی بەرهەمەکانە بەهۆی زیادبوونی چینی هەژار کە ئەمەش دەبێتە هۆی *زێدەبوونی بەرهەم‌هێنراو* و هەڵکشانی ڕادەی خەڵکی بێکار. دەرەنجامێکی دیکەی قەیرانی سەرمایەداری، خەبات و ململانێی کرێ...

PDF 4 KURD

بۆرژوازییە.

## قەیرانی سیاسی — بحران سیاسی — Political Crisis

حاڵەتێك كە تێیدا هاوسەنگی سیستەمی سیاسی و كۆمەڵایەتی شێوابێت. قەیرانە سیاسییەكان بەپێی ئاستی بەربڵاوی و پانتای جوگرافی، بە دوو جۆری ناوخۆیی و نێودەوڵەتی دابەش ئەكرێن. قەیرانی ناوخۆیی وەك، ململانێی كرژی سیاسی نێوان حیزب و لایەنە سیاسییەكان بۆ وەدەست هێنانی دەسەڵات، سەرهەڵدانی ناكۆكی جیددی لە نێوان باڵەكانی حوكمەت، كودەتای سەربازی، مانگرتنی درێژخایەن، شۆڕش و پێكدادانی ئەتنیكی و شەڕی چریكی. ریشەی قەیرانی سیاسی ناوخۆ تەنیا ناگەڕێتەوە بۆ چۆنیەتی مامەڵەی كاربەدەستانی ناوخۆی وڵاتەكە بەڵكوو لەم چاخەدا زۆربەیان لە ژێر كاریگەری دیاردە سیاسی و ئابوورییەكانی ناوچەكە و هێزە بان ـ ناوچەییەكان سەرهەڵئەدەن.

قەیرانی سیاسی نێودەوڵەتی، بریتیەلە هەلومەرجێكی چاوەڕواننەكراو كە لە ئەنجامی پێوەندی دوو یا چەند وڵات سەرهەڵئەدات، بۆ وێنە، ناكۆكی نێوان دوو وڵاتی دراوسێ كە لە ساردبوونەوەی پێوەندی سیاسییەوە بگرە تاكوو شەڕ تەشەنە ئەسەنێت.

## قەیسەرخوازی — سزاریسم/قیصر گرایی — Caesarism

ئەم زاراوە لە ناوی قەیسەر (سزار)، ئیمپراتۆری رۆما وەرگیراوە بۆ پێناسەكردنی جۆرێك حوكمەتی رەهای ملهوڕ و دیكتاتۆر كە بە كۆنترۆڵێكی توندوتۆڵی سەربازی ـ پشتئەستوور بە رەشەگەل ـ بۆ بەدیهێنانی دەسەڵاتێكی باڵادەست لە وڵاتێك، هەوڵ ئەدات. ئەم جۆرە دیكتاتۆرانە ئەغڵەب لە رێگای كودەتای سەربازی یان هەرەوەزی جڤاكی، بە دەسەڵات ئەگەن و بە رێكخستنی هەڵبژاردن و راپرسی* و هێنانە كایەی پەرلەمانی تەشریفاتی، هەوڵ ئەدەن رواڵەتی دیموكراسی بپارێزن و سیمایەكی دیموكرات بە خۆیان ببەخشن. قەیسەرخوازی بە دوو جۆر دابەش كراوە: كۆنەپەرست و پێشكەوتنخواز. لە جۆری یەكەمدا قەیسەرخوازی كاتێك بە كۆنەپەرست ناوبردە ئەكرێت كە سەرهەڵدانەكەی، جێخۆشكەربێت بۆ سەركەوتنی هێزە كۆنەپەرستەكان لە كۆمەڵگادا (بۆ نموونە ناپیلئۆنی سێهەم و بیسمارك). جۆری دووهەمیش بە پێچەوانەوە هەركات، زەمینە بۆ سەرهەڵدان و سەركەوتنی هێزە پێشكەوتنخوازەكان خۆش بكات، قەیسەرخوازی پێشكەوتنخواز دێتە مەیدانەوە( بۆ وێنە ژولیۆس قەیسەر و ناپیلئۆنی یەكەم).

PDF 4 KURD

# ك

**کابینە** کابینە Cabinet

بە واتای ئەنجومەنی وەزیران و نووسینگە و سکرتاریەتە و بە گوێرەی پێویست لە هەر سێ حاڵەتدا بە کار دێت بەڵام پتر بۆ ئەنجومەنی وەزیران و هەندێ جاریش لەجیاتی حکومەت بەکاردەبرێت. ماهییەتی کابینە لە وڵاتاندا جیاوازە. لە بریتانیا ئەندامانی کابینە لە لایەن سەرۆك وەزیرانەوە هەڵدەبژێردێن کە لە بەرامبەر مەجلیسی عەوامدا بەرپرسیارن. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئەندامانی کابینە لە لایەن سەرۆك کۆمارەوە هەڵدەبژێردرێن و هەمووان لە بەرامبەر ئەودا بەرپرسیارن. سەرۆکی کابینە بە سەرۆك وەزیران، راوێژکار و سەرۆکی دەوڵەت ناوی دەرکردووە.

**کابینەی سێبەر:** بڕوانە دەوڵەتی سێبەر.

**کاپیتالیزم:** بڕوانە سەرمایەداری.

**کاپیتۆلاسیۆن** کاپیتولاسیون Capitulation

ئەم زاراوە لە وشەی لاتینی capitulare وەرگیراوە و بە مانای پەیمان و گرێبەست و رێککەوتن هاتووە کە لە نێوان دەوڵەتاندا دەبەسترێ. بەپێی ئەم پەیمانە ئەگەر هاووڵاتیانی بێگانە لە قەڵەمڕەوی وڵاتێکیتردا تاوانێك ئەنجام بدەن، ئەوا دەبێ بکەونە ژێر پارێزگاریی یاساکانی وڵاتی خۆیان و لە لایەن کۆنسولێك کە نوێنەری ئەو دەوڵەتەیە بۆ دادگا بانگهێشت بکرێن. ئەم جۆرە پەیماننامانە پتر لە لایەن دەوڵەتانی ئەورووپییەوە بەسەر دەوڵەتانی ئاسیایی و ئەفریقایی دائەسەپا. لە راستیدا بیانووی ئەم وڵاتانە ئەوە بوو کە هاووڵاتیانی ئەوان لە رووی دادوەرییەوە پارێزراو نین و لە لایەن بەرپرسانی ئەو وڵاتانەوە ناپارێزرێن. بەڵام ئەوان بەم بیانووە دەیانویست بگەنە ئامانجە کۆلۆنیالیستیەکانی خۆیان. لەم سەردەمەدا کاپیتۆلاسیۆن گرنگی خۆی لە دەست داوە و لە لایەن دەوڵەتەکانەوە دژایەتی دەکرێ و وڵاتانێکی وەك ژاپۆن، تورکیا، میسر و ئێران و چین پووچەڵیان کردۆتەوە.

**کارتل** کارتل Cartel

ئەم زاراوە لە ریشەی cartello ئیتالیایی بە مانای هێماکردن و شەڕفرۆشتن و خەبات و هاوپەیمانی خاوەن بەشە جۆراوجۆرەکانی پیشەسازییەك بەکار براوە. کارتل لە وڵاتانی سەرمایەداری بۆ چالاکی نا...

PDF 4 KURD

بازرگانی بە مەبەستی ڕێککەوتنی نێوان کۆمپانیا گەورەکانی بەرهەمهێنان و بازرگانی کاڵایە بۆ مۆنۆپۆلکردنی بەرهەمهێنان. کارتلەکان هەندێ جار بە پشکبەندیکردنی بەرهەمهێنان یا بە کەمکردنەوەی خستنەڕووی کاڵایەکی تایبەتی بۆ فرۆشتن، دەبنە هۆی زیادکردنی نرخی ئەو کاڵایە لە بازاڕدا یا بە نزمکردنەوەی بە ئەنقەستی نرخەکان، ڕکابەرانی خۆیان لە گۆڕەپانەکە وەدەردەنێن و پاش تێکشکاندنی ئەوان ئینجا نرخەکان بەرز دەکەنەوە.

کارتلەکان تەنها لەسەر ئاستێکی نەتەوەییدا کارناکەن بەڵکوو هەندێ جار چەندین کۆمپانیای گەورەی هاوچەشن لە وڵاتانی جۆراوجۆر یەکدەگرن و کۆنترۆڵی بەرهەم و بەرز و نزم کردنەوەی نرخی یەك یا چەند کالا لە بازاڕەکانی جیهاندا دەکەن. نموونەی کۆنترین کارتلی جیهان(١٨٩٦) یەکیەتی نێوان کۆمپانیاکانی ئالکۆ (ئەمریکا) و ئالاگ (سویسرا) یە کە تەکنۆلۆژی ئەلمینیۆم یان بەدەستەوە گرتووە.

## کارەسات — فاجعە — Cataclyism

بە واتای گەردەلوولی جیهانی و ژێروژوور بوونی بارودۆخی گۆی زەوی یا هەر ڕووداو و پێشهاتێکە کە ڕەوشی زەوی یا دامودەزگای جیهانی مرۆیی تێکوپێك بدات. ئەم زاراوە بۆ ئەو ڕووداو و پێشهاتە گەورانە بەکاردێت کە بارودۆخی ئاسایی سروشت لەسەر گۆی زەوی بگۆڕێت (بڕوانە زستانی ئەتۆمی). لە زاراوەی سیاسیدا بە واتای گۆڕانکاری توندی سیاسی و کۆمەلایەتی مانا کراوەتەوە.

## کاریزما — فره/ فرّەمندی — Charisma

١ـ بەهرەیەکی مەعنەوی، ودم یا توانستێك کە وادەزانی لە لایەن یەزدانەوە بە کەسێك کەرەم کرابێت تاکوو بەو پێیە هەندێ کاری سەیر و سەمەرە ئەنجام بدات. ٢ـ توانستێکی تایبەتی کە بەهرەدارەکەی پێی وایە بۆ ڕێبەرایەتی کردنی جەماوەر لە پشتیوانییەکی پرسۆزی ئەوان بەهرەوەرە.

ئەم زاراوە لە بنەڕەتدا بە واتای «یارمەتی خواوەندی»یە. ماکس ڤێبەر، کۆمەڵناسی گەورەی ئەڵمانی(١٨٦٤ــ ١٩٢٠) ئەم وشەی لە کۆمەڵناسی سیاسی*دا بەکارهێناوە و مەبەستی لەم زاراوە،«گەوهەرێکی تایبەت» بووە کە بە کەسێك یا شتێك حاڵەتێکی بێوێنە و سەیروسەمەرە دەبەخشێ. ڤێبەر لە نێوان کاریزمای تاکەکەسی کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شەخسێکی تایبەت و کاریزمای مەقام، کە دەگەڕێتەوە بۆ پلەوپایە و مەقامێك، جیاوازی قاییل دەبێت. ئەو چەمکی کاریزمای لە بەستێنی تیۆری گشتی دەسەڵاتدا بەکارهێنا و بەم پێیە سێ جۆر ڕەوایی (مشروعیت)ی ناوبردە کرد: سوننەتی، کاریزمایی و قانوونی ـ عەقڵانی. ڤێبەر لەم دابەشکارییە بۆ شرۆڤەی پرۆسەی گۆڕانکاری کۆمەلایەتی کەڵکی وەرگرت.

ئەو پێی وابوو هەرکاتێك کۆمەڵگا و ئایینەکان لە ژێر فرمانی ئەو سوننەتانەدا بن کە پیرۆزییەکەیان لە ڕابردوو گرتبێت، تەنیا هێزێك کە توانایی ململانێی هەبێت، ڕێبەرێکی کاریزمایە کە شەرعییەتی خۆی لە بەهرە شەخسییەکانی وەرگرتبێت. کۆمەڵناسەکان ئەم زاراوەیان لە باری سیاسییەوە بۆ کەسایەتیگەلێ

PDF 4 KURD

وەك نكرۆمە لە غانا، سۆكارنۆ لە ئەندونیزیا و نیهرۆ لە هیندستان بەكار بردووە و پێیان وایە كە بەهرەی شەخسی ئەوان بۆتە سەرچاوەی دەسەڵات لە نێوان نەتەوەكانیان. بەڵام ئەم زاراوە بە شێوەیەكی بەربڵاوتر بۆ هەموو دیاردە و كەسانێك بەكار دەچێت كە بە هۆی تواناییەكی تایبەت و سەیرەوە، لە گەڵ رەشەگەل و جڤاك جیاوازییان هەیە.

### كاسترۆئیزم — كاسترويیسم — Castroism

كاسترۆئیزم، ئاوێتەیەكە لە رێبازی شۆرشگێرانەی ئەمریكای لاتین و ئایدیۆلۆجیای كۆمۆنیزم كە لە ساڵی ١٩٥٩ لە لایەن فیدل كاسترۆ رێبەری كووبا هاتۆتە ئاراوە. كاسترۆ لەو ساڵەدا پاش سەركەوتن بەسەر رژێمی دیكتاتۆری باتیستا، توانی شۆرشی كووبا بگەیەنێتە ئەنجام. بزاوتی شۆرشگێرانەی كووبا كە لە ساڵی ١٩٥٣ دەستی پێكرد، لە سەرەتاوە هیچ ئایدیۆلۆژیا و رێبازێكی روون و ئاشكرای نەبوو. لە ساڵی ١٩٦١، كاسترۆ رووی كردە ماركسیزم ـ لینینیزم و بزاڤی چەكداریی لە گەڵ كۆمۆنیزمدا تێكەڵ كرد و ئەوەش بوو بە ئایدیۆلۆژیای رەسمی كووبا بەڵام كاسترۆ هەندێ لایەنی شۆرشی كووبای بە زیندوویی راگرت و بەم جۆرە رواڵەتێكی تایبەتی بە كاسترۆئیزم بەخشی.

دوابەدوای شۆرشی كووبا، كاسترۆ پێوەندیەكی گەرمی دیپلۆماسی لە گەڵ یەكیەتی سۆڤیەت كردەوە و كووبا لە باری ئابوورییەوە كەوتە دوای وڵاتانی كۆمۆنیستییەوە. لە ساڵی ١٩٦١، دەوڵەتی ئایزنهاور(سەركۆماری ئەمریكا)، گەمارۆی ئابووری بەسەر ئەم وڵاتە داسەپاند و پێوەندی سیاسی و ئابووری لێ قەدەغە كرد. كاسترۆ پاش سەركەوتنی شۆرشی كووبا هەزاران كەس لە نەیارانی خۆی خستە بەندیخانە و لە سێدارەی دان. ئینجا حوكمەتێكی سۆشیالیستی تاك‌حیزبی پاوەجێ كرد. كاسترۆ لە نێوان بزاوتە سەربەخۆكانی ئەفریقیا و ئەمریكای لاتین، كەسایەتییەكی تەنیا و گۆشەگیرە. ئەگەرچی ئەو هەوڵی زۆری دا تاكوو بزاوتە كۆمۆنیستیەكەی بكێشێتە ناو نەتەوەكانی دیكەی ئەمریكای لاتین بەڵام دەوڵەتی كەنەدی ئەم هەوڵانەی لەبار برد. لە ساڵی ١٩٦٣، چواردە وڵاتی ئەمریكای لاتین پێوەندی دیپلۆماسی خۆیان لە گەڵ كووبادا پچراند و رژێمی كاسترۆ پتر گۆشەگیر بوو. دوای رووخانی یەكیەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٨٩، پێوەندی دیپلۆماسی رژێمی كاسترۆ لەگەڵ ئەم وڵاتە كۆتایی پێهات و ئەمەش بووە هۆی زیانێكی زۆر بە ئابووری كووبا.

### كا. گێ. بێ — كا. گ. ب — K G B

سەردێری كورتكراوەی دەستەواژەی رووسی Komitet Gosudarstvennoi Bezopasnosti بە واتای كۆمیتەی ئاسایشی دەوڵەتییە لە سۆڤیەت كە لە ساڵی ١٩٤٥ دامەزرا بە مەبەستی پاراستنی دەسكەوتەكانی سۆشیالیزم و لەناوبردنی نەیارانی ناوخۆیی، پاراستنی سنوورەكانی وڵات، كۆنترۆڵی بۆرۆكراسی و چاودێریی بەسەر هێزە سەربازییەكاندا. جگە لەمانەش، كا. گێ. بێ، لەناو وڵاتانی دەرەوە بە تایبەت وڵاتانی ئەندام لە رێكخراوەی پەیمانی وارشەو سیخوریی دەكرد تاكوو هەژمونی* خۆی زیاتر بسەپێنێت.

PDF 4 KURD

گێ بێ، هەروەك دەزگا ئاسایشییەکانی بەرلە خۆی، نموونەی بێڕەحمی و دڵڕەقی و توندوتیژی بوو لە بەرامبەر شارۆمەندانی رووسیدا.

پاش هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و کودەتای ۱۹۹۱/۸/۱۹، ئەم رێکخراوە ترسناکە لێك هەڵوەشا و لە ساڵی ۱۹۹۲ بەملاوە رێکخراوەیەکی بچووکتر بە ناوی *بەشی هەواڵگری ناوەندی کۆماری رووسیا*، جێگای گرتەوە.

## کۆتایی مێژوو — پایان تاریخ — The end of history

تیۆرییێکە لە لایەن فرانسیس فۆکۆیاما، جێگری بەشی پلاندانانی سیاسی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە لە ساڵی ۱۹۸۹ لە گۆڤاری «بەرژەوەندی نەتەوەیی»، هاتە ئاراوە. ناوبراو تیۆرییەکەی خۆی لە پێشدا لە وتارێکدا و پاشان لە کتێبێك بە ناوی «کۆتایی مێژوو و دوایین مرۆڤ» بڵاو کردەوە. بەڕای ئەو «لیبرال دیموکراسی» دوایین شێوازی حوکمەتە لە کۆمەڵگای مرۆڤ دا. مێژووی مرۆڤایەتیش، کۆمەڵێکی گونجاو و پێڕەوداره کە بەشی زۆری کۆمەڵی مرۆڤ بەرەو لیبرال دیموکراسی هانئەدات. فۆکۆیاما لە بارەی کۆتایی مێژوو دەڵێ:

«کۆتایی مێژوو ئەو کاتەیە کە مرۆڤ دەستی ئەگا بە شێوازێك لە کۆمەڵگای ئینسانی کە تێیدا قووڵترین و سەرەکیترین پێداویستیەکانی ئینسانی بەدی بکرێت. مرۆڤی ئەم سەردەمە گەیشتۆتە جێگایەك کە ناتوانێ جیهانێکی جیاواز لەم دنیایەی ئێستا وێنا بکات، چونکا هیچ هێمایەك نییە لەمەڕ باشتر بوونی دۆخی ئێستا».

«بە درێژایی چەن ساڵی رابردوو، هاوکات لە گەڵ سەرکەوتنی لیبرال دیموکراسی بەسەر دژبەرە ئایدیۆلۆجییەکانی خۆی، وەك پاشایەتی و فاشیزم و کۆمۆنیزم، لە سەرانسەری جیهاندا هاوڕایەتییەکی گرینگ دەربارەی رەوابوونی لیبرال دیموکراسی لەگوێن تاکە سیستەمی کارامە هاتۆتە ئاراوە. لەم رووەوە رەنگە ئەم سیستەمە لووتکەی فراژبوونی ئایدیۆلۆجیای مرۆڤ و دوایین شێوازی حوکمەتی مرۆڤ بێت کە دەکرێ بڵێین، کۆتایی مێژوو پێك دێنێت. لە راستیدا رووخانی کۆمۆنیزم بەڵگەیەك بوو بۆ سەرکەوتنی بەهاکانی لیبراڵی رۆژاوایی و کۆتایی ململانێی ئایدیۆلۆجییەکان. من باوەڕم بە کۆتایی هاتنی مێژووە».

دوای رووداوەکەی ۱۱ی سێپتەمبەری ۲۰۰۱، فۆکۆیاما بە نووسینی وتارێك جارێکیتر لەسەر تیۆری «کۆتایی مێژوو» جەختی کردەوە.

## کۆتر و هەڵۆ — شاهین‌ها و کبوترها — Hawks and Doves

ئەم زاراوە لە کاتی شەڕی ڤیەتنام، لە ئەمریکا رەواجی پەیا کرد. مەبەست لە هەڵۆکان ئەو سیاسەتمەدار و هێزە سەربازیانە بوون کە خوازیاری بەردەوامی جەنگ بوون و شەڕیان بە تاکە رێگای سەرکەوتنی ئەمریکا بەسەر ڤیەتنامدا دەزانی. کۆترەکانیش بەو سیاسەتمەدارانە دەگوترا کە بیر و بۆچوونیان دژ بە هەڵۆکان

PDF 4 KURD

و دەیانگوت هێرش و دەستدرێژی سوپای ئەمریکا لە ڤیەتنامدا کارێکی ناڕەوایە. ئەم زاراوە ئێستا لەمەڕ سیاسەتمەدارانی ولاّتانی دیکەش بەکار دەبرێت.

**کۆدەتا** کودتا Coup detat

ئەم وشە فەڕەنسییە و بە واتای «ڕووخاندنی حوکمەت» ە. کۆدەتا بە ڕاپەڕینی لەناکاوی گرووپێکی ناو دەسەلاّت دەگوترێ کە بە مەبەستی ڕووخاندنی گرووپی دەسەلاّتدار هەوڵ ئەدەن دەسەلاّت لەوان بستێنن و خۆیان بە حوکمەت بگەن. باوترین شێوازی کۆدەتا لە جیهاندا ڕاپەڕین بەدژی دامودەزگای ڕێبەرایەتی سیاسی ولاّتە کە لە ناوخۆ و بە دەستی ئەفسەرانی سەربازی بە ئەنجام دەگات. ئەم جۆرە کۆدەتایە لەو ولاّتانە ڕوودەدات کە دامودەزگا سیاسییە دەسەلاّتدارەکان، بنەمایەکی قایم و سەربەخۆیان نەبێت، هەر بۆیە هێزەکانی ئەرتەش وەك هەلێك دەیقۆزنەوە و دەچنە گۆڕەپانی سیاسییەوە. کۆدەتا، تایبەتمەندییەکی سیاسی زۆربەی ولاّتانی جیهانی سێهەمە.

جیاوازی نێوان کۆدەتا و شۆڕش ئەوەیە کە کۆدەتا دیاردەیەکی لەناکاوە و لە لایەن کەسانێك لە چینی دەسەلاّتدار و بە مەبەستی بەدەستەوە گرتنی دەسەلاّت ئەنجام دەدرێ بەلاّم شۆڕش یاخیبوون و ڕابوونێکی جەماوەرییە دژ بە زوڵم و ستەمی گرووپی دەسەلاّتدار. لە ولاّتانی جیهانی سێهەمدا جۆرێك لە کۆدەتا جێگای شۆڕشی گرتۆتەوە ئەویش بریتییە لەو کۆدەتایانەی کە لە لایەن ئەفسەرانی شۆڕشگێڕ و ڕیفۆرمخواز بە ئەنجام دەگات بە مەبەستی گۆڕانکاری لە پێکهاتە سیاسی و ئابووری و کۆمەلاّیەتیەکانی ولاّت. نموونەی ئەم کۆدەتایە، کۆدەتای جەمال عەبدولناسر لە میسر و سەرهەنگ قەززافی لە لیبی یە. لە بەرامبەر ئەم جۆرە کۆدەتایە کە بە لایەنگری چەپ ناوبانگی دەرکردووە، کۆدەتایەکی ڕاست گەرایانەش لە ئارادایە کە بۆ سەقامگیرکردنی حوکمەتێکی یاسایی و نەتەوەیی و مەدەنی هەوڵ ئەدات. نموونەی ئەم جۆرە کۆدەتایە، کۆدەتای ١٩٤٩ ئێران بەدژی حوکمەتی نەتەوەیی محەممەد موسەدیق و کۆدەتای ١٩٧٣ ژەنەراڵ پینۆشە بە دژی حوکمەتی نەتەوەیی ئالندە بوو لە ولاّتی شیلی. بە گشتی کۆدەتا بە داگیرکردنی ناوەندە گرنگەکانی ولاّت دەست پێدەکات وەك: ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، وێستگەی شەمەندەفەر، فڕۆکەخانە و دامودەزگا دەوڵەتییەکان و وێستگەی ئاو و کارەبا.

**کۆشکی سپی** کاخ سفید White House

ناوەندی ڕەسمی کاروباری سەرۆك کۆماری ئەمریکایە کە لە ساڵی ١٧٩٢ لەسەر فرمانی جۆرج واشنتۆن (١٧٣٢ـ ١٧٩٩ یەکەم سەرکۆماری ئەمریکا) لە شاری واشنتۆن بینا کراوە. کۆشکی سپی هێمایەکە بۆ حوکمەت و دامودەزگای سیاسی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

**کۆماریی** جمهوری Republic

لە زاراوەی سیاسیدا کۆماری، حوکمەتێکی دیموکرات یان نادیموکراتە کە سەرۆکەکەی



راستەوخۆ یا ناراستەوخۆی هەموو توێژێکی کۆمەڵگا هەڵئەبژێردرێ و جێماوەیی نییە وماوەکەشی دیاریکراوە. بەزۆری کۆماری بە رژێمێکی دیموکراتی پەرلەمانی ناوبردە ئەکرێت، ئەگەرچی هەندێ لە وڵاتان بە کۆماریی لە قەڵەم دراون بەڵام دیموکراسی پەرلەمانی بەڕێوە ناچێت. کۆماری لە یۆنانی کۆندا ئاوات و حەزی بیرمەندانی گەورەی ئەو سەردەمە بوو بەڵام زۆربەی فەرمانڕەوایان لە نێوان چینی باڵادەست و سەرمایەدارەکان هەڵئەبژێردران.

ئیمڕۆکە بە حوکمەتێك ئەوترێ کۆماری کە خاوەنی دیموکراسی یان دیکتاتۆری بێ پادشا بێت. کۆماری خۆبەخۆ بە مانای دیموکراسییەت نییە بەڵکوو سیستەمگەلی بەستنەوەی دەسەڵات وەك حیزب و پەرلەمان هاتوونەتە مەیدان کە دەورێکی باڵایان لە ئیدارەی وڵاتێکدا هەیە.

کۆماری نوێ بە چەن شێوازی جۆراوجۆر دابەش ئەکرێت:

**١ـ کۆماری دیموکراتی وەك ڕۆژاوا:** ئەم کۆمارییانە لە بنەڕەتدا لە ناخی قەوارەی دیموکراتی و ئیرادەی گشتی* بەدیهاتوون و بەرهەمی شۆڕشە ئازادیخوازییەکانی سەدەی ١٨و١٩ی ئەورووپان. نەریتی دیموکراسی لەم هەڵبژاردنەدا لە بەرچاو ئەگیرێ و سەرۆکەکەی لە ڕێی هەڵبژاردنەوە دێتە سەر کار. لەم جۆرە حوکمەتەدا دەوری حیزب و پەرلەمان بەرچاوە. بۆ وێنە ئەکرێ ئاماژە بدەینە کۆماری فەرەنسی کە تێیدا سەرکۆمار خاوەنی دەسەڵاتێکی بەرفراوانە و سەرۆکی دەوڵەتەکەشی ئەبێ لە پەرلەماندا هەمیشە لەدووی بە دەسهێنان و پاراستنی هێزی پەرلەمانی بێت. سەرەك وەزیران، بەهرەمەندە لە ئازادییەك کە«ناوەندێتی حوکمەتی» بە دواوە بێت.

**٢ـ کۆماری دیموکراتی جەماتی:** ئەم کۆمارییە لە پاش سەرهەڵدانی شۆڕشە کومۆنیستیەکانی ئەورووپای خۆرنشین و ئاسیا هەندێ ئالی دیکەی جیهان پێکهاتووە. لەم وڵاتانەدا سەرچاوەی حوکمەت ئەگەڕێتەوە بۆ دیکتاتۆری پرۆلتاریا(چینی کرێکار).

**٣ـ کۆمارییەکانی ئەمریکای لاتین و دیکتاتۆر لێدراو:** لەم جۆرە کۆمارییانەدا ئیرادەی گشتی بۆ بەڕێوەبردنی مەملەکەت هیچ دەورێك نابینێ و دەسەڵات لە دەستی ڕێبەردا پاوان کراوە. بنەمای جیاکردنەوەی هێزەکان* پشت گوێ دەخرێ و سەرکۆمار ئەغڵەب لە ڕێی کۆدەتا* و کێشەوهەرای سەربازی یان سەروساختی سیاسی دێتە سەرکار. ڕێبەر، دەسەڵاتێکی بێ سنووری هەیە و هەڵبژاردن لەم جۆرە وڵاتانەدا بە شێوەیەکی فەرمایشی بەڕێوە دەچێ.

چەن زاراوەیەکی‌تر لەم ڕێچکەوە ڕەواجیان پەیدا کردووە کە بریتین لە:

**کۆماری میران.** لەم کۆمارییەدا بەڕێوەبەرایەتی حوکمەت بەدەستی میران و پیاوانی باڵامەقامەوەیە.

**کۆماری پێناودار**(واسیتەیی). لەم کۆمارییەدا میللەت بە پێناوی نوێنەرانی خۆی دەسەڵات بەڕێوە ئەبات.

**کۆماری بێ‌پێناو،** لەم جۆرە کۆمارییەدا خەڵك بێ پێناو ماف دەسەڵاتداریەتی خۆی بەجێ ئەگەیەنێت. (وەك یاسادانان، هەڵبژاردنەکان و چاودێری کردن بە سەر کاروباری حوکمەتدا)

**کۆماری سەڵتەنەتی،** لەم کۆمارییەدا پاش مەرگی سەرکۆمار، سەرەك کۆماریی ئەدرێتە کوڕەکەی. بۆ وێ

PDF 4 KURD

هاتنە سەرکاری بەشار ئەسەد پاش مەرگی باوکی لە سوریا(ساڵی ٢٠٠٠).

**کۆماری ئیسلامی** جمهوری اسلامی Islamic Republic

ئەم زاراوە لە ساڵی ١٩٤٥ کاتێك پاکستان دەیویست لە هیندستان جیا ببێتەوە و سەربەخۆیی وەربگرێت بە مەبەستی بە ئیسلامی کردنی دەوڵەت و حوکمەت هاتۆتە ئاراوە. بەڵام زیاتر لە گەڵ ناوی وڵاتی ئێراندا ئاوێتە بووە. بۆیە هەرکات ئەم زاراوە بە زاردا دێت، پتر کۆماری ئیسلامی ئێران وەك تاکە وڵاتێك کە بە شێوەیەکی رەسمی و فەرمی ئاوەڵناوی ئیسلامی بە زاراوەی «کۆماری»یەوە لکاندووە، دێتەوە یاد.

باسکردن لە کۆماری ئیسلامی ئێران گرێدراوی شۆڕشی ئیسلامی ئەم وڵاتەیە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ تاکوو ١٩٧٨ بە ئەنجام گەیشت. لە نێوان ئەم ساڵانەدا هێدی هێدی لە بەینی حوکمەتی پاشایەتی پەهلەوی و مەلا و زانا ئایینی و نائایینی لە سەر رەوتی مۆدێرنیتە بە شێوازی رۆژاوا و پێشێلکاری دەستووری بنچینەیی ئەو سەردەمە، کێشە و دژایەتی قوت بۆوە. سەرەنجام نێوان دەوڵەت و ئایین لەمپەرێك پەیدا بوو کە بووە ژێرخانێك بۆ شۆڕشی ١٩٧٨ و رووخانی رژێمی پاشایەتی و هاتنە سەرکاری مەلاکان بە رێبەرایەتی ئایەتوڵا خومەینی.

هاتنە سەرکاری حوکمەتی نوێ بە ناوی کۆماری ئیسلامی لە ئێران بووە هۆی داڕشتنەوەی سەرلەنوێی دەستووری بنچینەیی ئەم وڵاتە. لەم دەستوورەدا کۆماری ئیسلامی سیستەمێکە کە لە سەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە پێکهاتووە:

١- حوکمەت و دەسەڵاتداریەتی راستەقینە هەر بۆ خوای تاقانەیە.

٢- وەحیی خواوەندی و پەسڵان(معاد) و عەدالەت لە دارشتنی یاسا دەوری سەرەکی ئەبینێت.

٣- ئیمامەت و رێبەرایەتی هەمیشەیی لە مانەوەی شۆڕشی ئیسلامی دەور ئەبینێت.

٤- بایەخ و بەهای مرۆڤ و ئازادی، هاوکات لە گەڵ بەرپرسیاریەتی لە بەرامبەر خودا لەم رێبازانەی خوارەوە زامن ئەکرێت:

١- بیرنیشاندان(اجتهاد)ی هەمیشەیی زانایانی ئایینی بە پێی کتێب (قورئان) و سوننەتی پێغەمبەر و ئیمامان.

٢- کەڵك وەرگرتن لە زانست و تەکنۆلۆجی پێشکەوتووی مرۆڤ.

٣- بەربەرچدانەوەی هەر چەشنە زوڵم و ستەمێك و بەرپاکردنی یەکسانی و عەدالەت و پاراستنی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری.

**کۆماری کوردستان** (مەهاباد) جمهوری کردستان (مهاباد) Mahabad republic

لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا ئەگەرچی ئێران بێلایەنی خۆی راگەیاندبوو بەڵام لە لایەن بەریتانیا و رووسەکانەوە لە ئاگۆستی ١٩٤١، کەرتی رۆژاوای ئێران داگیر کرا. بەریتانیا، بۆ پاراستنی کەرتی رۆژهەڵات

PDF 4 KURD

عێراق ناوچەی کرماشانی گرت و رووسەکانیش، ئازەربایجانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بێجگە لە شارەکانی مەهاباد و شنۆ و نەغەدەی داگیر کرد. لەم ناوەدا ناوچەی مەهاباد و سەقز، لە کۆنترۆڵی هیچ لایەنێك نەبوو. نەبوونی هیچ هێزێکی دەسەڵاتدار(تەنانەت ئێرانیش) لە ناوچەکەدا زەمینەی بۆ دامەزراندنی حوکمەتێکی خودموختار خۆش ئەکرد.

ئەم دۆخە، لانیکەم تا کۆتایی شەڕی جیهانی دووهەم بەردەوام بوو. قازی محەمەد ساڵێك دوای دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ٢٢ی ژانوییەی ١٩٤٦، لە مەیدانی چوارچرای مەهاباد، کۆماری کوردستانی راگەیاند. قازی محەمەد چەن رۆژ دواتر ئەنجومەنی وەزیرانی کۆمارییەکەی راگەیاند کە پێکهاتبوو لە حاجی بابەشێخ، سەرەك وەزیر و ١٢ وەزیری دیکە.

کۆماری کوردستان و دەوڵەتی کوردی تەنیا ١١ مانگی خایاند. هەر بۆیە لە رێکەوتی ١٧ی دێسەمبەری ١٩٤٧، دوور لە پشتیوانی رووسەکان، هێزە سەربازییەکانی رژێمی پاشایەتی هێرشیان کردە مەهاباد و شارەکانی دەوروبەر و کۆماری نوێباو رووخا. سەرەتای ژانوییەی ١٩٤٧ دەوڵەتی ئێران دادگایەکی سەربازی بۆ قازی محەمەد و براکەی و ئامۆزاکەی، سەدر و سەیف سازاند و لە رێکەوتی ٢٣ی ئەو مانگە لە سێدارە دران و کۆماری کوردستان کۆتایی پێهات.

کۆریس کۆچیرا، مێژونووسی بەناوبانگ دەربارەی هۆی رووخانی کۆماری مەهاباد لە زمانی مەلا مستەفا بارزانییەوە دەنووسێت: «ئەوە کورد نەبوو کە لە هێزەکانی ئەرتەشی ئێران تووشی شکست بێت بەڵکوو ئەوە یەکیەتی سۆڤیەت بوو کە لە بەرامبەر ئەمریکا و بەریتانیادا شکستی خواردبوو! » لەو هۆکارانەی کە ئەتوانێ ئەم بۆچوونە بسەلمێنێت، یەکەم، چوونەدەرەوەی هێزەکانی ئەرتەشی رووس بوو لە ئێران. دووهەم، قسەکانی باڵیۆزی ئەمریکا لە تاران کە گوتبووی، دەوڵەتی ئەمریکا لە یەکپارچەیی خاکی ئێران داکۆکی ئەکات.

## کۆمپانیای فرەنەتەوە شرکت‌های چندملیتی Multinational corporations

کۆمپانیا فرە نەتەوەکان، لە ئابووری و سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بە دیاردەیەکی نوێ دادەنرێن کە بە هۆی پەرەپێدان و بەرفراوان کردنی دەسەڵاتی خۆیان لە دەرەوەی سنوورە نەتەوەییەکان، رۆڵێکی گەورە لە سیاسەتی ئابووری جیهان دەگەیڕن. ئەم کۆمپانیانە پەرە ئەدەن بە چالاکی بازرگانی و پیشەسازیی خۆیان لە سەرانسەری جیهان بەتایبەت لە وڵاتانی رووەوپەرەسەندن و لقێکی لاوەکی کۆمپانیاکە لەم وڵاتانە دادەمەزرێنن، بۆ نموونە کۆکاکۆلا. ئەم کۆمپانیانە ئەمێستا، بوونەتە دیوەزمەیەکی گەورەی ئابووری و سیاسی و لەم وڵاتانەدا وەها ریشەیان داکوتاوە کە دیاریکردنی رەگەز و نەتەوایەتیان کارێکی دژوارە. کۆمپانیا فرەرەگەزەکان، بە سەرمایەدانان لەم وڵاتانە و سوود وەرگرتن لە سەرچاوەی سروشتی و وزەی کاری هەرزان، قازانجێکی زۆر بەدەست دەهێنن و لەم رێگەدا بەرژەوەندی ئابووری وڵاتەکان دەخەنە مەترسییەوە. گەورەترین ناوەندەکانی ئەم کۆمپانیانە لە وڵاتانی ئەمریکا، بریتانیا، ئەڵمانیا، فرەنسا و ژاپۆن

PDF 4 KURD

جێگیر بوون.

## کۆمۆن کومون Commune

ئاوەدانی یان کۆمەڵێکی خەڵکی کە لە هەرێمێکی بەربەست(شار یان دێهات) نیشتەجێ بووبێتن. کۆمۆن بە مانایەکی گشتی بریتییە لە جەماوەرێك کە بۆ ئیدارەی کاروباری خۆیان بە شێوەیەکی سەربەخۆ یارمەتی یەکتر دەدەن، بێ ئەوەی پێویستیان بە دەستێوەردانی کاربەدەستان بێت. لە هەندێ لە وڵاتانی ئەورووپی، بچووکترین یەکەی ئیداری بە کۆمۆن ناوبردە دەکەن. کۆمۆنی سەرەتایی یا کۆمەڵگای هاوبەشی سەرەتایی بە یەکەمین شێوازی بەرهەمهێنانی مێژوو دەگوترێ کە بنچینەکەی لەسەر خاوەندارێتی گشتی بەسەر ئامرازی سادە و سەرەتایی بەرهەمهێنان و کاری هەرەوەزیی دامەزرابوو. لە مێژووی سەدەکانی ناوەڕاستدا پاش ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما، هەر شارێك ئاوەدان بکرایە بە کۆمۆن ناوبردەیان دەکرد.

کۆمۆنی پاریس، لە باری مێژوییەوە بە دوو حوکمەتی شۆڕشگێری پاریس لە ساڵەکانی (١٧٩٥ـ ١٧٩٢) و ١٨٧١ گوتراوە. لە ئاکامی ڕاپەڕینی کرێکارانی پاریس لە مانگی مارسی ١٨٧١، بۆ یەکەمین جار لە مێژوودا حوکمەتی چینی کرێکار یا کۆمۆنی پاریس دامەزرا کە لە لایەن حوکمەتی فەرەنسا و بە یارمەتی ئەرتەشی پرۆس شەلاڵی خوێن کرا.

## کۆمۆنیزم کمونیسم Communism

ئەم زاراوە لە ڕیشەی لاتینی communis بە واتای هاوبەشیی وەرگیراوە. لە ساڵی ١٨٤٠ بەملاوە کە زاراوەی کۆمۆنیزم ڕەواجی پەیدا کردووە، مانای جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە کە بریتین لە:

١ـ هەوڵێکە بۆ پیادەکردنی ئەو ئاواتانەی کە هەندێ لە سۆسیالیستە خەیاڵییەکان بیریان لێ ئەکردەوە. بەم پێی ئەم خەیاڵانە، دەبوایە تەواوی دارایی و سامانی سەرزەوی دابەش بکرێت. هەرکەس دەبێ کار بکات و بە ڕێژەی توانستی خۆی بەرهەم بهێنێت و بە ڕادەی پێداویستییەکانی بکەوێتە خۆشی و ناز و نیعمەتەوە. ئەم ڕێبازە خاوەنداریەتی شەخسی لە بوارەکانی ئامرازی بەرهەمهێنان و کاڵا مەسرەفییەکان بە شتێکی یاساغ دەزانێ.

٢ـ ڕێکخراوەیەکی کۆمەڵایەتییە بە مێتۆدێکی زانستی و ڕاستبینانە کە لە بۆچوونەکانی مارکسدا بەم جۆرە باسی لێکراوە: «مێژووی مرۆڤ، خەبات و ململانێی هەمیشەیی جەماوەرە بۆ باشتر کردنی باری گوزەران. خەباتێك کە لە قۆناغی سەرمایەداریدا پەل دەکێشێتە ململانێی چینایەتی و سەرەنجام بە دیکتاتۆری پرۆلتاریا* کۆتایی پێ دێت». لەم سەردەمەدا تاکەکەس دەبێتە بەرهەمێکی ماقووڵی کۆمەڵگا کە توانستەکانی دەگەنە ئەوپەڕی فراژووتن و بە تەواوی گەشە دەکەن. لە بواری ئابوورییەوە کۆمەڵگا بە پێی ئەم قانوونە بەڕێوە دەچێت: «هەر کەسێك بە قەدەر تواناییەکانی و هەر کەسیش بە قەدەر پێداویستییەکانی».

PDF 4 KURD

٣ـ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری: بەدەر لە چینایەتی و مسۆگەرکردنی خاوەندارییەتی خەڵك بەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و یەکسانی کۆمەڵایەتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا کە تێیدا هێزەکانی بەرهەمهێن لەسەر بنەمای زانست و تەکنۆلۆژی، دایم روو لە پێشکەوتن بن.

مەبەست لە کۆمۆنیزمی سەرەتایی، سیستەمی ئابووری کۆمەڵگا سەرەتاییەکانە کە گۆیا لەم کۆمەڵگایانەدا سەرچاوەی سەرەکی ئابووری وەك زەوی و بەلەم و ... بەشی هەموو خەڵکانی کۆمەڵگایە نەك بەشی تاك و تەراك و بنەماڵەکان. بۆ نموونە کۆمەڵگای سپارتی کۆن.

لە سەردەمی کۆندا بزاوتگەلێکی زۆر بەدیهاتن کە ئامانجی کۆمۆنیستیان هەبووە بۆ وێنە بزاوتی مەزدەکییان بە رێبەرایەتی کەسێك بەناوی مەزدەك کە باوەڕی بە هاوبەشیی سامان و ژن بووە و سەرچاوەی ناکۆکی و ململانێی چینایەتی لەم دوو هۆکارە دەبینێت. پێداگرتنی ئەفلاتوونیش لەسەر هەڵوەشانەوەی بنەمای حاکمییەت و هاوسەرێتی (ازدواج) لە نێوان باڵادەستان و تاقمی دەسەڵاتدار، دەگەڕێتەوە بۆ باوەڕە کۆمۆنیستیەکانی ئەم بیرمەندە.

سۆشیالیزم*، کۆمەڵگایەکە کە بێ هیچ ناونجییەك لە سەرمایەداری* دەرباز دەبێ و کۆمۆنیزم، تەشکی پایەبەرز و شکۆمەندی کۆمەڵگایە و تەنیا کاتێك دەتوانێ پەرە بستێنێ کە سۆشیالیزم بە تەواوەتی پاوەجێ بووبێت. کۆمۆنیزم، دەرەنجامی وەرچەرخانی سۆشیالیزمە. مەرجی ئەم وەرچەرخانەش ئەم سێ ئەرکە سەرەکییە: دانانی بناغەی ماددی و تەکنیکی کۆمۆنیزم لەسەر بنەمای باڵاترین تەکنۆلۆژی و ئاستی سەرەوەی دەسکەوتە زانستییەکان. پاوەجێکردنی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمۆنیزم و پەرەپێدان بە دیموکراسی سۆشیالیستی(بڕوانە سۆسیال دیموکراسی). پەروەردەی ڕۆحی و جەستەیی مرۆڤی هاوچەرخ.

بە گشتی سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم، دوو قۆناغی بەرز و نەوی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری پێك دێنن کە بە پێکهاتەی کۆمۆنیستی ناوی دەرکردووە.

کۆمۆنیزمی نوێ پەیوەندی هەیە بە بیر و بۆچوونەکانی مارکس و کۆمەڵگای بەدەر لە چینایەتی کە لەسەر بنەمای خاوەندارییەتی هاوبەشی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان راوەستاوە. گرنگترین دەق بۆ موتالای کۆمۆنیزم، «مانیفستی حیزبی کۆمۆنیست»ـە کە لەسەر داوای دەستەی رێبەرایەتی «یەکیەتی کۆمۆنیستەکان»نووسراوە. ئەم مانیفستە لە لایەن مارکس و ئینگلس(١٨٤٧)نووسراوە و لە ١٨٤٨ لە لەندەن بڵاو کراوەتەوە. لینین لە بارەی مانیفستەکە دەڵێ: «ئەم نامیلکە بە قەدەر چەند کتێبی گەورە و مەزن بە نرخە». لە راستیدا مانیفست، بە «ئینجیل»ی کۆمۆنیزم و چڵەپۆپەی ئەندێشەی مارکس و ئینگڵس لە قەڵەم دراوە. کۆمۆنیزم بە کردەوە لە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆڤیەت لە ساڵی ١٩١٧ بەدیهات. دواتر پاش رێکخستنی کۆمینتێرن (کۆمۆنیزمی نێونەتەوەیی)، لە لایەن لینین و هەروا سیاسەتەکانی ستالین هەوڵ درا هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان بکەونە ژێر چەترێکەوە و نەزمێکی کرژ بەسەریاندا زاڵ ببێت. لە هەلومەرجێکی وادا هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان ملکەچی سۆڤیەت بوون و دەبوا لە سیاسەتەکانی حیزبی بولشویکی سۆڤیەت پەیرەوییان بکردایە.

PDF 4 KURD

پاش مەرگی ستالین(١٩٥٣) و بەدەسەڵات گەیشتنی خرۆشچۆف و پێشنیازی «سازانی ئاشتیخوازانە لە گەڵ رۆژاوا»، پێوەندی سۆڤیەت و چین کە دوو جەمسەری گرینگی جیهانی کۆمۆنیست لە ئەژمار دەهاتن، بەرەو ساردبوونەوە رۆیشت. چونکا چین هێشتا هەر لایەنگری ستالین بوو. ململانێی ئەم دوو هێزە سەرەکییەی کۆمۆنیزم، لەمپەرێکی لە نێوان بلۆکی رۆژهەڵاتدا دروست کرد.

پێش هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە نێوان ساڵەکانی ١٩٨٩ تا ١٩٩١، زاراوەی کۆمۆنیزم پتر بۆ ناوبردە کردنی ئایدیۆلۆژیای رەسمی و سیاسەتەکانی ئەم وڵاتە و چین و وڵاتانی ئەندام لە پەیمانی وارشەو بەکار دەبرا. لە سەدەی بیستەمدا حیزبەکانی پتر لە پەنجا وڵاتی لایەنگری کۆمۆنیزم، بە شێوازی جۆراوجۆر چالاکیان دەنواند و لە هەندێ وڵاتیشدا دەسەڵاتیان بەدەستەوە بوو. بەڵام پاش رووخانی دیواری بەرلین و هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت، بزاڤی کۆمۆنیزم لە جیهاندا تووشی نسکۆ هات و سیستەم و مەرامی کۆمۆنیستی لە وڵاتانی بلۆکی رۆژهەڵات، بە رەسمی کۆتایی پێهات. ئینجا ئەم وڵاتانە روویان کردە ئابووری بازاڕی ئازاد و دەستیان کرد بە پیادەکردنی ئەو بنەما و سیستەمە کە نزیکەی ٧٠ ساڵ لە گەڵیدا دژایەتیان دەکرد.

**جەمسەرەکانی کۆمۆنیزم:** جەمسەرەکانی کۆمۆنیزم لە جیهاندا بریتیبوون لە:

١ـ کۆمۆنیزمی سۆڤیەت کە پێیان دەگوت کرملینیزم و ناوەندەکەشی مۆسکۆی پێتەختی یەکیەتی سۆڤیەت بوو. ٢ـ مائۆئیزم* یا کۆمۆنیزمی چینی (ناسراو بە مائۆ تسەدۆن رێبەری چین).

٣ـ کاسترۆئیزم*(کۆمۆنیزمی داتاشراوی تایبەت بە فیدل کاسترۆ لە کووبا).

٤ـ تیتۆئیزم(ناسراو بە مارشاڵ تیتۆ رێبەری یۆگسلاڤیا).

٥ـ کۆمۆنیزمی ریفۆرمخواز(کە زۆربەی حیزبە کۆمۆنیستەکانی ئەورووپای رۆژاوا خۆیان بەم جەمسەرەوە هەڵواسیبوو).

## کۆمۆنیزمی زانستی — کمونیسم علمی — Scientific Communism

ئەم زاراوە لە ساڵی ١٩٦٢، لە لایەن میخاییل سۆسلۆف، بیرداڕێژی پایەبەرزی سۆڤیەت لە کۆنگرەیەکی گەورەی ئایدیۆلۆژیک چێ کراوە. بە باوەڕی کۆمۆنیستەکان، کۆمۆنیزمی زانستی بریتییەلە: زانستی ململانێی چینایەتی چینی کرێکار و شۆڕشی سۆشیالیستی و یاسامەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سۆشیالیزم و کۆمۆنیزم. کۆمۆنیزمی زانستی خۆی بە چۆنیەتی هەنگاونان لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆشیالیزم لە ئاستی جیهان و دامەزراندنی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی سەرقاڵ دەکات کە یەکەمین قۆناغەکەی، سۆشیالیستی لە قەڵەم دەدرێت. لەم رووەوە کۆمۆنیزمی زانستی، دەرەنجامی سیاسی کۆی ئەو ئایدیۆلۆژیەیە کە سەرەتا بە مەتریالیزمی دیالەکتیك دەست پێدەکا و پاشان «مەتریالیزمی مێژوویی»و«ئابووری سیاسی» بەدوا خۆیدا دەهێنێت.

PDF 4 KURD

**کۆمەڵکوژی** نسل کشی/نژاد کشی Genoside

بریتییە لە کوشتن و لەناوبردنی گرووپێکی نەتەوەیی، ڕەگەزی، ئەتنیکی و ئایینی بە پێی نەخشە و پلانێکی لەوە پێش دارێژراو. بە پێی «بڕیارنامەی نێونەتەوەیی بەرگری کردن لە ژینۆساید» کە لە ٩ی دێسەمبەری ١٩٤٨ مۆر کراوە، کۆمەڵکوژی، بەم کردەوانەی خوارەوە دەگوترێ:

١) لەناوبردنی یەکجارەکی یان بەشێك لە گرووپێکی نەتەوەیی، ڕەگەزی یا ئایینی.
٢) کوشتنی ئەندامانی گرووپێك.
٣) ئازاردانی جەستەیی یا دەروونی ئەندامانی گرووپێك.
٤) خستنە تەنگژە و ناستەنگی گرووپێك بە ئەنقەست.
٥) بەرگرتن لە سکوزا و زیادبوونی حەشیمەتی گرووپێك.
٦) ڕاگواستنی زۆرەملی منداڵانی گرووپێك بۆ ناو گرووپێکی دیکە.

لە یاسا نێودەوڵەتییەکان و مافەکانی کەمینەکاندا کۆمەڵکوژی چەند شێوازی لێ ئەکەوێتەوە کە بریتین لە: کۆمەڵکوژی جەستەیی یا ماددی، کۆمەڵکوژی سیاسی* کۆمەڵکوژی بایەلۆژیکی و کۆمەڵکوژی کەلتووری. ئەو کردەوانەی لە سەرەوە ئاماژەی پێدرا ئەکرێ وەك کۆمەڵکوژی جەستەیی و سیاسی و بایەلۆژیکی ناوبردە بکرێن بەڵام بە پێی پێناسەی نەتەوەیەکگرتووەکان کۆمەڵکوژی کەلتووری بەم جۆرە شرۆڤە کراوە:

کۆمەڵکوژی کەلتووری بریتییەلە هەر جۆرە کردارێکی بە ئەنقەست کە بە مەبەستی لەناوبردنی زمان و ئایین یا کەلتووری نەتەوەیەك، گرووپێکی ڕەگەزی یا ئایینی بە دژی ئەندامانی ئەو گرووپە بە ئەنجام بگات بۆ وێنە: ڕێگا نەدان بۆ بەکارهێنانی زمانی گرووپێك لە ئاخاوتنی ڕۆژانە یا قوتابخانە و بەرگری کردن لە بڵاوبوونەوەی کتێب و نووسراوە بەو زمانە.

١) سڕینەوە و لەناوبردنی کتێبخانە، خوێندنگا، مۆزەخانە و دەزگا و ڕێکخراوەی مێژوویی و کەلەپووری ئەو گرووپە.

کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە پێی هەمان بڕیار، «کۆمەڵکوژی بە تاوانێکی نێودەوڵەتی» ناوبردە کردووە. چەند نموونەی کۆمەڵکوژی بریتییە لە: کوشتنی بەملیۆنان لە جوولەکان لەلایەن ئەڵمانییای نازی لە شەڕی جیهانی دووهەم و کۆمەڵکوژی گەلی کورد لە عەمەلیاتی ئەنفالەکان لە کوردستانی باشوور کە ١٨٢ هەزار کەس بێسەروشوێن کران (بڕوانە ئەنفال). هەروەها کوشتنی ٦٠٠هەزار ئەرمەنی لە لایەن تورکان لە ساڵی ١٩١٥.

**کۆمەڵکوژی ئەرمەنییەکان** قتل عام‌های ارامنه Armenian Masscres

بریتییە لە کوشتنی بە کۆمەڵی کەمینەی مەسیحی ئەرمەنستان کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٤ تا ١٨٩٦ لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم، ئیمپراتۆری عوسمانی بە ئەنجام گەیشت. لە لایەن ئەرتەش

PDF 4 KURD

تورکەوە، چەند ئاکارێکی نامرۆڤانەی دیکە دەرحەق بە ئەرمەنییەکان رووی داوە کە بۆتە هۆی کۆچی زۆرەملێی نزیکەی ٢ملیۆن ژن و پیاو و منداڵی ئەرمەنی بۆ سوریا و کوشتنی نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەس لەم رێگەدا. لەم ساڵانەی دواییدا هەر لایەن و گرووپێك ئەم کۆمەڵکوژییەی خستبێتە ژێر پرسیارەوە، لە لایەن دەوڵەتی تورکیاوە تووشی زەخت و گوشار بووە.

## کۆمەڵکوژی سیاسی — کشتار سیاسی — Politicide

بریتییە لە کوشتاری پلانمەندی بەکۆمەڵ بۆ لەناوبردنی ئەندامانی گرووپێکی سیاسی لە لایەن دەوڵەتێك یا دەستوپێوەنەکەی. ئەگەرچی شیکردنەوەی جینۆساید* لە گەڵ کۆمەڵکوژی سیاسی لێك جیاوازن بەڵام مەبەست لە ئەنجامی ئەم دوو کردەوە، کەم تا زۆر، لەناوبردنی جەستەیی گرووپێکی رەگەزی و سیاسییە. رەنگە لە کاتی شەڕدا کوشتنی جەنگاوەران و هێزی سەربازی شتێکی ئاسایی بێت بەڵام کوشتنی بەکۆمەڵی خەڵکی مەدەنی ئاسایی نییە. ئەگەر خەڵکی مەدەنی بە ئەنقەست و بە شێوەیەکی پلان داڕێژراو لەناو بچن، تەنانەت ئەگەر لە لایەن گرووپێکی دژ بە دەوڵەتیش پشتگیرییان لێ بکرێت، وەها رووداوێك بە کۆمەڵکوژی سیاسی یان جینۆساید ناوبردە ئەکرێت.

جیاوازی نێوان جینۆساید و کۆمەڵکوژی سیاسی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو تایبەتمەندیانەی کە ئەندامانی گرووپی ناوبراو بۆ دەوڵەت ئاشکرای دەکەن. ئەوانەی بە جینۆساید دەبنە قوربانی بە هۆی تایبەتمەندیی کۆمەڵایەتی بۆ نموونە رەگەز، ئایینزا و نەتەوە، پۆلێن دەکرێن. بەڵام لە کۆمەڵکوژی سیاسیدا هۆکاری سەرەکی بۆ لەناوچوون، دەگەڕێتەوە بۆ هایراکی کۆمەڵایەتی یان دژایەتی سیاسی و نەیاری کردن لە گەڵ دەوڵەت یا گرووپە باڵادەستەکان.

## کۆمەڵگای جڤاکی — جامعەی تودەای — Mass society

کۆمەڵگای جڤاکی لە بەرامبەر کۆمەڵگای مەدەنی بۆ باسکردن لە جۆرە پێوەندییەك لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا هاتۆتە ئاراوە. بە گشتی هەندێ لە نووسەران هەموو کۆمەڵگاکان بێ رەچاوکردنی رژێمە سیاسیەکان، بە کۆمەڵگای جڤاکی لە قەڵەم ئەدەن چونکا لەم جۆرە کۆمەڵگایەدا وێکچوویی فیکر و بیرورا بەرچاوترە لە تەوفیر و جیاوازییەکانی نێوانیان. لێکچواندن و هاوشێوەکردن، تایبەتمەندی سەرەکی کۆمەڵگای جڤاکییە. بە کورتی کۆمەڵگای جڤاکی لە رەوتی هەنگاونان لە کۆمەڵگایەکی سوننەتیەوە بەرەو کۆمەڵگایەکی مۆدێرنە سەرهەڵئەدات. لە کۆمەڵگای جڤاکیدا بە گشتی جیاوازی پیشەیی و سینفی و سوننەتییەکان کاڵ دەبنەوە.

هەنگاونان لە«رەشەگەل»ـەوە بەرەو«کۆمەڵگا» سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی جڤاکی مسۆگەر دەکات. کەلتوورە ناوچەیی و لۆکاڵییەکان لە کاتی پەیدابوونی کۆمەڵگای جڤاکی، مەحف ئەبنەوە. لە وەها کۆمەڵگایەکدا *وشیاریی چینایەتی** لە هەناوی وشیاریی جڤاکیدا ئەتوێتەوە و یەکگرتووییەك لە نێوان

PDF 4 KURD

ئایدیۆلۆژی چین و توێژەکان دێتە کایەوە. لە ناخی کۆمەڵگای جڤاکیدا زەمینە بۆ دامەزرانی رێکخراوە و بزاڤی جڤاتی خۆش ئەبێت و لە ئاکامی ئەم بەهەرەوەزکردنەدا چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگا دەکەونە ناو جەغزی دەزگا سیاسییەکانەوە. هاوبەشێتی سیاسی لەم کۆمەڵگایانەدا بە پێی حەز و بەرژەوەندی پیشەیی نییە بەڵکوو بە پێی هەرەوەزکردن و هاندانە. لەم رووەوەیە کە یەکگرتوویی ریزەکانی جڤات لاواز دەبێ و زەمینەی بە ئایدیۆلۆژیك کردنی کۆمەڵگاش فەراهەم دەبێت.

لە پێناسەیەکی تردا سیاسەتی جڤاکی یان کۆمەڵگای جڤاکی کاتێك دێتە ئاراوە کە خەڵقێکی زۆر، بەدەر لە رێسا و شێوازە سیاسییەکان، بە مەبەستی کارتێکردن لەسەر کۆمەڵگا دەست ئەدەنە کردەوەیەکی سیاسی. جگە لەمەش لە کۆمەڵگای دیموکراتیدا سیاسەتی جڤاتی دژی دیموکراسییەتە چونکا لە سیستەمی قانوونی لائەدات. نموونەی ئەم جۆرە سیاسەتە جڤاکییانە مەككارتیزمە. بە پێی شرۆڤەیەکی کۆمەڵگای جڤاکی، مەترسییەکی سەرەکی کە لە سیستەمی سیاسی و ئازادییە مەدەنییەکان هەڕەشە ئەکات، باڵادەستی و دەسەڵاتی جڤاتە بە سەر نوخبەکاندا.

## کۆمەڵگای کراوە جامعەی باز Open society

ئەم زاراوە لە لایەن کارۆل پۆپێر فەیلەسووفی نەمسایی لە کتێبی«کۆمەڵگای کراوەودوژمنەکانی» (١٩٤٥) بۆ پێناسە کردنی کۆمەڵگایەکی ئاوەڵا هاتۆتە ئاراوە کە تێیدا هەموو کەس بتوانێ بە شێوەیەکی سەمەربەخش لە دەسەڵاتداران رەخنە بگرێ. پۆپێر بە نەقڵکردنی ئەم گوزارەی پریکلێس لە گەڵیا هاودەنگە کە دەڵێ: «ئەگەرچی تەنیا جەماعەتێکی کەم. سیاسەت بەرهەم دێنن بەڵام هەمووماندەتوانین لە بارەیەوە داوەری بکەین». ئەمەش بە مەرجێك بە ئەنجام ئەگات کە هێرش بکرێت بۆ سەر ئیستبداد و هایراکی«داخراو»ی کۆمەڵایەتی و سیاسی کە ئیجازە بە کەس نادات بە پێی لێوەشاوەیی و کارامەیی بەرەو پێشەوە بروات.

## کۆمەڵگای مەدەنی جامعەی مدنی Civil society

ئەم زاراوە لە سەدەی ١٨ پاش ئاراستە کردنی تیۆری «پەیمانی کۆمەڵایەتی» هاتە ناو گوتاری سیاسییەوە. کۆمەڵگای مەدەنی حاڵەتێکە کە تێیدا مرۆڤ دەسبەرداری ئازادییە سروشتییەکان ئەبێ و گەردنکەچی دەوڵەت و یاسا ئەبێت. لەم چاخەدا باسکردن لە کۆمەڵگای مەدەنی، باسێکی جیهانییە و رەگ و ریشەکەی ئەگەڕێتەوە بۆ وڵاتانی رۆژاوا. لەم وڵاتانەدا پاش شەڕی جیهانی دووهەم هەوڵ درا بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی و بەهرەداریی خەڵك و بەرگری لە سەرهەڵدان و شۆڕش، هەڵسوکەوتی گرووپە کۆمەڵایەتییەکان بەرێوشوێن و تەکوز بکرێن چونکا پێش ساڵەکانی ١٩٨٠ کۆمەڵگای مەدەنی لە ئاستی جیهانیدا تووشی لاوازی ببوو.

قەیرانی ئابووری لە کاتی شەڕدا ببووە هۆی زیادبوونی دەوری دەوڵەتەکان لە کۆمەڵگا و ئابووردا. لەم



دوا کەس داواکاری دەوڵەتێکی بچووک نەبوو. دەوڵەتان لە کاروباری ئابووری و کۆمەڵایەتی دەستیان وەر ئەدا. ئایدیۆلۆجی ناسیۆنالیزم لە وڵاتانی جیهانی سێهەم، بە زلکردنەوەی ترسێك کە لە بێگانە یا زلهێزەکان بوویان، جێگەیان بۆ لاوازکردنی کۆمەڵگای مەدەنی خۆش کرد. تا ئەو کاتەی لەم وڵاتانەدا دوژمنێکی دەرەکی گوماناوی وێنا بکرێت و هەستی ناسیۆنالیستیش ببتە هاندەر و لە سەر یەکگرتوویی و دەسەڵاتی دەوڵەت تەئکید بکرێت، پێکهاتە و هێزەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەبنە هۆی بشێوی و لێکهەڵوەشانی کۆمەڵگا.

سەردەمی شەڕی سارد، قۆناغی داتاشینی دوژمن و ترس لە بێگانەبووە. ئەم وەهمە بۆتە ڕێگرێك لە بەردەم گەشەسەندنی کۆمەڵگای مەدەنی. ئەگەرچی ڕادەی چالاکبوونی کۆمەڵگای مەدەنی لە جیهاندا جیاواز بووە. کۆمەڵگای مەدەنی لە ڕۆژاوا بە نیسبەت ڕۆژهەڵات بەهێزتر بوو.

ئێستا پاش کوژانەوەی ئاگری کەڵە ئایدیۆلۆجیایەکی وەك کۆمۆنیزم، ڕێگا بۆ کەنەفتیی ئایدیۆلۆجیایی لە جیهاندا خۆش بووە. لە بەستێنی مەعریفەی پاش مودێرنیزمیشدا بە شێوازی جۆراوجۆر، ئایدیۆلۆجی کەوتۆتە بەر هێرش و توانج و ڕەخنەی بەهێز. بە گشتی لایەنگری لە لاوازی دەسەڵات خوازی و ئایدیۆلۆجیایی دەوڵەت و بەهێز بوونی لایەنە کۆمەڵایەتی و مەدەنییەکەی، هەر دێتوو خۆیاتر ئەبێت. هەڵبەت کۆمەڵگای مەدەنی بە درێژایی مێژوو تووشی گۆڕان بووە و واتای جۆراوجۆری لێبۆتەوە. دوایین مانای ئەم زاراوە بریتیەلە لاواز بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتەکان و ئایدیۆلۆجییە مەزنەکان. کاتێك ئایدیۆلۆجی تووشی قەیران ئەبێت و قەیرانی ڕەوابوون و شەرعییەت پەرەئەسێنێت، ئینجا لایەنگری لە کۆمەڵگای مەدەنی بە کەس ناشاردرێتەوە.

*بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی:*

١ـ بەدەستەوە نەدانی شوناس: واتە ناکرێ شوناسە کۆمەڵایەتییەکان بچووك بکرێنەوە و یەکیان لە «ئەویدی»*دا بتوێنرێتەوە. کەواتە کۆمەڵگای مەدەنی مەکۆی فرەدەنگی و پێکهاتە جیاوازەکانە.

٢ـ بنەمای سوودمەندی: خەڵکی بە شوێن زیاترین قازانج و بەرژەوەندی خۆیانەوەن. ئەم بنەمایە ئەبێتە پاڵنەرێك بۆ کۆکردنەوەی مەردم لە مەکۆیەکی کۆمەڵایەتیدا.

٣ـ بنەمای بەرپرسیاریەتی: بەرپرسیاریەتی لە گەڵ سەربەستی ئاوێتەیە. کەواتە بەرپرسیاریەتی زیاتر بە مانای ئیختیاری زیاترە. بەرپرسیاریەتی ئەبێتە هۆی ئەندامەتی ئارەزوومەندانە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا.

٤ـ بنەمای دامەزراندن: خەڵك حەز ئەکەن کەسانیتر وەکارگرن و دامەزرێنن بۆ بەدیهێنانی ئامانج و بەرژەوەندییەکانیان. ئەم بنەمایە ئەبێتە هۆی تەکوزی کۆمەڵایەتی و یەکسانی مافەکان لەناو پێکهاتەیەکدا.

٥ـ باڵادەستی: ئەوە ئینسانەکانن کە بە پێی پەیمانی نووسراو و نەنووسراو، باڵادەستیی و دەسەڵات و پلە و مەقامی خۆیان دیاری ئەکەن. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بە پێی ئەم بنەمایە هیچ کەسێك ناتوانێ مافی خودایی حوکمەتکردن بۆ خۆی قاییل بێت.

٦ـ بنەمای جەبر: جەبر سەبەبی پاکانەیە. ئەم بنەمایە دەبێتە مایەی سڕینەوەی زۆرەملی و گوشارهێنان

PDF 4 KURD

بە پێی ڕێسای ڕێکخراوەکان و هەرکەس بە پێی بەرپرسیاریەتی خۆی ئەرکەکانی خۆی بەڕێوە ئەبات.

٧ـ بنەمای نەزانین: نەزانین سەبەبی پاکانەیە. ئەم بنەمایە لە سەر گەڕیانی زانیاری بە شێوەی ئازاد لە ناو پێکهاتەکاندا لەنگەر ئەگرێ.

٨ـ بنەمای زوڵبوون: ڕوونبوون و ڕووناکی بەسوودترە و کێشە و گرفتان کەم ئەکاتەوە. بەم پێیە هیچ کەس بۆی نییە لە ناو گرووپ یان پێکهاتێك کاری شاراوە و پەنامەکی ئەنجام بدات.

٩ـ بنەمای خۆخوازی: هەر کەسێك تەنانەت لە ناو گرووپیشدا بەرژەوەندی خۆی زیاتر بەلاوە گرنگە تاکوو بەرژەوەندی کەسانی دیکە. ئەمە ئەبێتە هۆی «نە»لێکردن بە پێوەندی مورید ومورادی کە کۆمەڵگای مەدەنی ڕەت ئەکاتەوە.

## کۆمەڵناسیی سیاسی    جامعەشناسی سیاسی    Political sociology

بێگومان ڕەگ و ریشەی تەواوی لقەکانی زانستی سیاسی نوێ لەوانەش کۆمەڵناسی سیاسی، پێوەندی هەیە بە فەلسەفەی سیاسی کۆنەوە. کەواتە ئەگەر کۆمەڵناسی سیاسی وەك تەقەلایەکی فیکری بۆ شرۆڤە و کۆڵینەوەی دیاردە و ڕەفتارە سیاسیەکان پێناسە بکەین کە بە هۆی هۆکارگەلێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووری ڕوویانداوە، ئینجا بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم جۆرە تێکۆشانە لە ئەندێشەی فەلسەفی پێشونانێکی وەك پلاتۆ و ئەرەستوو، نموونەی زۆربووە.

بەم حاڵە و بەم پێشینەوە، ڕیشەی کۆمەڵناسی سیاسی، وەك لقێکی زانستی سیاسی ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکارییە فیکرییەکانی سەدەی نۆزدە. بە گشتی کۆمەڵناسی سیاسی خۆی بە لێکدانەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی سیاسەت سەرقاڵ کردووە. گەوهەری کۆمەڵناسی سیاسی بریتیە لە لێکدانەوەی کاریگەری کۆمەڵگا، چ لە بەستێنی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان و ئابوور و چ لە بواری ریزبەندی کۆمەڵایەتی و کەلتووری بە سەر ستراکتوور و ڕەفتاری سیاسیدا. بە واتایەکی سادەتر کۆمەڵناسی سیاسی، ژیانی سیاسی بە پێی بگۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لێك ئەداتەوە.

ئەو بابەتانەی کە کۆمەڵناسی سیاسی لە سەریان ئەکۆڵێتەوە بریتین لە: ئاریشەکانی نوخبە، شەرعییەت و لێهاتوویی، عەدالەتی دابەشکاری، مەرجەکانی دیموکراسی، لێکدانەوەی شۆڕشەکان، هاوبەشێتی سیاسی، دەوری ڕۆشنبیر، سیستەمی حیزبی و حیزبایەتی و بەراوردکاری حوکمەتەکان.

## کۆمەڵەی ژ. کاف(ژیانەوەی کورد)    کومله ژ. کاف
Kurdish Rebirth Society

ئەم کۆمەڵە لە ڕێکەوتی ١٩٤٢/٩/١٦ (بەرامبەر بە ٢٥ی خەرمانانی ١٣٢١ك. ه) لە شاری مەهاباد لە لایەن چەند کوردێکەوە بە مەبەستی برەوپێدانی بیروباوەڕی نەتەوایەتی لەناو جەماوەری کوردی دامەزرا. هەندێك لەو کەسانەی کە بەشدار بوون لەم ڕێکخستنەدا بریتین لە: ڕەحمان عەلەوی، محەمەدئەمین شەرەفی،

PDF 4 KURD

نانەوازادە، ڕەحمان زەبیحی، حوسێن فرووهەر(زەرگەری)، عەبدوڕەحمان ئیمامی، قاسم قادری، میرعەبدوللا داودی، ئەحمەد عیلمی، عەزیز زەندی، محەمەد یاهوو، میرحاج (کوردستانی عێراق) و قادر مودەڕسی. لە ماوەی شەش مانگدا ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵە گەیشتە ١٠٠ کەس. هەموو کوردێك دەیتوانی لە کۆمەڵەدا ببێتە ئەندام. هەرکەس ببوایە بە ئەندام، لە دیدارێکی نهێنی و بە ئامادەبوونی سێ کەس لە ئەندامانی دامەزرێنەر، حەوت جار سوێندی بە قورئان دەخوارد کە بەم شەش خاڵەی خوارەوە وەفادار بمێنێت.

١ـ بە نەتەوەی کورد خەیانەت نەکات.

٢ـ هەوڵ بدات بۆ ئۆتۆنۆمی کوردان.

٣ـ هیچ نهێنیەك نەدرکێنی چ بە زمان چ بە نووسین.

٤ـ تا دوایین ڕۆژی ژیانی هەر ئەندام بێت.

٥ـ هەموو پیاوێکی کورد بە برا و هەموو ژنێکی کورد بە خوشکی خۆی بزانێت.

٦ـ بێ ئیجازەی کۆمەڵە لە هیچ پارت و ڕێکخراوەیەکی دیکەدا نەبێتە ئەندام.

لە مانگی گوڵانی ١٩٤٣ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بە ئامادەبوونی سەد کەس لە ئەندامانی کۆمەڵە، لە سەر کێوی خواپەرست، لە نزیك مەهاباد، هەڵبژێردران. بەڵام کەسێك بەناوی سەرۆك یا سکرتێر دیاری نەکرا بەڵکوو کۆمیتەیەکی سێ کەسی کە پێکهاتبوون لە ڕەحمانی زەبیحی، ڕەحمانی شەرەفکەندی(هەژار موکریانی) و محەمەد یاهوو، وەك دەستەی سەرۆکایەتی دەستنیشان کران. لە مانگی ڕەزبەری ١٩٤٤ قازی محەمەد بوو بە ئەندامی کۆمەڵەی ژ. کاف. کۆمەڵە لە گەڵ حیزبی هیوا(کوردستانی باشوور) و خۆیبوون*(کوردستانی باکوور)پێوەندی بووە و ڕۆڵێکی گرینگی هەبووە لە گەشەپێدانی هەستی نەتەوایەتی لە ناوچەکەدا. پاش دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/٨/١٦ بە سەرۆکایەتی قازی محەمەد و دامەزراندنی کۆماری کوردستان*، کۆمەڵەی ژ. کاف لەناو ئەو حیزبەدا توایەوە.

## کۆمەڵی گشتی — مجمع عمومی — General Assembly

کۆمەڵی گشتی، بەشێکی گرنگ و سەرەکی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە هەموو ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان تێیدا نوێنەریان هەیە. ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵی گشتی تا سێپتەمبەری ١٩٧٧، گەیشتە ١٤٩ وڵات. لە ساڵی ٢٠٠٢، ژمارەی ئەندامان گەیشتە ١٩١ وڵات. هەر وڵاتێکی ئەندام، دەتوانێ بە پێنج نوێنەری هەمیشەیی و پێنج نوێنەری یەدەکی لە کۆبوونەوەکانی ساڵانەی کۆمەڵ دا بەشداری بکات بەڵام هەر وڵاتێك یەك دەنگی هەیە. کۆبوونەوەکان، ساڵی جارێك لە سێهەمین سێ شەممەی مانگی سێپتەمبەر گرێ دەدرێ بەڵام سکرتێری گشتی دەتوانێ لەسەر داوای ئەنجومەنی ئاسایش یا زۆرینەی ئەندامەکان داوای بەستنی کۆبوونەوەی نائاسایی بکات.

PDF 4 KURD

کۆمەڵی گشتی، تاکە دەزگای سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکانە کە هەموو وڵاتان نوێنەریان تێیدا هەیە و بە پێی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بە تەنیا یا لە گەڵ ئەنجومەنی ئاسایش، دەتوانن ئەندامی بەشەکانی دیکە دەست نیشان بکات. جگە لەمەش هەموو دەزگاکانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان دەبێ هەموو ساڵێك راپۆرتی چالاکییەکانی خۆیان پێشکەش بە کۆمەڵی گشتی بکەن. بە گشتی بڕیاردان لەمەڕ کێشە و رووداوە گرنگەکان، وەك پێشنیاز و ئامۆژگاری دەربارەی ئاشتی و ئاسایشی جیهانی، هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش، دەرکردن یا هەڵپەساردنی ئەندامەکان و ... بە دەنگی دوو لەسەر سێی ئەندامانی کۆمەڵە بە ئەنجام دەگات.

بە پێی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆمەڵی گشتی لە چارەسەرکردنی ئەم کێشە نێودەوڵەتیانەی خوارەوەدا بەشداری دەکات:

١ـ ئەو کێشە نێودەوڵەتیانەی کە پێوەندییان هەیە بە نەهێشتنی چەك.

٢ـ ئەو کێشە نێودەوڵەتیانەی کە هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی دەکەن.

٣ـ ئەو کێشانەی کە پێوەندییان هەیە بە پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی، مادامێکی لە لایەن ئەندامێکی نەتەوەیەکگرتووەکان یا ئەنجومەنی ئاسایشەوە داوا بکرێ.

٤ـ ئەو کێشانەی کە زیان بە باری خۆشگوزەرانی گشتی و پێشکەوتنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەگەیەنن.

٥ـ ئەو کێشانەی کە لە بەردەم سەقامگیر بوونی پێوەندییە نێودەوڵەتییەکان ئاستەنگ دروست دەکەن.

## کۆمەڵی نەتەوەکان    جامعەی ملل    League of nation

رێکخراوەیەکی نێونەتەوەیی بوو کە لە ساڵی ١٩٢٠ بە پێی پەیماننامەیەکی ٢٦مادەیی کە بەشێك بوو لە پەیمانی ڤێرسای، دامەزرا. ناوەندی کۆمەڵە لە جێنیڤ بوو. کۆمەڵەی نەتەوەکان، بە دامەزراندنی «رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان»* لە ساڵی ١٩٤٦ لێك هەڵوەشا. ئەم کۆمەڵە بە پێی مادەی ١٤ی پرەنسیپەکانی ویلسۆن (١٨٥٦ـ ١٩١٩)، سەرکۆماری ئەمریکا، دامەزرا( بڕوانە چواردە مادەی ویلسۆن) بەڵام کۆنگرەی ئەمریکا پەسندی نەکرد و ئەم وڵاتە نەبووە ئەندام. جاڕنامەی کۆمەڵە، ئەندامانی پابەند ئەکرد بەوەیکە رێز بۆ یەکتر دابنێن و دەسدرێژی نەکەنە سەرخاکی یەکتر و بۆ راهیکردنی کێشەکانیان، روو نەکەنە زەبروزەنگ و ئەم کارە بسپێرنە کۆمەڵەی نەتەوەکان.

کۆمەڵە ساڵی جارێك دانیشتنی ساز ئەکرد و نوێنەرانی هەموو ئەندامەکان تێیدا بەشدار بوون. «لیژنەی کۆمەڵە» پێکهاتبوو لە ١٥ ئەندام، لەوانە ئیتالیا، ژاپۆن، فەرەنسە و بەریتانیا و دواتر ئەڵمانیا و سۆڤیەت وەك ئەندامانی هەمیشەیی کە لە ساڵیکدا سێ جار دانیشتنی ساز ئەکرد. دادگای جیهانی و رێکخراوەی نێونەتەوەیی کار لە رێکخراوە لاوەکییەکانی کۆمەڵە، لە ئەژمار دێن. گرفتی سەرەکی کۆمەڵەی نەتەوەکان ـ هەر وەك رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکانیش پێوەی ئەتلێتەوە ـ بریتییە لە نەبوونی زەمانەتێك

PDF 4 KURD

بەڕێوەبردن و پیادەکردنی بڕیارەکانی چونکا ناتوانێ دەوڵەتە زلهێزەکان بە ئەنجامدانی ئەو بڕیارانە پێمل بکات.

سەرەتای هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە، ئەو کاتە بوو کە دەوڵەتە گەورەکان، دەستیان دایە داگیرکاریی و کۆمەڵە هیچ کارێکی لە دەست نەهات. بۆ وێنە ژاپون لە ساڵی ١٩٣١ بە هەڵگیرساندنی شەڕی دووهەمی خۆی لە گەڵ چین، لەم کۆمەڵە هاتە دەرەوە. یان هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٣ بۆ پشت ئەستوورکردنی خۆی، وڵاتەکەی لە کۆمەڵە کێشایە دەرەوە کە دەرەنجامەکەی شەڕی جیهانی دووهەمی لێکەوتەوە.

## کۆمیسیۆنی ئابووری ئەورووپا    کمیسیون اقتصادی اروپا

## Economic Commission for Europe

ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەم کۆمیسیۆنەی لە ٢٨ی مارسی ١٩٤٧ بە مەبەستی پەرەپێدانی هاوکاری ئابووری و بەرزکردنەوەی ئاستی چالاکی ئابووری ئەورووپا بۆ پاوەجێکردنی پێوەندی ئابووری وڵاتانی ئەورووپی لەگەڵ وڵاتانی دیکە دامەزراند. ئەندامانی کۆمیسیۆن بریتین لە: ئەندامانی ئەورووپی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم کۆمیسیۆنە چەندین کۆمیتەی هەیە کە چاودێری کاروباری بەرد و خەڵووز، پۆڵا، پەرەپێدانی بازرگانی و کشتوکاڵ، پیشەسازیی، کارەبا و هاتوچۆ دەکەن و وڵاتانی ئەندامیش ساڵی جارێك کوبوونەوەی جۆراوجۆر ساز دەکەن. بارەگای کۆمیسیۆن لە شاری جنێڤ دایە. پێویستە بگوترێ کە ئەم کۆمیسیۆنە ئێستا کارێکی ئەوتۆ ئەنجام نادات و لە دانیشتنەکاندا تەنها لەمەڕ ڕەوشی ئابووری و بابەتەکانی دیکە بیر و ڕا دەگۆڕێتەوە.

## کۆمیسیۆنی ماڧی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان

## کمیسیون حقوق بشر ملل متحد

## United Nations Commission on Human Rights

یەکێك لە لقەکانی ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە لە ساڵی ١٩٤٦ بە پێی بەندی ٦٨ جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان*دامەزرا و لە یەکەمین هەنگاوی خۆیدا بەیاننامەی جیهانی ماڧی مرۆڤی دەرکرد. بە هۆی ئەوەی بڕیارەکانی ئەم کۆمیسیۆنە لە ئاست مەسەلەکانی هاوپێوەند لە گەڵ ماڧەکانی مرۆڤ زەمانەتی جێبەجێکردنیان نەبوو، لە ساڵی ٢٠٠٦ هاوکات لە گەڵ پیادەکردنی هەندێ ریفۆرم لە ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەم کۆمیسیۆنە پەرەی پێدرا و بە «ئەنجومەنی ماڧەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکان» ناوی گۆڕا کە تێیدا وڵاتانێکی زیاتر بوونە ئەندام.

## کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتی لێپرسینەوە    کومیسیون بین المللی تحقیق

## International Cmmission of Investigation

ئەم کۆمیسیۆنە ڕێگایەکی ئاشتیخوازانەیە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییە نێودەوڵەتییەکان. هەر کا

PDF 4 KURD

کێشە یان قەیرانێك بێتە ئاراوە، چەند کەسێك(بە ناوی کۆمیسێر) رادەسپێرێت لە کێشەکە بکۆڵنەوە. کاری ئەم راسپاردانە «دەرخستنی ماهییەت و چۆنییەتی مەسەلەکەیە» و ماق ئەوەیان نییە لەمەڕ بەرپرساریەتی کەسەکان هیچ زانیارییەك ئاشکرا بکەن. تەنیا وڵاتانی هاوپێوەند لەگەڵ کێشەکەدا بۆیان هەیە لە راپۆرتی کۆمیسیۆنەکە تێبگەن و مەسەلەکە لە نێوان خۆیاندا کۆتایی پێ بهێنن یا بیسپێرنە بەردەم دادوەرێك.

ئەم شێوازی چارەسەرییە، دەرەنجامی کۆنفرانسەکانی ئاشتی لاهای بووە کە لە بەندی ٩ تا ٣٦ رێککەوتننامەی ژمارە یەك، رێکەوتی ١٨ ئۆکتۆبەری ١٩٠٧ باسی لێکراوە. بەپێی رێساکانی لاهای، بۆ وەگەڕخستنی کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتی لێپرسینەوە، دەبێ ئەم رێسایانەی خوارەوە لەبەر چاو بگیرێت:

١) بابەتی کاری ئەم کۆمیسیۆنە رووخستنی چۆنییەتی کێشەکەیە.

٢) بەکارهێنانی ئەم شێوازە دڵخواز و ئازادانەیە.

٣) ئەم کۆمیسیۆنە بەپێی بەستنی رێککەوتننامەیەکی تایبەت دادەمەزرێت.

٤) راپۆرتی کۆمیسیۆنەکە بە سەر وڵاتانی پەیوەندیدار داناسەپێ و لایەنەکانی کێشەکە لە چۆنییەتی هەڵسوکەوت لە گەڵ مەسەلەکەدا سەرپشکن.

## کۆمین تانگ کومین تانـگ Kou-Min-Tang

کۆمین تانگ، ناوی *پارتی نیشتمانی گەلی* چین بوو کە لە ساڵی ١٩١١ لە لایەن سون یات سون، دامەزرا تا بە دژی زوڵم و زۆری دەسەڵاتدارانی تاکڕەو و کۆلۆنیالیستی وڵاتی چین خەبات بکات. پاش ماوەیەك بە هۆی چالاکییەکانی ئەم حیزبە، رژێمی پادشایی منچۆ رووخا و حوکمەتی کۆماری چین لەو وڵاتەدا بنیات نرا. پاش مردنی سون یات سون، لە ساڵی ١٩٢٥، چیانگ کای شك، رێبەرایەتی حیزبەکەی بەدەستەوە گرت و لە رواڵەتدا حوکمەتێکی نوێی بە ناوی کۆماری دیموکراتیکی چین پێکهێنا و پاشان زەمینەی بۆ سەرۆك کۆماریی خۆی خۆش کرد و کەوتە دژایەتی کردن لە گەڵ کۆمۆنیستەکان. چیانگ کای شك، حیزبەکەی کردە باڵێکی راستڕەو و لە رووی سەربازییەوە بەهێزی کرد و لە ساڵانی ١٩٣٧ تا ١٩٤٥، بە دژی ژاپۆنییەکان کەوتە جەنگەوە و لە گەرمەی جەنگی دووهەمی جیهانیدا رێبەرایەتی حیزبی کۆمین تانگ و حوکمەتی چینی لە ئەستۆدا بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٤٨ لە بەرامبەر حیزبی کۆمۆنیستدا شکا و بە ناچار لە گەڵ ژمارەیەك لە هێزەکانی بەرەو دوورگەی تایوان (فورمۆز) پاشەکشەی کرد و لەوێ حوکمەتی نیشتمانی چین(تایوان)ی دامەزراند. چیانگ کای شك، هەمیشە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە رۆژێك دێت هێرش بکاتەوە سەر چین. کێشەی نێوان تایوان و چین هەتانووکەش هەر بەردەوامە و دەوڵەتی چین هەمیشە تایوان بە بەشێك لە خاکی وڵاتەکەی دەزانێ و هەتا ئێستاش بە شێوەیەکی رەسمی دانی پێدا نەناوە. ئەم مەسەلە بۆتە هۆی کێشە لە نێوان پێوەندییەکانی وڵاتی چین لە گەڵ وڵاتێکی بەهێزی وەك ئەمریکا. بۆیە لە ساڵی ٢٠٠٩ کاتێك ئەمریکا چەك و تفاقی جەنگی فرۆشت بە تایوان، چین رووی لەم وڵاتە گرژ کرد و کەوتە هەڕەشە لەمەڕ دەوامەی پێوەندییەکانیان.

PDF 4 KURD

## کۆمینتێرن کومينترن Comintern

زاراوەی کۆمینتێرن، ناوی کورتکراوەی کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی یا ئەنتەرناسیۆنالی سێهەمە کە لە ساڵی ١٩١٩ لە مۆسکۆ بەڕێوەچوو. لە ئەنتەرناسیۆنالی سێهەمدا هەموو ئەو حیزبە مارکسی و کۆمۆنیستیانەی جیهان و کەسانی چەپڕەو کۆبوونەوە تا لە هەمبەر بڕیارەکانی کۆمۆنیستە میانڕەوەکان و حیزبە سۆشیال دیموکراتەکانی ئەورووپا لە ئینتەرناسیۆنالی دووهەم یەکبگرن و بەدژییان ڕاپەڕن. هەروا لەم کۆبوونەوەدا هەموو ئەندامانی کۆمینتێرن بڕیاریان دا شۆڕشێکی جەماوەری بەدژی سەرمایەداری و بۆرژوازی سازکەن بەڵام بەهۆی جەنگی جیهانی دووهەم و سەرهەڵدانی هیتلەر لە ئەڵمانیا(١٩٣٣)، کۆمینتێرن لە میانەی ساڵەکانی ١٩٣٦ تا ١٩٤٣ لە لایەن ستالین بە مەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی هاوپەیمانان بۆ لای خۆی هەڵوەشایەوە.

## کۆمنیفۆرم كومينفورم Cominfform

ناوی کورتکراوەی «نووسینگەی هەواڵگریی حیزبە کۆمۆنیستەکانی یەکیەتی سۆڤیەت» بوو کە لە ئۆکتۆبەری ١٩٤٧ بە دەستپێشخەری حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتی سۆڤیەت لە بەلگراد دامەزرا. مەبەستی کۆمینفۆرم، فراوانترکردنی چالاکی حیزبە کۆمۆنیستیەکانی وڵاتانی چێك وسلۆڤاکیا، بولگاریا، فەرەنسا، پۆڵەندا، مەجارستان، ئیتالیا، ڕۆمانیا و یۆگوسلاڤیا بوو. نوێنەری سۆڤیەت (ئاندری ژدانۆف)، بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە جیهان بە دوو ئۆردووگای سۆشیالیزم و سەرمایەداری دابەش بووە، کۆمۆنیستەکانی بۆ خەباتێکی بێوچان بەدژی سەرمایەداری بانگهێشت کرد و ئەمەش سەرەتای قۆناغی *شەڕی سارد**بوو. پاش دەرکردنی یۆگۆسلاڤیا لە ساڵی ١٩٤٨، ناوەندی کۆمینفۆرم لە بەلگراد بۆ بوخارێست گوازرایەوە. کۆمینفۆرم، هیچ کات نەیتوانی بە قەدەر *کۆمینتێرن** دەوری کاریگەر ببینێت هەر بۆیە لە ئاڤریلی ١٩٥٦ دوای هەوڵەکانی خرۆشچۆف بۆ ئاشت بوونەوە لە گەڵ یۆگوسلاڤیا، لێك هەڵوەشا.

## کۆنترۆڵی چەك كنترل تسليحات Arms Control

کۆنترۆڵی چەك، پرۆسەی ڕێسامەندکردنی بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێکە. جیاوازی ئەم پرۆسە لە گەڵ *چەك داماڵین** لەوەدایە کە مەبەست لە چەك داماڵین، گەیشتن بە ڕێگایەکی ئاشتیخوازانەیە بۆ قت کردنی چەك و تەقەمەنی لە ڕیزی خەرج وبەرجی دەوڵەتەکاندا. کۆنترۆڵی چەك بە پێی ستراتیجی و پەیمانی جۆراوجۆر جێبەجێ دەکرێت کە دەکرێ بەم شێوەی خوارەوە ئاماژەیان پێ بکەین:

١) بەربەستکردنی ڕادە و جۆری ئەو چەکانەی کە لە شەڕدا بەکار دەچێت.

٢) بەربەستکردنی هێزی خاپوورکەرانەی چەکەکان لە ڕێگای کەمکردنەوەی جبەخانەکانەوە.

٣) کەمکردنەوەی گشتی ڕادەی چەکەکان.

٤) قەدەغە کردنی وەبەرهێنانی ئەو تەکنۆلۆژییانەی کە لە هاوسەنگی دەسەڵاتدا دەور دەبینن.

PDF 4 KURD

٥) دۆزینەوەی چارەسەرییەکی متمانەبەخش.

ڕێککەوتن لەسەر کۆنترۆڵی چەك، ڕێگرە لەبەردەم بەرهەمهێنانی هەندێ چەکدا و لە بەرامبەر وەبەرهێنانی ئەو چەکانەی کە مەترسی هەڵگیرسانی شەڕ دێنێتە ئاراوە، تەگەرە سازدەکات. لە ساڵی ١٩٤٥ بەملاوە زۆربەی ڕێککەوتننامەکانی کۆنترۆڵی چەك، خۆلاسە بۆتەوە لەسەر نەهێشتنی پەرەپێدانی چەکی ناوەکی، کیمیایی و بایەلۆجی، سیستەمی مووشەکی دژی بالستیك و کەمکردنەوەی تاقیکارییە ئەتۆمییەکان کە بریتین لە:

- پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ لە جنێڤ لە بابەت بەکارنەهێنانی گازی ژەهراوی و چەکی باکتریۆلۆجیك.
- پەیمانی ١٩٥٩ جەمسەری باشوور لە بارەی نەکردنەوەی بنکەی چەکداری لە باشوور.
- کۆنڤانسیۆنی ١٩٧٢ چەکە بایەلۆژییەکان لەمەڕ نەهێشتنی وەبەرهێنان و خاوەندارییەتی ئەم جۆرە چەکانە.
- پەیمانی ١٩٦٨ بەربەستکردنی چەکی ئەتۆمی (NPT).
- گفتوگۆ لەمەڕ بەربەستکردنی چەکی ستراتیجیك، ناسراو بە سالت* لە ساڵی ١٩٧٢.
- پەیمانی کەمکرنەوەی چەکی ستراتیجیك، ناسراو بە ستارتی یەك (١٩٩١).
- کۆنڤانسیۆنی ١٩٩٣ چەکی کیمیایی (CWC) کە خوازیاری لەناوبردنی هەماری چەکی کیمیایی دەوڵەتانی ئیمزاکردەیە لە ماوەی ١٠ ساڵدا.
- پەیمانی مین(ئەڵغام)ی دژە نەفەر ١٩٩٨(APLT) .

یەکێك لەو گرفتانەی کە لەسەر ڕێی کۆنترۆڵی چەکەکاندا پێش هاتووە، مەسەلەی سەلماندن و بەڕاست گەڕانی پرۆسەکەیە کە تەنانەت بە یارمەتی سەتەلایتی زۆر پێشکەوتووش ناکرێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەم پرۆسە، بە دەوڵەتەکان متمانە بکرێت. بۆ نموونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا خۆی یەکێك لەو دەوڵەتانە بووە کە کۆنڤانسیۆنی ١٩٩٣ چەکی کیمیایی واژۆ کردووە کەچی ڕادەیەکی زۆری لەم جۆرە چەکانەی بەرهەم هێناوە و لە هەمارەکانی خۆیدا سەریەکی ناوە. لە لایەکی‌ترەوە سەپاندنی گەمارۆی دیپلۆماسی و ئابووریش، تەنیا بەسەر وڵاتانی لاوازدا زەختی دەهێنێ و بۆ وڵاتانێکی وەك ئەمریکا و چین و ڕووسیا کاریگەری نابێت.

## کۆنسوڵ　　کنسول　　Consul

کۆنسوڵ پۆستێکی گرنگی هەر شاندێکی دیپلۆماسییە کە ئەرکی ڕاپەڕاندنی کاروباری باڵیۆزخانەیەك بەزۆری لە ئەستۆ دەگرێ. هەندێ لەو ئەرکانە بە پێی پەیماننامەی ١٩٦٣ ڤییەن بریتین لە:

- پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و هاووڵاتیانی خۆی بە مەبەستی پەرەپێدانی پێوەندی بازرگانی و ئابووری و کولتووری.
- جێبەجێکردنی هەندێ کاروباری ئیداری وەك دەرکردنی ناسنامە و ڤیزە و تۆمارکردنی گرێبەست

PDF 4 KURD

هاوسەرێتی و ئاسانکاری پێویست بۆ ئەو کەسانەی کە دەخوازن سەردانی وڵاتەکەی بکەن.

- راگەیاندنی بەڵگەنامەی دادوەری و ئیداری و جێبەجێکردنی کاروباری دادوەری بە وەکالەت بە پێی رێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان و ...

باڵیۆزخانەکان دەتوانن جگە لە کۆنسوڵی جێنشین لە پایتەخت، لە شارە گرنگەکانی وڵاتی میوانیش کۆنسوڵگەری بکەنەوە. (بۆ نموونە کۆنسوڵی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە هەولێر). ژمارەی ئەم کۆنسوڵگەریانە و ئەندامەکانی بەستراوەتەوە بە ئاستی پێوەندی و رێککەوتنی هەر دوو وڵات. ئەگەر وڵاتێك لە وڵاتێکی دیکە چەند کۆنسوڵگەرییەك بکاتەوە، دەتوانێ سەرکۆنسوڵگەریش دابمەزرێنێ کە چاودێری کاروباری کۆنسوڵگەرییەکان بکات. کۆنسوڵ یا سەرکۆنسوڵ، لە رووی کارگێڕییەوە لە خوارووی باڵیۆزە بەڵام لە کارەکانی خۆیدا سەربەخۆییەکی زیاتری لە ئەندامانی دیکەی باڵیۆزخانە هەیە. کۆنسوڵیش وەك فەرمانبەرە سیاسییەکانی دیکە، ماڧ پارێزراویی دیپلۆماسی هەیە. ئیمڕۆکە لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا کۆنسوڵ بە چوار پلە دابەش دەکرێت کە بریتین لە:

١- سەرکۆنسوڵ، ٢- کۆنسوڵ، ٣- جێگری کۆنسوڵ، ٤- نوێنەری کۆنسوڵ.

### کۆنفرانس — کنفرانس — Conference

١- کۆبوونەوەی نوێنەرانی سیاسی هەرخۆحەسێوی(تام‌الاختیار) دوو یان چەند دەوڵەت بۆ دۆزینەوەی رێگاچارە و گەیشتن بە دەرەنجامێك لەسەر مەسەلەیەکی سیاسی نێودەوڵەتی. ئەو رێگاچارە و دەرەنجامانە دەبێ لە بەڵگەنامەیەکی سیاسیدا بنووسرێت. بۆ نموونە کۆنفرانسی ئاشتەوایی جەنگی جیهانی یەکەم.

٢- کۆبوونەوەی وەزیری دەرەوەی وڵاتێك لە گەڵ نوێنەرانی راسپاردەی دەرەوەی ئەو وڵاتە بۆ کۆڵینەوەی مەسەلەیەکی سیاسی. بۆ وێنە کۆنفرانسی لەندەن بۆ کاروباری بەلجیکا لەساڵی ١٨٠٣ تا ١٨٣٩.

٣- کۆبوونەوەی نوێنەرانی چەند دەوڵەتێك کە ماڧ ئیمزاکردنی پەیماننامەیان نییە و تەنیا بۆ لێکۆڵینەوە و موتاڵای مەسەلەیەکی دیاریکراو دادەنیشن و ئەنجامی کۆڵینەوەکان بۆ تاقیکاری ئاراستەی دەوڵەتەکانی خۆیان دەکەن. بۆ نموونە کۆنفرانسی یاسای نێودەوڵەتی تایبەتی لاهای.

٤- کۆبوونەوەی رێکخراوەی راوێژکاریی دەزگایەکی نێودەوڵەتی کە لە رێساکانیدا پێکهاتە و فۆرم و ئەرك و تەوزیمەکانی دیاری کرابێت. بۆ نموونە کۆنفرانسی نێودەوڵەتی کار و کۆنفرانسی گشتی یۆنسکۆ.

٥- کۆبوونەوەی رێکخراوە تایبەتییەکان کە نوێنەری دەوڵەتان تێدا ئەندامن. بۆ وێنە ئەنجومەنی خاچی سوور یا مانگی سوور.

ئەم زاراوە هەروا بۆ توێژینەوە و باسکردن لەسەر بابەتی زانستی و تەکنۆلۆجی خوێندکاران و قوتابیان بەکار براوە بۆ وێنە کۆنفرانسی خوێندکارانی کۆلێژی پزیشکی یا ئەدەبی.

### کۆنفرانسەکانی جنێڤ — کنفرانس‌های ژنو — Geneva Conferences

ئەم زاراوە، ئەم زنجیرە کۆنفرانسە لە خۆ دەگرێ:

PDF 4 KURD

١ـ کۆنفرانسی مانگەکانی پێنج تا حەوتی ١٩٥٤ بۆ چارەسەر کردنی شەڕەکانی کوریا و هیندوچین کە بوو بە هۆی کۆتایی هاتنی داگیرکارییەکانی فرەنسا لە ناوچەی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و سەربەخۆیی ڤیتنامی باکووری و باشووری و لائۆس و کامبۆجیا.

٢ـ کۆنفرانسی مانگی حەوتی ١٩٥٥ی سەرۆکی وڵاتان بە بەشداربوونی ئایزنهاور، خرۆشچۆف، ئایدن و ئۆدگار فۆر(سەرۆك وەزیرانی فرەنسا) بۆ هێورکردنەوەی کرژیی شەڕی سارد.

٣ـ مانگی دوازدەی ١٩٧٣، کۆنفرانسی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوین لە ژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان کە هیچ دەرەنجامێکی لێ نەکەوتەوە.

٤ـ کۆنفرانسی مانگەکانی ئۆکتۆبەر ـ نۆڤەمبەری ١٩٧٦ لە بابەت دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەك بۆ زیمبابووە.

**کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئاسیا** کنفرانس امنیت و همکاری آسیا

Conference for Security and Cooperation in Asia (CSCA)

ئەم دانیشتنە هاوشێوەی «کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری لە ئەوروپا»*یە کە بە مەبەستی پاراستنی ئاشتی و ئۆقرەیی لە ئاسیادا پێکهاتووە. دوابەدوای دانیشتنی سەرۆك کۆماری وڵاتانی ئێران، تورکیا و وڵاتانی ئاسیای ناوین لە عیشقاباد لە ساڵی ١٩٩٢ لە بارەی پێویستی ڕێکخستنێکی نوێ بۆ ئاسایش، سەرکۆماری قازاغستان پێشنیازی دامەزراندنی کۆنفرانسێکی لەم شێوەی چێکرد کە ئامانجەکانی بریتی بوون لە:

١ـ دەستەبەرکردنی گەرەنتییەك بۆ پیادەکردنی ئاسایش و ئۆقرەیی ناوچەکە لەسەر بنەمای سنوورە ناسراوەکانی ئەو کاتە.

٢ـ ئاسانکاری بۆ پەرەسەندنی هاریکاری لە نێوان وڵاتانی ناوچەکە.

٣ـ دیاریکردن و بەکارهێنانی پێوانە و پێکهاتەی یەکسانی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

کۆنفرانس، سێ بابەتی بۆ وێککەوتن دیاری کردووە: ئاسایش، ئابووری و ئینسانی.

**کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا** کنفرانس امنیت و همکاری اروپا

Conference on Security and Cooperation in Europe (CSCE)

ئەم کۆنفرانسە پێکهاتووە لە ٥٣ وڵاتی ئەندام کە لە دوای ئیمزاکردنی «کۆنفرانسی هلسینکی» لە ساڵی ١٩٧٥ بنیات نرا. ئامانجەکانی ئەم کۆنفرانسە لە «جاڕنامەی پاریس» کە لە ڕێکەوتی ٢١ی نوامبر ١٩٩٠ لە لایەن ئەندامەکانی ئیمزا کرا بریتی بوون لە:

پابەندبوون بە چارەسەری کێشە و ناکۆکییەکان لە ڕێگای ئاشتییانە و ڕێزگرتن لە بەهاکانی دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ. ئەم کۆنفرانسە هەنگاوێکی گرنگ بوو بۆ نەهێشتنی گرژیی لە نێوان هەردوو ئۆردووگا

PDF 4 KURD

رۆژهەلات و رۆژاوا و هەلوەشانەوەی سنوورەکانی نێوان ئەم دوو بلۆکە. گرنگترین بڕیاری کۆنفرانس، سەقامگیرکردنی سنوورەکانی ئەوکاتەی ئەورووپا بوو.

وەزیرانی دەرەوەی ئەم کۆنفرانسە هەموو ساڵێك پێکەوە دیدار دەکەن و بە پێی بڕیارنامەیەك ئەم دەزگایانەی خوارەوە بۆ پێشڤەبردنی کاروباری کۆنفرانس دامەزراون:

١- ناوەندی نووسینگەی کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا لە پراگ ـە.

٢- «ناوەندی بەرگرتن لە پێکدادان» بنکەکەی لە ڤیەنای وڵاتی نەمسایە.

٣- «نووسینگەی هەڵبژاردنی ئازاد» لە وارشەو (پۆڵەندا)یە.

ئەندامانی ئەم کۆنفرانسە بریتین لە:

ئاڵبانیا، ئەرمەنستان، نەمسا، ئازەربایجان، بەلجیکا، بووسنی هەرزەگۆڤین، بریتانیا، بولغارستان، رووسیەی سپی، کەنەدا، کرۆڤاسیا، قوبرس، چێك، دانیمارك، فەنلاند، فرەنسا، گورجستان، ئەڵمانیا، مەجارستان، ئیسلەندا، ئیرلەندا، ئیتالیا، قازاغستان، قرغیزستان، لیتۆنیا، لیختنشتاین، لیتوانیا، لۆکزامبۆرگ، ماڵت، مۆڵداوی، موناکۆ، هۆڵەندا، نەرویج، پۆڵەندا، پۆرتوغال، رۆمانیا، فیدراسیۆنی رووسیە، سێن مارینۆ، سلۆڤاکیا، سلۆڤانیا، سپانیا، سوید، سویسرا، تاجیکستان، تورکیا، تورکمانستان، ئوکراین، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئوزبەکستان، ڤاتیکان، یۆگوسلاڤیا (سیربستان و مۆنتێنگرۆ) و یۆنان.

لە دانیشتنی بوداپێست (٦و٥ ی دێسەمبری ١٩٩٤) ناوی ئەم کۆنفرانسە بوو بە «رێکخراوەی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپا»(OSCE) .

## کۆنفرانسی ئاسیا ـ ئەفریقا کنفرانس کشورهای آفریقایی ـ آسیایی
## Afro-Asian Conference

ئەم کۆنفرانسە لە ئاڤریلی ١٩٥٥ لە باندۆنگی ئەندونیزیا پێکهات و یەکەم کۆنفرانسی نێوان ـ دەوڵەتانی کیشوەری ئاسیا و ئەفریقا لە ئەژمار دێت. ئەگەرچی ناکۆکییەکی توند لە نێوان وڵاتانی لایەنگری رۆژاوا و دەوڵەتانی لایەنگری کۆمۆنیستی و وڵاتانی بێلایەن لە ئارادا بوو بەڵام کۆنفرانسی باندۆنگ، چەند بڕیارێکی لەمەڕ هاریکاری ئابووری و کولتووری و خودموختاری و دژایەتی لە گەڵ کۆلۆنیالیزم دەرکرد. ئەم کۆنفرانسە، سەرەڕای دژایەتی چین، پشتگیری خۆی لە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ راگەیاند.

وڵاتانی بەشدار بریتی بوون لە: ئەفغانستان، کامبۆج، سەیلان، ئەردەن، لائۆس، لوبنان، لیبریا، لیبی، نیپاڵ، پاکستان، ئێران، فیلیپین، عەرەبستان، سوودان، سووریا، تایلەند، تورکیا، ڤیتنامی باکووری و باشووری و یەمەن. توێژەرانی سیاسی نوێنەرانی قوبرس، ئەمریکا و کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقاش بەم کۆنفرانسەوە دەلکێنن.

PDF 4 KURD

**کۆنفرانسی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناوین** کنفرانس صلح خاورمیانه

Middle – East Peace Conference

ئەم کۆنفرانسە لە مانگی ۱۰ی ۱۹۹۱ بە دەست پێشخەری ئەمریکا و بە ئامادەبوونی دوو لایەنی شەڕ (عەرەب و ئیسراییل)، جۆرج بۆش(باوك) سەرکۆماری ئەمریکا و گورباچۆف سەرکۆماری ئەوکاتەی یەکیەتی سۆڤیەت، لە مەدرید پێتەختی ئیسپانیا گرێدرا. پاش چەند قۆناغ دانیشتن و گفتوگۆ، *ڕێکخراوەی ڕزگاری خوازی فەلەستین**و ئیسراییل پێکەوە ڕێککەوتنێکی ئاشتییان لە بەرواری ۱۹۹۳/۹/۱۳ لە ژێر سەردێری «اعلامیه اصول» بە ئامادەبوونی بیل کلینتۆن سەرکۆماری ئەمریکا و وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و ڕووسیە لە واشینتۆن ئیمزا کرد. ڕێککەوتنێکی سازش لە نێوان ئەردەن و ئیسراییلیش لە ڕێکەوتی ۱۹۹٤/۷/۲۵ لە کۆشکی سپی واژۆ کرا. جێی ئاماژەیە، ئیمزا کردنی ئەم ڕێککەوتننامانە بووە هۆی نارەزایەتی گرووپە فەلەستینیەکان لەوانە، حەماس*و حیزبوڵڵا.

**کۆنفرانسی ئاشتی لاهای(۱۸۹۹)** کنفرانس صلح لاهه (۱۸۹۹)

Hague Peace Conference of 1899

ئەم کۆنفرانسە بە دەست پێشخەری نیکۆلای دووهەم، ئیمپراتۆری سۆڤیەت دامەزرا و لەسەر سێ مەسەلەی سەرەکی ڕێککەوتن:

۱ـ دامەزراندنی دیوانی هەمیشەیی دادوەری، وەك سەرچاوەیەکی بڕواپێکراو.

۲ـ ئامادەکردنی یاسا و ڕێسای شەڕی زەوینی.

۳ـ پیادە کردنی ڕێککەوتننامەی ۱۸٦٤ جنێڤ دەربارەی شەڕی دەریایی.

کۆنفرانسی دووهەمی لاهای لە ڕێکەوتی ۱۹۰۷/٦/۱۵ گرێ درا و سەرەڕای بە ئەنجام گەیاندنی بڕیارەکانی کۆنفرانسی یەکەم، ڕێککەوتنێکی نوێی لە بابەت ڕێساکانی بێلایەنی* و شەڕی دەریایی بە ئیمزا گەیاند.

**کۆنفرانسی ئاڵمائاتا** کنفرانس آلماآتا Alma-Ata Conference

ئەم کۆنفرانسە لە ڕێکەوتی ۲۱دیسەمبری ۱۹۹۱ لە ئاڵمائاتا پێتەختی قازاغستان، بە بەشدار بوونی دوازدە کۆماری یەکیەتی سۆڤیەت واژۆ کرا کە تێیدا کۆتاییهاتنی تەمەنی یەکیەتی سۆڤیەت ڕاگەیاندرا و بنیاتی پێکهاتەیەکی نوێ بە ناوی«وڵاتانی سەربەخۆی هاوبەش» دامەزرا. بەڵگەنامەی ئەم کۆنفرانسە لە لایەن هەموو کۆمارییەکانی سۆڤیەت جگە لە گورجستان، ئیمزا کرا. کۆمارییەکانی بەشدار لە کۆنفرانسەکە بریتی بوون لە:

ئازەربایجان، ئەرمەنستان، ئۆزبەکستان، ئۆکراین، تاجیکستان، تورکمانستان، ڕووسیە، ڕووسیەی سپی، قازاغستان، قرغیزستان و مۆڵداوی.

PDF 4 KURD

**کۆنفرانسی باکوور ـ باشوور** کنفرانس شمال و جنوب
North-South Confrence

لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/١٢/١٦ لەسەر بانگهێشتی «ژیسکار دیستەن» سەرۆك كۆماری ئەوكاتەی فرەنسا لە شاری پاریس نوێنەرانی وڵاتانی جیهان کۆبوونەوە تا سیستەمی پێوەندییە ئابوورییەکانی جیهان بگۆڕن. ئەو وڵاتانەی کە لە کۆنفرانسەکەدا ئامادە ببوون بریتین لە: ١٢ وڵاتی ڕووە و گەشەسەندن، بە نوێنەرایەتی پتر لە ١٠٠ وڵات کە ٢ ملیارد کەس حەشیمەتی جیهانیان لەخۆ گرتبوو، ٧ وڵاتی بەرهەمهێنی نەوت و نوێنەرانی وڵاتانی پیشەسازی جگە لە یەکیەتی سۆڤیەت و وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات. هۆی پێکهاتنی ئەم کۆنفرانسە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو گرفتانە بوو کە وڵاتانی پیشەسازی پاش بەرزبوونەوەی نرخی نەوت لە ساڵانی ١٩٧٣ و ٧٤ ڕووبەڕووی بوونەوە بەڵام لە ڕواڵەتدا ئەم کۆنفرانسە بۆ ئەو مەبەستە بوو کە زەمینەیەکی نوێ بۆ هاوکاری لە نێوان وڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی(باکوور) و وڵاتانی جیهانی سێهەم(باشوور) بڕەخسێنێ.

کۆنفرانسی باکوور ـ باشوور بە پێکهێنانی چەند لیژنەیەك بۆ توێژینەوە لەو بابەتانەی کە باس کراون، پاش ١٨ مانگ باس و گفتوگۆکردن بە هۆی ناکۆکییە سەرەکییەکانی نێوان وڵاتانی باکوور و باشوور نەگەیشتە هیچ ئەنجامێك و کۆتایی بە کارەکەی خۆی هێنا.

**کۆنفرانسی پۆتسدام** کنفرانس پوتسدام Potsdam Conference

کۆنفرانسی پۆتسدام لە میانەی ١٧ی ژوئییە تا ٢ی ئۆگۆستی ١٩٤٥، دوای خۆ بەدەستەوەدانی ئەڵمانیا و بە بەشداری بەرەی سەرکەوتووی جەنگی دووهەمی جیهانی(وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیا) بە مەبەستی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی *کۆنفرانسی یالْتا**، گرێ درا. لەم کۆنفرانسەدا ئەڵمانیا کرایە چوار بەش و هەر بەشێکی کەوتە ژێر دەسەڵاتی هەر یەك لە وڵاتانی ئەمریکا، سۆڤیەت، بریتانیا و فرەنسا و لیژنەیەکی پێکهاتوو لەو چوار وڵاتە، کاروباری ئەم وڵاتەی بەدەستەوە گرت.

هەر لەم کۆنفرانسەدا شاری بەرلین کرایە چوار بەش و بەڕێوەبردنی شارەکەش کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەو لیژنەیە. سوپای نازی و دەزگا سیاسییەکانی ئەڵمانیا هەڵوەشایەوە و دادگای سزادانی تاوانبارانی جەنگی پێکهات. بە گشتی ناکۆکییەکانی نێوان سۆڤیەت و وڵاتانی ڕۆژاوایی بووە بەربەست لە بەردەم بڕیارەکانی کۆنفرانسدا.

**کۆنفرانسی تاران** کنفرانس تهران Tehran Conference

لە ڕێکەوتی ١١/٢٨ تا ١٩٤٣/١٢/١ بە بەشداری سەرۆکی وڵاتانی ئەمریکا، بریتانیا و سۆڤیەت لە تاران گرێدرا بە مەبەستی پاراستنی سەربەخۆیی ئێران لە جەنگی جیهانی دووهەمدا و ئەم وڵاتانە بەڵێنیان دا هێزەکانی خۆیان لە ئێران بکشێننەوە( لەو کاتەدا ئێران لە لایەن هاوپەیمانانەوە داگیر کرابوو).

PDF 4 KURD

ڕاگەیاندراوی هاوبەشی ئەم سێ وڵاتە ـ کە بۆ لێکدانەوەی شەڕ بەدژی ئەڵمانیا ساز درابوو ـ بریتی بوو لەوە کە سێ دەوڵەتەکە نەخشە و پلانەکانی خۆیان بۆ لەناوبردنی هێزەکانی ئەڵمانیا ڕێك بخەن و چۆنیەتی و کاتی هێرش بردنە سەر ئەم وڵاتەیان لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ باشوور دیاری کرد.

**کۆنفرانسی جیهانی دژی ڕەگەزپەرستی** کنفرانس جهانی ضد آپارتاید

International Conference Againest Apartheid

ئەم کۆنفرانسە لە ڕێکەوتی ٢٢ تا ١٩٧٧/٨/٢٦ لە لاگۆس پێتەختی نایجیریا گرێ درا و بە پێی بڕیارێك لە هەموو وڵاتانی جیهان داوای کرد کە هیچ جۆرە چەکێك نەگەیەنن بە دەوڵەتی ئەفریقای باشووری چونکا ئەم دەوڵەتە سیاسەتی ڕەگەزپەرستانە پیادە دەکات. کۆنفرانس هەروا داوای کرد هیچ جۆرە هاوکارییەك لە بواری ئەتۆمی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا بە ئەنجام نەگەیەنن.

**کۆنفرانسی دومبارتون ئۆکس** کنفرانس دومبارتن اوکس

Dumbarton Oaks Conference

لە ١٩٤٤/٨/٢١ لە کۆشکی دومبارتون ئۆکس لە شاری واشنتۆن گرێ درا. لەم کۆنفرانسەدا نوێنەرانی وڵاتانی ئەمریکا، بریتانیا، سۆڤیەت و چین بەشدار بوون و لە بابەت دامەزراندنی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکەوە گفتوگۆیان کرد. کۆنفرانسەکە تا ١٩٤٤/١٠/١٧ دەوامەی بوو تا ڕیزی پێشنیازەکان بڵاو کرایەوە. لە ڕاستیدا ئەم پێشنیازانەش، بوو بە گەڵاڵەیەك بۆ جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان. هەر لەم کۆنفرانسەدا داوا کرا بۆ پیادەکردنی ئاشتی لە جیهاندا ئەنجومەنێك بە ناوی *ئەنجومەنی ئاسایش** پێك بێت تا پێش بە ئەگەری ڕوودانی هەر جەنگێك بگرێت. جگە لەوەش بڕیار درا پێنج وڵاتی گەورەی ئەمریکا، بریتانیا، سۆڤیەت، چین و فەرەنسا ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایش بن و هەوڵی چارەسەرکردنی گرفتەکان و دابینکردنی ئاشتی جیهانی بدەن.

باسکردنی کێشەی دەنگدانی ئەندامان لە ئەنجومەنی ئاسایش تا ساڵێك بە هەڵپەسێراوی مایەوە تا سەرەنجام لە کۆنفرانسی یاڵتا بە بەشداری ئەمریکا، بریتانیا و سۆڤیەت، بڕیار درا ماف *ڤیتۆ** بۆ پێنج وڵاتی گەورە بمێنێتەوە.

**کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆ** کنفرانس سانفرانسیسکو

San Francisco Conference

ئەم کۆنفرانسە لە ١٩٤٥/٤/٢٥ بە بەشداری پەنجا وڵات لە شاری سان فرانسیسکۆی ئەمریکا پێکهات بە مەبەستی ئیمزاکردنی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە ئەویش لەسەر ڕاسپاردەکانی *کۆنفرانسی یاڵتا** پێکهاتبوو. وڵاتانی بەشدار لەم کۆنفرانسەدا ئەندامانی سەرەکی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەژمار دەهاتن.

PDF 4 KURD

لەسەر داوای یەکیەتی سۆڤیەت، ولاتی پۆلەندا کە لەم کۆنفرانسەدا بەشدار نەبوو، وەك ئەندامی سەرەکی نەتەوە یەکگرتووەکان ناسێندرا. کەواتە کۆمەڵی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکەم دانیشتنی خۆی بە بەشداری ٥١ ئەندام دەست پێکرد. لەم کۆنفرانسەدا پێنج زمانی ئینگلیزی، فەرەنسی، رووسی، چینی و سپانیایی بە زمانە رەسمییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دیاری کران و لە ١٩٤٥/٦/٢٦ بە ئیمزاکردنی هەموو ولاتانی بەشداربوو، جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان راگەیاندرا و لە ١٩٤٥/١٠/٢٤ جێبەجێ کردنی جارنامەکە دەستی پێکرد.

## کۆنفرانسی نێودەوڵەتی پیشە کنفرانس بین‌المللی اشتغال
## International Conference of Employment

ئەم کۆنفرانسە بە دەست پێشخەری رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٤ تا ١٩٧٦/٦/١٧ لە جنێڤ بەرێوە چوو. بەم بۆنەوە ١٣٠٠ کەسی پسپۆر بە نوێنەرایەتی دەوڵەت و یەکێتییە کرێکاری و خاوەن کارەکانی ١٢١ ولاتی جیهان، لەسەر بانگهێشتی رێکخراوەی نێودەوڵەتی کار، بەشداری کۆنفرانسەکە بوون. ئامانجی سەرەکی ئەم کۆنفرانسە، باس و لێکۆڵینەوە و رێدەرکردن بە چۆنییەتی پەرەپێدان بە رێژەی کاری راستەقینە لە شارەکان بوو بە لەبەرچاوگرتنی مەسەلە جۆراوجۆرەکانی شار و دێهات. ئەم کۆنفرانسە لە راستیدا یەکەم هەنگاوی جیددی نێودەوڵەتی بوو لەمەڕ چۆنییەتی روبەڕوبونەوە لە گەڵ زیادبوونی رێژەی بێکاری لە جیهان.

بە باوەڕی زۆربەی توێژەرانی نێودەوڵەتی، ئەگەر بێتوو ئارێشەی بێکاری چارەسەر نەکرێت، رۆژبەرۆژ مەترسیدارتر دەبێت. کورت والدهایم، سکرتێری گشتی ئەوکاتەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پەیامەکەی خۆیدا گوتبووی: «ئەگەرچی مەسەلەی سەرەکی ئێمە پاراستنی ئاشتی جیهانییە بەلام نکوڵی لێناکرێت کە سەرکەوتن بەسەر مەسەلەی بێکاریش هاوشانی ئاشتی لە ئەژمار دێت. گۆڕانکاری بەسەر پێوەندی ئابووری نێودەوڵەتی، دەبێ لە رێگای چاکسازی کۆمەلایەتی و ئابووری ولاتانی رووەو پەرەسەندن و شێوازی نوێی روبەرووبون لە گەڵ بێکاریدا بەهێزتر بکرێت».

کۆنفرانسی جیهانی کار، لە بڕیارەکانی خۆیدا لەسەر ئەم شتە جەغد دەکات کە زیادکردنی کار و پیشەی وەبەرهێن، هۆکارێکی گرینگە بۆ دابینکردنی پێداویستیە سەرەکییەکانی مرۆڤ بۆ وێنە خانوو، خواردەمەنی و خزمەتگوزارییە کۆمەلایەتییەکان. بەم بۆنەوە کۆنفرانس، داوای هاوکاری نێودەوڵەتی دەکرد بۆ جێبەجێکردنی ئەم مەبەستە و پشتیوانی خۆشی لەمەڕ چاکسازی سیستەمی بازرگانی و ماڵی جیهان بە قازانجی ولاتانی رووەوپەرەسەندن دەربڕی. کۆنفرانس، هەروا لەسەر راگواستنی تەکنۆلۆژی و مەسەلەی پەنابەران و هەلومەرجی نوێی کار، کۆڵینەوەی ئەنجامدا و بڕێك پارەشی لە سەندووقی پەرەسەندنی کشتوکاڵ بە مەبەستی داهێنانی ئیش و کار لە گوندەکان تەرخان کرد.

PDF 4 KURD

**کۆنفرانسی یاڵتا** کنفرانس یالتا Yalta Conference

ئەم کۆنفرانسە لە ڕێکەوتی ٤ تا ١٩٤٥/٢/١١ بە بەشداربوونی سەرۆکی وڵاتانی ئەمریکا، سۆڤیەت و بریتانیا لە شاری یاڵتا(باشووری نیمچە دوورگەی کریمێ) گرێ درا و ئەم بڕیارانەی خوارەوەی دەرکرد:

١ـ پاش خۆبەدەستەوەدانی ئەڵمانیا، ئەو وڵاتە بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا و وڵاتانی بەشدار لە کۆنفرانسەکەدا.

٢ـ *کۆنفرانسی سان فرانسیسکۆ** بە مەبەستی بڕیاردان لەمەڕ دامەزرانی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان و لە بابەت شێوازی ڤیتۆ کردنی بڕیارەکان لێکۆڵینەوە بکات.

٣ـ یەکیەتی سۆڤیەت ڕازی بوو کە لە ماوەی ٣ مانگدا لە گەڵ ژاپۆن بکەوێتە شەڕەوە.

٤ـ گەڕاندنەوەی دوورگەکانی «ساخالین» و «کوریل» بە سۆڤیەت و گەڕانەوە بۆ دۆخی ساڵی ١٩٠٤ لە «پورت ئارتۆ» و «دارن».

زاراوەی یاڵتا لە نەریتی سیاسیدا مانای دابەشکردنی جیهان لە پشتی درگا داخراوەکان دەدات.

**کۆنفرانسی ٤+٢** کنفرانس ۴+۲ Conference ۴+۲

بریتییە لە دانیشتنێکی یەک ڕۆژە بە بەشداربوونی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا، سۆڤیەت، فەرەنسا و بریتانیا لە لایەکەوە و وەزیرانی دەرەوەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لە لایەکی ترەوە کە لە پێنجەمی ژوونی ١٩٩٠ لە بون بەڕێوە چوو. لەم کۆنفرانسەدا مەسەلەی یەکگرتنەوەی دوو ئەڵمان، بە تایبەت باروودۆخی سیاسی و سەربازی ئەم وڵاتە یەکالا کرا. سەرباسی ئەم کۆنفرانسە، مەسەلەی ئەندامیەتی ئەڵمانیای یەکگرتوو بوو لە *پەیمانی ناتۆ** یا ئەندامەتی لە هەر دوو پەیمانی وارشەو و ناتۆدا. سۆڤیەت لە گەڵ ئەندامەتی ئەڵمانیای یەکگرتوو لە ناتۆدا دژایەتی دەکرد چونکا پێی وابوو ئەندامبوونی ئەم وڵاتە لە پەیمانێکی سەربازیدا دەبێتە مەترسییەك بۆ سەقامگیریی ئەوروپا. ئەمریکاش پێی وابوو کە دوابڕیار لە بارەی بەئەندامبوونی ئەڵمانیای یەکگرتوو، دەبێ لە لایەن وڵاتانی ڕۆژاواییەوە دەرکرێت.

**کۆنفیدراسیۆن** کنفدراسیون Confederation

یەکگرتنی چەند دەوڵەت بۆ هاریکاری و یارمەتیدان بە یەکتر بە کۆنفیدراسیۆن پێناسە کراوە. کۆنفیدراسیۆن، خاوەنی دەسەڵاتێکی ناوەندی نییە تاکوو بە سەر شارۆمەندانی هەموو دەوڵەتانی یەکگرتوودا سەروەری بکات. دەوڵەتانی ئەندامی کۆنفیدراسیۆن لە سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەکیدا سەربەخۆن و مافی جیابوونەوە لە کۆنفیدراسیۆن پارێزراوە. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەر لەوەی ببێتە فیدراسیۆن (بڕوانە فیدرالیزم)، لە ساڵی ١٧٧٨ تا ١٧٨٧ بە شێوەی کۆنفیدراسیۆن ئیدارە دەکرا کە بریتی بوو لە: هیندوراس، نیکاراگووە و سەن سالوادۆر.

PDF 4 KURD

ئەڵمانیا لە (١٨١٥ تا ١٨٦٦) و هۆڵەندا لە (١٥٨٠ تا ١٧٩٥) دوو نموونەی سیستەمی کۆنفیدراسیۆن لە ئەژمار دێن. ئەگەرچی سویسرا، بە «کۆنفیدراسیۆنی سویسرا» خۆی ناساندووە بەڵام لە راستیدا بە شێوازی فیدراڵی ئیدارە دەکرێت. وڵاتانی ئەندامی کۆنفیدراسیۆن، بۆ پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان بە شێوەیەکی جیاواز دەمێننەوە، بەڵام لە ناو خۆیاندا شەڕ بە شتێکی ناڕەوا دەزانن.

**کۆنڤانسیۆن** کنوانسیون Convention

کۆنڤانسیۆن یا کۆنڤانسیۆنی نەتەوەیی، ناوی کۆمەڵەیەکی گرنگی فەرەنسی بوو کە پاش ئەنجومەنی یاسادانان لە ٢١ سێپتەمبەری ١٧٩٢ لە لایەن خەڵکی ئەم وڵاتەوە دامەزرا. ئەم کۆنڤانسیۆنە بڕیاری لە سێدارەدانی لویی شانزەهەمی پەسند کرد و کۆمیتەی رزگاریی نەتەوەیی پێك هێنا و راسپاردەکانی خۆی نارده شارەکانی فەرەنسا بۆ بڵاوکردنەوەی بیرۆکە و ئارمانجەکانی شۆڕش و پتەوکردنی هەست و سۆزی نیشتمانپەروەرانە.

لە زاراوەی سیاسیدا کۆنڤانسیۆن، واتای سازش و رێککەوتن و تەبایی دەگەیەنێ و بریتییە لەو ئەنجومەنانە کە لە کۆڕ و کۆبوونەوە جۆراوجۆرەکاندا دروست دەبن تا لەمەڕ کێشە گرنگەکان گفتوگۆ بکەن و بگەنە رێککەوتن. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەو کۆنگرە حیزبییانە دەگوترێ، کە بە مەبەستی دیاریکردنی پاڵێوراوانی سەرۆك کۆماری دەبەسترێ. هەروا بەو رێککەوتنانەش دەگوترێ کە لە بواری بازرگانی و بوارەکانی دیکەی هاوکاری لە نێوان وڵاتاندا گرێ دەدرێ. جگە لەمەش، پەیمانی بەرامبەر وڵاتانی دژ بەیەك بۆ گۆڕینەوەی دیلەکان و کۆتایی هێنان بە جەنگ و کۆبوونەوەی نوێنەرانی ویلایەتێك بۆ دەستنیشانکردنی پاڵێوراوە حیزبییەکان و دیاریکردنی ئامانج و پێڕۆی حیزب بە کۆنڤانسیۆن ناودەبرێت. لە کۆنڤانسیۆنە بەناوبانگەکان، دەکرێ ئاماژە بدەین بە کۆڤانسیۆنی نێودەوڵەتی ئاشتی لاهای(١٨٩٩ و ١٩٠٧)، کۆنڤانسیۆنی قەدەغەکردنی بازرگانی کۆیلە (١٩٦٣) و کۆنڤانسیۆنی پێوەندی دیپلۆماسی (١٩٦١).

**کۆنڤانسیۆنی ئەورووپی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان**

کنوانسیون اروپایی حمایت از حقوق بشر و آزادی‌های اساسی

European Convention for the Protection of Human Rights and Fundamental Freedoms

پەیماننامەیەك کە لە ساڵی ١٩٥٠ لە نێوان پانزە وڵاتی ئەورووپای رۆژاوا مۆرکرا بە مەبەستی پاراستن و مسۆگەر کردنی ئازادی و مافەکانی هاووڵاتیانی خۆیان. ئەم ماف و ئازادییانە بریتییەلە: ماف ژیان و ئازادی، قەدەغەکردنی کۆیلایەتی و دیلیەتی، دڵنیایی و بێخەمی لە دەسگیرکردن، زینـدانی کردن و دوورخستنەوەی پڕوپووچ، ماف داکۆکی کردن لە دادگایەکی بێلایەن، ئازادی ئەندێشە و بیروڕا و ئایین و ئازادی کۆبوونەوە. (بۆ نموونە رێکخستنی یەکیەتی و ...)

لە ساڵی ١٩٥٩ «دادگای ئەورووپایی مافەکانی مرۆڤ» بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەم گرێبەستە دا...

PDF 4 KURD

و هاوولاتیان ماف ئەوەیان هەیە داواکاری و شکاتەکانیان لە دەولەتی خۆیان رادەستی کۆمیسیۆنی مافەکانی مرۆڤ بکەن. ئێستا ٢١ ولاتی ئەوروپی لەم کۆنڤانسیۆنە ئەندامن و چەند پرۆتۆکۆلیشی پێ زیاد بووە.

## کۆنڤانسیۆنی مافە سیاسیەکانی ژنان مقاولەنامە حقوق سیاسی زنان
## Convention on Political Rights of Women

ئەم کۆنڤانسیۆنە لە لایەن کۆمەڵی گشتی رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکان لە رێکەوتی ٢٠ی سێپتەمبەری ١٩٥٢ پەسند کرا. ئەم بڕیارنامە لە چوارچێوەی جێبەجێکردنی مادەکانی جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و جارنامەی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ هاتە ئاراوە و بەم پێیە هەموو ولاتانی ئەندام، بەڵێنیان داوە کە مافەسیاسیەکانی ژنان تا ئاستێکی یەکسان لەگەڵ پیاواندا بپارێزێ. بە پێی ئەم کۆنڤانسیۆنە دەبێ ژنانیش، هاوشانی پیاوان لە مافەکانی هەڵبژاردن و پالاوتن و گەیشتن بە پلەوپایە ئیداریەکان بەهرەوەر بن.

## کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا کنگره ملی آفریقا
## African National Congress

ئەم زاراوە بە بزاوتێکی سیاسی ئەفریقای باشووری دەگوترێت کە بۆ بردنەسەرەوەی ئاستی ژیانی رەش پێستەکان لە سالی ١٩١٢ بنیات نراوە. ئەم رێکخراوە لە سالی ١٩٢٦ لە گەڵ کۆمەڵەی هیندییەکان یەکییان گرت تاکوو ببنە نەتەوەیەکی یەکگرتوو. کۆنگرەکە بە رێبەرایەتی سەرۆك لیتۆلی (٦٧ــ ١٩٥٢) و بە سوود وەرگرتن لە شێوازی نەرم و بەدەر لە شەڕەنگێزی، خەباتی خۆیان بە دژی رەگەزپەرستی شێلگیرانەتر کرد بەلام لە لایەن دەسەلاتەوە بەرەورووی توندوتیژی بوون و سەرکوت کران و لە سالی ١٩٦١ هەلوەشێندرا. بالی چەکداریی کۆنگرە ناسراو بە «شمشێری گەل» لە لایەن نیلسۆن ماندیلا (١٩١٨ــ ) دامەزرا بۆ ئەوەی بەرپەرچی شەڕەنگێزییەکانی حوکمەت بداتەوە. ئەم بزاوتە لە ولاتانی دیکەی جیهان، نوێنەرایەتی سازکردبوو تاکوو ئەم ولاتانە بۆ کۆتایی هێنان بە رژێمی رەگەزپەرستی لە گەڵ خۆیدا هاودەنگ بکات و بتوانێ دەسەلات بگەڕێنێتەوە بۆ رەشپێستەکان.

لە سالی ١٩٩٠، دوابەدوای ئەو گۆرانکاریانەی کە لە زۆربەی ناوچەکانی جیهان روویاندا دەولەتی ئەفریقای باشووری، چەند هەنگاوێکی بۆ لابردنی یاساکانی رەگەزپەرستی هەڵێنا. گرنگترینی ئەم هەنگاوانە کە لە لایەن دۆ کلۆرك، سەرکۆماری ئەم ولاتە (١٩٩٠) راگەیاندرا بریتی بوون لە:

ـ کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقا، بە شتێکی قانوونی راگەیاندرا.

ــ رزگار کردنی خێرای نیلسۆن ماندیلا رێبەری کۆنگرە لە بەندیخانە. (ماندیلا، لە سالی ١٩٦٢ پاش گەرانەوەی لە کۆنفرانسی «بزاڤی رزگاری و یەکیەتی ئەفریقا» کە لە ئادیسابابا بەرێوە چوو، بە تاوانی بەزاندنی سنوور، دەکەوێتە بەندیخانە و ماوەی ٢٨سال لە زیندان دەبێت).

PDF 4 KURD

لە ساڵی ١٩٩٤، یەکەمین هەڵبژاردنی دیموکراتیک لە ئەفریقای باشووری بەڕێوە چوو. کۆنگرەی نەتەوەیی ئەفریقای باشووری زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمان دەباتەوە و نێلسۆن ماندێلا وەك سەرکۆمار دیاری دەکات. بەڵام پاش ماوەیەك، ماندێلا کورسی دەسەڵات بۆ کەسانی دیکە جێدەهێڵێت و لە سیاسەت دوور ئەکەوێتەوە، هەر بۆیە وەك کەسایەتییەکی ناوداری ئەفریقا و جیهان دەمێنێتەوە.

## کۆنەپارێزی/قایمەکاریی محافظه کاری Conservatism

بریتییە لە کۆمەڵێ ئەندێشە و ڕێبازی سیاسی کە بیروبۆچوون و نەریتە کۆنەکان بەبایەختر دەزانێت لە هەر چەشنە بیرۆکەیەکی نوێباو و ئەزموون نەکراو. کۆنەپارێزی لەسەر یاسا و ڕێباز و نەریت جەخت دەکا و پێی وایە کە هیچ کاتێك بە شێوەیەکی ڕەها، شەڕ و ئاژاوە لەسەر زەوی ریشەکێش ناکرێت چونکا زاتی مرۆڤ زاتێکی ناکامڵە. کۆنەپارێزی لە نەریتی سیاسی بریتانیادا خاوەنی پێگەیەکی بەهێزە. بەکارهێنانی زاراوەی کۆنەپارێز لەم وڵاتەدا لە ساڵی ١٨٣٥ تا ١٨٤٠ دەستی پێکرد و لەو کاتەوە جێگەی واتای مێژوویی«توری» گرتۆتەوە. لە سیستەمی سیاسی بریتانیادا حیزبی کۆنەپارێز، هەمیشە حیزبێکی سەرەکی لە ئەژمار هاتووە و کەسانێکی وەك ئیدمۆند بۆرگ، کالریچ، پیل و دیزراییل، هەوڵیان داوە ئەم حیزبە گەشە پێ بدەن. ئەگەرچی کۆنەپارێزی هیچکات نەبۆتە خاوەنی سیستەمێکی گونجاوی فەلسەفی بەڵام بە گشتی لەم بنەمایانەی خوارەوە پەیڕەوی دەکات:

کۆنەپارێزی لە بەرامبەر رادیکالیزم* و شۆڕشگێڕیدا رادەوەستێ. لە ڕوانگەی کۆنەپارێزێکەوە رادیکاڵ و شۆڕشگێڕ، دەخوازن بە ئامانج و مەبەستی تیۆری و قوتابخانەیی، زۆربەی دەزگا بایەخدارە کۆمەڵایەتییەکان لەناو ببەن. ئیدمۆند بۆرگ، هێرش دەکاتە سەر توندڕەوی (رادیکالیزم) و بە ڕێبازی دەمارگیرانە و دژ بە کولتووری گرانبەهای ڕابردووی دادەنێ و دەڵێ: پێویستە سوود لە ئەزموونی پێشوونانی خۆمان وەربگرین و ئەگەر چاکسازیش پێویست بێت، دەبێ لە گەڵ شکڵ و شێوازی ڕابردوودا بیگونجێنین. خاڵێکی مەترسیدار لە ڕێبازی کۆنەپارێزیدا بڕواهێنانە بە کەماڵی موتڵەق. چونکا هیچ شتێك بە قەدەر بەرجەستەکردنەوەی یۆتۆپیا بۆ پێشڤەبردنی ڕاستەقینە زیانبار نییە. سیاسەت بە کردەوە، بێ توانایە و هیچ شتێك مەترسیدارتر لەوە نییە کە بۆ گەیشتن بە خەون و یۆتۆپیاکان زەبر و زەنگ بەکار ببرێت.

کۆنەپارێزی بۆ کۆنارایی، ڕێزێکی زۆر قایل دەبێت و هەر دەزگا یا نەریتێکی کۆمەڵایەتی کۆنتر و لە مێژینەتر بێت، لای ئەم ڕێبازە بەنرختره. کۆنەپارێزەکان، هەمیشە لەدووی ئەزموونی وەچەکانی پێشوون و هەوڵ دەدەن بە جەوهەری ڕۆحی ئەو ئەزموونانە، کلك وگوێی واقیعە کۆمەڵایەتییەکان بقرتێنن. لە بنەماکانی دیکەی ئەم قوتابخانە دەکرێ ئاماژە بدەین بە پاراستنی نەریتی لیبرالیزمی ئەورووپایی، ڕێزگرتن لە خاوەنداریەتی تایبەتی و کەمکردنەوەی دەستێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووری.

## کۆنەپەرستی ارتجاع/گذشته گرایی Reactionarism

مانای وشەکە «گەڕانەوە»یە بەڵام بەمانای«پەرستشی ڕابردوو» یان «ڕابردووخوازی»بەکار هاتووە.

PDF 4 KURD

ئەم زاراوە دەرحەق بەو جۆرە گرووپ و حیزب و حوکمەت و خەڵکە بە کار هاتووە کە لە بەرامبەر هەرچەشنە گۆڕانکاریەکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا دژایەتی بکەن یان خوازیاری پووچەڵکردنەوەی هەندێ گۆڕانکاری و گەڕانەوە بۆ رابردوو بن. کۆنەپەرستی و پێشکەوتن خوازی لە هەر کۆمەڵگایەکدا شتێکی رێژەیی‌یە و پابەندی قۆناغی مێژوویی ئەو کۆمەڵگایە لە قەڵەم ئەدرێت. چونکا لەوانەیە ئەوشتەی کە لە کۆمەڵگایەك پێشکەوتن خوازانە لە ئەژمار بێت، لە کۆمەڵگایەکی‌تر کۆنەپەرستی بێت. لە هەر کۆمەڵگایەك کۆنەپەرستان، بریتین لە باڵی راستی توندڕەو (بڕوانە چەپ و راست)کە دەست و پێوەنیان پابەندی دەزگا ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی ئێستا و رابردووە و لە بەرامبەر هەموو گۆڕانکاریەك بەربەرەکانێ دەکەن.

کۆنەپەرستی دژی ستاندنەوەی دارایی و دەسەڵات لەدەست چینی سەردەست و رادەست کردنەوەی بە چینی ژێردەستە. سیستەمە ئیستبدادی و دسپۆتیزمەکان و هێزە لایەنگرەکانیان، لە جوملەی کۆنەپەرستانن. لە بەرامبەر کۆنەپەرستی‌دا هایراکییەك لە *کۆنەپارێزی** و ریفۆرمخوازی* و شۆڕشگێری ریز ئەکرێت.

**کوێرباوەڕی/دەمارگرژی** تعصب/جمود فکری Fanaticism

فاناتیسیزم، بە بیر و باوەڕی تەسك و کوێرانە دەگوترێ و مێشك تەسك یان کوێرباوەڕ کەسێکە کە دەربارەی بابەتە جۆراوجۆرەکان، غیرەت و هەست وخوستێکی تایبەت لەخۆی نیشان دەدا و بێ بەڵگە هەڵدەچێ و لایەنگری کوێرکوێرانە لە بابەتێکی سیاسی، ئایینی، کۆمەڵایەتی و ئابووری دەکات. مرۆڤی کوێرباوەڕ، کارەکانی خۆی لەڕووی ئاوەز و ئەندێشەوە ئەنجام نادات و گوتار و کرداری خۆی بە پێوەرە عەقڵییەکان هەڵناسەنگێنێ و لە ژێر کاریگەریی هەست وسۆزدا لە هیچ هەوڵ و کۆشش و فیداکارییەك درێخی ناکات و بۆ سەپاندنی بیروڕای خۆی لە هەموو ئامرازێك کەڵك وەردەگرێ. هەر بۆیە فاناتیسیزم، دژ بە فەلسەفە دەوەستێ چونکە فەلسەفە زانستی بیرکردنەوە و بەکارهێنانی هزر و ئاوەز و بەرهەمی ئاخافتن و گفتوگۆیە.

حاشای لێ ناکرێ کە کوێرباوەڕی لەو مەسەلانەی کە پێویستیان بە تێفکرین و ئەندێشە هەیە، ئەوەك بەرەو دۆزینەوەی هەقیقەت رێنموونیمان ناکات، بەڵکوو دەبێتە لەمپەرێك لەبەردەم شیاندن و بەڵگاندنی ژیرانەی بابەتەکان. مرۆڤی تەسك بیر، رێگایەك شك نابات جگە لەوەی بیر و بۆچوونی خۆی بە زۆرەملی داسەپێنێت. بەم بۆنەوە دەرفەتی توێژینەوە و شرۆڤەی بیروڕای خەڵکانی دیکەشی لە دەست دەرئەچێ.

**کۆیلەداریی** بردەداری Slavery

کۆیلەداری دیاردەیێکە کە پێوەندی دەسەڵاتدارێتی و ژێردەستەیی نیشان ئەدات. سنووری ئەم پێوەندییە لە دەسەڵاتی کۆیلەدار بە سەر مەرگ و ژیانی کۆیلەوە بگرە تاکوو رێسای وشکی چاودێری بە سەر مافەکانی دوولایەن، جیاوازە. رەگەزی سەرەکی ئەم دیاردە مافێکە کە کۆیلەدار بەو پێیە دەتوانێ کە

PDF 4 KURD

مەجبوور بکات هەندێ کار بە قازانجی ئەو ئەنجام بات. بازرگانی کۆیلە لە پێوەند لە گەڵ کشتوکاڵ لەو شوێنانە کە کرێکار کەم بن، ئاسایی بووە. کۆیلەداری لە ناوماڵ، لە گەڵ کاروباری خێزان و خزمەتگوزاری شەخسی پێوەندی هەبووە. پاساوی ئەم کەشە بۆ کۆیلەدار ئەوە بووە کە سوود و بەهرەی ئابووری و ئایینی کۆیلەکان دەستەبەر ئەکات.

کۆیلەداری دیاردەیەکی زۆر کۆنە و لە چوار هەزار ساڵ پێش زایین، لە شارستانییەتی سۆمەرەوە دەستی پێکرد. تەنانەت لە یۆنانی کۆنیش بووە. ئەرەستۆ، کۆیلەداری بە دەرەنجامی سروشتیی پێوەندی نێوان سوڵتە ـ فەرمانبردن و کۆیلە بە «دارایی زیندوو» ناوبردە ئەکات. یاسای ڕوومی، کۆیلە نەك بە ئینسان نازانێ بەڵکوو لەگوێن کەرەستەیەك لە خزمەت ئامانجەکانی کۆیلەدار ناوبردەی ئەکات. یەکەمین شۆڕش و ڕاپەڕینی کۆیلەکان بە ڕێبەرایەتی سپارتاکووس بەڕێوە چوو کە لە ساڵی ٧٣ی پێش زایین بەدژی ڕژێمی کۆماری ڕۆم خەباتیان کرد.

کۆیلەداری لە هەندێ شوێنی ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاست بەردەوام بووە. بەڵام پاش دەستێوەردانی مەسیحییەکان، حاڵ و وەزعیان باشتر بووە. لە قۆناغی نوێدا کۆیلەداری بەسرایەوە بە کارکردن لە ناو مەزرای گەورە لە وڵاتانی ڕۆژاوا و وڵاتانی موسوڵمان(وەك کەنین)و سەپان. لە سەدەی بیستەمدا سەرلەنوێ کۆیلەداری لە وڵاتانێکی پیشەسازی وەك ئەڵمانیای سەردەمی نازیسم، ژیایەوە. کۆیلەداری لە دوو سەرەوە پێوەندی بووە لە گەڵ ناسیۆنالیزمدا: لە لایەکەوە بەرهەمی هەست و سۆزی ناسیۆنالیستی حوکمەتێك بووە. لە لایەکی ترەوە، کۆیلەکان بە خۆڕاگری و ڕاپەڕین، یارمەتییان داوە بە بەهێزکردنی ناسیۆنالیزم*.

مۆرکردنی پەیماننامەی ١٩٥٦ لە لایەن ٣٣ ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ باشتر کردنی هەلومەرجی کۆیلەداری،نیشانەی دەوامەی سەرسەختانەی دیاردەی کۆیلەدارییە.

**کەلتووری سیاسی** فرهنگ سیاسی Political Culture

١ــ بریتییەلە کۆمەڵێ بڕوا و هەست و ئایدیال و نەریت و بۆچوون و بایەخی کەلتووری کۆمەڵگا یان سیستەمێکی سیاسی. ٢ــ ئاستی زانستی و ڕامانەی تاك و چین و توێژە جۆراوجۆرەکان لە دەسەڵات و سیاسەت. ٣ــ ئەرکی لایەنە تایبەتییەکانی کەلتووری گشتی کۆمەڵگا کە لە گەڵ چۆنییەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ سیاسەت، هێز، دەسەڵات، ئازادی، عەدالەت، دەوڵەت، حوکمەت و سیستەمی سیاسیدا پێوەندی هەیە. ئەمەش دەرەنجامی ئەزموونی مێژوویی نەتەوەیە لە کاتی ڕوارووییی لە گەڵ دیاردە و ڕووداوە سیاسییەکانی ئەو نەتەوەدا.

**کەمالیزم** کمالیسم Kemalism

بریتییە لە ئایدیۆلۆژیا و ڕێبازەکانی مستەفا کەمال پاشا ناسراو بە ئاتاتورك (١٩٣٨ـ١٨٨١)، یەکەم سەرۆك کۆمار و دامەزرێنەری تورکیای نوێ. ڕێبازەکانی کەمالیزم کە بەردی بنچینەی حیزبی خەڵك

PDF 4 KURD

تورکیا پێک دێنێت، بریتین لە: کۆماریخوازی، ناسیۆنالیزم، ریفۆرمخوازی، جیاوازی ئایین لە سیاسەت، سپاردنی کاروبار بە جەماوەر و دامەزراندنی دەوڵەتێکی دەسەڵاتدار و بەهێز. گرینگترین هەنگاوەکانی ئاتاتورک بۆ رۆژاوایی کردنی تورکیا، لابردنی چارشێوی ژنان، دانانی ناوی بنەماڵە بۆ خێزان، پەسندکردنی رۆژژمێری گریگۆری و گۆڕینی خەت بە لاتین بوو. کەمالیزم، پاش ٧٥ ساڵ ئێستاش لەناو رێکخراوە کۆنەپارێزەکانی ئەم وڵاتە وەك هێزەکانی ئەرتەش پشتیوانی زۆری لێدەکرێت. بەڵام ئەم رێبازە لەمەڕ سیاسەتی هاوچەرخی جیهانی و ئازادی ئابووری و زیندووبوونەوەی ئیسلامی سیاسی و *کێشەی کورد** لەم وڵاتەدا بەرەورووی پرسیار بۆتەوە.

## کەمینە/ کەمایەتی — اقلیت — minority

گرووپێك، بە کۆمەڵێ تایبەتمەندی هاوبەشی نەتەوەیی، زمانی، کەلتووری و ئایینی کە بەو پێیە خۆیان لە زۆرینە*ی خەڵکی وڵاتێك کە تێیدا دەژین، بە جیاواز دەزانن. ئەم وشیارییە هاوبەشییەی کەمایەتی لە ئاست ئەم جیاوازییانەدا ئەبێتە بنەمایەك بۆ ئامانج گەلێکی سیاسی تایبەت و لەم بەستێنەوە ئەکەونە ژێر ئازار و بێعەداڵەتی و تاراندن: بۆ وێنە یەکسانبوون لە گەڵ زۆرینە(لە بەرانبەر بێعەداڵەتی ئیش و کار) یان رەفتارێکی تایبەت(وەك پەروەردە بە زمانی زگماکی) یان داوای خۆدموختاری کردن(بۆ وێنە ئەرمەنییەکان لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوین لە دەوڵەتانی ناوچەکە و کاتولیکەکانی ئایرلەندی باکوور). بە دەگمەنیش هەڵئەکەوێ کەمایەتییەك بە پێچەوانەوە، دەستی بە دەسەڵاتی سیاسی بگا و ئینجا زۆرینە ئەکەونە ژێر زەخت و فشارەوە(بۆ وینە رژێمی ئەفریقای باشوور لە قۆناغی رەگەزپەرستیدا). کەواتە «کەمایەتی» و«زۆرینە» بە پلەی یەکەم، چەمکی سیاسی لە قەڵەم ئەدرێن بەر لەوەیکە چەمکێکی عەددی بن.

لە پێش سەدەی ١٩ تەنیا کەمایەتییە ئایینیەکان بوون کە لە گۆڕەپانی نەتەوەیی و نێونەتەوەییدا چالاکییان ئەنواند. لە سەدەی نۆزدە بەملاوە وشیاری نەتەوەیی پەرەی سەند، ئینجا کەمایەتییە نەتەوەییەکانیش گرنگایەتی زۆریان پێدرا. کەواتە لە روانگەی ناوخۆییەوە کەمایەتییە نەتەوەییەکان بەزۆری بۆ چاککردنی وەزعی خۆیان دەنگیان هەڵبڕی(بۆ وێنە چیکەکان لە ئیمپراتۆرییەتی بنەماڵی هاپسبۆرگ). کەچی لە روانگەی نێونەتەوەییەوە کەمایەتییەکان بوونە هۆی ئەوەیکە نەتەوەیەك نەتوانێ لە کاروباری نەتەوەکەی تردا دەستێوەردان بکات(وەك ئەوەیکە هیتلێر کەمایەتییە ئەڵمانی زمانەکانی، کردە دەسپێچکێك بۆ گوشارهێنان بۆ سەر دەوڵەتەکانی چێك و پۆڵەندا).

لە روانگەی زانستی سیاسیەوە هەبوونی کەمایەتی لە کۆمەڵگادا یەکێکە لە مەرجەکانی دیموکراسیەت. بە واتایەکی تر، هیچ وڵاتێك دیموکرات نییە مەگەر ئەوەیکە کەمینەی لە خۆ گرتبێ. بایەخی دیموکراسیەتیش پابەندە بە دەور و رۆڵی کەمینە لە کۆمەڵگادا. کەواتە زامنکردن و بە رەسمییەت ناسینی دەوری کەمایەتی لە کۆمەڵگا ئەبێتە هۆی مانەوە و بەقای رژێمێکی دیموکراتی. بە هەمان شێوە کە هەڕەشە و گوڕەشە لە کەمایەتیش دەبێتە هۆی لەکەدار بوونی دیموکراسی.

PDF 4 KURD

ئێستا کە لە ٩٤ وڵاتی جیهاندا شەڕ و ئاژاوە بەرپایە کە سەرچاوەی زۆریان دەگەڕێتەوە بۆ پشت گوێ خستنی خواست و مافەکانی کەمینەکان کە لە لایەن دەوڵەتانی پێوەندیدار بەم مەسەلەوە وەلا دەنرێت.

**کیشۆت ئاسایی**/پاڵەوانبازی کیشوت مآبی Quixotism

لە ناوی دۆن کیشۆت، پاڵەوانی داستانی میگێل سێرڤانتس (١٦١٦-١٥٧٤) رۆمان نووسی ئسپانیایی وەرگیراوە کە بە واتای کەسێکی ئایدیال و گێل و بەسەزمان و دوور لە واقیعە کە هەمیشە شکست بخوات.

**کێشەی کورد**: بڕوانە ناسیۆنالیزمی کوردی.

PDF 4 KURD

# گ

**گانگستر** گانگستر Gangster

ئەم زاراوە لە دوو وشەی Gang بە واتای دەستە و گرووپ و Ster بە واتای ڕێنوێنیکەر و بەشداربوون هاتووە. سەرجەم، واتای گرووپی خراپکار و ئاژاوەگێڕ و تێکدەر دەبەخشێ. گانگستریزم بە واتای لایەنگری کردنە لەو شێوازە.

**گرووپی بانکی جیهانی** گروه بانک جهانی World Bank Group

ئەم گرووپە پێکهاتووە لە ٣ ڕێکخراوەی نێودەوڵەتی (IGOs):

١- بانکی نێودەوڵەتی بۆ چاککردنەوە و پەرەسەندن (IBRD)، ئەم بانکە بە ناوی بانکی جیهانی ناوبانگی دەرکردووە کە مەبەستی ئەویش نوێکردنەوەی سیستەمی ئابووری وڵاتانی پەرەسەندووی سەردەمی جەنگی جیهانی بوو کە لێك هەڵوەشابوو. *بانکی جیهانی**، هاوجووتی سەندووقی نێودەوڵەتی دراوە.

٢- ڕێکخراوەی نێودەوڵەتی پەرەسەندن (IDA)، ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٦٠ بە مەبەستی بەخشینی قەرزی «سووك» بۆ یارمەتی بە ژێرخانی ئابووری و پەرەسەندن دامەزراوە.

٣- کۆمپانیای نێودەوڵەتی ماڵی(IFC) کە لە ساڵی ١٩٥٦ بە مەبەستی بەهێزکردنی کەرتی تایبەتی ئابووری لە وڵاتانی کەمتر پەرەسەندوو دامەزرا.

**گرووپی فشار** گروه فشار Pressure Group

لە وڵاتانی پیشەسازی نوێدا بیروڕای گشتی، کاریگەریی زۆری لە سەر ئاستی کۆمەڵگادا هەیە. لەم ڕووەوە گرووپی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی بە تایبەت گرووپە ڕەسمییەکان هەوڵ دەدەن بە شێواز و ئامرازی جۆراوجۆر *ڕای گشتی** بەرەو لای خۆیان داکێشن. کەشوهەوای مۆدێرنی ئەم چاخە وایکردووە کە دامودەزگای بەرێوشوێن کە لە زاراوەی کۆمەڵناسیدا بە گرووپی فشار ناوی دەرکردووە، بێنە مەیدانەوە تاکوو ڕای گشتی لەگەڵ بۆچوونەکانی خۆیان هاوتەراز بکەن و بە ئامانجەکانیان بگەن. گرووپی گوشار بە گرووپێك دەگوترێت کە هەوڵدەدات بە گوێرەی بایەخپێدان و ئاراستەکانی خۆی یان جەماوەر (کە خۆی بە نوێنەریان دەزانێت) کاریگەری دابنێ لە سەر ئەو هێزانەی بڕیاری یاسایی دەدەن یاخود ڕێکخراوە حوکمییەکان (پەرلەمان، دەستەی حوکمەت، وەزارەت و دامودەزگاکان) و هەروەها گۆڕانکاری پێویست بهێنێتە ئاراوە.

PDF 4 KURD

کەواتە گرووپی فشار هەوڵ دەدات بە شێوەی راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ کاریگەری دابنێن لەسەر رای گشتی و سەپاندنی بڕواکانی خۆیان بەسەر کۆمەڵگادا.

ئەو پێناوانەی کە ئەم گرووپانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بە شێوەیەکی ناڕەوا کەڵکی لێوەردەگرن بریتین لە:

پێناوی ئابووری: وەك بەخشینی خەڵات و بەرتیل دان بە جەماوەر.

پێناوی یاسایی: گرووپی گوشار هەوڵ دەدەن خواستەکانی خۆیان لە رێگای یاساکانەوە بەسەر خەڵکدا بسەپێنن بۆ ئەم مەبەستەش دزە دەکەنە ئەنجومەنی یاسادانانی وڵاتانەوە.

پێناوی تێکدەرانە: ئەم گرووپانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان هەڵدەستن بە کاری تێکدەرانە و بشێوی و شەڕنانەوە لە وڵاتدا.

پێناوی پرۆپاگەندەیی: لە رێگای پرۆپاگەندەوە دەست دەکەن بە بڵاوکردنەوەی بیروڕای خۆیان بۆ گۆڕینی رای گشتی.

## گرووپی ١+٥ گروه ١+٥ G 5+1

بریتییە لە پێنج ئەندامی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بریتانیا، فەرەنسا، سۆڤیەت و چین) لە گەڵ ئەڵمانیا کە لە بابەت کێشەی ئەتۆمی ئێران لە ساڵی ٢٠٠٦ بەملاوە لە گەڵ ئەم وڵاتە گفتوگۆیان دەکرد. وڵاتانی رۆژاوا، ئێران بەوە تۆمەتبار دەکەن کە بە شێوەیەکی پەنامەکی و نهێنی لە لەفافەی بەرنامەی ئەتۆمی ئاشتی خوازانەدا خەریکی پیتاندنی ئۆرانیۆمە و دەیهەوێت چەکی ئەتۆمی دروست بکات. ئێران ئەم شتە رەت دەکاتەوە و دەڵێ لە پیتاندنی ئۆرانیۆم بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا کەڵك وەردەگرێ. لە ماوەی ٣ ساڵدا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان چوار بڕیاری بە دژی ئێران دەرکردووە و هەندێ ئاستەنگی و گەمارۆی ئابووری بە سەر ئەم وڵاتەدا سەپاندووە.

## گرووپی ٢+٦ گروه ٢+۶ G 6+2

دوابەدوای رووداوە تیرۆریستییەکەی ٢٠٠١/٩/١١ و هێرشی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان لە ٢٠٠١/١١/٧ و جموجووڵە سەربازییەکەی هاوپەیمانی باکوور کە بووە هۆی رووخانی رژێمی تالیبان، گرووپی ٢+٦ دامەزرا. ئەم گرووپە پێکهاتووە لە نوێنەرانی ٦ وڵاتی دراوسێی ئەفغانستان، واتە: ئێران، پاکستان، ئۆزبەکستان، تاجیکستان، تورکمانستان و چین و دوو وڵاتی دوور لە هەرێمەکە، واتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و رووسیا. ئەم گرووپە لە سەروبەندی قەیرانی ئەفغانستان، هەستا بە گفتوگۆ و راوێژ لەمەڕ چارەسەرکردنی قەیرانەکە و دۆزینەوەی رێگایەك بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی و دیاریکردنی پلانی سیاسی دوارۆژی ئەفغانستان.

PDF 4 KURD

### گرووپی ٨ گروه ٨ G - 8

ئەم گرووپە لە سەرەتای دامەزرانییەوە پێکهاتبوو لە ٧ وڵاتی گەورەی پیشەسازی جیهان واتە: ئەڵمانیا، بریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئیتالیا، ژاپۆن، فرەنسا و کەنەدا، بەڵام لە دوای ڕووخانی یەکیەتی سۆڤیەت (١٩٩١)، فیدراسیۆنی ڕووسیاش لە کۆبوونەوەکانی ئەم گرووپەدا بەشداری دەکات. هەر بۆیە لە دانیشتنی ١٩٩٨ی لەندەن، بە شێوەیەکی فەرمی ئەم وڵاتەش بوو بە ئەندامی گرووپەکە و گرووپی حەوت، ناوی خۆی بە گرووپی ٨ گۆڕی. ڕێبەرانی ئەم هەشت وڵاتە، ساڵی جارێك و هەندێ جاریش لە کاتی نائاساییدا کۆبوونەوە ساز دەکەن و گەلێك لە کێشە و گیروگرفتە ئابووری و سیاسیەکانی جیهان لەم دانیشتنانەدا تاوتوێ دەکرێن. بۆ نموونە لە دانیشتنی ساڵی ٢٠٠٦ کە لە سانپێتەرزبۆرگی ڕووسیا بەڕێوە چوو، وێڕای باسکردن لە بابەتی تایبەتی گرووپەکە، لەسەر دۆسییەی ئەتۆمی ئێرانیش لێکۆڵینەوە کرا. گرووپی ٨ لەم چەن ساڵەی دواییدا دەرگای بە ڕووی ١٢ وڵاتی دیکەی جیهان کە خاوەنی ئابوورییەکی ڕووەو گەشەسەندنن بۆ وێنە بەرازیل و هیندستان ئاوەڵا کردووە و وێدەچێ لە داهاتوودا شوناسی گرووپەکە تووشی گۆڕان بکات.

### گرووپی ١٥ گروه ١٥ G - 15

ئەم گرووپە لە ساڵی ١٩٨٩ لە لایەن هەندێ لە وڵاتانی ڕووەوگەشەسەندن، بە مەبەستی چۆنیەتی دانوستان و هەڵسوکەوت لە گەڵ وڵاتانی پیشەسازی جیهان و پێکهاتەگەلێکی وەك گرووپی ٨ و ڕێکخراوەی بازرگانی جیهانی دامەزرا. ئەگەرچی ژمارەی ئەندامەکانی لە ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتە ١٨ وڵات، بەڵام ناوبانگەکەی هەر بە ناوی گرووپی ١٥ ماوەتەوە. ئەندامانی ئەم گرووپە بریتین لە: ئەرجەنتین، ئەلجەزایر، ئەندونیسیا، بەرازیل، پیرۆ، جامایکا، زیمبابوا، سەنگال، مالیزیا، میسر، مەکزیك، نایجیریا، ڤینزۆئیلا، هیندستان، شیلی، ئێران، کێنیا و کۆلۆمبیا. لە بەیاننامەی حەوتەمین کۆبوونەوەی سەرۆکی وڵاتانی ئەندام کە لە ساڵی ١٩٩٧ لە کوالالامپوور دەرکرا، ئاماژە کراوە: ئەگەرچی ڕێکخراوەی بازرگانی جیهانی چوارچێوەیەکی گرینگە بۆ ئاسانکاری بازرگانیکردن لە جیهاندا بەڵام پێکهاتێکی نایەکسانە و هەموو وڵاتان ناتوانن بە شێوەیەکی یەکسان لە بەرژەوەندی و مافەکانی خۆیان داکۆکی بکەن.

### گرووپی ٧٧ گروه ٧٧ G-77

ئەم گرووپە لە کۆنفرانسی بازرگانی و گەشەکردنی نەتەوە یەکگرتووەکان (١٩٦٤) ناسراو بە «ئانکتاد» بە بەشداری ٧٧ وڵاتی ڕووەو گەشەکردن پێکهات بۆ ئەوەی ببێتە گرووپێکی فشار و لە بەرژەوەندییەکانی وڵاتانی بەرەو گەشەکردن داکۆکی بکات. یەکەم دانیشتنی ئەم گرووپە لە ساڵی ١٩٦٧ لە ئەلجەزیرە گرێ درا و لەو کاتەوە تا ئێستا ژمارەی ئەندامانی هەر زیادی کردووە بە چەشنێك کە ئێستا ژمارەی ئەندامەکانی گەیشتۆتە ١٣٠ وڵات بەڵام ناوەکەی هەر نەگۆڕاوە. دانیشتنەکانی ئەم گرووپە بۆتە هۆی گەشەکر

PDF 4 KURD

پێوەندی بازرگانی لە نێوان وڵاتانی ئەندام بەڵام هەر نەیتوانیوە هەندێ لە ئامانجە سەرەکییەکانی وەك پاراستنی توانای کڕینی کەرەستەی خاو، بپێکێت.

## گشتاپۆ — گشتاپو — Gestapo

ئەم زاراوە کورتکراوەی ئەم دێڕە ئەڵمانییەیە (Geheim Staats Polizie) کە واتای پۆلیسی نهێنی ڕژێمی نازی دەبەخشێ. ئەم دەزگا پۆلیسیە لە مانگی ئاڤریلی ١٩٢٣ لە لایەن گۆرینگ دامەزرا و پاشان کەوتە ژێر دەستی هیملەر و ئینجا لەگەڵ S. S (یەکە سەربازییەکانی ئەڵمانیای نازی) تێکەڵ کرا. گشتاپۆ، لە بەرامبەر هیچ ئۆرگانێکی دادوەری و چاودێریدا خۆی بە بەرپرسیار نەدەزانی و بە شێوەیەکی خودسەرانە ڕەفتاری دەکرد. هەر بۆیە دەسەڵاتێکی ڕەها و بێسنووری بەدەست هێنا و دەستی دایە تیرۆر و کوشتن و نەخشە و پلانی بەرهەڵستکارانی ئاشکرا دەکرد و سزای دەدان. پاش شکستی ئەڵمانیا لە جەنگی جیهانی دووهەم دادگای نۆرمبێرگ، گشتاپۆی لەگوێن ڕێکخراوەیەکی تاوانکار و دژ بە بنەما مرۆییەکان لەقەڵەم دا و سزای بەسەریا سەپاند.

## گفتوگۆی شارستانییەتەکان — گفتگوی تمدنها — Dialogue Among Civilizations

پرۆژە بڕیارێك لە بەرامبەر تیۆری «ململانێی شارستانییەتەکان» و بیرکردنەوە دەربارەی گفتوگۆ لە جیاتی ململانێ و ڕواورووبی بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان. ئەم پێشنیازە لە دانیشتنی سەرۆکی وڵاتانی ئەندامی *ڕێکخراوەی کۆنفرانسی ئیسلامی** لە تاران (١٩٩٧) لە لایەن محەمەد خاتەمی سەرۆك کۆماری ئێران ئاراستە کرا و دواتر لە دوازدەیەمین دانیشتنی وڵاتانی ئەندامی بزووتنەوەی بێ لایەن* (١٩٩٨) لە ئەفریقای باشووری چێ کرا. هەمان ساڵ لە کۆمەڵی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان هاتە ئاراوە و لە دانیشتنی ٢٣ ئۆکتۆبەر، بەکۆی دەنگ پێشنیازی ئێران کەوتە بەرباس و سەرەنجام لە ٤ی نۆڤەمبەر بڕیار درا کە ساڵی ٢٠٠١، بە ناوی ساڵی گفتوگۆی نێوان شارستانییەتەکان لە ئاستی جیهاندا پەسند بکرێت.

## گلاسنۆست — گلاسنوست — Glasnost

گلاسنۆست وشەیەکی ڕووسییە بە واتای ڕەپ و ڕاستی بەڵام لە زاراوەی سیاسیدا بریتیە لە کەشوهەوای کراوەی سیاسی و «پرۆسەی دیموکراتیزەکردنی» بلۆکی سۆشیالیستی. ئەم زاراوە دوابەدوای بە دەسەڵات گەیشتنی گۆرباچۆف، ڕێبەری سۆڤیەت ڕەواجی زۆری پەیدا کردووە. گلاسنۆست و پیرۆسترێکا دوو زاراوە بوون کە لە لایەن ڕێبەرانی یەکیەتی سۆڤیەت شانبەشانی یەکتر بۆ پیادەکردنی سیاسەتەکانیان بەکار دەبران. لە ئەنجامی گلاسنۆست، گۆرباچۆف دەرفەتی بە ڕۆژنامەنووسانی سۆڤیەت دا کە باس لە کەموکووڕی و گەندەڵی وڵات بکەن و ئاندرە ساخارۆڤ لە تاراوگە گەڕاندەوە و گەلێك لە نەیارانی سیاسی

PDF 4 KURD

بەندیخانە ئازادکرد. ئەم گۆڕانکارییانە لە لایەن رۆژاواوە پێشوازی لێکرا و ئاکامەکەشی هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت بوو لە ساڵی ١٩٩٠.

## گۆبینیزم گوبینیسم Gobinism

بیروبڕوای ژۆزف گۆبینۆ (١٨٨٢ـ ١٨١٦) دیپلۆمات و رۆژهەلاتناسی فەڕەنسی کە لە کتێبەکەی خۆی بەناوی «نایەکسانی ڕەگەزی مرۆڤ»، لەسەر بنەمای بالادەستی رەگەزی ئاریایی دایڕشتووە. ئەم بیروبڕوایە دواتر کاریگەری زۆری لەسەر «ئەفسانەی بالادەستی رەگەزی نۆردیك» و فەلسەفەی ئەڵمانیای نازی دانا.

## گوتار/دیسکۆرس گفتمان Discourse

پێشینەی ئەم زاراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٤ زایینی کە لە ریشەی discurrere یۆنانی بە واتای بزووتن بە دەورووبەردا وەرگیراوە. مانای گشتی گوتار بریتییەلە گفتوگۆ و ئاخاوتن وەك لقێکی زانستی. بەلام لە زاراوەدا بریتییەلە پێوەندی نێوان زمان و واقیعە کۆمەلایەتیەکان یا پێوەندی پەیڤ و کارلێکە فیکری و کۆمەلایەتیەکان کە ئەویش کۆی چالاکییەکانی مرۆڤ لە بواری سیاسی و کۆمەلایەتی و زانستی و هونەری لەخۆ دەگرێت. گوتار، دیاردە یان پرۆسەیەکی کۆمەلایەتییە کە خاوەنی بنیچە و زەمینەیەکی کۆمەڵەکییە. دەربڕینی بیروبۆچوون و پەیڤ و ڕستە و گوزارە و ماناکانیان، پێوەندی بەوە هەیە کە ئەم دەربڕینە، چۆن و لە لایەن چ کەسێك و لە چ ساتەوەختێکدا و بەدژ یان بە قازانجی چ کەسێك دەبێت.

ئەم زاراوە لە لایەن ئانتۆنی گرامشی(١٩٣٧ـ ١٨٩١)، بە تەرزێکی لاوەکی و میشل فۆکۆ(١٩٨٤-١٩٢٦)، بە شێوازێکی ئاشکرا بەکار براوە. هەڵبەت فۆکۆ یەکەم کەس نییە کە بەستێنی گوتار راکێش دەکاتە هەناوی کۆمەڵگاوە بەڵکوو ئەو هەنگاو دەنێتە جێ‌پێی کەسانێکی وەك مارتین هەیدگێر و ئیمیل بنونیست.

بە بۆچوونی فۆکۆ، گوتار بریتییەلە جیاوازی نێوان ئەو شتەی کە دەکرێ لە سەردەمێکی دیاریکراو (بە پێی ڕێسا و لۆژیك) بە هەقیقەت بگوترێ و ئەو شتەی کە لە واقیعدا دەگوترێ. فۆکۆ گوتارەکان بە پێی ڕێژەی پێوەندییان بە دەسەلاتەوە پێناسە دەکات. لەم روانگەوە گوتار، دەربڕینی ئایدیالیستی وەهم و گومانەکان نییە بەڵکوو لە بەستێنێکی ماتریالیستیدا بەشێك لە پێکهاتەی دەسەلات لە ئەژمار دێت. گرینگی گوتار لە دەرخستنی کەمەی دەسەلاتدایە لە پێگە دیاریکراوەکانیدا. کەواتە بۆ دەرك پێکردن بە مێژووی گوتارەکان دەبێ خودی گوتارەکان موتالا بکرێت تاکوو بەم بۆنەوە پەردە لەسەریان هەلمالدرێت. فۆکۆ پێی وایە کە گوتار پێکهاتێکە لە چەند هێمایەك بەلام کاریگەرییەکەی لەم هێمایانە زیاترە. ئەم تایبەتمەندییە ناهێڵێت گوتار دابەزێنێتە ئاستێکی ساکاری زمان و پەیڤ و ئاخاوتن. گوتار رۆشنکەرەوەی تایبەتمەندیی مێژوویی ئەو شتانەیە کە گوتراوە و ئەو شتانەش کە هێشتا نەگوتراوە. گوتار کۆمەڵێك گوزارەیە کە لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا بەرجەستە دەبێت و لە سەر زۆربەی بەستێنە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و فیکرییەکان لەنگەر ئەگرێت. بە باوەڕی فۆکۆ گوتار، کۆمەڵێك کردەوەیە کە بە شێوەیەکی سیستماتیك

PDF 4 KURD

بابەتگەلێك دەوروژێنێ كە خۆبەخۆ باس و لێوەكۆڵین بەرهەم دێنێت. بە تێپەڕبوونی زەمەن، گوتارەكانیش تووشی گۆڕان دەبن. وەك چۆن شێوازی بیركردنەوە و باسكردن لە بابەت چەمكگەلێكی وەك ئازادی و ئاسایش و مۆدێرنیتە تووشی گۆڕان هاتوون.

**گۆشەگیریی/ دوورەپەرێزیی** كنارە گیری/ انزواگرایی Isolationism

سیاسەت یان داكۆكی لە سیاسەتێك كە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەیی وڵاتێك، ئەوە بە باشتر ئەزانێ كە لە گەڵ وڵاتانی دیكە پێوەندی نەكاتەوە. گۆشەگیری سیاسی و ئابووری ئەگەرچی بە ئامانجێكی سیاسییەوە بێت بەڵام لە واقیعدا دژوارە. ژاپۆن جارێك لە سەدەی بیستەمدا بە تەواوەتی لەم قۆناغە تێپەڕی بەڵام وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و بەریتانیا ـ كە كاتی خۆی ئەم سیاسەتەیان گرتە بەر ـ نەیانتوانی بە تەواوەتی پێی بگەن.

وشەی دوورەپەرێزیی(isolation) كاتێك مانای سیاسی لەخۆ گرت كە بەریتانیا لە ١٨٩٠ تا ١٩٠٠ لەبەرامبەر دوو بەرەی دەوڵەتەكانی «سێكوچكەی یەكگرتوو» و دەوڵەتانی هاوپەیمان لە گەڵ فەرەنسە و سۆڤیەتدا سیاسەتی«گۆشەگیری مەزن»ی گرتە بەر. زاراوەی دوورەپەرێزیی لە سەدەی بیستەمدا بۆ چەن لایەنێكی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریكا و ئەندێشە و ڕێبازی هەندێ گرووپ بەكار هاتووە. ئەمەریكا، دوای شەڕی جیهانی یەكەم ئەگەرچی لە كاروباری نێونەتەوەییدا دەستی بوو بەڵام هیچ بەرپرسیارییەتێكی لە ئەستۆ نەگرت و لە كۆمەڵی نەتەوەكان و دادگای نێونەتەوەییدا بەشداری نەكرد. نزیكایەتی ئابووری و سیاسی جیهان و ڕووداوەكانی دوو شەڕی جیهانی، كارێكی كرد دوورەپەرێزیی لە ناو سیاسەتی نەتەوەییدا بێ بایەخ ببێت.

**گەمارۆ/ئابلۆقە** محاصره/ دریابندان blockade

بەرگرتن بە كاڵا و شمەكی پێویستی وڵاتی دوژمن لە ڕێگای دەریا یان ئاسمان كە سەرەنجام بە گەمارۆی دەریایی كۆتایی پێ دێت. ئابلۆقە، بۆ ئەوەی بتوانێ وەك سزایەكی لەبار ئیش بكات ئەبێ لە هەمبەر پاپۆڕە بێلایەنەكانیش بەڕێوە بچێت كە ئەمە لەباری یاسا نێودەوڵەتییەكانەوە كێشە سازدەكات. بە پێی یاسای نێودەوڵەتی، ئەكرێ دەست بەسەر ئەو پاپۆڕە بازرگانیانەی كە گەمارۆكە دەشكێنن، بگیردرێ. نموونەی گەمارۆ، هەوڵەكانی بەریتانیا بوو لە هەر دوو شەڕە جیهانیەكە بۆ گەمارۆی دەریایی ئەڵمانیا. نموونەیەكیتر، گەمارۆی وڵاتی كووبا بوو لە لایەن وڵاتەیەكگرتووەكانی ئەمریكا لە ساڵی ١٩٦٢.

**گەندەڵیی سیاسی** فساد سیاسی Political Corruption

كەڵك وەرگرتن لە دەسەڵاتی سیاسی بۆ گەیشتن بە قازانجی شەخسی و ناڕەوا بە گەندەڵی سیاسی لە قەڵەم دراوە. گەندەڵی ماڵی و ئیداری، گرنگترین لایەنی گەندەڵی سیاسی لە ئەژمار دێت. ڤیتۆ تانزی

PDF 4 KURD

هۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی، بەم شێوە ناوبردە ئەکات:

١- یاسا و ڕێساکان (وەك دەرکردنی ئیجازەنامە، بە ناوچەیی کردنی ئیش و کارەکان).

٢- چاودێری کردنی ڕێککەوتننامەی کڕین و سەرمایەدانانی دەوڵەتی (وەك دروستکردنی ڕێگاوبان پرد و فڕگە).

٣- ئەو بەرنامانەی کە پاڵنەرن بۆ باجدان.

٤- چاودێری بە سەر ڕەوتی دامەزراندنی کارمەندان.

٥- ماهییەتی سیستەمی سیاسی.

٦- ماهییەتی سیستەمی سزادان.

بە بڕوای تانزی، گەندەڵی سیاسی لە زۆربەی وڵاتان لە ژێر سەری ڕێبەرانی سیاسییەوەیە و لە هەندێ وڵاتی دیکە لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەت و کارمەندانی شارەوانییە. ئەو دەوڵەتانەی کە بە پێی بەرنامەی ئایدیالی بەهێز و شۆڕشگێڕانە، ئەگەن بە دەسەڵات، ڕەنگە بتوانن تا ماوەیەك بە پاڵپشتی ئەم ئایدیالە و هەستوخوستی شۆڕشگێڕانە، گەندەڵی کۆنترۆڵ بکەن بەڵام هەر کە هەست و سۆزەکە نیشتەوە، سەرلەنوێ هەڵ ئەداتەوە و پەرە ئەستێنێ و ڕیشە دائەکوتێ. لە سیستەمی دیموکراسی ڕاستەقینەدا گەندەڵی ڕێبەران و بەرپرسانی سیاسی کۆنترۆڵ ئەکرێت یان ئاشکرا ئەبێت و بەری پێ ئەگیردرێت و بە دەگمەن ئەگاتە ئاستی گەندەڵی لە وڵاتانی ئیستبدادیدا.

PDF 4 KURD

# ل

**لاییک/لادین** لائیک Laic

ئەم زاراوە لە ڕیشەی لاتینی laicus (بە واتای پابەندیی بە خواوەند) وەرگیراوە. هەروا بە مانای کەسێکی نائایینی و ناڕۆحانی‌یە کە هیچ کاروبارێکی لە لایەن دەزگای ئایینییەوە پێ نەسپێردرابێت و ڕەمەکی و دوور لە ئایین بێت.

لاییسیزم laicisme، لەم چاخەدا بریتییە لەو ڕێبازەی کە خوازیاری دەرهاویشتنی بنبونیاد و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانە لە ژێر دەسەڵاتی ئاییندا. ئەم ڕێبازە بزاوتێک بوو بۆ خەبات لە بەرامبەر زۆرداری و تەنگپێهەڵچنینی ئایین و ڕاوەستان بەدژی پشکنینی بڕوا لە سەدەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا لە سەردەمی ڕینسانسدا. واتای لاییک لەو سەردەمەدا پەیوەست بوو بە پێکهاتەی کڵێسە و کۆمەڵگای مەدەنییەوە. کۆمەڵگای مەسیحی بە دوو چینی کلێرک clerk و لاییک دابەش کرابوو: لاییکەکان بریتی‌بوون لە مەسیحی ئاسایی و کلێرکەکانیش پێکهاتبوون لە کڵێسەییەکان یا خود کارمەندانی کڵێسە. ئەم کارمەندانە لە لایەن کڵێسەوە کاروباری ئیداری وپەروەردەیی و کولتوورییان پێ ئەسپێردراو مووچەی خۆیان وەردەگرت.

لاییسیتە laicite بە مانای گەوهەرێکە کە پێکهاتە و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاست ئایینەکان دەری دەبڕن. ئەم مەسەلە لە دوو لایەنەوە شیاوی سەرنج پێدانە:

*یەکەم، خەمساردی دەوڵەت بە نیسبەت ئایین کە ئەمیش چەند مانایەک لە خۆ دەگرێت:*

١- بە واتای جیاوازی کۆمەڵگای نەتەوەیی لە کۆمەڵگای ئایینی. بە واتایەکی‌تر، جیاوازی دەزگای ئایینی لە دەزگای حکوومی. لەم حاڵەتەدا دەوڵەت خاوەنی دەسەڵاتی ئایینی نییە و دەستێوەردانی کڵێسە بە هەرشێوازێك بێت ڕەت دەکاتەوە و کڵێسەش هیچ دەسەڵاتێکی سیاسی نییە.

٢- بە واتای بێ‌لایەنی لە کاروباری ئاییندا. دەوڵەت بۆ هەموو ئایینێك بە چاوێکی یەکسان دەڕوانێ و بۆ ئەنجامی مەراسیمی ئایینی هەموو هاووڵاتیان بە شێوەیەکی بەرابەر ئازادییان بۆ دابین دەکات.

٣ـ بە واتای بێ‌دینی و بێ‌باوەڕی بە خوا و ئایین بە شێوەیەکی ڕەسمی. لەم حاڵەتەدا دەوڵەت بە کارمەندان و کاربەدەستان و فێرکارانی پەروەردە ڕادەگەیەنێت کە مافی ئەوەیان نییە بانگاشە بۆ هیچ ئایینێك بکەن و هیچ مەراسیمێکی ئایینی بەئەنجام بگەیەنن.

*دووهەم، خەمساردی قوتابخانەکان بە نیسبەت ئایین:* لەم حاڵەتەدا ڕەنگە دەزگای پەروەردە هەموو ئایینێك پەسند بکات و ئیماندارانی هیچکام لە ئایینەکان نەڕەنجێنێ بەڵام هەر چەشنە پڕۆپاگەندەیەك بە قازانجی ئایینێکی تایبەت قەدەغە بێت.

بە گشتی لاییک بە شێوازی حکومەتی ئەو وڵاتانە دەڵێن کە ئایین و سیاسەتیان لێك جیا کردۆتەوە

PDF 4 KURD

ئایینی رەسمییان نییە. سیستەمی حوکم لە گەلێك لە ولاتانی رۆژئاوایی نائایینیە و لە نێوان ولاتانی موسلمانیش تورکیا کە خۆی بە ولاتێکی ئەورووپی دەزانێ، پەیڕەوکاری ئەم سیستەمەیە.

**لسەفەیر/ئابووری ئازاد** لسە فر Laissez-Faire

زاراوەیەکی فەرەنسییە کە بە واتای ئازادی رەهای ئابووری و دەستدرێژی نەکردنی دەولەت بەکار براوە، هەروا ئەم مانایەش دەبەخشێ: «لێگەڕێ مرۆڤ هەرچی دەخوازێ با ئەنجامی بات». ئەم زاراوە ناونیشانێکی دیکەیە بۆ تیۆری «ئابووری کلاسیك» کە پێی وایە ئەگەر دەولەت یا هەر هێزێکی دیکەی خۆسەپێن دەستێوەردانی کاروباری ئابووری نەکەن، گیروگرفتەکان خۆبەخۆ چارەسەردەکرێن و بە باشترین شێوە بەڕێوە دەچن. ئەم رێبازە لە سەرەتای سەدەی ١٧ دانراوە و کۆمەلێك لە ئابووریناسانی فەرەنسی کە بە فیزیۆکراتەکان ناسراون پوختەیان کردووە.

**لۆبیگەریی** لابیگری Lobbying

لۆبی زاراوەیەکی باوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە واتای «هۆل» دەدات بەلام لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای کاریگەربوونە لەسەر دەسەلاتی یاسادانان بە مەبەستی چەسپاندنی بیروبۆچوونێك کە ئەویش لە رێگای پێوەندی کردن بە ئەندامانی کۆنگرێسەوە دێتە بەرهەم. ئەم پێوەندییانە لە ناو هۆل و چەند ژوورێکی عەمارەتی کۆنگرێس سازدەبن. دەستە و *گرووپی فشار** لە ناو هۆلەکانی کۆنگرێس بۆ سەپاندنی بیروڕای خۆیان بە مەبەستی رەتکردنەوە یا پەسندکردنی بریارێك پێوەندی بە ئەندامانی کۆنگرێس دەکەن.

لۆبی جوو‌ەکانی ئەمریکا، یەکێکە لە گرنگترین و بەهێزترین گرووپەکانی گوشار لەو ولاتەدا کە بە دزەکردن بۆ ناو رێکخراوە دەولەتی و ئابوورییەکان و دامودەزگاکانی راگەیاندنی ئەمریکا، کاریگەریی لەسەر بریارەکانی دەولەت و کۆنگرێس دادەنێت لەمەڕ کێشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و پێش بە هەر بریارێك دەگرێت کە دژی بەرژەوەندییەکانی ئیسراییل بێت. لەم ولاتەدا لۆبی دیکەش بەکارن کە دەکرێ ئاماژە بدەین بە لۆبی ژاپۆنییەکان کە سالانە پتر لە ٣٠٠ ملیۆن دۆلار بوودجەی هەیە و تاکوو ئێستا توانیویەتی پێش بەو بریارانەی کۆنگرێس و کۆشکی سپی بگرێت کە هەناردەکانی ژاپۆن سنووردار دەکەنەوە.

**لۆترانیزم** مذهب لوتری Lutheranism

رێبازێکی ئایینی پرۆتستانە کە دەدرێتە پال مارتین لۆتر (١٥٤٦-١٤٨٣)، بنیاتنەری بزووتنەوەی «ریفۆرمی ئایینی» ئەلمانیا. رێبازی لۆتر لەسەر دوو ئەستوون راوەستاوە: یەکەم، تەنیا بەلگەی بڕواپێکراو کتێبی پیرۆزە واتە ئینجیل. دووهەم، پاکبوونەوە لە گوناح، تەنیا بە هۆی ئیمان و کاری چاکە مەیسەر دەبێت. لۆتر بۆ نزیکایەتی و پێوەندی مرۆڤ بە خواوەند بڕوای بە پێوەندی قەشە و کلێسە نەبوو. ئەو لە سالی ١٥٢٠

PDF 4 KURD

جاڕنامەکەی پاپای کە تێیدا هەڕەشەی وەدەرنان لە کڵێسەی لێکرابوو، سووتاند. لۆتر لایەنگری ئازادی تاکەکەسی و ئازادی ئایینی و بیروڕا بوو. ئەو بەکارهێنانی زەبروزەنگی بۆ بەهێزکردنی ئایینی بە ناڕەوا دەزانی و بیروباوەڕی بە حاڵەتێکی دەروونی لە قەڵەم ئەدا. هەر بۆیە خەڵکانێکی زۆر وەدووی کەوتن و ڕێبازی لۆترانیزمیان بنیات نا. ئەم ڕێبازە بە هۆی جیاوازی و ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر بە شێوازەکانی ئایینزای کاسۆلیك، بە پرۆتستان ناوبانگیان دەرکرد. پرۆتستانەکان کە بەزۆری لە ڕۆژئاوای ئەورووپا دەژین بیروباوەڕ و ڕەحمەتی خوداوەند بە هۆکاری ڕزگاربوون دەزانن و زۆر پابەندی بیروڕا و ئازادی ئایینن.

**لۆمپن پرۆلتاریا** لـومپن پرولتاریـا Lumpen Proltariat

لۆمپن، وشەیەکی ئەڵمانییە و بە کەسانی بەتاڵیا و پەست و خوێڕی و شەڕەخۆر دەگوترێ. زاراوەی لۆمپن پرۆلتاریا لە نەریتی سیاسیدا بە توێژێك لە خەڵکی چارەڕەش دەگوترێ کە بە هۆی بێبەشبوونی یاسایی و کۆمەڵایەتی و بێئاگایی لە کاروباری سیاسی و مرۆیی، ویژدانی شۆڕشگێڕانەی خۆیان لەدەست داوە. ئەم توێژە بە تایبەت لە کۆمەڵگا کۆلۆنیالیستیەکاندا سەرهەڵدەدەن و دەبنە هۆی تووڕەیی و بێزاری خەڵك و بەرە - بەرە بە هۆی ڕەوشی نالەباری ئابووری، زیاتر لە ناو تاوان و گەندەڵیدا نوقم دەبن. دەتوانین لۆمپن بە گرووپێکی شەڕەخۆر و بەرەڵڵا و تاوانکار لە قەڵەم بدەین کە دەبنە کرێگرتەی وڵاتانی سەرمایەداری و چینی دەسەڵاتدار کە بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی دواکەوتووانە و دژەنەتەوەیی خۆیان سوودیان لێ وەردەگرن و بەم جۆرە پلەوپایە و پێگەی خۆیان بەهێزتر دەکەن.

لۆمپنەکان، لە کودەتا و پیلانەکاندا لە ڕێی جاشییەتی و کرێگرتەیی هەوڵی سەرکوتکردن و پێشێلکردنی ماف ڕەوای جەماوەر دەدەن. ئەمانە هەرچەندە ژیانێکی ناخۆش و دژوار بەسەر دەبەن بەڵام هەموو کارێك ئەنجام دەدەن و لە ئەنجامدانی هیچ کردارێکی نامرۆیی سڵ ناکەن. ناتوانین لۆمپنەکان لە چوارچێوەی چینێکی تایبەتدا ڕیزبەندی بکەین چون هیچ کار و کەسایەتییەکیان نییە و جگە لە ئاژاوەگێڕی و تێکدان کارێکی دیکە ئەنجام نادەن و بە گشتی دەچنە ڕیزی کەسانی مشەخۆر و سەرباری کۆمەڵگا و دوژمنانی گەلەوە.

**لیبرالیزم:** بڕوانە ئازادیخوازی.

**لیبرالیزمی دیموکراسی:** بڕوانە دیموکراسی لیبرال.

**لیبرالیزمی نوێ** لیبرالیسـم نـو Neo-Liberalism

لایەنگرییەکی نوێ لە ئەندێشەی سیاسی و ئابووری ڕۆژئاوایە کە لە دەیەی ١٩٦٠ بە ئاوێتەکردنی ڕێبازی سیاسی لیبرالی و گەشەی ئابووری هاتە ئاراوە. لیبرالیزمی نوێ لە ڕاستیدا پەرچەکردارێك بوو لەبەرامبەر

PDF 4 KURD

سەرهەڵدانی *دەوڵەتی خۆشگوزەرانی** کە لە پاش قەیرانی نێوان دوو شەڕی گەورەی جیهانی، بە تایبەت لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی هاتە ئاراوە. لیبرالیزمی نوێ زەمینەی فیکری سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی هەندێ لە وڵاتانی رۆژاوایی بە دژی پێکهاتەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی و دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری و سۆشیالیزمی حیزبە کرێکارییەکان لە سیستەمی سەرمایەداری پێکهێنا. ئەم قوتابخانە ئەگەرچی لە بابەت ژێرخانی فیکرییەوە لە ناواخنی بزاوتی فیکری لیبرالیزمی کۆندا جێگیردەبێت بەڵام لە هەندێ لایەنەوە بیرۆکەیەکی نوێ لە ئەژمار دێت.

لیبرالیزمی نوێ، لە بەستێنی ئەندێشەی سیاسیدا لە بەرامبەر پەرەپێدان بە دامودەزگای دەوڵەت راوەستاوە و هەندێ لە ئاواتەکانی لیبرالیزمی کلاسیکی لەمەڕ سنووردارکردنی رەخنەکردنی دەوڵەت هێناوەتەدی. ئەم رێبازە خوازیاری کەمکردنەوەی خەرج وبەرجی دەوڵەتە بۆ دابەزینی رێژەی هەڵامسان چونکا لەم روانگەوە هەڵامسان دوژمنی سەرەکی لە ئەژمار دێت. لایەنگرانی ئەم رێبازە بەرامبەر دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابوور و کاروباری کۆمەڵگادا بەتوندی رەخنە ئەگرن و هەندێ بیرۆکەی نوێباویان لەمەڕ ئازادی تاکەکەس و کەمکردنەوەی رۆڵی دەوڵەت تا نزمترین ئاستی گونجاو و پێداچوونەوە بە ئەرکە سوننەتییەکانی حوکمەتدا ئاراستە کردووە.

**لێبوردن/چاوپۆشی/هەڵکردن** تسامح/ رواداری tolerance/Amnesty

رەوا دیتنی بیر و بۆچوونی جیاوازی ئایینی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، فەلسەفی و هونەری لە سیستەمێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا. لێبوردن یەکێک لە بەنرخترین بەهاکانی لیبرالیزم و دیموکراسی نوێیە. بە پێی ئەم بنەمایە، ئازادییەکانی تاکەکەس، تەنیا کاتێک دەپارێزرێن کە کۆمەڵگا لە بەرامبەر بیر و بۆچوونی جیاواز و بڵاوکردنەوەیاندا لە خۆ بووریێ و سەرکوتیان نەکات. هەروەها گەشەسەندنی کۆمەڵگا و گەیشتن بە عەقڵێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی رێکوپێک، کاتێک مەیسەر دەبێت کە کۆمەڵگا و دەسەڵاتی حاکم، بنەمای لێبوردن و چاوپۆشی پەسند کردبێت. لێبوردن یەکێک لە کەرەستەکانی خەباتی لیبرالیزم بووە بەدژی زۆرداری کڵێسە لە ئەورووپا.

واتایەکی دیکەی لێبوردن مانای فەرامۆشی و لەبیربردنەوە دەبەخشێ کە لێرەدا مەبەست لە بڕیارێکی تایبەتە کە دەوڵەت لە هەندێ هەلومەرجی تایبەتدا دەریدەکات و لە تاوانبارانی سیاسی و ... خۆش دەبێت. لە کاتی گۆڕین یا رووخانی رژێم بە هۆی شۆڕش یا گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەوڵەتدا لێبوردن گرنگییەکی تایبەتی دەبێت و زەمینە بۆ ئازادکردنی هەموو زیندانی و تاوانباران خۆش دەکات.

**لێبوردنی نێودەڵەتی** عفو بين الملل Amnesty International

رێکخراوەیەکی ناحوکومییە کە لە ١٩٦١/٥/٢٨ لە لایەن پیتر برێنسۆن، یاساناسی بریتانی بە مەبە[...]

PDF 4 KURD

هەوڵدان بۆ ئازادی ئەو زیندانییە سیاسیانەی کە دەستیان نەداوەتە شەڕەنگێزی دامەزرا. لێبوردنی نێونەتەوەیی، بەرە ـ بەرە ڕێکخستنەکانی خۆی بەرفراوان کرد بە چەشنێك کە ئەمڕۆ لە پتر لە ١٥٠ وڵاتی جیهان نوێنەرایەتی هەیە و زیاتر لە یەك ملیۆن کەس کە زۆربەیان یاساناس و *پەرلەمانتار** و نووسەرن، خۆبەخشانە لە گەڵ ئەم ڕێکخراوەدا هاوکاری دەکەن. ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە لە ڕواڵەتدا بریتییەلە خەبات بۆ ئازادی بیروڕا و ویژدان و زەمانەتی جێبەجێکردنی بەندەکانی جاڕنامەی گەردوونی ماف مرۆڤ لە وڵاتانی جیهاندا بەڵام تا رادەیەکیش لە ژێر کاریگەریی سیاسەتی بەریتانیایە. بوودجەی ئەم ڕێکخراوە لە ڕێگای یارمەتی ئەندامەکانی و بە شێوەیەکی خۆبەخشانە دابین دەکرێت. ڕێکخراو، ساڵانە بۆ لێکدانەوەی ڕەوشی ماف مرۆڤ لە جیهاندا شاندەکانی خۆی بۆ وڵاتانی جیهان دەنێرێ و گۆڤارێکی ساڵانەش لەم بابەتەوە بڵاو دەکاتەوە. ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی لە ساڵی ١٩٧٢ خەڵاتی ئاشتی نۆبلی پێ بەخشرا.

## لیڤیاتان — لویاتان — Leviatan

لیڤیاتان لە کتێبی تەورات دا ناوی نەهەنگێکی گەورە و زەبەلاحە کە هیچ هێزێکی ئەم سەرزەمینە ناتوانێ لەبەرامبەریا ڕاوەستێ و لە عەرزی بات. تۆماس هۆبز (١٦٧٩ــ ١٥٨٨) فەیلەسوفی ئینگلیزی، لیڤیاتان بە نیشانەیەك بۆ دەوڵەتێکی بەدەسەڵات و زەبر و زاکوون لە قەڵەم ئەدات و هەر بەم ناوەش کتێبە ناودارەکەی *(لیڤیاتان)* بڵاو دەکاتەوە. پوختەی قسەکانی هۆبز لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ئەگەر خەڵك بخوازن بە تەواوی لە ئاسایش و ئارامیدا بژین، دەبێ هەموو دەسەڵاتی خۆیان ڕادەستی کەسێك یا ئەنجومەنێك (لیڤیاتان) بکەن. بەم پێیە ویست و ئیرادەی لیڤیاتان دەبێتە جێنشینی ویست و ئیرادەی جەماوەر. بەڕای هۆبز، لیڤیاتان بۆی هەیە هەر شتێك بە پێویست بزانێ ئەنجامی بات و ڕێوشوێن و بڕیارەکانیشی دەبێ لە لایەن هەموانەوە جێبەجێ بکرێت بەڵام خۆی لەم بارەوە سەرپشك و موختارە چوونکا دەسەڵاتی لیڤیاتان لە هەموو دەسەڵاتێك باڵاترە.

## لێنینیزم — لنینیسم — Leninism

لێنینیزم، قوتابخانەیەکی سیاسییە کە لە ناوی ڤلادیمیر ئیلیچ ئۆلیانۆڤ لینین (١٩٢٤ــ ١٨٧٠) ڕێبەری شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ سۆڤیەت وەرگیراوە. لێنینیزم لەگوێن ئایدیۆلۆژیایەکی سیاسی، پاش مەرگی لینین داهات و ئەویش شێوازێکی تایبەتی مارکسیزمە کە لە سۆڤیەت پیادەکرا.

ئەم قوتابخانە باوەڕی بە چاکسازی فەلسەفەی مارکسیزم هەیە بەڵام لە هەمان کاتدا خۆی بە پابەندی بنەماکانی ئەو فەلسەفە دەهێڵێتەوە. لێنینیزم، کۆمەڵێك نووسراوەی دەستچین کراوی لینین بوو کە لە پاش هەندێ گۆڕان و چاکسازی بەسەر بنەماکانی مارکسیزمدا هاتە ئاراوە و هەندێ خاڵی پێ زیادکرا و هەندێ خاڵیشی لێ سڕایەوە تاکوو لە گەڵ ڕەوشی ڕووسیادا بگونجێ. لە ڕاستیدا داهێنەری لێنینیزم، ستالین بوو کە کۆمەڵێك لە وتارەکانی لێنینی بە بێ لەبەرچاوگرتنی کاتی نوسینیان، لە ٩ بابەتدا بە ناوی «بنەماکا...

PDF 4 KURD

لینینیزم» کۆ کردەوە. لەم کۆکردنەوەدا هەندێ لە ئەندێشەکانی لینین دابڕا یان بە کورتوکوێری بڵاوکرایەوە. ترۆتسکی لە بەرامبەر ئەم کارەی ستالین دەنگی هەڵبڕی و رایگەیاند: «لینینیزمی ستالین» جگە لە کۆگایەك خەوش‌وخۆڵی فیکری و کورتبینی و کەمتەرخەمی، هیچی دیکە نییە. کەواتە ئەو لینینیزمەی کە ستالین دایهێنا، بوو بە تیۆری رەسمی یەکیەتی سۆڤیەت. لە بەرامبەردا ئەو شرۆڤە و لێکدانەوەی کە لە لایەن کەسانێکی وەك ترۆتسکی و بوخارین لە سەر بیروڕای لینین بە ئەنجام گەیشت، بە دەسکیسی ستالین تووشی شکستی سیاسی هاتن. دواتر، رێژەی وەفاداری لینینیزم، نەك هەر بە ئەندێشەکانی مارکس بەڵکوو بە نیسبەت ئەندێشەکانی لینینیش، بووە هۆی مشتومڕ لە نێوان مارکسییەکاندا.

لە باری مێژوویی یەوە، وشەی لینینیزم، یەکەم جار لە لایەن مارتۆف، رێبەری منشڤیکەکان لە ساڵی ١٩٠٤ بەکار برا کە ئەویش بۆ رەخنە لە تیۆری لینین بوو لەمەڕ رێکخستنی حیزبی پێشڕەو.

لینینیزم، لە گەڵ *بولشویزم** لە سەرچاوەیەك ئاودەخۆنەوە و لەباری سیاسییەوە بەهێزترین لقی *مارکسیزم** لە ئەژماردێت کە بە *کۆمۆنیزم** ناوبانگی دەرکردووە. کۆمۆنیستەکان، خۆیان بە «*مارکسیزم – لینینیزم*»* ناوبردە دەکەن.

بیروبۆچوونەکانی لێنین لە سەردەمی پێش شۆڕشی رووسیا لە گەڵ سەردەمی پاش شۆڕشدا جیاوازن. بەر لە شۆڕش، لێنین بە پەیڕەو کردنی مارکس، باوەڕی بە رەوتی مێژوویی دایەلیکتیك هەبوو چونکا رووسیا هێشتا ئامادە نەبوو بۆ شۆڕشێکی کرێکاری و نەگەیشتبووە قۆناغی پرۆلتاریا. لەبەرئەوە، سەرەتا دەبوو لەو وڵاتەدا شۆڕشێکی بۆرژوایی روویدات(وەك شۆڕشی فەرەنسا) و رژێمی تاکرەو و دیکتاتۆری تیزاری، جێگای خۆی بدات بە رژێمێکی دیموکراتی و یاسایی و حوکمەتی چینی میانە.

لێنین، مارکسییەکی دەمارگرتوو بووە و لەگەڵ هەرچەشنە پێداچوونەوەیەك بە بنەما و رۆحی شۆڕشگێڕانەی مارکسیزمدا دژایەتی کردووە. ئەگەرچی ئەو شتەی کە لینین بە مارکسیزمی زیاد کردوووە، لەبواری تیۆرییەوە نایەتە بەرچاو بەڵام لێنینیزم هەڵگری وەرچەرخانێکی گرینگە لە مارکسیزمدا ئەویش گەڕانەوەیە لە دیترمینیزمی ئابووری بۆ ئیرادەگەرێتی. بە پێی دیترمینیزمی ئابووری – کە یەکێك لە تیۆرییەکانی مارکسە - سیاسەتی دەوڵەتەکان و رووداوە مێژووییەکان، بەگشتی هۆکاری ئابوورییان هەیە و بەرهەمی هێزە جەبرییە ئابوورییەکانن. لەم گۆڕانە فیکرییەدا لینین، لە جیاتی ئەوەی کەشوهەوای شۆڕشگێڕانەی کرێکاری بە پاشکۆیەکی رەهای شێوازی بەرهەمهێنان و دۆخی ئابووری بزانێت، هۆکاری دەروونی و زەینی واتە «ئیرادەی شۆڕشگێڕانە» و رێکخستنی بوێرانە، بە پاڵنەری سەرەکی بۆ چوونە ناو رەوتی مێژوو دەزانێت. لێنین پێی وابوو کە بێ تیۆری شۆڕش هیچ کارێکی شۆڕشگێڕانە بە ئەنجام ناگات.

لێنین تیۆرییەکی تایبەتی دەربارەی ئیمپریالیزم ئاراستە کرد کە بەرفرەوان کردنی مارکسیزم بوو لە بواری شیکردنەوەی رەوتی فراژووتنی مێژوویی سەرمایەداریدا. ئەو ئیمپریالیزمی بە دوایین قۆناغی «سەرمایەداری پاوانخواز» دەزانی کە لە سەرەمەرگی خۆیدا بوو. ئەم تیۆرییە بوو بە بنەمایەك بۆ دابەشبوونی جیهان بە دوو ئۆردووگای سۆشیالیزم و ئیمپریالیزم کە لە قۆناغی *شەڕی سارد** زۆر دەنگی دایەوە. بە ...



ئەم دابەشكارییە، سەركەوتنی بەرەی سۆشیالیزم بەسەر ئیمپریالیزم. لەباری مێژووییەوە نكوڵی لێناكرێ چوونكا ئیمپریالیزم بەرەو مەرگ گلۆر بۆتەوە.

لینین كاریگەریی زۆری لەسەر بزووتنەوەی سۆشیالیستی (بە تایبەت ماركسیستی) دانا. تاكوو بەر لە شۆڕشی ١٩١٧، ماركسییەكان هەمیشە بە دەوری یەك حیزب كۆ دەبوونەوە كە ئەویش بە «حیزبی سۆشیال دیموكرات» ناوبانگی دەركردبوو. بەڵام لینین لەپاش دامەزراندنی ئینتەرناسیۆنالی سێهەم (بڕوانە كۆمینترن) ئەم حیزبانەی بە دوو حیزبی كۆمۆنیست و سۆشیالیست دابەش كرد. وردە ـ وردە ڕێوشوێنی لینین سنووری وڵاتەكەی بەزاند و زۆربەی وڵاتانی جیهانی گرتەوە. نووكە، ئەگەرچی لە ساڵی ١٩٩٠ سیستەمی كۆمۆنیستی لە یەكیەتی سۆڤیەتی پێشوو لێك هەڵوەشایەوە، بەڵام لە چەند وڵاتێكی وەك چین و كووبا، ئەم ڕێبازە لە باو نەكەوتووە و هێشتا هەر ئەم وڵاتانەی پێ ئیدارە دەكرێ.

PDF 4 KURD

## م

**مائۆئیزم** مائوئیسم Maoism

بریتییە لە بیرو بۆچوونەکانی مائۆتسە توونگ (١٩٧٦ ـ ١٨٩٣) بنیاتنەری حیزبی کۆمۆنیستی چین و ڕێبەری سیاسی ئەم وڵاتە. مائۆئیزم لە چین، بە ڕێبازی مارکسیزیم ـ لینینیزم دەگوترێ. مائۆئیزم وەك ستالینیزم، دەستکاری پرەنسیپەکانی قوتابخانەی مارکسیزم ناکات بەڵکوو پتر بە چۆنییەتی پراکتیزەکردنەوە سەرقاڵ دەبێ و پشت بە شۆڕشی جووتیاریی و سەقامگیرکردنی سیستەمی سۆشیالیستی لە کۆمەڵگا دواکەوتووەکان دەبەستێ. هەر بۆیە مائۆئیزم لەو وڵاتانەی کە هاوشێوەی چین ڕەفتار دەکەن گەشەی کردووە.

ئەو شتەی کە مائۆ و کۆمۆنیستەکانی چین بە کۆمۆنیزمیان زیاد کرد، بریتییە لە گواستنەوەی ناوەندی خەبات لە شارەکانەوە بەرەو گوندەکان و لە کرێکارانی شارەوە بۆ جووتیاران. لە بواری سیاسەتی ناوخۆیشدا مائۆئیزم، داهێنانێکی تازەی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو کە ئامانجەکەی گۆڕینی کۆمەڵگای دواکەوتووی چین بوو کە تایبەتمەندییە گرنگەکانی بریتین لە: چاکسازی خاوەندارییەتی زەوی، بە هەرەوەز کردنی کشتوکاڵ، بەرنامەی «هەنگاوی گەورە بەرەو پێشەوە» و «شۆڕشی کولتووری».

هەروەك چۆن *لینینیزم**، پێداچوونەوەی مارکسیزم و گونجاندنی بوو لە گەڵ بارودۆخی پرۆلتاریای لاوازی پیشەسازی ئەوسەردەمەی رووسیا، مائۆئیزمیش پێداچوونەوەی مارکسیزم ـ لینینیزمە بۆ گونجاندنی ئایدیۆلۆجیای شۆڕشگێڕانە لە گەڵ ڕەوشی ئەو وڵاتانەی کە پرۆلتاریای پیشەسازیی زۆر لاوازیان هەیە.

مائۆئیزم، پاش سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان چین و سۆڤیەت وەك ڕێبازێکی توندڕەو لە باڵی چەپ جیا بووەوە و خۆی بە ڕێبازێکی بەپێزتر و لەبارتر دەزانی بۆ وڵاتانی جیهانی سێهەم و لە سەرانسەری جیهاندا بڵاو بووەوە. بزاڤە چەپییەکانی ئەمریکای لاتین، پتر لە ژێر کاریگەریی مائۆئیزمدا بوون بەڵام تەنها لە نیکاراگوا توانییان سەرکەوتن بەدەست بهێنن هەرچەندە حکومەتی مارکسیستی نیکاراگواش تەنها دە ساڵ جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە بوو.

مائۆ چەند وانەیەکی لە شۆڕشی سۆڤیەت وەرگرت کە لەگەڵ کەشی ناوخۆی چین سازگار بوو بۆ وێنە، پلاندانانی ئابووری و دەست گرتن بە سەر پیشەسازییە مەزنەکاندا. لە بواری ئایدیۆلۆجییەوە، سەرەتا سەر لە ڕەهەنی مۆسکۆ بوو بەڵام دواتر کە خۆی «ڕێگای چینی بۆ گەیشتن بە سۆشیالیزم» دۆزییەوە، ئیتر بە دەربەستی مۆسکۆ نەمایەوە. مائۆیی‌یەکان پێیان وابوو کە شۆڕش نابێ کۆتایی پێ بێت بەڵکوو دەبێ هەمیشە لە حاڵی جووڵە و بزووتنەوەدا بێت. لەم ڕوانگەوە خەبات، چ لە قەبارەی چینایەتیدا و چ بە شێوەی

PDF 4 KURD

شەڕ لەگەڵ خەمساردی شۆڕشگێڕانە، پێویستە هەر دەوامەی بێت. بەم بۆنەوە لە ساڵی ١٩٦٦ دەستیان دایە شۆڕشی کولتووری و مائۆ بە پشتبەستن بە گەنج و لاوانی شۆڕشگێڕ و سپای خەڵکی، داوای لە جەماوەر کرد لە بەرامبەر خۆبەزلزانی و خەمساردی راپەڕن و خەبات بکەن.

## مارکسیزم مارکسیسم Marxism

تیۆرییەك دەربارەی چۆنییەتی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ـ مێژوویی مرۆڤ و یاساکانی زاڵ بەسەریا کە لە لایەن کارل مارکس (١٨٨٣ـ ١٨١٨) فەیلەسوف، کۆمەڵناس و ئابووریزانی ئەڵمانی و هاورێکەی، فەردریخ ئەنگڵس (١٨٩٥ـ ١٨٢٥) دانراوە. ئەم دوو بیرمەندە بە ئاوێتەکردنێکی ئاڵۆزی فەلسەفەی ئەڵمانی و *ئابووری سیاسی** ئینگلیزی، بنەمای ئەندێشەیەکیان دانا کە ئەم دوو پێناسە لەخۆ دەگرێ:

یەکەم، تیۆرییەکی گشتی دەربارەی مێژووی مرۆڤ و قاییلبوون بە دەوری چارەنووسسازی «فۆرماسیۆنی ئابووری» یان شێوازەکانی بەرهەمهێنان لە مێژوودا.

دووهەم، تیۆرییەکی تایبەت دەربارەی گەشە و پەرەسەندن، بەرهەمهێنانەوە و ئاڵووێرکردنی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارانە کە پرۆلتاریا لەگوێن چینێکی جنگن بە هۆکارێکی مێژوویی و چالاك دەزانێ بۆ گەیشتن بە کۆمۆنیزم.

گومانێکی تێدا نییە کە مارکسیزم، یەکێك لە بزووتنەوە فیکرییە هەرە سەرەکییەکانی سەدەی نۆزدە و بیستەم بووە و لە ماوەی سەدساڵی رابردوودا کاریگەرییەکی مەزنی لەسەر ئەندێشە و مێژووی رۆژاوایی و جیهان داناوە. بەگشتی مارکسیزم، بە مانا جۆراوجۆرەکانییەوە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر کرژکردنەوە و توندڕەوکردنی پانتای فیکری سەدەی بیستەم لەسەر ئاستی جیهانی دانا بەڵام لە باری مانایی جەوهەریی مارکسیزم، لە نێوان مارکسییەکان جیاوازی بیروڕا هەیە. هەربۆیە بە درێژایی سەدەی بیستەم، چەندەها رێبازی مارکسی هاتە ئاراوە کە بەزۆری لە مەبەستەکانی مارکسیش ئەولاتر کەوتن. نموونەی ئەم رێبازانە بریتین لە: مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس، ماکسیزمی شۆڕشگێڕ، مارکسیزمی رووسی، مارکسیزمی فەلسەفی، مارکسیزمی رەخنەگرانە مارکسیزمی ئیگزیستانسیالیست و... کەواتە مارکسیزم، زۆر بەرفراوانترە لە ئەندێشەکانی مارکس. لەراستیدا گرنگترین قوتابخانە مارکسییەکانی سەدەی بیستەم، بەرهەمی ئاوێتەبوونی رەهەندێك لە ئەندێشەکانی مارکس و رەهەندەیك لە ئەندێشەی بیرمەندانێکی دیکەیە. بۆ وێنە، ئاوێتەبوونی ئەندێشەکانی مارکس لەگەڵ تیۆرییەکانی داروین، سپینۆزا، هێگل، کانت و فرۆید.

ئەندێشەکانی مارکس لە هەناوی بزاوتی کرێکاری و سۆشیالیستی سەدەی نۆزدەدا بوو بە هێزێکی سیاسی گرینگ لە رۆژئاوا. ئەم بیروڕایە لە راستیدا لایەنێکی کۆنباوی سۆشیال دیموکراسی ئەڵمانیا بوو کە لەسەر بزاوتی سۆشیالیستی و کرێکاری سەدەی نۆزدە کاریگەری دانا. بیرۆکەی سەرەکی لایەنگرانی ئەم رێبازە، بۆ وێنە مارکس، ئەمە بوو کە ناکرێ دیموکراسی ببەستینەوە بە چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵگا، بەڵکوو دەبێ بزاوتە کرێکارییەکانیش لەم رەوتەدا بەشدار بن چونکوو هاوبەشێتی ئەوان لە ژیانی سیا...

PDF 4 KURD

ناسینی مافەکانیان، دیموکراسی بۆ هەمیشە مسۆگەر دەکات. مارکس لە تیۆرییەکانی خۆیدا بەڕوونی هۆیەکانی سەرهەڵدان و ڕۆچوونی هەریەك لە قۆناغە کۆمەڵایەتییەکان ئاشکرا دەکات و ڕووخانی سیستەمی سەرمایەداری بەدەستی چینی ڕەنجدەران و زەحمەتکێشان (پرۆلتاریا) بە حەتمییەتێك دەزانێ. لە ڕوانگەی مارکسەوە سەرهەڵدانی دایەلیکتیکە مادی و ئابوورییەکان بەبێ جەنگی چینایەتی بەدی نایەت و فراژووتنی شارستانییەت لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی‌تر، بەبێ ململانێی توندوتیژی چینایەتی نایەتە بەرهەم و دەوری ڕاستەقینەی کرێکارانی لە بواری بووژاندنەوەی جیهانی بەدەر لە چینایەتی خستەڕوو.

لە نێوان تیۆرییەکانی فەلسەفەی مارکس ئەوەی کە زیاتر سەرنج ڕادەکێشێ، تیۆری مەتریالیزمی دایەلیکتیکە. مارکس لەم بیردۆزەدا تیۆری و کردەوە پێکەوە گرێ ئەدا و تێگەیشتنی ئەو لەم بوارەدا دیدێکی وردبینانەیە بۆ توێژینەوە لە پرسەکانی جیهان و ئەو شتانەی کە لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا سەرهەڵئەدەن. مەتریالیزمی دایەلیکتیك، بۆ هەر دیاردەیەك باوەڕی بە سێ فاکتەری کاریگەر هەیە بە ناوی تێز (These)، ئانتی تێز (Antithese) و سەنتێز (Synthese). بۆ وێنە لە ڕوانگەی ئەو، سەرمایەداری، تێزە، کرێکار، ئانتی تێزە و سۆشیالیزم، سەنتێزە.

مارکس، لە بەرامبەر ئایدیالیزمی دایەلیکتیکی هێگلدا «مەتریالیزمی دایەلیکتیکی»* داهێنا. هەڵبەت مارکس لەبری ئایدیالیزمی هێگل، هێزی ئابووری بە بنەما و بنیچەی ڕووداوەکانی مێژووی مرۆڤ دادەنێ. ئەو جگەلەوەی لەژێر کاریگەری فەلسەفەی هێگلدا بووە، تیۆرییە سۆشیالیستیەکانی فەرەنساشی بەردڵ کەوتووە و لە شۆڕشی مەزنی ئەو وڵاتە و تیۆرییە ئابوورییەکانی ریکاردۆش سوودی وەرگرتووە. بەڕای مارکس، مێژووی مرۆڤ، پرۆسەیەکی«سرووشتی»یە کە ڕەگوڕیشەکەی لە ناو پێداویستیە مادییەکانی مرۆڤدایە. ئەم گوزارە، بیرۆکەی سەرەکی«مەتریالیزمی مێژوویی»*یە کە مارکس و ئەنگڵس ئەم بۆچوونە بە هاوشانی داروینیزمی ژینگەیی لە قەڵەم ئەدەن. لەم بارەوە ئەنگڵس پێی وایە کە مارکس یاساکانی گووڕانی سەرمایەداری، هەروەك بەشێك لە گەشەی کۆمەڵایەتی خستۆتە ڕوو.

مارکس پێی وابوو کە سەرجەم شێوازەکانی بەرهەمهێنان لە هەر چاخێکدا دەبێتە ژێرخانێك بۆ سەرخانە سیاسی و ئایدیۆلۆجییەکان. مەبەست لە شێوازی بەرهەمهێنان بریتیە لە چۆنیەتی ڕێکخستن بۆ وەبەرهێنانی کۆمەڵایەتی و ئامراز و کەرەستەکانی پێویست بۆ ئەم کارە. بەڵام لە هەر چاخێکدا سەرەنجام هێزە بەهەرهەمهێنەکان دەکەونەوە پێش شێوازی بەرهەمهێنان و ئینجا ناتەبایی و شۆڕشی کۆمەڵایەتی ڕوونەدات. لە سەردەمی سەرمایەداریش‌دا کاتێك هێزە بەرهەمهێنەکان گەیشتنە باڵاترین ئاستی گەشە و نەشەی خۆیان، پێوەندییەکی نوێ دێتە کایەوە و پاشان کۆمەڵگای سەرمایەداری لە ئاکامی کۆمەڵێك شۆڕش و وەرچەرخان دەڕووخێ. ئینجا زەمینەی لەدایکبوونی پێکهاتەیەکی مێژوویی نوێباو بە ناوی سۆشیالیزم ئامادە دەبێت.

مارکس لە دوایین پلانەکەی لەمەڕ سیستەمی خاوەنداریێتی، باس لە سێ قۆناغی دیاریکراو دەکات: یەکەم، قۆناغی بەدەر لە چینایەتی سەرەتایی کە تێیدا هیچ جۆرە خاوەنداریەتیەکی تایبەتی لە ئارادا نەبووە و کۆمەڵگا بە شێوەی ڕاوچییەتی بەڕێ چووە(کۆمۆنی سەرەتایی). دووهەم، قۆناغی چینایەتی کە بەرە بەرە

PDF 4 KURD

چینی جۆراوجۆر لەسەر بنەمای چۆنیەتی کەڵك وەرگرتن لە زەوی پێکهاتن. کۆمەڵگا لێرەدا بە چوار چینی تایبەت دابەش دەکرێت: (١) کۆمەڵگای کەونارا کە هەمان سیستەمی کۆیلەدارییە(بۆ وێنە لە رۆمای کۆندا). (٢) کۆمەڵگا ئاسیاییەکان کە لە وڵاتانی ئاسیایی لەسەر بنەمای کۆچێیی دەسەڵات لە دەستی ئیمپراتۆر یان فەرمانڕەوا بەڕێوە چووە. (٣) کۆمەڵگا دەرەبەگایەتییەکان کە بە پێچەوانەی وڵاتانی ئاسیایی، کۆچێیی دەسەڵات لە ئارادا نەبووە بەڵکوو دەسەڵات بە شێوەیەکی بەربڵاو لە لایەن میرنشینەکانەوە بەڕێوە چووە. (٤) کۆمەڵگای سەرمایەداری کە لە هەناوی سیستەمی دەرەبەگایەتییەوە بەدی هات، لەم کۆمەڵگایەدا گرنگترین جۆری خاوەندارێتی لە کۆمپانیا پیشەسازییەکاندا بەرچاو دەکەوێ و کەرەستەی بەرهەمهێنانیش تەکنۆلۆجی نوێیە.

سێهەم، قۆناغی بەدەر لە چینایەتی کۆمۆنیستی کە بە باوەڕی مارکس لە ناخی *کۆمەڵگای* سەرمایەدارییەوە لەدایك دەبێ کە ئەویش لە راستیدا بەرهەمی ناتەبایی نێوان خەسڵەتی کۆمەڵایەتی بەرهەمهێنان و خاوەندارێتی تایبەتییە.

مارکس بۆ راگواستن لە قۆناغی سەرمایەدارییەوە بەرەو سۆشیالیزم، باس لە قۆناغێکی میانە بە ناوی «دیکتاتۆری پرۆلتاریا» دەکات کە تێیدا چینی کرێکار، دوای دامەزرانی دیکتاتۆریەتی خۆی، چینەکانی دیکە وەلا دەنێ و بە پیادەکردنی سیستەمی سۆشیالیستی، هەموو خەڵکانی کۆمەڵگا دەبنە «کرێکار» و ئینجا جیاوازییەك لە نێوان کاری دەستی و فیکری و شار و دێهات نامێنێت. ئەم بەشە لە بۆچوونەکانی مارکس، چەندین جار لە لایەن لایەنگرانییەوە پێداچوونەوەی بەسەردا کراوە تەنانەت لە کۆنگرەی ٢٢ ی حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا، مەسەلەی «دیکتاتۆری پرۆلتاریا» رەت کرایەوە. تاکوو پێش هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەڵات لە ساڵی ١٩٩١، سێ ـ یەکی حەشیمەتی جیهان لە ژێر دەسەڵاتی ئەو رژێمە سیاسیانەدا بوون کە سەرلەرەهنی ئەندێشەکانی مارکس بوون. کاردانەوەی مارکس، جیاواز لە جیهانی ئەندێشە، بەستێنی کۆمەڵناسی و فەلسەفە و ئابووری و تیۆری کولتووریشی گرتۆتەوە.

## مارکسیزم ـ لێنینیزم     مارکسیسم ـ لنینیسم     Marxism-Leninism

ئەم زاراوە لە گەرمەی مشتومڕە ئایدیۆلۆژییەکانی پاش مەرگی لێنین هاتە ئاراوە بۆ وەدەرنانی دوژمنانی ستالین. لە ژێر سەردێڕی ئەم ناوەدا مارکسیزم، بە پێی تێڕوانینی ستالین بۆ تیۆر و کردەوەی لێنین، سەرلەنوێ پێناسە کرایەوە. ئەم تێڕوانینە شەرعییەتی دەبەخشی بە سیاسەتەکانی ستالین و تا دەهات پێگەکەی وەك سەرچاوەیەکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیك قایمتر دەکرد. پاش سەردەمی ستالین، ئەم چەمکە بوو بە نیشانەی رەوابوونی دەسەڵاتی رێبەرانی داهاتوو. هەروەها لە گەرپانی کێشمەکێشی نێوان جەمسەرەکانی کۆمۆنیزمدا بوو بە بنەمایەکی ئایدیۆلۆژیك بۆ تاوانبارکردنی هەر چەشنە «لادان»ێك لە رێباز و باوەڕی مارکسی. لە میانەی مشتومڕی چین و سۆڤیەت، رووسەکان چینیان بەوە تاوانبار دەکرد کە لە رێبازی مارکسیزم ـ لێنینیزم لایداوە بەڵام چینییەکان رێگای خۆیان بەرەو ئایدیۆلۆژی «مارکسیزم ـ لێنینیزم

PDF 4 KURD

مائۆئیزم» هەڵبژاردبوو.

مارکسیزم ـ لینینیزم، ئاوەڵناوێك بوو كە پێشتر زۆربەی حیزبە كۆمۆنیستیەكان بۆ ناوبردەكردنی ئایدیۆلۆژی خۆیان بەكاریان دەبرد و بەم بۆنەوە خۆیان لەو حیزب و لایەنە ماركسییانەی كە باوەڕیان بە ڕێبازەكانی مارکس لەمەڕ شۆڕشی سۆشیالیستی و دیکتاتۆری پرۆلتاریا نەبوو جیا دەکردەوە. ئەم ڕێبازە لە بنەڕەتدا ئایدیۆلۆژی بزووتنەوەی کرێکاری بوو بەڵام لە کردەوەدا لە هەندێ لە وڵاتان بوو بە ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی و کۆنەپارێزی چینی دەسەڵاتدار و بۆرۆکراسی دەوڵەتی.

## مارکسیزمی نوێ — مارکسیسم جدید — Neo-Marxism

ئەم زاراوە پێناسەیەكە بۆ لایەنگرانی «قوتابخانەی فرانکفۆرت». قوتابخانەی فرانکفۆرت لە ساڵی ١٩٣٠ بە ناوی «سەنتەری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی فرانکفۆرت» بە پاڵپشتی **تیۆری ڕەخنەیی** و بە سەرپەرشتی ماکس هۆرکهایمر(١٩٧٣ ـ ١٨٩٢) دامەزرا. ئەم قوتابخانە کە دواتر بیرمەندانێکی وەك تئۆدۆر ئادرنۆ، هێربرت مارکۆزە و ئێریش فرۆم ی بەخۆ بینی، بوو بە مایەی دوو پێداچوونەوەی گرنگ بە بیروباوەڕەکانی مارکسدا:

یەکەم، تیۆری ڕەخنەیی رووی کردە گۆڕانکارییەکانی **دەروونشیکاری** و بە تایبەت مارکۆزە و فرۆم هەوڵیان دا بۆ تێهەڵکێش کردنی تیۆرییەکانی مارکس و فرۆید. دووهەم، هۆرکهایمر و مارکۆزە، گەیشتنە ئەم قەناعەتە کە پرۆلتاریا بووەتە بەشێکی سیستەمی سەرمایەداری و هێزی خۆی بۆ گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و شۆڕش لە دەست داوە.

مارکسیزمی‌نوێ هەروەها بە لایەنگرانی *چەپی نوێ** و شرۆڤەکارانی مارکس دەگوترێ کە لە نەریتی مارکسیزم ـ لینینیزم لایاندابێ و روویان کردبێتەوە خودی مارکس. زۆربەی ئەم کەسانە ئەنگلس و لێنین بە بەرپرسی بەهەڵە تێگەیشتنی ئەندێشەکانی مارکس دەزانن و وەلای دەنێن.

سەرچاوەی لایەنگریی ئەم گرووپە دەگەڕێتەوە بۆ نووسراوە سەرەتاییەکانی مارکس، بۆ وێنە **ئایدیۆلۆژیای ئەڵمانی** و **دەستنووسە ئابووری وفەلسەفییەکان** و بیرکردنەوە دەربارەی بنەماکانی مارکسیزم. بە واتایەکی دیکە سەرنج دان بە لایەنی هێگلی و یۆتۆپیایی و ڕۆمانسییەتی نێوان ئەندێشەی مارکس، لەبری ئابووری پەرستی و جەخت کردن لەسەر نامۆگەرێتی لەجیاتی پێداگرتن لەسەر بەرهەمهێنانی مرۆڤ.

ئەم گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی ئەندێشەی مارکس، لە کتێبێکی وەك **وشیاری چینایەتی و مێژوو** بەرهەمی گیئۆرگ لۆکاچ(١٩٧١ ـ ١٨٨٥) دەبینرێ. لۆکاچ، یەکەم بیرمەندێکە کە بە شێوازێکی سیستەماتیك، لە مارکسەوە گەڕایەوە بۆ هێگل و پرۆلتاریای مارکس ـ کە هەڵگری ئاگایی مێژوویییە ـ دەخاتە جێی «ڕۆح» لە فەلسەفەی هێگلدا.

مارکسیزمی نوێ، زیاتر ڕێبازێکی ئەکادیمی لە ئەژماردێت و لە کردەوەی سیاسیدا کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە.

PDF 4 KURD

**مافی دەرە ـ سنووریی** حقوق برون مرزی Exterritoriality

بەو مافانە دەگوترێ کە وڵاتێك بە کەسانێکی بیانی تایبەت کە لەو وڵاتەدا دەژین دەیبەخشێت. بە پێی ئەم مافانە ئەگەر بێتوو ئەو کەسانە تاوانێك ئەنجام بدەن، ئەوا دادگاکانی ئەو وڵاتە ناتوانن دادگاییان بکەن. هەڵبەت ئەم ڕێسایە باڵیۆز و نوێنەرانی سیاسی دەوڵەتەکان دەگرێتەوە و کەسانی ئاسایی ناگرێتەوە. ئەم مافانە پاراستنی ئەم جۆرە کەسانە و خێزانەکانیان دەگرێتەوە. لە سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتە داگیرکەرەکان لەم ڕێسایە کەڵکی نابەجێیان وەرگرت و بە ناوی کاپیتۆلاسیۆن* ئەم مافانەیان بۆ هەموو هاووڵاتیانی خۆیان مسۆگەر کرد و بەسەر دەوڵەتانی لاواز دەیانسەپاند.

**مافە سرووشتییەکان** حقوق طبیعی natural rights

ئەم چەمکە لە ئەندێشەی ئەورووپا، پێشونەیەکی دێرینی هەیە بەڵام زێدەتر لە سەدەکانی ١٧ و ١٨ برەوی پەیدا کرد. مافە سرووشتییەکان بریتین لەو مافانەی کە بە پێی «یاسای سرووشتی» دراوە بە تاکی مرۆڤ و شتێکی نەگۆڕ و حاشاهەڵنەگرە و بۆ هەموو کەسێك یەکسانە. بیرمەندانی سیاسی ئەورووپا ئەم مافانە بە مافێك ئەزانن کە مرۆڤ لە پێش بەدیهاتنی دەوڵەت، بە شێوەیەکی خۆڕسك و سرووشتی لێی بەهرەوەر بووە. سەرەکیترین مافە سرووشتییەکانی مرۆڤ بریتین لە: مافی ژیان، مافی ئازادی و مافی یەکسانی.

هەندێ لە بیرمەندانی سیاسی دوو زاراوەی «مافی یاسایی» لە گەڵ «مافی سرووشتی» جیا دەکەنەوەو زیاتر لە سەر مافی یاسایی لەنگەر ئەگرن. ئەم جیاوازییە تاکوو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەوامەی بوو، لەمەودوا «مافی یەکسانی بێ فەرق و جیاوازی بۆ هەموو ئەندامانی بنەچەی مرۆڤ» ڕاگەیاندرا و ئەم دەستەواژە لە جاڕنامەی گەردوونی مافی مرۆڤ (بڕوانە مافەکانی مرۆڤ) کە لە کۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان (١٩٤٨) لە پاریس پەسند کرا هاتە ئاراوە.

ناوەرۆکی بوێرانەی بیرۆکەی مافە سرووشتییەکان کە لە سەدەی ١٧ سەری هەڵدا، ئەم بنەمایە بوو کە حوکمەت ئەبێ لەسەر خواست و ڕەزایەتی خەڵك دابمەزرێت. لایەنگرانی ئەم تیۆرییە بەم قەناعەتە گەیشتن کە «کۆمەڵگای سیاسی» خۆی بەرهەمی پەیمانێکی کۆمەڵایەتییە. لەم ڕووەوە خواستی خەڵك، تەنیا یەکسانی و عەداڵەت بووە و یەکسانیش دەرکەوتێك بووە بۆ ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە.

**مافی سیاسی** حقوق سیاسی politicoal rights

مافی سیاسی بریتییە لەو مافانەی کە لە یاسای گشتی ناوخۆیی، تەنیا بە هاووڵاتیانی خۆجێیی وڵاتێك ئەدرێ و بۆ بەهرەمەند بوون لێی ئەبێ ببێتە شارۆمەندی ئەو وڵاتە. کەواتە ئەم مافە بۆ خەڵکانی بێگانە و هەندەرانی لە ئارادا نییە تاکوو نەتوانن لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتێکیتر دەستێوەردان بکەن. هەندێك پێیان وایە کە بەخشینی ئەم مافە بە کەسێکی لاوەکی، دژایەتی هەیە لە گەڵ یاسا نێونەتەوەییەکاندا، کەواتە بۆ ڕێزگرتن لەم یاسایەش بێت دەوڵەتان، ئەم مافە نابەخشن.

PDF 4 KURD

## مافیا — مافیا — Mafia

مافیا ناوی ڕێکخراوەیەکی تیرۆریستی نهێنی نێودەوڵەتییە کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەستاوە بە دژایەتیکردنی دەسەڵاتی یاسایی ولاتان. مافیا لە زۆربەی ولاتانی جیهان بە تایبەت ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵدەستێ بە کرداری تیرۆریستی و قاچاخی مادە سڕکەرەکان و باج وەرگرتن و رفاندنی مرۆڤ و ... بۆ ماوەیەکی زۆر سەرچاوەی ئەم ڕێکخراوەیان دەگەڕاندەوە بۆ ئیتالیا، بەڵام ئیمرۆکە گرووپی مافیایی و نیمچە مافیایی، زۆربەی ولاتانی جیهانی تەنیوەتەوە. بۆ وێنە کاربەدەستێکی پۆلیسی ئەمریکا گوتوویە کە مافیای رووسیا لە مافیای ئیتالیا پێشکەوتووترە. گرووپە مافیاییەکان ئەغڵەب لە سێ بەشی سەرمایەدانان، قاچاخی مادەسڕکەرەکان و سێکس چالاکی دەنوێنن.

## ماف چارەی خۆنووسین — حق تعیین سرنوشت — self-determination

لە بنەڕەتدا بە مانای ماف خواستی شارۆمەندانی ولاتێکە بۆ هەڵبژاردنی حوکمەت یان شێوازی حوکمەتی خۆیان بۆ ئەوەی سەربەخۆ بن لە ولاتێکی تر. (لە جاڕنامەی سەربەخۆیی ئەمەریکا ١٧٧٦ و جاڕنامەی ماف مرۆڤ، لە شۆڕشی فەرەنسە ١٧٩٣) ئاماژەی پێدراوە. بە پێی یەکێك لە بنەماکانی ناسیۆنالیزم کە ئەبێ دەوڵەت بالانوێنی هێز و دەسەلاتی نەتەوە بێت، ماف چارەی خۆنووسین ماف دامەزرانی دەوڵەتی نەتەوەیە بۆ ئەو گرووپە ئەتنیکی و نەتەوەییانە کە لە دەوڵەتانی فرەنەتەوە و ئیمپراتۆریەکان جیا دەبنەوە. ماف چارەی خۆنووسین لە هەر دوو شەڕە جیهانییەکەدا دەورێکی بالای هەبوو لە پڕۆپاگەندەی بەرەی موتتەفقین. (بۆ وێنە چواردە مادەکەی ویلسۆن*)

پێناسەی نێونەتەوەیی لە چەمکی ماف چارەی خۆنووسین، گرفت ساز بووە. لە دوای شەڕی جیهانی یەکەم ئەم مافە بوو بە دەسپێچکێکی هاندەر بۆ هەڵوەشانەوەی ئەو ئیمپراتۆریانەی کە شکستیان هێنابوو. خێرایی دەرکەوت کە ئەم داواکارییە بۆ تێکشکاندنی زلهێزەکانی ئەو سەردەمە بە جێیە بەلام بۆ دامەزرانەوەی سیستەمێکی سیاسی نوێ گونجاو نییە. لایەنگرانی ماف چارەی خۆنووسین ئەم هەقیقەتەیان لەبەر چاو نەگرت، کە نەتەوە بوونەوەرێکی تۆکمە نییە کە بە تایبەتمەندی کەمینەوە ببێتە دیاردەیەکی جیهانی. ئەم کەمتەرخەمییە جگە لەوەیکە بووە هۆی ناثارامی سیاسی لە ولاتانی نوێباوی هەڵقولاو لە ئیمپراتۆرییەکانی عوسمانی و نەمسا ـ مەجارستان، بنەمایەکی یاسایی نوێی هێنایە کایەوە کە ٢٠ ساڵ دواتر، نازیسم بە دژی ولاتە سەرکەوتووەکان لە شەڕدا بە کاری هێنا.

بەم حاڵەش، ماف چارەی خۆنووسین وەك بنەمایەکی یاسای نێونەتەوەیی نەچەسپاوە و ئێستاش هەر یەکلا نەکراوەتەوە. ئەم تەمومژە بە سەر چەمکی چارەی خۆنووسیندا، کارێکی وایکردووە کە هەر ولاتێکی ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان بە جۆرێك لێکی بداتەوە و دەرفەتێکی وا بڕەخسێنێ کە هەر قەیرانێك بە لا خۆیا داکێشێ. لە لایەکیتریشەوە چونکا زۆربەی ولاتان هەڵقولاوی ڕاپەڕین و خەباتی خەڵك بە دژی گرووپێکی دەسەلاتدار بوون و بە شێوازی دیموکراتی و هەڵبژاردن، بە ڕێوە ئەچن، ئەم مافە ئەکەوێ

PDF 4 KURD

پەراوێزەوە و لە گەڵ واقیعەکانی دنیای سیاسەتی ئیمڕۆدا ناگونجێ.

داکۆکی کردن لە ماڤی چارەی خۆنووسین، لە جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ببوە بنەمایەك بۆ دژایەتی کردن لە گەڵ ئیمپریالیزمدا. بەڵام گرێی سەرەکی ئەم رەوتە، لە تیۆر و واقیعدا، ناسینی گرووپێکی نەتەوەیی یان یەکەیەك بوو کە ئەم مافەی ببێت، چونکا لەم زاراوەدا لە سەر «خۆ» جەخت ئەکرێ و جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکانیش کە پێ لە سەر خودموختاری دائەگرێ، روونی ناکاتەوە کە کام گرووپ توانایی و ماڤی خودموختاری هەیە.

جاڕنامەی ساڵی ١٩٦٠ی نەتەوە یەکگرتووەکان بە کۆی ٨٩ دەنگ، سەربەخۆیی شوێنە داگیرکراوەکانی راگەیاند. بەڵام ئەم جاڕنامە لە جیاتی ئەوەیکە بوار بدات بە «نەتەوە» کە دەوڵەتێك بۆ خۆی دامەزرێنێ، ماڤی چارەی خۆنووسینی تەنیا بە قوربانییەکانی ئیستیعماری وڵاتە ئەورووپیەکان بەخشی. ئەگەرچی پێودانگێکی دیاریکراویش لە ئارادا نەبوو تاکوو دەری بخات کە دەبێ چ نەتەوەیەك وەك قوربانی ئیستیعمار بناسرێت!

بە گشتی گرووپی نەتەوەیی گەورە و ئەو ناوچانەی کە لەباری جوگرافییەوە لە دەوڵەتی ناوەندی دوورن، وەها مافێکیان هەیە. ماڤ چارەی خۆنووسین، لە هەمان کاتدا کە بریتییەلە ئازادی دامەزرانی دەوڵەت و دیاریکردنی رژێمی سیاسی، بە مانای رزگاربوونیشە لە رکێف و گوشاری دەرەکی پاش وەدەسهێنانی سەربەخۆیی. ماڤ چارەی خۆنووسین، هەندێ جار بە مانای خودموختاری و ئۆتۆنۆمی ئەنجومەن و کەمایەتی ئایینی و نەژادی لە ناو وڵاتێك پێناسە کراوە.

**ماڤ خاك** اصل حقوق خاك Law of the Soil (Jus Soil)

تیۆرییەکی یاسایی کە نەتەوایەتی، گرێدراوی خاك و شوێنی لەدایکبوونی منداڵ لە قەڵەمڕەوی حاکمییەتی دەوڵەتێك دەزانێ. واتە هەر کەسێك پەیڕەوی وڵات و شوێنی لەدایکبوونی خۆیەتی. ئەگەر بێتوو کەسێك لە فڕۆکە یان پاپۆڕ لەدایك بێت، لێرەدا چونکا بەپێی نەریتی نێودەوڵەتی پاپۆڕ لە دەریای ئازاد و فڕۆکە لە ئاسماندا سەر بەو وڵاتەن کە ئاڵاکەی هەڵگرتووە کەواتە پاپۆڕ یان فڕۆکە لەگوێن خاکی ئەو دەوڵەتە لە ئەژمار دێن. بۆ نموونە، ئەگەر منداڵێك لە پاپۆڕێکی ئەمریکی لەدایك ببێت، بەپێی بنەمای ماڤ خاك ئەو منداڵە سەربە دەوڵەتی ئەمریکا دەبێت و رەگەزنامەی ئەمریکی وەردەگرێت. ئەمڕۆ زۆربەی وڵاتانی جیهان ماڤ خاك لە یاسا مەدەنییەکاندا لەبەر چاو دەگرن و بەو پێیە هەڵسووکەوت دەکەن.

**ماڤ خودایی** حق الاهی Divine right

لە پێش سەرهەڵدانی بزاڤە کۆماریخواز و دیموکراسییەکان، بە زۆری لە سەرتاسەری جیهان دەسەڵاتی حوکمەتەکان بە پێی بیرۆکەی ماڤ خودایی پاساو ئەدرا. بە پێی ئەم مافە، سوڵتان و پادشاکان بە ئیزنی خودا لە سەر زەمیندا فەرمانڕەواییان دەکرد. ئەم بیرۆکە تا ئەو شوێنە پێی درێژ کرد کە پادشا و سوڵتان بە سێبەری خوا لە قەڵەم بدرێن. نموونەی ئەم سێبەر و گوماشتە ئیلاهییانە، بریتییەلە شاکانی هەخامەنشی و

PDF 4 KURD

ئێران، خاقانی چین، دێواپوترای هیندستان و ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست تاکوو پێش شۆڕشی فەڕەنسە. ئەمانە هەموویان خۆیان بە سێبەری خوا و نوێنەری ئەو لە سەر قەڵەمڕەوی حوکمەتەکەیان ناوبردە کردووە.

دوای سەرهەڵدانی بزاڤە رزگاریخوازەکانی لیبرالیزم و دیموکراسیەت، ئەم جۆرە رژێمانە جێی خۆیان دا بە رژێمی دەستووریی و دەسەلاتی راستەقینە گەڕایەوە بۆ خەلك و دەوڵەتیش لە بەرامبەر خەلك خۆی بە بەرپرس دەزانێ.

## مافەکانی مرۆڤ — حقوق بشر — Human Rights

ماق مرۆڤ، شێوازێکی نوێیە لە تیۆری ماق سروشتی کە یەکەم جار جان لاك (١٦٣٢-١٧٠٤) فەیلەسوفی ئینگلیزی، تیشکی خستە سەر و دواتر بە ناوی ماق مرۆڤ لەقەڵەم درا. ماق مرۆڤ بە کۆمەڵە مافێك دەگوترێ کە ئینسانەکان بە حوکمی ئینسان بوونیان ـ نەك لە بەر یاسا ـ ئەبێ لێی بەهرەوەر بن.

یەکەمین قەرار و بڕیاری نێو نەتەوەیی بۆ داکۆکی کردن لە ماق مرۆڤ، بۆ پشتیوانی کردن لە ماق خەڵکانی دەرەکی لە بەرامبەر ئازاردانی مەقاماتی خۆجێیی بوو. بە درێژایی سەدەی ١٩ زۆربەی دادگا نێونەتەوەییەکان، نیمچە قانوونێکیان بۆ رەفتار کردن لە گەڵ خەڵکانی بێگانە پەسند کرد...لە پاش شەڕی جیهانی یەکەم، زنجیرە پەیماننامەیەك لە نێوان دەوڵەتە ئەورووپییەکان واژۆ کرا کە چەن وڵاتی ئەورووپی بە پشتیوانی کردن لە کەمینە نەتەوەیی و ئایینی و نەژادییەکانی پێمل دەکرد و کۆمەڵی نەتەوەکانیش بە سەر ئەم بڕیارەدا چاودێری دەکرد.

یاسا نێونەتەوەییەکان بە گشتی گوێ نادەنە پێوەندی دەوڵەت و شارۆمەندەکانییەوە بەڵام ئەگەر بێتو ئەم پێوەندییە دوور بێ لە بنەمای ئینسانی و دژ بە عەداڵەت راوەستێ و ویژدانی مرۆڤ بهەژێنێ، ئەوا ناچار ئەبێت خۆی تێهەڵقوتێنێ. بۆ وێنە پاش سەدەی ١٩ بازرگانی کردن بە کۆیلە بە تەواوی مەحکووم کرا و دوای کوشتاری بە کۆمەڵی ئەرمەنییەکان بە دەس عوسمانی، وڵاتانی ئەورووپی کەوتنە هەوڵ ودەوڵێکی زۆرەوە بەڵام ئەو شتەی کە داکۆکی نێونەتەوەیی لە ماق مرۆڤ بەربڵاو کرد، جەنایەت و کوشتوکوشتاری کەمینە ودانیشتووانی وڵاتە داگیرکراوەکان بە دەس رژێمی نازییەوە بوو.

لە کۆنفەڕانسی سان فرانسیسکۆ(١٩٤٥) کە بۆ دەرکردنی بەیاننامەی نەتەوەیەکگرتووەکان ساز درابوو زۆرێك لە وەفدە نوێنەرایەتیەکان، پێداگرییان کرد کە لە بابەت ماق مرۆڤ و بەیاننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، هەندێ پێشنیاز بکرێت بەڵام لە بەر ئاستەنگی و گرینگی بابەتەکە ئەم کارە نەکرا و تەنیا لەچەن شوێنی بەیاننامە کە بەزاراوەی ماق مرۆڤ ئاماژە کرا.

**بەیاننامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ:** کۆمیسیۆن، بەیاننامەکەی لە مانگی ژووەنی ١٩٤٨ ئامادە کرد و کۆنگرەی گشتی لە دانیشتنی ١٠ی دیسەمبەری ١٩٤٨ بە تێکرای دەنگ پەسندی کرد. (٦ ئەندامی بلۆکی سۆڤیەت و عەرەبستانی سەعودی و ئەفریقای باشور لە دەنگدان خۆیان پاراست) کۆنگرە ئە

PDF 4 KURD

بەیاننامەی وەك «پەیمانێکی هاوبەش بۆ هەموو گەل و نەتەوەکان» ڕاگەیاند و هاوکات دەبوا هەمووان «بە فێرکردن و پەروەردە بۆ ڕێزدانان بەم ماف و ئازادییانە تێبکۆشن و بە هەنگاونانی کاوەخۆ لە ئاستی نێونەتەوەیی، ناساندن و پاراستنی لە سەرانسەری جیهاندا مسۆگەر بکەن».

بەیاننامەکە جگە لە پرەنسیپی مافە سیاسی و مەدەنییە پەسندکراوەکان لە دەستووره بنچینەیی و دیموکراتیکەکان، چەندین مافی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتووریشی تیا گونجاوە. یەکەمین بابەت لەم مافانە، بریتییە لە:مافی ژیان، مافی ئازادی و ئاسایشی تاك، پاراستنی تاك لە بەرامبەر زیندانی کردنی نایاسایی و ناردنە تاراوگە، مافی داکۆکی کردن لە دادگایەکی دادپەروەرانە و ئازاد و سەربەخۆ و بێلایەن، ئازادی ئەندێشە و ویژدان و ئایین و ئازادی کۆبوونەوەی ئاشتی خوازانە. لە بەیاننامەکەدا چەن مافێکی نوێ گونجاوە کە بریتییە لە: مافی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، مافی ئیش و کار، مافی پەروەردە، مافی هاوبەشێتی لە ژیانی کەلتووری کۆمەڵگا و مافی بەهرەمەندی لە هونەر و پێشکەوتنی زانست و بەرهەمەکانی.

***پشتیوانی لە مافی مرۆڤ لە ئەورووپا*** : داکۆکی کردن لە مافی مرۆڤ تەنیا لە ئەستۆی نەتەوە یەکگرتووەکان نییەو ئێستا چەن ڕێکخراوەی نێونەتەوەیی ئەم ئەرکە بە ئەنجام ئەگەیێنن. بۆ وێنە «ڕێکخراوەی لێبووردنی نێونەتەوەیی» یان «پەیماننامەی ئەورووپایی مافی مرۆڤ» سەر بە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژاوا. لە ساڵی ١٩٥٩ «دادگای ئەورووپایی مافی مرۆڤ» بۆ پیادەکردنی ئەم پەیماننامە دامەزرا و هەموو کەسێك، بۆی هەیە لە دەوڵەتی خۆی، داد بۆ ئەم دادگایە بەرێت و شکات بکات. بەم پێیە بۆ پشتیوانی ڕاستەوخۆی نێونەتەوەیی لە مافی مرۆڤ، ئەم هەنگاوانە نراوە.

## دەقی بەیاننامەی جیهانی مافەکانی مرۆڤ

لە لایەن کۆمەڵی گشتی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بەرواری ١٠ی دیسەمبەری ١٩٤٨ دا پەسند کرا و ئەم ڕێکخراوە لە هەموو ئەندامان داوای کرد بەیاننامەکە بڵاو بکەنەوە و بە تایبەت بۆ شیکردنەوە لە ناو قوتابخانە و ناوەندە پەروەردەییەکان، کارئاسانی بکرێت. بنەڕەتی ئەم بەیاننامە لە پێشەکی دەستووری بنچینەیی ١٧٩١ فەرەنسەدا هاتووە. بەیاننامە کە بریتییە لە یەك پێشەکی و ٣٠ مادە کە بەم پێیەی خوارەوەیە:

### پێشەکی

لەبەر ئەوەیکە ویژدانی هەموو ئەندامانی کۆمەڵی مرۆڤ و مافی یەکسان و نەگۆڕی ئەم جڤاتە بنەمای ئازادی و عەداڵەت و ئاشتییە لە جیهاندا"

لەبەر ئەوەیکە بێئاگایی و سووکایەتی کردن بە مافی مرۆڤ ئاکامێکی دڕندانەی وای لێکەوتۆتەوە کە ویژدانی مرۆڤی هەژاندووە و بەدیهاتنی جیهانێك کە تێیدا کۆمەڵی مرۆڤ بۆ دەربڕینی بیروڕا ئازادبن و دوور بن لە مەترسی و هەژاریی، گەورەترین ئاواتی مرۆڤ ڕاگەیێندراوە"

لەبەر ئەوەیکە پێویستە بە پیادەکردنی یاسا لە مافی مرۆڤ پارێزگاری بکرێت تاکوو مرۆڤ وەك دوایین

PDF 4 KURD

چارە ناچار نەبێت بە دژی ستەمکاری راپەڕێت"

لەبەر ئەوەیکە پێویستە تەواوی گەلانی جیهان بۆ پەرەدان بە پێوەندی دۆستانە گاڵ بدرێن؛

لەبەرئەوەیکە گەلانی نەتەوە یەکگرتووەکان دووپاتیان کردبوٚوە کە برِوایەکی قایمیان بە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ و کەرامەت و بایەخی تاك و یەکسانی ماڤ ژن و پیاو هەیە و بریارێکی شێلگیرانەیان داوە کە بە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی یارمەتی بگەیەنن و لە ژینگەیەکی ئازادانەتر ژیانێکی باشتر بەدی بێنن؛

لە بەرئەوەیکە دەوڵەتانی ئەندام پەیمانیان داوە کە بە هاوکاری نەتەوە یەکگرتووەکان، رێزی جیهانی و پاراستنی ماڤ مرۆڤ و ئازادییە سەرەکییەکان دابین بکەن"

سەرەنجام، لە بەر ئەوەیکە باش لەم ماف و ئازادییانە تێبگەین چونکا بۆ وەفاداری بەم پەیمانە گرنگایەتییەکی زۆری هەیە:

کۆنگرەی گشتی ئەم بەیاننامە جیهانییەی ماڤ مرۆڤ وەك ئاواتی هاوبەشی هەموو گەلانی ئەم سەرزەمینە رادەگەیێنێ تا هەموو کەس و هەموو بەشێکی کۆمەڵ رێزی بۆ دابنێ و بە راهێنان و پەروەردە ئەم ماف و ئازادییانە پەرە بدەن و بە هاوبیری نەتەوەیی و نێونەتەوەیی هەوڵ بدەن بۆ ناساندن و پیادەکردنیان، چ لە نێوان ئەندامان و چ لە دەرەوەی ئەنداماندا.

١

تێکرای کۆمەڵی مرۆڤ، ئازاد لە دایك دەبن و لە ئاست شەرەف و ماف، پێکەوە یەکسانن. هەموویان خاوەنی عەقڵ و ویژدانن و دەبێ لە گەڵ یەکتردا هەڵسوکەوتی برایانەیان هەبێت.

٢

١ـ هەر کەسێك بۆی هەیە بێ هیچ جیاوازییەك بە تایبەت لە بواری رەگەز، رەنگ، زایەند، ئایین و بروای سیاسی یان هەر مەرامێکیتر، هەروەها نەتەوە و پێگەی کۆمەڵایەتی ودارایی و زێد و خاك لە تەواوی ئەو ماف و ئازادییانەی لەم بەیاننامەدا ناوبردەکراون، بەهرەمەند بێت.

٢ـ هەمدیسان، نابێ لەسەر دۆخی سیاسی و دادپەروەری و نێونەتەوەیی وڵاتێك، دەرحەق بە کەسێك، هیچ بێعەداڵەتییەك رووبدا، جا چ ئەم وڵاتە سەربەخۆ بێت یا بندەست، چ خاوەنی دەسەڵاتێکی سنووردار یا نائازاد بێت.

٣

هەرکەسێك ماف ژیان و ئازادی و ئاسایشی تاکەکەسی هەیە.

٤

نابێ هیچکەس بە کۆیلەیی وەمێنێت و کرین و فرۆشتنی کۆیلە بە هەر شێوازێك بێت، قەدەغەیە.

٥

نابێ هیچکەس ئەشکەنجە و ئازار بدرێت یان لە گەڵیا رەفتارێکی ستەمکارانە و دژە مرۆڤانە و سووکایەتی ئامێز بکرێت.

PDF 4 KURD

٦

کەسایەتی یاسایی هەرکەس، وەك مرۆڤێك لە هەموو شوێنێك لە بەرامبەر یاسا دا بە رەسمییەت بناسرێت.

٧

هەموو کەس لە بەرانبەر یاسادا یەکسانە وماف ئەوەی هەیە کە یاسا بە چاوێك سەیری بکات و بە عەدالەت لە گەڵیا رەفتار بکرێت. ماف ئەوەشی هەیە کە لە بەرامبەر هەر چەشنە بێعەدالەتییەك کە ئەم بڕیارە پووچەڵ بکاتەوە، راوەستێ و لە ئاستی هەر پاڵنەرێك کە ئەم دۆخە تێك بدات، یاسا پشتگیری یەکسانی لێ بکات.

٨

لە بەرامبەر ئەو کردەوانەی کە مافە سەرەکییەکانی تاك ئەخەنە مەترسییەوە ـ ئەو مافانەی کە دەستووری بنچینەیی یان یاسایەکی تر پێی بەخشیبێت ـ هەر کەس ماف ئەوەی هەیە پەنا بەرێتە بەر دادگایەکی نەتەوەیی ئاشتی خواز.

٩

نابێ هیچکەس لەخۆوە دەسبەسەر بکرێ و بخرێتە بەندیخانە یان تاراوگەوە.

١٠

هەر کەس بێ هیچ فەرق و جیاوازییەك، ماف ئەوەی هەیە سکاڵا بەرێت بۆ دادگایەکی سەربەخۆ و بێلایەن و لەوێش بە شێوەیەکی ئاشکرا و دادپەروەرانە، ماف و داواکانی تاوتوێ بکرێن یان بە هەر شتێك تۆمەتبار کرابێت، لە سەری بڕیار بدرێت.

١١

١ـ هەرکەسێك تۆمەتی کەتنێکی لێدرابێ، پێش وەخت، «بێتاوان» لە ئەژمار دێت مەگەر ئەوەیکە لە رەوتێکی دادپەروەرانەی گشتیدا کە ئەویش ئەبێ هەموو بووارێك بۆ زامنکردنی پاراستنی ئەو کەسە رەخسابێت، لە باری یاساییەوە سڕی ئاشکرا بێ و پاشان تاوانبار لە قەڵەم بدرێت.

٢ـ هیچکەس لەبەر ئەنجامدان یا نەکردنی کردەوەیەك کە لە کاتی تێوەگلاندا بە پێی ماف نەتەوەیی یا نێونەتەوەیی، تاوان لە ئەژمار نەهاتووە، نابێ سزا بدرێت. هەروەها نابێ لە سزای کاتی تێوەگلانییەوە زیاتر سزا بدرێت.

١٢

کەس بۆی نییە سەر بکێشێتە ناو ژیانی تایبەتی و کاروباری خێزان و شوێنی حەوانەوە یان نووسراوەکانییەوە یان ناوبانگ و شەرەف و ئابڕووی بکەوێتە مەترسییەوە. یاسا دەبێ لە هەرکەسێك کە بەرەورووی ئەم جۆرە مەترسیانە بووبێتەوە پشتیوانی بکات.

١٣

PDF 4 KURD

۱ـ هەرکەس بۆی هەیە لە ناو هەر ولاتێکدا بەئارەزووی خۆی هاتووچۆ بکا و شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی هەڵبژێرێ.

۲ـ هەر کەس مافی ئەوەی هەیە هەر ولاتێك تەنانەت ولاتەکەی خۆشی بەجێ بهێڵێ یان بگەڕێتەوە ولاتەکەیخۆی.

۱٤

۱ـ لە بەرامبەر ئەشکنجە و ئازار و راوناندا، هەرکەسێ مافی ئەوەی هەیە کە پەنایەك بدۆزێتەوە و پەنا بباتە ولاتێکی دیکە.

۲ـ لە کاتێکدا کە راونان لە واقیعدا لە سەر تاوانێکی گشتی و ناسیاسییە یان لە سەر کردارێکی دژ بە بنەما و ئارمانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بێت، ناکرێ لەم مافە کەڵك وەرگیرێ.

۱٥

۱ـ هەرکەسێك مافی ئەوەی هەیە کە خاوەنی مافی شارۆمەندی ولاتێك بێت.

۲ـ ناکرێ کەس لەخۆوە لە مافی شارۆمەندی خۆی یان لە مافی گۆڕینی رەگەزنامەی نەتەوەیی بێبەش بکرێت.

۱٦

۱ـ ژن و پیاوی بالغ مافی ئەوەیان هەیە کە بێ هیچ سنوورێکی رەگەزی و نەتەوەیی و ئایینی و شارۆمەندی، پێکەوە زەماوەند بکەن و خێزان پێك بهێنن. لە تەواوی ژیانی هاوبەش و تەنانەت لە کاتی جیابوونەوەشدا ژن و پیاو لە هەموو کار و بارێکی زەماوەندا مافی یەکسانیان هەیە.

۲ـ زەماوەند ئەبێ ئازادانە و بە رەزامەندی ژن و پیاو سەر بگرێ.

۳ـ خێزان ئەستوونێکی سروشتی و سەرەکی کۆمەڵگایە و ئەبێ دەوڵەت و کۆمەڵگا پشتگیری لێ بکەن.

۱۷

۱ـ هەرکەس بە تەنیایی یان بە کۆمەڵەکی مافی خاوەندارییەتی هەیە.

۲ـ ناکرێ بە بێهۆ مافی خاوەندارییەتی لە کەسێك زەوت بکرێت.

۱۸

هەرکەسێك مافی ئەوەی هەیە لە ئازادی ئەندێشە و ویژدان و ئایین بەهرەوەر بێت. ئەم مافە هەروەها ئازادی گۆڕینی ئایین و مەرام و رادەربڕین، پەروەردە و مەراسیمی ئایینیش دەستەبەر ئەکات. هەرکەس دەتوانێ لەم مافانە بە شێوەی تاکەکەسی یان کۆمەڵەکی، بەهرەمەند بێت.

۱۹

هەرکەس مافی ئازادی باوەڕ و رادەربڕینی هەیە و ئەمەش بریتییە لە بیروڕای ئازایانە و وەرگرتنی زانیاری و فیکر و دەربڕینیان بە هەر چەشنێکی مومکین بێ رەچاوخستنی سنوورەکان.

۲۰

PDF 4 KURD

١- هەرکەس ماڤی ئەوەی هەیە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئاشتی خوازانە بە ئازادی ڕێك بخات.

٢- نابێ هیچکەس بە زۆرەملی ناچار بە بەشداری کردن لە کۆبوونەوەیەك بکرێت.

٢١

١- هەرکەس ماڤی ئەوەی هەیە لە ئیدارەی گشتی ولاتەکەیدا ڕاستەوخۆ یان بە هۆی نوێنەرانێك کە ئازادانە هەڵبژێردراین، بەشداری بکات.

٢- هەرکەس ماڤی ئەوەی هەیە لە هەلومەرجێکی یەکساندا پلە ومەنسەبە گشتییەکانی ولاتەکەی خۆی بەدەستەوە بگرێت.

٣- ئیرادەی گشتی، بنیات و بنەمای دەسەلاتی حوکمەتە. ئەم ئیرادە ئەبێ لە ڕێی هەڵبژاردنێکی بێغەش و ڕاست و ڕەوا بەرێوە بچێت. هەڵبژاردن ئەبێ گشتی و یەکسان بێت و بە دەنگی نهێنی یا بە چەشنێکی وا کە ئازادی دەنگدان دەستەبەر بکات بە ئەنجام بگات.

٢٢

هەرکەس وەك ئەندامێکی کۆمەڵگا، ماڤی ئاسایشی کۆمەلایەتی هەیە و ئەتوانێ لە ڕێی هاریکاری نەتەوەیی و نێونەتەوەیی، ماڤی ئابووری و کۆمەلایەتی و کەلتووریش کە بۆ پێگە و گەشەی ئازادانەی کەسایەتی ئەو پێویستە، بە لەبەرچاوگرتنی پێکهات و سەرچاوەکانی هەر ولاتێك بە دەس بێنێت.

٢٣

١- هەرکەس ماڤی هەیە کار بکات، پیشەی خۆی بە ئارەزووی خۆی هەڵبژێرێ، خوازیاری هەلومەرجێکی دڵخۆشکەر بۆ کارەکەی بێت و لە کاتی بێکاریدا پشتگیری لێ بکرێت.

٢- هەمووان ماڤی ئەوەیان هەیە کە بە عەدالەت، لە بەرامبەر کاری یەکساندا مووچە و پاداشی یەکسان وەرگرن.

٣- هەرکەسێك کار بکات ماڤی ئەوەی هەیە بە ڕەزامەندی و ئینسافەوە مووچەکەی پێبدرێ تاکوو ژیانی خۆی و خێزانەکەی بە سەربەرزی و شەرەفەوە بەرێوە ببات و بۆ فراژبوونی ژیانی، لە کاتی پێویست یارمەتی بدرێت.

٢٤

هەرکەسێك ماڤی حەسانەوە و ئاسوودەیی و گەشتوگوزاری هەیە. ئەبێ کات وساتی ئیشکردنەکەی بەرێوشوێن بێت و لە کاتی پشوودانیش نانبڕاو نەبێت.

٢٥

١ـ هەرکەس ماڤی ئەوەی هەیە ئاستی ژیان و تەندروستی و بەهرەداری خۆی و خێزانەکەی لە بواری خواردەمەنی و ماڵ و چاودێری پزیشکی و خزمەتگوزارییە کۆمەلایەتییەکان بباتە سەرەوە. دیسانەوە ماڤی ئەوەی هەیە کە لە کاتی بێکاری و نەخۆشی و پەککەوتن و بێوەکەوتنەوە و پیری یان هەر حاڵەتێکی تر کە مرۆڤ خۆی دەستی تیانەبووبێت و مەعاشەکەی لە دەست بات، لە ژیانێکی ئابڕوومەندانە بەهرەمەند بێت

PDF 4 KURD

٢ـ دایکان و منداڵان ماڤ ئەوەیان هەیە لە یارمەتی و چاودێری تایبەت بەهرەوەر بن. منداڵان، چ ئەوانەی کە بە شەرعی لە دایك بوو بێتن و چ ئەوانەش کە حەرامزا بن، ماڤ ئەوەیان هەیە کە بە یەك چاو سەیر بکرێن.

٢٦

١ـ هەرکەس ماڤ ئەوەی هەیە لە پەروەردە بەهرەمەند بێت. پەروەردە ئەبێ لانیکەم تا قۆناغی سەرەتایی خۆڕایی و حەتمی بێت. فێرکاری پیشەیی ئەبێ گشتگیر بکرێ و دەرگاکانی خوێندنی باڵاش بۆ هەمووان ئاوەڵا بێ تاکوو هەرکەس بە پێی توانستی خۆی لێی بەهرەوەر بێت.

٢ـ پەروەردە ئەبێ جۆرێ راپێچ کرێت کە کەسایەتی ئینسانی هەمووکەس بیووژێنێ و رێزگرتن لە ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ بەپێزتر بکات. پەروەردە ئەبێ فاماندنی قووڵ و لێبوردن و رێزدانان بۆ بیر و بڕوای نەیار و تەبایی نێونەتەوەیی و رەگەزیی و ئایینزایی و هەروەها پەرەدان بە چالاکییەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان، بخاتە گەڕ بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشەوە.

٣ـ دایك و باوك، لە هەڵبژاردنی جۆری پەروەردەی منالەکانی خۆیان بە نیسبەت کەسانی‌تر، لە پێش‌ترن و ماڤ لە پێشتریان هەیە.

٢٧

١ـ هەرکەس ماڤ ئەوەی هەیە کە لە ژیانی کەلتووری کۆمەڵگادا بەشدار بێت و لە بواری هونەری و پێشکەوتنی زانستی و قازانجەکانی بەهرەوەر بێت.

٢ـ هەرکەس ماڤ ئەوەی هەیە لە پشتگیری مادیی و مەعنەویی ئاسەوارە زانستی و کەلتووری و هونەرییەکانی خۆی بەهرەمەند بێت.

٢٨

هەرکەس بۆی هەیە خوازیاری چەسپاندنی نەزمێکی وابێت کە لە باری کۆمەڵایەتی و نێونەتەوەییەوە، ئەو ماف و ئازادییانەی کە لەم بەیاننامەدا هاتوون، دەستەبەر بکرێ و بەو پێیە هەڵسوکەوت بکات.

٢٩

١ـ هەمووکەس لە کۆمەڵگادا ئەرکی لە ئەستۆیە تاکوو گەشەی ئازادانە و بووژانەوەی کەسایەتی بۆ ئاسان بکرێت.

٢ـ هەرکەس بۆ پیادەکردنی ماف و بەهرەمەندی لە ئازادییەکانی، تەنیا خۆی پابەند بەو سنووربەندییە یاساییە ئەزانێت کە بۆ ناسین و پیادەکردنی ماف و ئازادییەکانی خەڵکانی‌تر و بۆ بەڕێوەچوونی خواستە ئەخلاقییەکان و تەکوزی کۆمەڵایەتی و بەهرەداری گشتی لە کۆمەڵگەیەکی دیموکراتیکدا قەراریان لە سەر دراوە.

٣ـ هیچ بەندێکی ئەم ماف و ئازادییانە، نابێ دژ بە ئامانج و بنەماکانی کۆمەڵی نەتەوەیەکگرتووەکان پیادە بکرێت.

٣٠

PDF 4 KURD

هیچکام لە قەرار و بڕیارەکانی ئەم بەیاننامە نابێ جۆرێك لێکبدرێتەوە کە بۆ دەوڵەت یان گرووپ یان کەسێك، ئەم مافە قاییل بکات کە بەو پێیە هەرکام لە ماف و ئازادییەکانی ئابراو لەم بەیاننامە، پووچەڵ بکا یان لەم رێگەوە هەنگاو بنێ.

**ماکیاڤیلیزم** ماکیاولیسم Machiavellism

تیۆرییەکی سیاسییە کە لە لایەن سیاسەتمەداری ئیتالیایی، نیکۆلۆ ماکیاڤیلی(١٥٢٧ــ ١٤٦٩) داڕێژراوە. ماکیاڤیلی، نووسەر و مێژونووسێکی بەناوبانگ و سکرتێری حکومەتی کۆماری فلۆرانس بووە کە لە ماوەی ژیانیدا گەلێك ئەرکی سیاسی ئەنجامداوە بەڵام پاش ماوەیەك لێی کەوتنە گومان و لەسەر کار لایانبرد. ئەویش هەموو کاتی خۆی تەرخان کرد بۆ نووسینی کتێبێك بە ناوی میر (prince). ئەو لەم کتێبەدا گەیشتن بە دەسەڵات بە ئامانجی کردەوەی سیاسی دەزانێ و بە هیچ بەربەستێکی ئەخلاقی نایبەستێتەوە. بۆیە پێی وایە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، دەکرێ لە هەر شتێك کەڵك وەربگیردرێت و نابێ بە هیچ کلۆجێك ئەخلاق لەگەڵ سیاسەتدا تێکەڵ بکرێت. لە روانگەی ماکیاڤیلیستیەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان دەکرێ پشت بە هەر ئامرازێك ببەسترێ تەنانەت ئەگەر ناپەسند و دزێو بێت و لەم بارەوە پابەندی بە ئەخلاق و مرۆڤایەتی بایەخی نییە.

ئەم بیرۆکەی ماکیاڤیلی، پاشان بۆ ئەو دەسەڵاتدارانە بەکاردەهات کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان لە هیچ تاوانێك سڵیان نەدەکرد و هەندێ جاریش زاراوەکە بۆ دەسەڵاتدارانی دیکتاتۆر و ستەمگەر بەکار دێت. ماکیاڤیلی پێی وایە کە ئەگەر دەسەڵاتدار حەز بە مانەوە دەکات نابێ لە هەر شێوازێکی خۆپەرستانە و تاکڕەوانە و نامرۆڤانە خۆی بپارێزێت چوونکا ئەگەر وا نەبێت، ناتوانێ دەوڵەتەکەی رابگرێ.

ماکیاڤیلی کە لە سیاسەتدا ریالیزمی گەیاندە بەرزترین ئاستی خۆی، لە نێوان مەسەلە سیاسییەکان و گرفتە ئایینیەکان جیاوازی قایل بووە. مەبەستی سەرەکی ئەو مانەوەی دەوڵەت بووە و حکومەتی کۆماریی بە مەرجێك پەسند دەکات کە جەماوەر بە گشتی بگەنە ئاستێکی باڵای عەقڵانی. ئەگەرچی ماکیاڤیلی کەسێکی دیموکرات نەبووە بەڵام پێی وابوو کە جەماوەر دەبێ لە بەڕێوەبردنی دەسەڵاتدا دەورێکی باڵا بگێڕێت تاکوو دەوڵەت بتوانێ لەباری سیاسییەوە سەقامگیر بێت. ئەو پێی وابوو کە بۆ رژێمێکی دیکتاتۆریش، لەناوبردنی حوکمەتێکی دیموکراتی لێوەشاوە، کارێکی دژوار دەبێت.

خوڵاسە، جیهانبینی ماکیاڤیلی بۆ ماوەی چوار سەدە لە مێشکی خەڵکدا هاوواتا بووە لەگەڵ زۆرداری و نەگریسی و خەیانەت. بیرداڕێژی ئەم قوتابخانە، بە نموونەی سیاسەتمەدارێکی مووقەلاش بەڵام مەکراوی و فێڵباز ناسراوە.

**مانگرتن** اعتصاب strike

ئەم وشە لە ناوی لێواری دەریایەکی فەرەنسی بە ناوی(پلاژدو گرو- Plage de greve) گیراوە کە کرێکارە بێکارەکان تێیدا ئاپۆرەیان دەبەست.

PDF 4 KURD

لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای دەست لە کار کێشانەوەی کرێکاران یا کارمەندانی دەزگایێکی ئابووری یا ئیداری یا خزمەتگوزارییە بۆ وەرگرتنی مووچە یان داوای زیادکردنی. مانگرتن لە دوای شۆرشی پیشەسازییەوە سەری هەڵدا و چینی کرێکار کە لەو شۆڕشەدا لە دایك بوو، بۆ گەیشتن بە مافەکانی خۆی لە بەرامبەر کاربەدەستاندا ئەم بزووتنەوەی رێکخست و لەم رێگاوە مافەکانی خۆی دەستەبەر ئەکرد.

لە سەرەتا دا دەوڵەت و خاوەن کارەکان، بە شێوازی جۆراوجۆر و تەنانەت بە یارمەتی هێزی پۆلیسەوە مانگرتنەکانیان تێك ئەشکاند و سەردەستەی مانگرەکانیش غەڵتانی خوێن دەکران بەڵام لە میانەی سەدەی ١٩ بەملاوە بە پێی خەباتی لەپسان نەهاتووی کرێکاران، هێدی هێدی مانگرتن رواڵەتێکی یاسایی بەخۆوە گرت و کارمەندان و خوێندکاران و... تاد گرتەوە. ئینجا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە حیزب و رێکخراوە سیاسیەکان لە مانگرتن بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی کەڵکیان وەرگرت. لایەنگرانی سەندیکالیزم* و ئانارشیزم*، مانگرتنیان وەك داردەستێك بۆ روخاندنی دەوڵەت بە کار هێنا. لە مانگرتنی گشتیدا کرێکاران وفەرمانبەرانی تەواوی دەزگا ئابووری و پیشەسازی و خزمەتگوزارییەکانی وڵاتێك، بۆ گەیشتن بە ئامانجی سیاسی یان پیشەیی خۆیان، دەست لە کار ئەکێشنەوە. لە رژێمە دیکتاتۆرییەکان بە پێی قانوون مانگرتن یاوان و قەدەغەیە.

لەم دەور و چاخەدا چونکا زۆر سەرنج ئەدرێتە کۆمەڵ و کێشە ئابوورییەکانیش رەهەندێکی سیاسی لەخۆ ئەگرن، جیا کردنەوەی مانگرتنی پیشەیی لە گەڵ مانگرتنێك کە ئاکامی سیاسی بە دواوە بێت، زۆر دژوار بۆتەوە.

## مانیفست — مانیفسـت — Manifest

مانیفست لە ریشەی لاتینی manifetus بە واتای راگەیاندراو وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بریتییەلە راگەیاندراوێك کە لە لایەن کۆمەڵە، گرووپ یان رێکخراوەیەك بۆ دەربڕینی بیروبڕوای سیاسی خۆیان بڵاو دەبێتەوە. راگەیاندراوی سەرۆکی وڵاتان یا کاربەدەستانی باڵا لە پێوەند لە گەڵ رووداوی گەورەی سیاسی وڵاتێك یاخود لە ئاستی نێودەوڵەتیش بە مانیفست لە قەڵەم دراوە. یەکەمین بەرنامەی کۆمۆنیستەکان کە لە لایەن مارکس و ئەنگڵس لە ساڵی ١٨٤٨ بڵاو کرایەوە، بە مانیفستی حیزبی کۆمۆنیست ناوبانگی دەرکرد.

## مرۆڤ دۆستی/مرۆڤگەرایی — انسان باوری — Humanism

مرۆڤ دۆستی یا هیۆمانیزم لە وشەی Human بە واتای مرۆڤ وەرگیراوە. ئەم زاراوە لە زانستە مرۆییەکاندا مانای جۆراوجۆری هەیە بەڵام بە گشتی بریتییە لە کۆمەڵێ تیۆری کە رێز بۆ مرۆڤ و خەسڵەتە ئینسانییەکانی دادەنێ و حەز بە گووران و بەختەوەری مرۆڤ دەکات. هەروەها بریتییەلە فەلسەفە و رێبازی مرۆڤایەتی کە ژیانی ئادەمیزاد لەم جیهانەدا بە گرنگتر دەزانێ لە لێکۆڵینەوەی ئاین و شتی مانایی و نەبینراو. بە پێی ئەم رێبازە پەروەردە شتێکی زور گرنگە بۆ گەشەسەندن و پێگەیشتنی توانستەکانی

PDF 4 KURD

**لە مێژووی شارستانییەتی ڕۆژئاوادا مرۆڤپەروەری، ناوی بزووتنەوەیەك دەخاتەوە بیر كە بوو بە بنەمایەك بۆ ڕینسانس و بووژانەوەی زانست و كولتوور و هونەر و چڕ كردنی گیروگرفتە كۆمەڵایەتی وسیاسییەكان، دوور لە پەروەردە و دەسەڵاتی پاپا ئایینییەكان. ئەم بزاوتە كولتوورییەی ئەورووپا بە هۆی ئاشنابوون لە گەڵ كولتووری كەونارای یۆنان و ڕۆما هاتە ئاراوە تاكوو لە بەرامبەر تاریكستانی فەرهەنگی سەدەكانی ناوەڕاست، كولتوورێكی نوێ بەرهەم بێنێت. دروشمی مرۆڤ دۆستی لەسەر ئەم قسەی پرۆتاگۆراس بەندە كە دەیگوت مرۆڤ پێودانگی هەموو شتێكە. بەم پێیە مرۆڤی خستە جێی خواوەند و كڵێسە و مەسیح و تاك گەرێتی و بڕەوی دا بە خۆپەرستی ئاوەزمەندی و لەبری باوەڕ بە مانەوەی ڕۆح و بەڵێنی بەهەشت، خۆشبینی بەم جیهانەی بەرجەستە كردەوە. ئایدیولۆژیای مرۆڤ دۆستی دوو قوتابخانەی لێ كەوتۆتەوە: یەكەم، لیبرالیزم* كە بالانوێنی عەقڵێكی شارستانی بە تایبەت چینی ڕۆشنبیر بوو كە لەگەڵ كۆت و بەندە كۆمەڵایەتییەكاندا دژایەتی دەكرد و دواتر وەك ئایدیۆلۆژیای كۆمەڵگای سەرمایەداری هەژمۆنی* پەیدا كرد. دووهەم، سۆشیالیزم كە خەونی بە چاكسازی و باشتر كردنی باری گوزەرانی چینی هەژارەوە دەبینی. نوێنەرانی مرۆڤ دۆستی لە ئەورووپا بریتین لە: دانتە، داڤینچی، مەیكڵ ئانژ، گالیلە، دكارت، لۆتر، شكسپیر، نیۆتۆن، سێرڤانتس، كۆپرنیك، ئەراسمۆس و بۆكاچیۆ.**

**مرۆڤناسیی سیاسی** انسان‌شناسی سیاسی politicol anthropology

**ئەم لقە زانستییە ئاوێتەیەكە لە زانستی مرۆناسی كەلتووری و زانستی سیاسەت كە سەروكاری لە گەڵ هەندێ لە قووڵترین كێشە سیاسیەكانی كۆمەڵگا سەرەتاییەكاندا بووە.**

**لە ڕوانگەی زۆربەی مرۆڤناسانی سیاسییەوە، هەموو بەستێنەكانی ژیان كەمتاكورتێك خەسڵەتێكی سیاسییان هەیە و ژیانی كۆمەڵایەتی تێكڕا پێكهاتێكە لە سێكوچكەی ململانێ، دەسەڵات و سوڵتە. یەكەمین ئاسەواری مرۆناسیی سیاسی كتێبی فریدریش ئێنگڵس بوو لە ژێر سەردێڕی سەرچاوەی خێزان، خاوەندارێتی تایبەت و دەوڵەت** (١٨٤٤).

**لەم سەردەمەدا موتالاكردنی پێوەندییەكانی دەسەڵات لە ناخی ستراكتووری خێزان، عەشیرە، نەتەوە و ڕایەند(سێكس) بە تایبەت لە وڵاتانی بەرەو پێشكەوتن، بۆتە بابەتێك بۆ مرۆناسانی سیاسی. ململانێ و مشتومڕی سیاسی لەم وڵاتانەدا زۆرتر لەسەر ئەم مەسەلانەیە و بە تایبەت باسكردن لە دواهاتی سیاسی ئەتنیكی و كێشمەكێشی نەتەوەیی كەوتۆتە بەر سەرنجی مرۆناسیی سیاسی. جیاواز لەم باسە تازانە، بابەتی كلاسیكی مرۆناسیی سیاسی ئێستاش هەر شێوازە سیاسییەكانی پێش دروسبوونی دەوڵەتە. یەكەمین شێوازی ڕێكخراوەیی ژیانی سیاسی لە قەوارەی هۆزەكان سەری هەڵدا كە ستراكتووری دەسەڵات لە ناویاندا لە سەر پێوەندی خزمایەتی سازدرابوو. چەن هۆكارێك بوونە هۆی گۆڕینی ئەم شێوازە سیاسییانە بەرەو دەوڵەتی ڕێكخراوەیی كە بریتین لە: بەرفراوان كردنی جوگرافیای دەسەڵاتی هۆزەكان و سەركەوتنیان،**

PDF 4 KURD

زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵ، زۆربونی حەشیمەت، پەرەسەندنی بێعەدالەتی کۆمەڵایەتی، پەرەسەندنی بازرگانی و گەورەبوونی شارەکان.

مرۆڤناسیی سیاسی، بۆ مرۆڤ وەك ئینسانێکی سیاسی ئەڕوانێ و تایبەتمەندییە هاوبەشەکانی هەموو ڕێکخراوە سیاسییەکان لەباری مێژوویی و جوگرافییەوە پێناسە دەکات. ئەم واتایە لە کتێبی سیاسەتی ئەرەستۆ کە لە بنەڕەتدا مرۆڤ بە بوونەوەرێکی سیاسی ئەزانێت، بەرچاو ئەکەوێت.

**مرۆڤی نوێ** انسان نـو New Man

ئەم زاراوە لە دەیەی ١٩٢٠ ڕەواجی پەیا کردووە و لە زاراوەی سیاسی چەپدا بە واتای ئاڵوگۆڕی ماهییەتی مرۆڤ و گۆڕانی بەرەو بوونەوەرێکی نوێ، بەدەر لە هەرچەشنە فیز و دەمارێك، پێش ڕاگەیشتن بە خۆی و خێزانەکەی، وەفاداری بە خەڵك بە ئەرکی سەرشانی دەزانێ. ئەم جۆرە مرۆڤە، خاوەنی بیرورایەکی نوێیە و شێوازی رابردووی خستۆتە لاوە. تایبەتمەندی گرنگی ئەم مرۆڤە، سەرنج دانە بە داهاتوو لەبری رابردوو، ئینسانێکی بە تەکوزە و وردەبینە، بڕوای بە پلاندانان و ڕێکخستنی کارەکانە، باوەڕی بە زاڵبوونی مرۆڤە بە دەوروبەریا، بڕوای بە پیادەکردنی عەداڵەت و یەکسانی و زانست و تەکنۆلۆژییە.

**مووساد** موساد Mossad

مووساد زاراوەیەکی عیبرییە کە بە واتای دەزگایە و سەردێڕەکەی بریتییە لە:
Ha Mossad le Modein ve Tafkidim meyuhadim بە واتای دەزگای هەواڵگیریی و ڕاسپاردنە تایبەتەکانە.

مووساد، ناوی ڕێکخراوی هەواڵگیریی و ئاسایشی ئیسرائیلە کە لە ساڵی ١٩٥٣ دامەزراوە و ئێستا بە یەکێك لە ڕێکخراوە سیخوڕییە بەناوبانگەکانی جیهان دادەنرێت. ئەم ڕێکخراوە تۆڕێکی گەورە و بەرفراوانی هەواڵگیریی لە سەرانسەری جیهان و بە تایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و وڵاتانی ئەفریقاییدا بڵاوکردۆتەوە و لە وڵاتانی ئەورووپی و ئەمریکاشدا بەدوای هەر چالاکییەك دەکەوێت کە بەدژی ئیسرائیل بێت و پووچەڵی دەکاتەوە. مووساد لە گەڵ ڕێکخراوی هەواڵگیریی ئەمریکا(سیا)* هاوکارییەکی نزیکی هەیە و دزەی کردۆتە ناو گەلێك ڕێکخراوەی هەواڵگیریی دیکەش لە جیهاندا.

**مەتریالیزمی دایەلیکتیك** ماتریالیسم دیالکتیک Dialectical Materialism

تیۆرییەکی فەلسەفی دەربارەی مێتافیزیك کە لە لایەن فردریك ئەنگڵس ــ بۆ جەخت کردن لەسەر بۆچوونەکانی مارکس لەم بارەوە ــ لە کتێبی ئانتی دورینگ (١٨٧٨) و دایەلیکتیکی سرووشت (١٩٢٥) ئاراستە کراوە. (هەڵبەت ئەم زاراوە یەکەم جار لە لایەن پولخانۆف بەکار براوە). ئەم فەلسەفە، پاش ئەوەی کلك و گوێی کرا، بوو بە فەلسەفەی ڕەسمی حیزبە کۆمۆنیستەکان و «مەتریالیزمی مێژوویی»* کامڵ ک

PDF 4 KURD

مەتریالیزمی دایەلیکتیکی، تەنها مادە بە راست و گرنگ دەزانێ و بە بناغەی گەردوون دایدەنێت. ئەم فەلسەفە، سەرچاوەی هەموو نیشانە و بەرهەمەکانی ژیان بە مادی لەقەڵەم ئەدا و هەموو گۆڕانکارییەکان بە مادە پەیوەست دەکات کە ئەم گۆڕانکاریانەش بە پێی کۆمەڵێك یاسای تایبەت کە پێی دەگوترێ « دایەلیکتیك»، روو ئەدەن. دایەلیکتیك* هەم شێوازی گۆڕینی واقیعەکانە و هەمیش شێوەی دۆزینەوەی «یاساکانی جووڵە»ی ئەو واقیعانە یە. ئەم قوتابخانە پێی وایە کە پرەنسیپەکانی مەتریالیزمی دایەلیکتیك لەگەڵ هەموو لقە زانستییەکاندا دەخوێنێتەوە.

مەتریالیزمی دایەلیکتیك، مادە لە ئاوەزی مرۆڤ بە گرنگتر دەزانێ و ئاوەز بە رەنگدانەوەی جیهانی مادە لە مێشکی مرۆڤ لە قەڵەم ئەدات و هەموو شتێك یان دیاردەیەك بە دەرەنجامی جووڵەی جەوهەری مادە شرۆڤە ئەکات.

مارکس، دایەلیکتیکی تەنها لە هەمبەر دیاردەکان و کۆمەڵگا دەبەستەوە بەڵام ئەنگلس، رووبەری ئەم فەلسەفەی بەرەو سرووشت بەرفرەوان کرد و لە ژێر کاریگەریی بیروڕاکانی هێگل، پێی وابوو کە جیهان (سروشت و ئەندیشە ومێژوو) دەکەونە ژێر باری سێ یاسا: ١) یاسای هەڵگەڕانەوەی چەندایەتی(کمیت) بە چۆنایەتی(کیفیت). ٢) یاسای ئاڵۆزی دژەکان (اضداد)، بە پێی ئەم یاسایە جووڵە، دەرەنجامی دژایەتی نێوان رەگەزە هاودژەکانی ناو سروشت و کۆمەڵگا و مێژووە. لە کۆمەڵگای چینایەتیدا لەبەر ئەوەی چینەکان دژی یەکترن، ململانێی چینایەتی دەبێتە مەرجێك بۆ فراژووتنی کۆمەڵگا. ٣) یاسای رەتکردنەوەی رەتکراو.

زۆربەی زانایانی مارکسی کە تەنها مارکس بە سەرچاوە دەزانن و بۆ ئەنگلس و لینین بایەخێکی ئەوتۆ قایل نین، بە مەتریالیزمی دایەلیکتیکیش ـ وەك میتۆدێکی فەلسەفی ـ بەهایەکی ئەوتۆ نادەن، بە چەشنێك لەم دواییانەدا حیزبە کۆمۆنیستیەکانی فرەنسا و ئیتالیا، ئەم رێبازەیان لەگوێن فەلسەفەی رەسمی حیزبەکەی خۆیان خستە لاوە.

## مەتریالیزمی کولتووری ماتریالیسم فرهنگی Cultural Materialism

رێبازێکی رەخنەگرانەیە کە لە کۆتایی حەفتاکان و هەشتاکان لە بریتانیا هاتە ئاراوە بەڵام دەرخستنی لایەنەکانی، لەگوێن چەمکێکی تیۆریی کارێکی دژوارە. ئەم زاراوە لە بەستێنی مەتریالیزمدا شرۆڤە دەکرێت چوونکا پێی وایە دامودەزگا و دەسکرد و کردەوە کولتوورییەکان، لە چەند رەهەندێکەوە لە لایەن پرۆسە مادییەکان دیاری دەکرێن و کولتوور بە کردارێکی مادی لەقەڵەم ئەدات.

مەتریالیزمی کولتووری، یەکەمجار لە لایەن رایمۆند ویلیامز (١٩٨٨ ـ ١٩٢١) رۆشنبیر و رەخنەگری کولتووریی بەریتانی، وەك میتۆدێکی تایبەتی خۆی و زاراوەیەکی رەخنەگرانە ئاراستە کرا. مەتریالیزمی کولتووری باوەڕی وایە کە هەر تیۆرییەکی کولتووری(نەك بە تەنیا تیۆری کولتووری مارکسی)، کە قایل بە جیاوازی نێوان «هونەر» و «کۆمەڵگا» یان «ئەدەب» و«پێشینەی کۆمەڵایەتی» بێت، باوەڕی بە تەوەربوونی کولتوور نییە لە کۆمەڵگادا (واتە شێوازی بەرهەمهێنان، شکڵ و دامودەزگا و چۆنیەتی بەکارهێنانی) لە

PDF 4 KURD

روانگەوە نابێ هیچکات، بۆ فۆرمە کولتوورییەکان وەك دەقێکی ناوازە بڕوانین بەڵکوو دەبێ لە قەبارەی پێوەندی و پرۆسە مێژوویی و مادییەکاندا سەیریان بکرێت.

## مەتریالیزمی مێژوویی ماتریالیسم تاریخی Historical Materialism

مەتریالیزمی مێژوویی پاژێکی گرنگی فەلسەفەی «مەتریالیزمی دایەلیکتیك»* لە ئەژماردێت کە لە سەر بنەمای تیۆری مارکس دەربارەی مێژوو بنیات نراوە. مارکس ئەم تیۆرییەی بە کورتی لە پێشەکی کتێبە ناودارەکەی خۆی بە ناوی «توێژینەوەی ئابووریی سیاسی»(١٨٥٩) هێنایە ئاراوە. ئەو دەنووسێ: «لە بەرهەمهێنانی پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکانی ژیاندا، لە نێوان ئینسانەکان پێوەندییەکی دیاریکراو دێتە کایەوە کە لە ویست و ئیرادەی ئەوان بەدەرە، ئەمەش هەمان پێوەندیی بەرهەمهێنانە کە گرێدراوی گەشە و فراژووتنی هێزە بەرهەمهێنەرەکانە. سەرجەمی ئەم پێوەندییانە ژێرخانی کۆمەڵگا پێکدێنن کە سەرخانی سیاسی و دادوەری و فیکری (ئایدیۆلۆجیکی) لەسەر ئەو ژێرخانە دادەمەزرێت. شێوازی بەرهەمهێنان لە ژیانی مادی دا چارەنووسی تایبەتمەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و ڕەوتی مەعنەوی ژیان دیاری دەکات. لێرەدا وشیاریی مرۆڤ، چۆنییەتی ژیان و گوزەرانی دیاری ناکات بەڵکوو بە پێچەوانەوە، شێوازی گوزەرانی کۆمەڵایەتی، ئاستی وشیاریی ئەو دیاری دەکات... کە شێوازی بەرهەمهێنان دەگۆڕێت، سیمای جیاوازییە کۆمەڵایەتی و دابەشکارییە چینایەتییەکانیش، بە هەوای ئەم گۆڕانە تووشی وەرچەرخان دەبێت. ئەم گۆڕانکارییانە بە شێوازێکی دایەلیکتیکی و بە دەرکەوتنی دژایەتییەکانی هەناوی واقیعە کۆمەڵایەتییەکان ڕوونەدەن کە ئاکامەکەشی ململانێی چینایەتییە ...»

بە پێی تیۆری مەتریالیزمی مێژوویی، سەرچاوەی ڕەوتی فراژووتنی مێژوویی کۆمەڵگای ئینسانی دەگەڕێتەوە بۆ جووڵە و گۆڕانی دژبەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگا. دژایەتی نێوان چینەکانی کۆمەڵگا، وزەیەکی پاڵنەرە بۆ ڕەوتی فراژووتنی ئەو کۆمەڵگایە. لە روانگەی ئەم قوتابخانەوە جڤاك و ڕەشەگەل مێژوو دەخولقێنن نەك پاڵەوانان. ئەگەرچی دەوری ڕێبەرانی شۆڕشگێڕ لە مێژوودا ڕەت ناکاتەوە.

## مەك کارتیزم مک کارتیسم Mc-Carthyism

ئەم زاراوە دەگەڕێتەوە بۆ جۆزف مەك کارتی (١٩٠٩ـ١٩٥٧) سیناتۆری ئەمریکایی کە لەساڵی ١٩٤٦ خۆی بۆ ویلایەتی ویسکانسین پاڵاوتبوو. مەك کارتی نوێنەری ئەندێشەی توندڕەوانەی ئەمریکایی بوو بەدژی لیبراڵەکانی ئەم وڵاتە و هەندێ لە کاربەدەستانی وەزارەتی دەرەوەی بە لایەنگری لە کۆمۆنیزم تۆمەتبار کرد و ژمارەیەك نووسەر و ڕووناکبیریشی هەر بەم تۆمەتەوە کێشایە ژێر لێپرسینەوە و گوشار. قۆناغی گەشەی مەك کارتیزم، سەردەمی شەڕی سارد بوو کە بە «شەڕی پیرۆز» بەدژی کۆمۆنیزم ناوی دەرکرد.

PDF 4 KURD

**میترۆپول** مترویل Metropole

میترۆپول لە وشەی یۆنانی Mteer بە واتای دایك و Polis بە واتای شار پێکهاتووە. ئەم زاراوە بە شارێك دەڵێن کە ناوەندی چالاکیەکی تایبەت بێت و هەروەها بە شارێك دەگوترێ کە بنکەی ئۆسقوفێ گەورەی تێدا هەڵکەوتبێ. لە زاراوەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا میترۆپول بەو شارانە دەگوترێ کە ڕێژەی حەشیمەتەکەی لە ٧ ملوێن کەس زیاتر بێت.

لە زاراوەی سیاسیدا میترۆپول بە وڵاتێکی کۆلۆنیالیست دەگوترێ کە خاوەنی چەند وڵاتێکی ژێردەستە بێت. دەسەڵاتی ئەم وڵاتە بە هۆی ئەو توانایيە ماڵی و پیشەسازی و قازانجە زۆرەیە کە لە چەوساندنەوەی ئەو وڵاتە کۆلۆنییە بدەستی هێناوە.

**میتـۆد** روش / اسلوب Method

بریتییە لـە شێوازی مەعریفە و لێکۆڵینـەوە و پراکتیکـی ئینسـانی بـۆ راهـاتن بـە بابـەتێکی دیـاریکراو یـان گەیشتن بە ئامانجێکی تایبەت. شێواز یان میتۆد، پرۆسەیەکی وردبینانە و مووقەڵاشە بۆ گەیشتن بە زانست یان دەسەڵات.

**مێگەلی ئینسانی** گله انسانی Human Herd

کۆمەڵێکی ئینسانی کە وەك ئاژەڵ، بێ رامان و بیرکردنەوە، کوێرکوێرانە شـوێن ڕێبـەرەکانیان دەکەون و هاوشێوەی رەفتاری ئەوان هەڵسوکەوت دەکەن.

**میلیتاریزم/سوپا پەرستی** نظامیگری / میلیتاریزم militarism

میلیتـاریزم، چـوار شـێواز لـەخۆ دەگـرێ: شـەڕئەنگێزی، زاڵبـوونی هێزەچـەکدارەکان بـە سـەر دەوڵـەت، ستایشی سوپا و بە هەرەوەز کردن بۆ گەیشتن بە ئامانجی چەکداری. کاتێك ئەم چوار شێوازە بە تێکرا بێتە کایەوە(وەك ژاپۆن لە سەردەمی هیدکی تۆجۆ ٤٤-١٩٤٠ ) میلیتاریزم بە تـەواوی پاوەجـێ دەبێت. کاتێکیش دوو یا سێ شێواز بێتە کایەوە، حاڵەتێکی رێژەییە.

میلیتـاریزم، مانـای زۆری لێبۆتـەوە. هەنـدێجار بـە واتـای شـەڕئەنگێزی یـان سیاسـەتی پاوانخوازانـە لە ئاست دەرەوە و ئامادەبوون بۆ بەرپاکردنی شەڕ بە کار هاتووە. لە شوێنی دیکـەدا بە واتـای سـەروەری سـوپا بەسەر دامودەزگای دەوڵەتە. لە کەشێکی وادا بۆ ئـەوەی دامودەزگایـەکی دەوڵـەتی بە میلیتـاریزم نـاو دەرکا، ئەبێ بەستێنی دەسەڵاتی چەکداری و مـەدەنی بە وردی لێك جـودا بکرێتـەوە و دەسـەڵاتی چەکداری بە سـەر دەزگا ئیداری و سیاسیەکاندا زاڵ بێت. یەکـەمین نیشـانەکانی جیـاوازی ئـەم دو بەسـتێنە لـە رژێمـی پادشـایی ئێران لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین بەدیهات.

پێـوەندی سـەرەکی بـۆ دەرکـەوتنی دەسـەڵاتی هێـزە چـەکدارەکان لـە دەوڵەتـدا رادەی بـەهرەوە...

PDF 4 KURD

سەربازەکانە لە دەزگای سیاسی ئەو وڵاتەدا. نمونەیەکی تر لەم جۆرە حوکمەتە، ئیمپراتۆریەتی رۆمایە لە سەروبەندی کۆتایی هاتنیدا.

دەسەڵاتی هێزی چەکدار بە سەر دامودەزگای حوکمەتدا هەمیشە بە واتای بە کارهێنانی سیاسەتی شەڕخوازانە نییە لە ئاست وڵاتانی دیکەدا. بۆ وێنە ژاپۆنی سەردەمی توکوگاوا و دیکتاتۆرییەکانی ئەمریکای لاتین. مانایەکی تری میلیتاریزم کۆنترۆڵ کردنی ژیان و کومەڵگایە لە لایەن هێزە چەکدارەکانەوە. بەم هەژمۆنییە کە بە حەزی چەکدارەکان کۆمەڵگا رێك ئەخات، دەگوترێ کۆمەڵگای «میلیتاریزە». جاری واش هەیە لە دۆخێکی جەنگیدا تەواوی دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکان دەکەونە خزمەت هێزە چەکدارەکانەوە، بۆ وێنە وڵاتی بەریتانیا لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا.

PDF 4 KURD

# ن

**ناتۆ:** بڕوانە ڕێکخراوەی پەیمانی ئاتلانتیکی باکووری.

**نازیسم** نازیسم Nazism

زاراوەی نازیسم، لە وشەی نازی Nazi وەرگیراوە کە ئەویش کورتکراوەی دەستەواژەی«**حیزبی ناسیۆنال سۆشیالیستی کرێکارانی ئەڵمانیا** Deutsche Arbiter Partei Nationalsozialistische»یە. ئەم حیزبە پاش جەنگی جیهانی یەکەم لە ساڵی ١٩١٩ لە شاری مۆنیخ بنیات نرا و لە میانەی ساڵەکانی ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ بەسەر ئەڵمانیادا حوکمەتی کرد. زاراوەی نازیسم ئەغڵەب بۆ تیۆری و شێوازی حکومەتی ئەڵمانیا لە سەردەمی ئادۆڵف هیتلەر (١٨٨٩ـ ١٩٤٥) بەکار دەبرێ و هەندێ جاریش لە گەڵ فاشیزم* و تیۆرییە هاوشێوەکان لە وڵاتانی دیکەی جیهاندا بە یەك مانا لێکدراوەتەوە. فەلسەفەی سیاسی نازیسم، ئاوێتەیێکە لە فاشیزمی ئیتالیا، بیروبڕوای ناسیۆنالیستی کۆنی ئەڵمانیا و تیۆری ڕەگەزپەرستانەی *باڵادەستیی ڕەگەزی ژێرمەن* و *مەزنایەتی سوپای پرۆس*. ئەم بڕاوتە، لەدووی دامەزراندنی ئەڵمانیایەکی بەهێزی خاوەن سوپایەکی مەزن بووە کە دەیهەویست پەرەبدات بە سنوورەکانی خۆی و یەکیەتییەك لە نێوان هەموو وڵاتانی ئەڵمانی زمان ساز بکات. شێوازی ئەم حوکمەتە، دیکتاتۆری و تۆتالیتاریزم بووە و لە پرۆپاگەندە و زەبروزەنگ کەڵکی زۆری وەرگرتووە. نازییەکان باوەڕیان بە باڵادەستیی ڕەگەزی جێرمەن هەبوو لە سەرانسەری جیهاندا و لەو بڕوایەدا بوون کە ڕۆژێك دادێت ئەڵمانیا بەسەر هەموو جیهاندا فەرمانڕەوایەتی بکات.

حیزبی نازی لە کاتی دامەزرانیدا بەرنامەکەی خۆی کە لە ٢٥ مادە پێکهاتبوو ڕاگەیاند کە هەندێ لەو خاڵانە بریتین لە:

١ـ ئێمە خوازیاری یەکگرتنی هەموو گەلی ئەڵمانیاین بە مەبەستی دامەزراندنی ئەڵمانیایەکی گەورە لە سەر بنەمای مافی خودموختاری گەلان.

٢ـ هیچکەس، جگە لە نەتەوەی ئەڵمانیا، واتە ئەوانەی کە خوێنی ئەڵمانی لە دەمارەکانیان دەخرۆشێ، هاووڵاتی ئەم وڵاتە لە ئەژمار نایەت، کەواتە یەك جوولەکەش بۆی نییە خۆی بە ئەڵمانی بزانێت.

٣ـ لەمەدووا پەنابردنی خەڵکی وڵاتانی دیکە، جگە لە ئەڵمانییەکان بۆ ئەم وڵاتە قەدەغەیە و دەبێ بەری پێ بگیرێت. داواش دەکەین هەرچی خەڵکی بیانی کە لە ١٩١٤/٧/٢ بەملاوە هاتوونەتە ناو خاکی ئەم وڵاتە، دەسبەجێ دەرکرێن.

٤ـ ئێمە خوازیاری پاوەجێکردنی سیستەمێکی یاسایی ئەڵمانی و پووچەڵ کردنەوەی یاساکانی هاوپێوەند بە ڕۆما و ئایینی کاسۆلیکین.

PDF 4 KURD

٥ـ حیزب لە مەسیحییەتی راستەقینە لایەنگری دەکات. حیزب و نەتەوەی ئەڵمان لە گەڵ جەوهەری ماتریالیستی جوولەکەکاندا بەشەڕ دێت.

حیزبی نازی بە پێی هەندێك لەو خاڵانە، گەلێك بەڵێنی دڵخۆشکەری بە خەڵك دا و گوتی هەموو بوارە گرنگ و نەتەوەییەکان بەهێز دەکرێن و بواری کۆمەڵایەتیش لەبەرچاو دەگیرێت بەڵام پاش ئەوەی کە گەیشتە دەسەڵات هیچ یەك لەو بەڵێنانەی نەبردەسەر و خەریکی پەرەپێدانی *سەرمایەداری** و *میلیتاریزم** بوو. بە هۆی جەنگەوە هیچ ئاوڕێکی لە بواری ئابووری و گرفتە نەتەوەییەکان نەدایەوە و پتر لە جاران گرنگی بە باڵادەستی رەگەزی جێرمەن دەدا.

هیتلەر کە رێبەرایەتی حیزبەکەی بە دەستەوە بوو، لە ساڵی ۱۹۲۳ پاش کۆدەتایەکی بێئاکام دەکەوێتە بەندیخانە. لە زیندان کتێبی «خەباتەکەم» دەنووسێ کە دواتر ئەم کتێبە دەبێتە کتێبێکی پیرۆز و مەرامنامەی نازییەکان. حیزبی نازی تاکوو هەڵبژاردنەکانی ۱۹۳۰ بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو بەڵام پاش سەرهەڵدانی قەیرانە ئابوورییەکەی ئەم وڵاتە، خێرا گەشەی کرد و بوو بە گەورەترین و گەشبینترین هێزی سیاسی ئەڵمانیا. دوابەدوای ئەوە کە هیدنبۆرگ، سەرکۆماری ئەڵمانیا لە ۱۹۳۳ هیتلەری وەك راوێژکاری ئەم وڵاتە هەڵبژارد، لە ماوەی چەند مانگێکدا هیتلەر کۆماریی وایمار و حیزبەکانی دیکەی هەڵوەشاندەوە و حیزبی نازی لە گۆڕەپانی سیاسەتی ئەڵمانیا بوو بە یەکەتاز. لەم سەروبەندەدا رەخنەگرتن قەدەغە کرا و نەیارانیش دوورخرانەوە بۆ ئۆردووگای کاری زۆرەملێ. هەر ئەم سیاسەتە داگیرکارانەی نازییەکان بوو کە بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی جیهانی دووهەم و ئەو هەموو ماڵ وێرانی و کوشت و کوشتارەی لێکەوتەوە. سەرەنجام حکومەتی نازی لە ساڵی ۱۹٤٥ تووشی شکست هات و خاکی ئەڵمانیا کەوتە دەست هاوپەیمانان و زۆرینەی دەسەڵاتدارانی نازی لە *دادگای نورمبێرگ** بەدژی مرۆڤایەتی بە تاوانبار دەرچوون و بە سزای خۆیان گەیشتن.

**ناسینەوەی دووفاکتۆ/نیمچە سەربەخۆ** دوفاکتو / شناسایی De facto

لە پێوەندی نێودەوڵەتیدا بە مانای پەسندکردنی دەوڵەتێکە لە لایەن دەوڵەتێکیتر و کردنەوەی سەری پێوەندی و پابەندی دوولایەنە لە نێوانیان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یا بێسنوور. دووفاکتۆ لە روانگەی یاسا نێودەوڵەتییەکاندا بە دوو جۆر دێتە ئاراوە:

۱) ناسینەوەی واقیع کە بریتییە لە دان پێدانان بە هەبوونی دەوڵەت *یان وڵاتێکی نوێ، لەگوێن دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بەتوانا بۆ بەکارهێنانی هێز و دەسەڵات لە قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی خۆیدا. ئەم جۆرە ناسینە، بەری تەسکە چونکا ئاستی پێوەندییەکان لە دۆخێکی نزمدا ئەمێنێتەوە و پێوەندی دیپلۆماسی لە نێوانیاندا ناکرێتەوە.

۲) ناسینەوەی قانوونی de jure کە بریتییە لە ناسینی دەوڵەت یان وڵاتێکی نوێ، لەگوێن دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بەتوانا لە بەکارهێنانی هێز و دەسەڵات لە قەڵەمڕەوی وڵاتەکەی خۆیدا و راپەڕاندنی پەیماننامە

PDF 4 KURD

نێودەوڵەتییەکانی خۆی. ئەم جۆرە ناسینە، کۆی پێوەندی دیپلۆماسی و پارێزراویی نوێنەرانی سیاسی لەخۆ دەگرێ.

## ناسیۆنالیزم ناسیونالیسم Nationalism

ناسیۆنالیزم لە وشەی nation بە واتای *نەتەوە** وەرگیراوە کە ئەویش لە ریشەی لاتینی nasci بە مانای لەدایك بوون سەرچاوەی گرتووە. بە گشتی بە لایەنگرانی بیروباوەڕێك دەگوترێ کە پشتگیری لە داب و نەریتە نەتەوەیییەکانی خۆیان دەکەن تاکوو خاوەنی یەك زمان و فەرهەنگ و ئایین بن و لە قەڵەمڕەوی یەك وڵاتدا بژین. ناسیۆنالیزم لە قامووسی یاسای نێودەوڵەتیدا بریتییە لە فەلسەفەیەکی سیاسی کە پێی وایە دەبێ نەتەوە، یەکەم هۆکار بێت بۆ پێناسەکردن و دامەزراندنی دامودەزگا سیاسییەکان بە تایبەت وڵاتەکان. لەم ڕوانگەوە ناسیۆنالیزم دەبێتە هۆی دامەزرانی وڵاتێك یا بە ڕەسمییەت ناسینی مافە نەتەوەیییەکانی گرووپێکی تایبەت لە ئاستی نێونەتەوەییدا.

ئەم زاراوە کە ڕاستەوخۆ دەلالەتێکی سیاسی لەخۆ دەگرێ، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، جێی خۆی لە زمانە ئەوروپییەکاندا کردەوە. بە درێژایی سەدەی ڕابردوو هەوڵ و دەوڵێکی زۆر دراوە بۆ پێناسە کردنی ئەم زاراوە کەچی هێشتاکە مانایەکی هەمەلایەن و شیاو بۆ ئەم زاراوە بەدەستەوە نەدراوە.

هەندێ لە زانایانی سیاسی پێیان وایە کە ناسیۆنالیزم دیاردەیەکی کۆن و مێژوویییە کە لە سپێدەی دروستبوونی کۆمەڵگا و بەرەبەیانی مێژووەوە سەری هەڵداوە. بۆ کۆڵینەوە لە ریشەکانی ناسیۆنالیزم، زۆربەی نووسەران ئاماژە ئەدەن بە چەشنێك وشیاری و هەستێکی نەتەوەیی کە لە نێوان گەلانی یۆنانی و کەلیمی لە ئارادا بووە. ناسیۆنالیزمی یۆنانی بە دابەشکردنی مرۆڤ بە «یۆنانی و بەربەر»، بەرجەستەتر بوو لە ناسیۆنالیزمی کەلیمی کە مرۆڤی بە «جوولەکە و بت پەرست» دابەش ئەکرد. نەتەوەی بەرجەستە لای یۆنانییەکان ڕەنگی ئایینیی لێ نەنیشتبوو بەڵام لای جوولەکەکان، نەتەوەی باڵا ڕواڵەتێکی تەواو ئایینی هەبوو. یەکەم جار لە سەدەی پێنجەمی پ. ز، سۆفیستەکان لە بەرامبەر ناسیۆنالیزمی توندڕەودا دەنگیان هەڵبڕی. دواتر «رواقیون» لە ڕێبازە فەلسەفییەکەی خۆیاندا لەسەر جیهانی بوونی مرۆڤ و نەبەستنەوەی بە کیانێك یان نەتەوەیەکی تایبەتەوە جەختیان دەکرد.

سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی نوێ وەك بزاوتێکی جڤاکی دەگەڕێتەوە بۆ بزووتنەوەی «پیوریتەنەکان»ی بریتانیا لە نیوەی یەکەمی سەدەی ١٧. لەمەو پێش، نووسەرانێکی وەك «ماکیاڤللی» و «جان بودن» بەرهەمە ناسیۆنالیستیەکانی خۆیان تەنها بۆ پاشایان و میران دەنووسی. پیوریتەنەکان ئامانجی خۆیان لە سەر بنەمای ناسیۆنالیزمی کەلیمی و ئامۆژگارییەکانی «عهد عتیق» دارشتبوو. خۆشیان بە «خەڵکانێکی ناوازە» دەزانی کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئەم ڕێبازەیان پێ سپێردراوە. ئەوان لە یەکەم هەنگاودا دەستیان دایە نووسینی یاسایەکی بنەڕەتی بۆ بریتانیا و داوایان لە جەماوەر کرد کە گوێی بۆ ڕادێرن تاکوو هەست بە

PDF 4 KURD

یەکیەتی بکەن و یەك بگرن. ئەم بزاوتە بووە هۆی لەناوچوونی پێوەندییە بنەماڵەیی و ناوچەییەکان و نەهێشتنەوەی ملکەچی بە پاتشا و پاپاکان کە ببوە لەمپەرێك لە نێوان تاك و نەتەوەدا.

پەیمانی وێستفالی* و شۆڕشی مەزنی فەرەنسا دوو هۆکاری سەرەکی بوون کە لە سەر ناوەرۆك و قەبارەی ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ کاریگەرییان دانا. یەکەمیان لەسەر دەرکەوتنی سیستەمی نوێی بەڕێوەبردنی وڵات و ئەویدیکەش، بەخشینی ناواخنی جڤاکی بە رواڵەتی ناسیۆنالیزم و دەوڵەتەکانی چاخی نوێی بۆ دەوڵەتی نەتەوە گواستەوە. شۆڕشی فەرەنسا لە دوو لاوە لە سەر ناوەرۆکی ناسیۆنالیزمی سەدەکانی هەژدە و نۆزدە کاریگەری دانا: یەکەم، بە ئاراستەکردنی تێزی دەسەڵاتی خەڵکی لە لایەن «رۆسۆ»وە چەمکی نەتەوە لە شەخسی پاتشاوە گواسترایەوە بۆ خەڵکی ئاسایی و ناسیۆنالیزمی نوخبەپەروەر و حکومەتی رەهای سەدەی حەڤدە، بوو بە ناسیۆنالیزمی دیموکراتی و دابەشکراوی سەدەی هەژدە. دووهەم، بیروبڕوا سکۆلاریستیەکانی سەرەتای رێنسانس کە ماوەیەکی درێژ لە ژێر کاریگەریی بزاوتی ریفۆرماسیۆندا بوو، بۆ جارێکی دیکەش لە لایەن شۆڕشگێڕان زیندوو کرایەوە و سەرەنجام نەریت و هێما ئایینی و گەردوونییەکان جێی خۆیان دا بە نەریت و کەلەپووری نەتەوەیی. بە هۆی پەرەسەندنی ناسیۆنالیزم و بەهێز بوونی لە ئەورووپادا سەدەی نۆزدە بە «سەدەی ناسیۆنالیزم» ناوبردە کراوە.

ناسیۆنالیزمی سەدەی نۆزدە، ئایدیۆلۆژیای سیاسییە راسترەوەکان و چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگا ئەورووپییەکان بووە و چەمکی نەتەوەش لەم چاخەدا تەنها بۆ ئەم تاقمە مومتازە بەکار دەبرا. ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە لە یەك شوێندا لە بەرامبەر سۆشیالیزم، شیر و تیری نیشان داوە ئەویش لە بزووتنەوەیەکی جیهانی کە هەموو کرێکارانی پیشەسازیی و جووتیارانی هەژاری لەخۆ دەگرت.

یەکێکی دیکە لە تایبەتمەندییەکانی ناسیۆنالیزمی ئەم چاخە، سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزمی کولتووری بووە کە رەگ و ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بزاوتی «رۆمانتیزم» و بزووتنەوەی مێژووگەرێتی ئەڵمانیا و بیرمەندانێکی وەك «هێردێر» و «فیختە».

برەوپێدان بە بیرگەلێکی دەسکردی وەك باڵادەستی رەگەز و زمان و یەکپارچەکردنی زمان و«پەروەردە» و بەهێزکردنی سنوورەکان و تۆقاندنی خەڵك بە دوژمنێکی دەرەکی و هەروەها ئافراندنی پاڵەوانان و داهێنانی نیشانە و هێماگەلێکی وەك *سروودی نەتەوەیی** و *ئاڵا* *ی نەتەوەیی بووە هۆی سەرڕێژبوونی هەست وسۆزی «رۆمانسییانە»ی جەماوەر.

لە سەدەی بیستەمدا ناسیۆنالیزمی ئەورووپی یەکێك لە پاڵپشتە سەرەکییەکانی فاشیزم* و جووڵانەوە تۆتالیتارییەکان بووە و هەروا پاڵنەرێکی بەهێزیش بووە بۆ راپەڕینی خەڵکی وڵاتانی داگیرکراو بەدژی داگیرکەران و بۆ کەمایەتییە نەتەوەییەکانیش لە بەرامبەر زەخت وزۆری دەوڵەتە ملهوڕەکان هاندەر بووە. ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە بە «ناسیۆنالیزمی پۆزەتیڤ» لە قەڵەم دراوە کە پتر لە نێوان ئەو وڵاتانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی کۆلۆنیایی و ئیمپریالیستیدا ژیاون دەبیندرێ.

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووهەم، بۆ یەکەمین جار مێژوو کەوتە ناو قۆناغێکەوە کە تێیدا

PDF 4 KURD

ڕێبازە ناسیۆنالیستیەکان بوونە فاکتەرێکی گەورە و بەرچاو. ناسیۆنالیزم، بەتایبەت لە ئاسیا و ئەفریقا بە خێرایی پەرەی سەند. لە ماوەی کەمتر لە ٢٥ساڵ پاش دامەزرانی نەتەوەیەکگرتووەکان، ژمارەی ئەندامەکانی لە ٥١ نەتەوە گەیشتە ١١٧ نەتەوە.

ناسیۆنالیزم، جۆرە وشیارییەکی کۆمەڵایەتییە بە مانای دڵبەندی بە نەتەوەیەک. ئەم وشیارییە پێی دەگوترێ «وشیاری نەتەوەیی». وشیاری نەتەوەیی، هەستی هاوخەمی و یەکگرتوویی بەدی دەهێنێت کە سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشی زمان و بایەخی ئەخلاقی، ئایین، ڕەگەز، ئەدەب، نەریتی کۆن، مێژوو، هێما و ئەزموونی هاوبەش. ناسیۆنالیزم هەروەها بەرپرسیارییەک لە بەردەم چارەنووسی نەتەوەیی و ئەمەگداری بە نیشتمان سازدەکات کە بەهێزترە لە وەفاداری بە خێزان. کەواتە خیانەت کردن بە وڵات و«دەوڵەتی نەتەوەیی» لەگوێن خیانەت بە نەتەوە دێتە ئەژمار. ناسیۆنالیزم، تاکەکەس لە بەرامبەر داواکارییە نەتەوەییەکان (وەك پاراستنی سەربەخۆیی یان خەبات بۆ وەدەست هێنانی) یان هەوڵدان بۆ خۆشگوزەرانی و سەربەرزی نەتەوەکەی گاڵ ئەدات و ئەو بە لێپرسراو دەزانێت.

بە گشتی ناسیۆنالیزم، ئایدیۆلۆژیایەکە کە «دەوڵەتی نەتەوەیی» وەك باڵاترین شێوازی پێکهاتەی سیاسی لە قەڵەم ئەدات. گەشەکردنی ناسیۆنالیزم پەیوەستە بەو ساتەوەختە مێژووییەی کە تێیدا نەتەوەکان بوون بە یەکینەیەکی سیاسی سەربەخۆ و بنەمای «حاکمییەتی نەتەوەیی» پەسند کرا. لەبەر ئەوەی هەر نەتەوەیەك خاوەنی کیانێکی تایبەتە، وەفاداری و گیانبەختکردن لە پێناوی ئەو خاکەدا یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی ناسیۆنالیزم لە ئەژمار دێت.

لە بەرامبەر ناسیۆنالیزمدا زاراوەی ئینتەرناسیۆنالیزم*، هاتۆتە ئاراوە کە ئەویش لە سەر بەرژەوەندی نەتەوە و ئەتنیکی جیاواز بە تێکڕایی جەخت دەکات. ئەگەرچی بیرۆکەی ئەنتەرناسیۆنال و تیۆری خەباتی چینایەتیش برەوی پەیدا کردووە بەڵام ئێستاش ناسیۆنالیزم وەك بەهێزترین وزەی سیاسی جیهانی هاوچەرخ لە ئەژمار دێت.

ناسیۆنالیزم وەك ئایدیۆلۆژیایەك بە چەند شێوازێك دابەش ئەکرێت کە بریتین لە:

١ـ ناسیۆنالیزمی لیبراڵ: هەندێ لە سۆشیالیستە ڕیفۆرم خوازە نوێباوەکان یا لایەنگرانی بازاڕ، ناسیۆنالیزم وەك زمانێك پەسند دەکەن. ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە پتر لە بەها و بایەخە سەرەکییەکانی لیبراڵی داکۆکی دەکات. لە زۆر بابەتەوە، «چواردە مادەی ویلسۆن»* کە پاش شەڕی جیهانی دووهەم بڵاو کرایەوە، پێناسەی ناسیۆنالیزمی لیبراڵی دەکات. ناسیۆنالیزمی لیبراڵی ڕێز لە ماف و ئازادی گەلانی دیکە دەگرێ و گرنگی پێ ئەدات. هەر بۆیە ئەو وڵاتانەی کە پەیڕەویی لەم ڕێبازە دەکەن، وێڕای بەهەند گرتنی بەرژەوەندیی نەتەوەیی خۆیان، لەسەر ئاستی نێودەوڵەتیش هاوکاری وڵاتانی دیکەش دەکەن و ڕێز لە بەها و پرەنسیپە نێودەوڵەتییەکان دەگرن.

٢ـ ناسیۆنالیزمی کۆنەپارێز و سەربە نەریتی کۆن: ئەم قوتابخانە ناسیۆنالیستییە لە داڕشتنی بنەماکانی ناسیۆنالیزمی کولتووریدا کاریگەری زۆرری هەبووە. بە باوەڕی کۆهن پلامناتز، ئەم ناسیۆنالیزمە لە

PDF 4 KURD

چەمکە کولتووریی و رۆژهەڵاتییەکاندا پێوەندی و نزیکایەتی هەیە. بەم پێیە داب و نەریتە کۆنەکان سەرلەنوێ پیادە دەکرێنەوە. پاڵنەری سەرەکی ئەم ئەندێشە، دژایەتیکردن بوو لە گەڵ چاخی رۆشنگەری.

٣ـ ناسیۆنالیزمی توندڕەو: ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە نەتەوەیەك لە نەتەوەکانی دیکە بە باڵاتر دەزانێ، هەر بۆیە بەرژەوەندییەکانی ئەو نەتەوە لە سەرووی نەتەوەکانی دیکە دادەنێ و لە راستیدا پەرگیرییەکی نالۆژیکی رەگەزی و نەتەوەییە کە دەستدرێژی کردن بۆ سەر نەتەوەکانی دیکەش بە رەوا دەزانێ. نموونەی ئەم ناسیۆنالیزمە، رژێمەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا بوون بەر لە جەنگی دووهەمی جیهانی.

٤ـ ناسیۆنالیزمی سیاسی: مەبەست ئەوەیە کە هەر وڵاتێك لە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیدا ئازاد و سەربەخۆ بێت و هەر رژێم و حوکمەت و یاسایەکی پێویست بێ بۆ خۆی دەستنیشانی بکات. ئەم جۆرە ناسیۆنالیزمە لە چاو سەدەی نۆزدەهەم لاوازتر بووە و ئەمڕۆ گەلان و وڵاتانی بچووك هەوڵ دەدەن لە چوارچێوەی یەکێتییە ناوچەییەکاندا یەکبگرن، وەك یەکێتی ئەورووپا* و کۆمکاری عەرەب*.

## ناسیۆنالیزمی کوردی ناسیونالیسم کردی Kurdish Nationalism

کورد کە ئەغلەب لە شار و بازاڕان دوور بوون و پتر لە دێهات و کەژ و کێواندا ژیاون، بۆ ماوەیەکی زۆر بێبەهرە بوون لە چینی مامناوەندی شارستانی کە ـ ئەم چینە ـ لە بەدیهێنانی بزاڤی نەتەوەییدا دەوری باڵا دەگێڕێ. کە مودێرنیتی سەری هەڵدا و جۆرە راپەڕینێکی نەتەوەیی هاتە مەیدانەوە،(ئیمرۆکە رەوتی مۆدێرنیتی وایکردووە زمانێکی ئەدەبی بخوڵقێنێ کە زۆرینەی کوردان دەرکی پێئەکەن) وادەرئەکەوت کاتی ئەوە بەسەر چووبێت کە ئەم راپەڕینە بتوانێ بەسەر رووداوەکاندا زاڵ بێ و لە سەروبەندێکی مێژوویی وەك دارمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و کەساسی ئێرانییەکان، وڵاتێکی کوردی بۆ خۆی دامەزرێنێ. لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم جۆرە بزوتنەوەدا کە بە هەنگاوی یەکەمی ناسیۆنالیزمی کوردی دەناسرێت، بزوتنەوەکەی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لە ناوەڕاستەکانی نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدە، بە گرینگترین و سەرەتاییترین خاڵی شێوەگیربوونی ناسیۆنالیزمی کوردی لە ئەژماردێت. سەرەنجام کە راپەڕینێکی نەتەوەیی مۆدێرن سەری هەڵدا، خەونەکانی کورد لە گەڵ بەرژەوەندی دەوڵەتانی ناوچەکە کە زیاتر لە ٨٠٪ کوردیان لە خۆ گرتبوو، یەکیان نەگرتەوە و رووبەڕووی یەکتر وێستان.

سەیر نییە ئەگەر بڵێین مێژووی ناسیۆنالیزمی کوردی، لە راستیدا مێژووی شەڕی ناوخۆ و خەبات بۆ گەیشتن بە سەربەستی بووە. ئەو ناسیۆنالیزمەی کە لە جەوهەردا لە گەڵ دژایەتی دەوڵەتانی ناوچەکە رووبەڕوو بووە و بۆ تێگەیشتن لێی، ئەبێ هەلومەرجی زاڵ بە سەر هەرکام لەم وڵاتانە بە باشی لێك بدرێتەوە.

گومانیش نییە لەوەی ناسیۆنالیزمی کوردی بزاوتێکە پتر لە بەردەم فشاری ناسیۆنالیزمەکانی دیکەدا گەشەیکردووە و ناسیۆنالیزمێکی پەرچەکردارانە بووە و زادەی پرۆسە ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەکنیکییەکانی ناو هەناوی کۆمەڵگای کوردی نەبووە. ناسیۆنالیزمی کوردی دەرەنجامی گەشەی ئەو هێزانە نەبووە کە دەسەڵاتی سیاسییان بە شێوەیەکی ئۆرگانی بە دەسەڵاتی سیاسی نەتەوەوە گرێدابێ.

PDF 4 KURD

ناسیۆنالیزمی کوردی بە حوکمی ئەوەی بەرهەمی گەشەیەکی سرووشتییانە و سەربەخۆی کۆمەڵگا نییە و بەرەنجامی داگیرکردنە، کردەیەکی بەرگریکارانەیە و پەرچەکردارێکە بۆ مانەوە. ئەم دۆخە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر جەوهەری ناسیۆنالیزمی کوردی جێهێشتووە و سرووشتی هەموو چالاکییەکانی ئەم ناسیۆنالیزمەی بە مۆرکێکی تایبەتی مۆر کردووە.

ستراتیجی* ناسیۆنالیزمی کوردی لە سەدەی بیستەمدا ئەوەیە جاربۆجار رایدەگەیێنێ «هێشتا کاتی ئەوە نییە دروشمە سیاسییەکانم بەرز بکەمەوە و روخساری راستەقینەی خۆم ئاشکرا بکەم». بە کوردی و بە کورتی، ناسیۆنالیزم بۆ زەمەنێکی نموونەیی دەگەڕێ تا خۆی تیا ئاشکرا بکات. زەمەنێکی خوراق کە نییە و نابێت. زەمەنێك لەبری ئەوەی ناسیۆنالیزم خۆی دروستی بکات، چاوەڕوانە مۆعجیزەیەك بۆی دروست بکات.

## ناسیۆنالیزمی کورد لە تورکیا

زیاتر لە ١٢ملوێن کورد لە ناو سنوورە کانی تورکیا دەژین کە بەزۆری لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەم وڵاتە نیشتەجێ بوون. لە سەردەمانێکی مێژووییدا هەمیشە کوردی تورکیا، زیاتر لە کوردی ئێران و عێراق چالاکیان لە خۆیان نیشان داوە و رێبەرانی کورد زیاتر لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەورێکی سیاسیان گێڕاوە تاکوو ئێران. زۆرینەی کوردەکانی ئێران لە سەردەمی سەفەوییەکاندا چوونە سەر ئایینزای شیعە، کەچی زۆربەی کوردی تورکیا سەر بە ئایینزای سوننە بوون. لە ئیمپراتۆری عوسمانیدا چونکا کوردەکان موسوڵمان بوون، لە ناو هێزە سەربازییەکان وەرئەگیران و لە سەروبەندی شەڕی جیهانی یەکەم بۆ سەرکوتکردنی ئەرمەنییەکان کەڵکیان لێ وەرگیرا. لە ئاکامدا هێندەی نەخایاند کە کورد کەوتە بەر شاڵاوی تۆڵەئەستاندنەوەی هێزەکانی سۆڤیەت و هاوپەیمانە ئەرمەنییەکانی. بەم حاڵەش، پێشمەرگەی کورد سەرەڕای ئەو هەموو رەنج و مەینەت و پلە و پایە نزمەش کە بوویان، جارێکیتر لە ساڵەکانی ١٩٢٠-١٩٢١ بە رێبەرایەتی مستەفا کەمال ئاتاتورك، لە بەرامبەر فەرەنسیەکان و ئەرمەنیەکان راوەستان و بوون بە قەڵغانی بیر و باوەڕە ئیسلامییەکەیان.

رەتکردنەوەی پێوەندی ئیسلامی تورکیا بۆ چەسپاندنی شوناسی تورکی لە لایەن مستەفا کەمال لە هەردوو بەستێنی مەدەنی و ئەتنیکییەوە بووە هۆی لەدایکبوونی ناسیۆنالیزمی کوردی. سەرکوتکردنی راپەڕینی کوردی سوننەی زازایی لە فێڤرییەی ١٩٢٥ بووە هۆی دەسخەڕۆکردنی هەمەلایەنەی کورد و هەر ئەم سەرکوتکردنە بێڕەحمانە بوو کە برایەتی و هاوسۆزی ئایینی لە نێوان کوردەکان ژیاندەوە. راپەڕینێکیتر کە لە ساڵی ١٩٢٨ لە کوێستانیەکانی ئارارات سەری هەڵدا (و لە لایەن سەرەك خێڵ و عەشیرەتەکانی ناوچەکە رێبەرایەتی کرا و بۆ یەکەم جار رێکخراوەی ناسیۆنالیستی ـ خۆیبوون* ـ پشتگیری لێکرد)، بۆ ماوەی ٢ ساڵ دەوامی هێنا. دەوڵەت وەها لە مەحفکردنەوەی کوردەکان پێداگربوو کە بە پێی یاسای٢٥١٠ دانراوی ژوەنی ١٩٣٤، بڕیاری دابوو تەواوی ناوچە کوردنشینەکان بخاتە چوارچێوەی پلانی تواندنەوەی کورد لە ناو کەلتووری تورکیدا.

PDF 4 KURD

سەیر ئەوە بوو کە کۆچ ورەوی خەڵکی هەژار لە ناوچە کوردنشینەکانەوە بەرەو شارەکانی رۆژاوای تورکیا کە ئابوورێکی بریسکەداری هەبوو(ناوەنجی داهاتی کەسەکی لەم شارانەدا لە کۆتاییەکانی ١٩٨٠ چوار ئەوەندەی ناوچەکانی‌تر بووە)، بووە هۆی لەدایکبوونی چینێکی رووناکبیر و کرێکاری شارنشین کە بزاڤی ناسیۆنالیزمی نوێی کوردەکان، لە هەناوی ئەمەوە هاتەدەرێ. لە کۆتاییەکانی ١٩٦٠ لەبەر هۆکاری چینایەتی و ئەتنیکی، کوردەکان بە هۆی «حیزبی کریکارانی تورکیا» کە حیزبێکی توندڕەوی چەپگەرا بوو، بایەخیان پەیدا کرد. هۆکاری ئەم مەسەلە ئەگەڕایەوە بۆ سنعاتی بوونی تورکیا بە رێژەی وڵاتانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوین کە ئەمیش لە کەم جێگای ناوچەکە دەست ئەکەوت. لە هەشتاکان بەملاوە و دوابەدوای نیشتنەوەی ململانێی چەپ و راست، کە کوردەکان لە هەر دوو باڵەکەدا بەشدار بوون، سەرەنجام رەهەندی ئەتنیکی و نەتەوەیی بە سەر رەهەندی چینایەتیدا زاڵ دەبێت.

بە دامەزرانی حیزبی کرێکارانی کوردستان (PKK) لە ساڵی ١٩٨٣ ئەم راستیە ئاشکرا بوو کە پێکهاتەی ناوبراو تا ئێستاش هەر بەهێزە و گوڕ و تینی خۆی لە دەست نەداوە. ئەم حیزبە دەستی دایە هێرش بردن بۆ سەر هێزەکانی ئەرتەش و ملکدارە کوردەکان و جوتیارانی نەیار و هەر دوو باڵی راست و چەپ چونکا پێی وابوو بە ئاواتەکانی کورد خەیانەتیان کردووە. رادەی کوژراوەکانی هەر دوولا کە لە ساڵی ١٩٩١ نزیکەی ٢٥٠٠ کەس بوو، لە ١٩٩٥ گەیشتە ٢٠ هەزار کەس. لە ساڵی ١٩٨٥ ئەرتەش هێزێکی بەناوی «گاردی دێهاتی» دامەزراند کە ژمارەی ئەندامەکانی لە ساڵی ١٩٩٦ گەیشتە ٦٠ هەزار کەس.

کاتێك بەرەنگار بوونەوە رووی لە زیادبوون کرد، دەسەڵاتدارانی تورکیا بۆ ماوەیەکی کورت رویانکردە شوناسی کوردەکان. تورگۆت ئۆزال، سەرەك وەزیری ئەو کاتە ئیجازەی دا کە رۆژنامەی کوردی بڵاو بکرێتەوە و ئەنستیتۆیەکی کوردیش لە ئەنقەرە بکرێتەوە و کورد ئەمجار بتوانێ لە جیاتی ناوی تورکی ناوی کوردی بەکار بێنێت. لە ١٩٩٠ حیزبێکی نوێ بە ناوی «حیزبی کرێکاری گەل» دامەزرا کە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ وتەبێژی پەرلەمانی pkk لە ئەژمار ئەهات بەڵام مەرگی کتوپڕی ئۆزال لە ١٩٩٣ بووە هۆی هەڵوەشانەوەی خێرای ئەم حیزبەش. بە تیاچوونی ئۆزال ــ چونکا هەر دوولا پێیان وابوو کە دەکرێ لەسەر بنەمای سازش و گفتوگۆ سیاسەتێکی نوێ بێتە کایەوە ــ کەسایەتییەکی گرینگ لە گۆڕەپانی سیاسەتی تورکیادا مەحف بۆوە. لەو سەردەمەوە حیزبی کرێکارانی کوردستان لە سەر بنیاتێکی فیدراڵ بۆ تورکیا جەخت ئەکا کە لە سایەی ئەم سیستەمەوە تا رادەیەکیش خودموختاری بۆ خۆی مسۆگەر بکات بەڵام دەوڵەت بەزۆری ئەم پێشنیازەی رەتکردۆتەوە. لە لایەکی ترەوە لە ١٩٩٥ بەملاوە دەوڵەت هێزی سەربازی خۆی ناردە باکووری عێراق بۆ سەرکوتکردنی pkk. ئەم رەفتارە شەرەفی نێونەتەوەیی تورکیای خستە ژێر پرسیارەوە. ساڵی ١٩٩٨ بۆ کوردی تورکیا ساڵێکی نگریس بوو چونکا لەو ساڵەدا رێبەری pkk عەبدوڵلا ئۆجەلان بە پێی هاوبەندییەکی سیخوڕی نێودەوڵەتی بە هاوبەشی دەوڵەتانی کینیا، یۆنان، ئیسراییل و تورکیا دەسبەسەر کرا و رادەستی حوکمەتی تورکیا کرایەوە. ئەم رووداوە بوو بە هۆی بشێوی و نائارامی لە هەموو ناوچە کوردنشینەکان و کوردانی دانیشتووی ئەورووپاش دەنگی نارەزایەتی خۆیان بە [illegible]

PDF 4 KURD

کردەوە هەڵبڕی. دەوڵەتی تورکیا پاش ماوەیەك حوکمی سێدارە بۆ ئۆجەلان دەبڕێتەوە بەڵام ئەم حوکمە لە ژێر گوشاری یەکیەتی ئەوروپا ـ کە تورکیا حەز دەکات دڵی رابگرێ ببێ بەشکم ببێ بە ئەندامی یەکیەتی ـ بە هەڵپەسێردراوی دەمێنێتەوە تاکوو سەرەنجام لە سەر داوای یەکیەتی، حوکمی سێدارە لە یاساکانی تورکیا لادەبرێت. ئێستاش ئۆجەلان ماوەی ١٢ ساڵە تەنیا لە بەندیخانەی دوورگەی ئیمراڵی یەخسیرە.

## ناسیۆنالیزمی کورد لە عێراق

لە یەکەمی دێسەمبەری ١٩١٨، شەست کەس لە رێبەرانی کورد پەیمانێکیان لە گەڵ بەریتانیا مۆرکرد کە زۆر مژاوی و دژبەر بوو. ئەم پەیمانە کە پێشەنگاوێك بوو بۆ *پەیمانی سێڤەر**، دەرفەتی خودموختاری بۆ کوردەکان ئەرەخساند بەو مەرجەی کە کوێستانەکانی باکوور و باشوور پێکەوە گرێ بدات و تورکیاش دامرکێنێ. بەڵام بەهێزبوونی هەرچی زیاتری سۆڤیەت و هاوکات، نیازی بەریتانیا بۆ رازیکردنی تورکیا و مەلیك فەیسەڵ ـ کە وەك پاتشای عێراق داینابوو ـ بووە هۆی ئەوە کە کوردەکان فەرامۆش بکرێن. لەم رووەوە لە پەیمانی ١٩٣٠ بەریتانیا و عێراق، نەوەك باسێك لە خودموختاری کورد نەکرا بەڵکوو تەنانەت هیچ باسێکیش لە ماف کەمایەتیەکانیش نەهاتە ئاراوە. لە میانەی ١٩٣٠ تاکوو ١٩٥٠، کوردەکان چەندین جار بە رێبەرایەتی شێخ مەحموودی بارزانی راپەڕین. پاش ئەوەی، عەبدولکەریم قاسم لە ساڵی ١٩٥٨ حوکمەتی پاشایەتی لەناو برد، پێوەندی دەوڵەت و خەباتی سیاسی کورد بۆ ماوەیەکی کورت گەشایەوە. بەڵام لە ١٩٦١ مەلا مستەفا بارزانی و هەندێ رۆناکبیری شارستانی سەربە حیزبی دێموکرات بە رێبەرایەتی برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی سەرلەنوێ بەدژی دەوڵەت راپەڕین و شۆڕشێکیان پێکهانی. لە ساڵی ١٩٦٤ دەوڵەتی قاسم رووخا و کورد دیسانەوە لە بەرامبەر دەوڵەت وێستا. بەڵام ئەمجارە لە گەڵ جارەکانی پێشوو جیاوازی هەبوو، ئەویش ناکۆکی ئەکەوێتە بەینی حیزب و برایم ئەحمەد و تاڵەبانی لە حیزب جیا ئەبنەوە و پێکەوە یەکیەتی نیشتمانی کوردستان (PUK) دائەمەزرێنن. ئەم حاڵەتە، سەرەتای مودێلێکیماڵوێرانکەر بوو لە خەباتی سیاسی کوردەکان کە کەمتاکورتێك تا ئێستاش هەر درێژەی بووە و دەرەنجامی نالەباری بۆ ئامانجی کورد لێکەوتۆتەوە.

سەیر ئەوەیە کە رژێمی پان ـ عەرەبی بەعس کە لە ساڵی ١٩٦٨ بە دەسەڵات گەیشت، لانیکەم لە رواڵەتدا زۆرترین سازگاری لە گەڵ ناسیۆنالیزمی کورد هەبوو. لە رێکەوتنامەی ١١ی ئەیلوولی ١٩٧٠ دەوڵەتی عێراق بە شێوەیەکی فەرمی دوو نەتەوەی لەم وڵاتە بە رەسمییەت ناسی و یەکێك لە دوو پۆستی جێگری سەرکۆماری بە کوردەکان بەخشی. زمانی کوردی وەك یەکێك لە دوو زمانە سەرەکییەکەی عێراق رەسمییەتی پێدرا و دەوڵەت زەمانەتی ئەوەیکرد کە کاروبارە دەوڵەتییەکانی ناوچەکە بسپێرێتە دەست کوردەکان.

بەڵام هێندەی نەخایاند بە هۆی دڕدۆنگی و گومانی هەر دوولا بە یەکتر، پێوەندییەکانیان بچڕا. لە کاتێکدا کە دەوڵەت پێی وابوو بارزانی لە گەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەروساختی هەیە، کەچی بارزانیش دەوڵەتی گومانبار ئەکرد بەوەیکە ناوچە پڕنەوتەکەی کەرکووك بە ئانقەست دەکاتە عەرەبنشین.

PDF 4 KURD

ئەم گومانە لەو کاتەی کە دەوڵەتی عێراق نزیکەی پەنجا هەزار کوردی ئێرانی لە کەرکووك بەرەو ئێران وەدەرنا، زیاتر بڕوای پێکرا. لە مارسی ١٩٧٤ دەوڵەت بە شێوەیەکی یەکلایەنە یاسایەکی لە بابەت ئۆتۆنۆمی کوردەکان بڵاوکردەوە و کەرکووکی لەم ناوچانە هەڵاوارد. بارزانی و حیزبی دیموکرات ئەم قانوونەیان ڕەتکردەوە. شۆڕشێکی خوێناوی دەستی پێکرد بەڵام کاتێك سەدام ماف ئێرانی لە بابەت شەتولعەرەبەوە بە ڕەسمییەت ناسی، بەو مەرجەی کە ئێران دەست لە پشتیوانی خۆی لە کوردی عێراق هەڵگرێ، کتوپڕ ئەم شۆڕشە قەتیس مایەوە. دەوڵەت پلانەکەی خۆی درێژە پێدا و ٥٠٠ ئاوایی کوردنشینی لە گەڵ خاکا یەکسان کرد و ٦٠٠هەزار کەس لە دانیشتووانی ئەم گوندانەی نارده ناو ئۆردوگا کە زیاتر لە ناوەندی عێراق بوون تاکوو لە بەینی ئێران و عێراق وەك لەمپەرێك بۆ پاراستنی خۆی کەڵکی لێ وەربگرێت.

دەرفەتێکی‌تر کە بۆ دابینکردنی ماف خودموختاری بۆ کورد هەڵکەوت، هاوکات بوو لە گەڵ شەڕی هەشت ساڵەی ئێران و عێراق لە ١٩٨٠ بەملاوە. بەڵام ئەمجارەش ڕاپەڕینی کوردەکان لە بەینی دوو پارتە سەرەکییەکە تووشی کێشە و شەڕی براکوژی هات. سەرکەوتنی ئێران و داگیرکردنی شارێکی عێراق لە بەرەی باکوور(١٩٨٣) و پشتیوانی کوردەکان لە ئێران لەم کاتەدا بووە هۆی ڕق ئەستووربوونی سەدام لە ئاست کورد. هەشت هەزار کەس لە پیاوانی بارزانی کە لە ئۆردوگای قوش تەپە بوون، دەسگیر ئەکرێن و پاش نومایش کردنیان بە شەقامەکانی بەغدا، لە سێدارە ئەدرێن. لە ساڵی ١٩٨٧، هێزەکانی بەعس بۆ یەکەم جار لە ئاستێکی بەربڵاودا، چەکی کیمیاوییان لە شار و دێهاتە کوردنشینەکان بەکار هێنا و هەزاران کەس تیاچوون. پاش ساڵێکی‌تر ئۆپەراسیۆنی *ئەنفال** و تیابردنی کوردەکان بە ئەنجام گەیشت کە لە ئاکامدا نزیکەی ٢٠٠ هەزار کەس کوژران و ٤٠٠٠ ئاواییش وێران کرا.

لە ئاگۆستی ١٩٩٠، سەدام هێرشی کردە سەر خاکی کوەیت و ئەم وڵاتەی داگیر کرد، دوای ساڵێك هێزی هاوپەیمانان، لە ئاسمان و زەوییەوە هێرشێکی چڕوپڕیان کردە سەر عێراق. لە وەها کەش و هەوایەکدا هێزی کوردی برستی لێبڕابوو. بەڵام دواتر لە فێڤرییەی ١٩٩١ لە دوای ڕاپەڕینی شیعەکان لە باشوور، هێزەکانی کوردیش ڕاپەڕین و دەستیان کردە هێرش بردن بۆ شارە کوردنشینەکان کە تا ئەو دەم بە دەست هێزەکانی عێراقەوە بوو. لە ١٩ ی مارس کەرکووك گیرایەوە، بەڵام دوو حەوتە دواتر دیسانەوە کەوتە دەست عێراقییەکان. زیاتر لە یەك ملوێن کورد کە دڕندەیی و وەحشیگەرییەکانی سەدامیان لە بیر نەچووبۆوە، بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا هەلاتن کە هەندێ دیمەنی ناخۆش و سۆزناك لە شاشەی تەلەفیزۆنەکانی جیهان لەم بارەوە بڵاو کرایەوە. ڕای گشتی جیهان کەوتە خرۆش و لە ئاکامدا بۆ یەکەم جار لە ٢٨ ی ئاپریلی ١٩٩١، هاوسوێندییەکی نێونەتەوەیی بە مەبەستی پاراستنی گیانی کوردەکان لە باکووری عێراق لە حاستی خولگەی ٣٦ دەرەجە هاتە کایەوە و ناوچەیەکی ئەمنی ڕاگەیاندرا کە سەدام بۆی نەبوو سنووری ئاسمانی و زەوینی ئەم ناوچە ببەزێنێ.

گفتوگۆ لە سەر کێشەی کەرکووك و مەندەلی و خانەقین و هەروەها دیموکراسی فرەحیزبی لە نێوان سەدام و کوردەکان سوودبەخش نەبوو و شکستی هێنا. لە مانگی مەی ١٩٩٢ لە هەرێمی کوردستان

PDF 4 KURD

هەڵبژاردنێك بەڕێوە چوو بە مەبەستی دامەزرانی دەوڵەتێك كە خاوەن بەهایەكی نێونەتەوەیی بێت. دوو حیزبی سەرەكی(یەكیەتی و پارتی)، هەركامیان ٤٥٪ دەنگەكانیان بردەوە. بەڵام هاوپەیمانان هیچ پێوەندییەكیان لە گەڵ پەرلەمانی كوردستان و حوكمەتی هەرێم نەكردەوە. دواتر هەرێمە ئازادكراوەكە لەبەینی دوو حیزبەكەدا وردە ـ وردە تووشی كێشە و ململانێ بوو كە لە ساڵی ١٩٩٤ لە شەڕی براكوژیدا گەیشتە ئەوپەڕی خۆی.

ساڵی ٢٠٠٣ جارێكی تر هاوپەیمانان بە ڕێبەرایەتی وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا هێرشێكی چڕ و پڕیان كردە سەر خاكی عێراق و توانییان لە ماوەی ٢١ ڕۆژدا ئەم وڵاتە بگرنەوە. ٣ ساڵ پاش ڕووخانی ڕژێمی سەدام، جەلال تاڵەبانی (سەرۆكی یەكیەتی نیشتمانی) بووە سەرۆك كۆماری ئەم وڵاتە و مەسعوود بارزانیش بووە سەرۆكی حوكمەتی هەرێم. ساڵی ٢٠٠٥ قۆناغێكی نوێ لە كوردستانی عێراق دەست پێ ئەكات كە ئەویش یەكگرتنەوەی دوو ئیدارەی هەرێمەكە بوو. ئەمێستا زیاتر لە ١٦ ساڵە كە كوردی ئەم پارچە لە هەرێمەكەدا حوكمەتی خۆی بەڕێوە دەبات و خاوەنی كێشێكی سیاسی باڵایە لە ناوچەكە و عێراقدا.

## كورد لە سوریا

حەشیمەتی كوردی سوریا، نزیكەی ١ ملوێن و ٧٥٠ هەزاركەس دەبێت كە ١٠٪ حەشیمەتی ئەم وڵاتە پێكدێنن كە زۆربەیان لە ١٩٢٠ بەملاوە بەتایبەت لەدوای شكست هێنانی ڕاپەڕینی كورد لە توركیا ڕوویانكردە ئەم وڵاتە. ئەم كوردانە هەر خێرا ڕواڵەتی عەرەبیان لێ نیشت و لە سەرەتاكانی دامەزرانی كۆماری تازەپێگەیشتووی سوریا، دەستیان گەیشتە پلە و پایەی باڵای سەربازی بەڵام لە ١٩٥٨ پاش ئەوەیكە كۆماری یەكگرتووی عەرەب دامەزرا و بڕیار درا میسر و سوریا ببنە وڵاتێكی یەكگرتوو، كوردەكانیان لە پلە و مەقامە باڵاكان وەدەرنا. لێكهەڵوەشانی ئەم كۆمارییەش، نەك هەر كاریگەریی ئەوتۆی لەسەر چارەنووسی كوردەكان دانەنا بەڵكوو دەوڵەت دەستی كرد بە دروستكردنی دیواربەندێكی عەرەبنشین لە جزیرە كە زۆرینەی كوردەكانی لەخۆ گرتبوو. ئەم پلانە لە لایەن حافز ئەسەد سەرۆك كۆماری ئەو كاتەی سوریا لە ساڵی ١٩٧٦ پووچەڵ كرایەوە. بەڵام داخوازییە فەرهەنگییەكان وەك پەروەردە بە زمانی كوردی و ناولێنانی كوردی، ئێستاش هەر پێشێل ئەكرێت. كاربەدەستانی سوریا ئێستاش ناسنامەیان بە نزیكەی ٣٠٠ هەزار كوردی ئەم وڵاتە نەداوە و ئەم حەشیمەتە بە ئەجنەبی لە قەڵەم ئەدەن. كەچی سەیر ئەوەیە لە خەباتی پارتی كرێكارانی كوردستان (pkk) بەدژی دەوڵەتی توركیا پشتیوانی كردووە، بەڵام حازر نابێت دان بنێ بە مافە سەرەتاییەكانی هاووڵاتیانی كوردی خۆی.

تا ئێستا هیچ بزاڤێكی سەربەخۆیی خوازانە لە لایەن كوردی سوریاوە ڕانەگەیەندراوە. یەكەم حیزبی كوردی لە سوریا حیزبی دیموكراتی كوردستان بووە كە لە ساڵی ١٩٥٧ دامەزرا. ئێستا بە شێوەیەكی نایاسایی و پەنامەكی ١٣حیزبی كوردی چالاكی ئەنوێنن كە زێدەتر لە قامیشلی و جزیرە، لایەنگریان لێدەكرێت. حیزبە كوردییەكانی سوریا پێوەندییەكی پتەویان پێكەوە نییە بەڵكوو بەهۆی یەكگرتوویی...

PDF 4 KURD

لە گەڵ ئیسلام خوازانێکی وەك ئیخوانولموسلمین هەیانە، بوونەتە مەترسییەك بۆ رژێمی سوریا.

تێکشکانی رژێمی سەدام حسەین لە ساڵی ٢٠٠٣ و دامەزرانی حوکمەتێکی فیدراڵ لە کوردستانی باشوور، رووداوەکانی یاری تۆپیپێی قامیشلی لە ١٢ی مارسی ٢٠٠٤ و گوشارە نێونەتەوەییەکان بەسەر رژێمی بەشار ئەسەد بە تۆمەتی تیرۆری رەفیق حەریری، سەرۆك وەزیرانی لوبنان لە ساڵی ٢٠٠٥، کۆمەڵە هۆکارێکن کە کوردی سوریا زیاتر لە جاران بەرەو بزاڤێکی ناسیۆنالیستی هانئەدات.

## نافەرمانی مەدەنی نافرمانی مدنی Civil Disobedience

هەر هەنگاوێك کە سنووری یاسا ببەزێنێت بە مەبەستی راکێشانی سەرنجی هەمووان بۆ راوەستان لە بەرامبەر ناڕەوایی و نادروستی یاساکان لەباری ئەخلاقی و عەقڵانییەوە بە نافەرمانی مەدەنی لە قەڵەم ئەدرێت. ستراتیجی نافەرمانی مەدەنی یا بێعەمری حوکمەت، لە لایەن مهاتماگاندی رێبەری سەربەخۆیی هیندستان بۆ رزگاربوون لەژێر دەستی بریتانیا هاتە ئاراوە. شێوازی گاندی بریتیبوو لە: سەرپێچی کردن لە یاساکانی وڵات، نەدانی باج، وەرنەگرتنی پۆست و مەقامی دەوڵەتی، یاساخکردنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی یاسادانان، هاوکاری نەکردن لە گەڵ ئینگلیزییەکان و پاوانکردنی شمەکی بەریتانی. لەم جۆرە خەباتەدا زیاتر لەسەر بێموبالاتی و بێدەنگی جەخت ئەکرێت. بەڵام نافەرمانی مەدەنی پێویستی بە هەنگاونان و کردەوەیە. لایەنی هاوبەشی ئەم دوو خەباتە تەنیا ئەوەیە کە ئاشتیئامێزە و دوورە لە شەڕەنگێزی.

## ناوبژیوانی میانجیگری Meditation

بریتییە لە شێوازی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەیەکی نێودەوڵەتی بە دەستپێشخەری لایەنێکی سێهەم و رازی بوونی دوولایەنی مەسەلەکە. ناوبژیوان بە شێوەیەکی چالاك هەوڵ ئەدات لە گفتوگۆکاندا بەشدار بێت و پێشنیاری پێویست بۆ کۆتایی هێنان بە گرفتەکە چێ دەکات و بەگشتی هەوڵی ئاشتکردنەوە و نزیك کردنەوەی دوولایەن دەدات. ناوبژیوان، تەنها پردێکی پێوەندی نییە لە نێوان دوو لایەنی کێشەکە بەڵکوو یارمەتییان ئەدات بۆ خستنەڕووی پێشنیار و دۆزینەوەی چارەسەری هەمیشەیی. بە پێی بڕیاری کۆنڤانسیۆنی لاهای (١٩٠٧) لەمەڕ چارەسەرکردنی ئاشتییانەی کێشە نێودەوڵەتییەکان، ناوبژیوانی نابێ بە واتای کردارێکی دوژمنکارانە و دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتێکی دیکە لە ئەژمار بێت. نموونەی ئەم هەنگاوە، ناوبژیوانی تاشکەند(١٩٦٦) بۆ چارەسەری کێشەی نێوان پاکستان و هێندستان و هەروا ناوبژیوانی کەمپ دەیڤید لە نێوان ئیسراییل و میسر لە ساڵی ١٩٧٩ بووە.

## ناوچەی ژێر دەسەڵات حوزەی نفوذ Sphere of influence

زاراوەیەکی جوگرافییە بەواتای ناوچەیەك کە تێیدا باڵادەستیی سیاسی یان ئابووری وڵاتێك بە

PDF 4 KURD

رەسمییەت ناسرابێت ئەگەرچی دەسەلاتێکی کەموکووریش بێت. ناوچەی ژێردەسەلات، لەوانەیە یەکلایەنە رابگەیێندرێت: یان چەند لایەنە بێت. بۆ نموونە دابەشکردنی ئێران بە پێی رێککەوتنامەی دوولایەنەی سۆڤیەت و بەریتانیا لە ساڵی ١٩٠٧ بە دوو ناوچەی ژێر دەسەلاتی باشوور بۆ بەریتانیا و باکوور بۆ سۆڤیەت.

ناوەندگەرێتی مرکزگرایی Centralism

ناوەندگەرێتی (سەنترالیزم) لە وشەی لاتینی centrum بە واتای ناوەند وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بە سیستەمێکی دەسەلاتداری دەگوترێ کە هەموو کاروبارە ئابووری و سیاسی و ئیدارییەکان لە ناوەندی ولاتدا کۆدەبێتەوە و هەموو دامودەزگا ناوچەیی و پارێزگاکان دەبێ ملکەچی دەسەلات و بریارەکانی ناوەند بن. رژێمی هیتلەر نموونەیەکی تۆخی ئەم سیستەمەیە بە چەشنێك کە لەم حوکمەتەدا پلە و پایە ناوچەییەکان تاکوو ئاستی دەزگا نزمەکانی حوکمەتی ناوەندی داکشابوون.

لە بەرامبەر ناوەندگەرێتیدا سیستەمی نامەرکەزی (دیسەنترالیزم) لە ئارادایە لەم جۆرە حوکمەتانەدا بە پێچەوانەوە، هەموو دەسەلاتەکان لە ناوەند چەق نابەستێ بەڵکوو دەقەرە ئۆتۆنۆمی یا فیدراڵیەکان لە سەرانسەری ولاتدا ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن و لە چوارچێوەی هەندێك یاسای دیاریکراو لە کاروباری ناوخۆییدا سەربەخۆییان پێ ئەدرێت. نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە حوکمەتە، سیستەمی فیدراڵیزمە. (بروانە چەقبەستن و فیدراڵیزم)

نوخبە سرآمد/ نخبه elite کەسێك

کە لە کۆمەڵگادا بە هۆی چەن تایبەتمەندیەك (واقیعی یان خەیاڵی)خاوەنی پێگەیەکی بەرجەستە و شیاو بێت. کەواتە هەرکەسێك لێهاتووتر و شایستەتر بێت، نوخبە لە قەڵەم ئەدرێت.

ئەم زاراوە لە لایەن ویلفیرد پارتۆ کۆمەڵناسی ئیتاڵی، بۆ شرۆڤەی کۆمەلایەتی لەسەر دوو توێژی کۆمەڵگا هاتە ئاراوە: ١) توێژی بن دەست یان رەشەگەل. ٢) توێژی بالا یان نوخبە. توێژی بالا دوو جۆرە: یەکەم، نوخبەی فەرمانڕەوا، دووهەم، نوخبەی سەرکەش.

نوخبەگەرێتی سرآمدباوری/ نخبه گرایی Elitism

بە پێی ئەم رێبازە ماهییەتی هەر کۆمەڵگایەك چ زیندوو بێت چ مەنگ و مردوو، رەوا یا نارەوا بەپێی ماهییەتی نوخبەکانی خۆی دیاری ئەکرێت. لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لەو باوەڕە کە لە هەر کۆمەڵگایەك یان گرووپی کۆمەلایەتی، ئابووری، سیاسی، کولتووری و... کەسێك یا کەسانێك بەهۆی لێهاتوویی تایبەتەوە، بالاترن لە ئەوانیدی و ئەم بالادەستیە ماف پێشەوایی و رێبەرایەتیان بۆ دەستەبەر ئەکات. نوخبەگەرێتی لە گەڵ دیموکراسی*دا نەیارە و ئەم سیستەمە بە پێشێلکەری ماف خەڵکانی نوخبە و لێها...

PDF 4 KURD

دەزانێ و پێی وایە خەڵکانی رەشۆکی و کەم بەهرە تا ئاستێکی نابەجێ بەرز دەکاتەوە. نوخبەگەرێتی لە سیستەمی پەروەردەدا بریتیە لە هەڵبژاردنی هۆشمەندترین قوتابیان و پەروەردەکردنیان بە شێوازی ناوازەی پەروەردەیی بۆ بەرهەمهێنانی باشترین و بەتواناترین ئینسانەکان. ئەم شێوازە پەروەردەییە لە وڵاتانێکی وەك بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، سۆڤیەت و ئەمریکا بە کار براوە. بەگشتی باسی چوارجۆر نوخبە دەکرێت کە بریتین لە:

١) نوخبەی دەسەڵاتی سیاسی

٢) نوخبەی ئابووری

٣) نوخبەی سەربازی

٤) نوخبەی فیکری

### نوخبەی دەسەڵات سرآمد قدرت Power elite

ئەم زاراوە لە لایەن رایت میلز(١٩٦٢-١٩١٦) کۆمەڵناسی ئەمەریکی دەرحەق بەو کەسانە بە کار هات کە لە سەرووی هایراکی دەزگا گەورەکانی کۆمەڵگەی هاوچەرخ وەك کۆمپانیا و دەوڵەت و سوپا دائەنیشن.

### نەتەوە ملت Nation

زاراوەی نەتەوە، دیاردەیەکی مێژوویی ـ سیاسی لە ئەژمار دێت کە لەگەڵ زاراوەی دەوڵەتی نەتەوەدا نزیکایەتیان هەیە. دەرکەوتنی ئەم زاراوە بە واتا نوێکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدە. پێش ئەو سەردەمە ئایین و ئایینزا، هێڵی جیاکەرەوەی نەتەوەکان لەیەکتر بووە.

نەتەوە یەکینەیەکی گەورەی ئینسانییە کە لە نێوان کولتوور و هۆشیارییەکی هاوبەشدا گرێبەستێك سازدەکات. پێناسەیەکیتری ئەم زاراوە بریتییەلە کۆمەڵگایەکی هاوڕگەز کە خاوەنی پێشینەیەکی مێژوویی یەکسان و بەرژەوەندیەکی هاوبەش و زمانێکی یەکگرتووبێت. لە رابردووی ئیمپراتۆریەتەکاندا خێڵ و عەشیرەت و دەوڵەت ـ شارەکان، گرنگترین یەکینەی ژیانی سیاسی پێك دەهێنا بەڵام ئیمرۆکە چەمکی نەتەوە، لە بەراورد لەگەڵ زاراوەگەلێکی وەك هۆز و عەشیرەت و شاردا چەمکێکی ئاڵۆز لە ئەژماردێت و لەبارەی رەگەزەکانی ئەم پێکهاتە بیروبۆچوونی جوداجودا لە ئارادایە. بیرمەندانی سیاسی رەگەزە پێکهێنەرەکانی نەتەوە دەگەڕێننەوە بۆ بەدیهاتنی رێکخراوەیەکی سیاسی یەکگرتوو، کولتوور و زمانێکی هاوبەش و پێشینەیەکی مێژوویی هاوبەش.

شۆڕشی فەرەنسا، ژێرخانێکی فیکری و سەرچاوەیەکی گرینگ لە ئەژماردێت بۆ سەرهەڵدانی یەکەمین بیرۆکەی چەمکی نەتەوە بە مانا نوێکەی. لەم بارەوە نەریتی شۆڕشی فەرەنسی بەپلەی یەکەم هۆکاری بەرێکخراوەیی کردنی سیاسی بە گرینگ دەزانێ و رەگەزەکانی تر بە پلەی دوایی ناوبردە ئەکات. کەواتە لەم

PDF 4 KURD

روانگەوە بەدیهاتنی نەتەوە، پێشوەخت پێویستی بە دامەزرانی دەوڵەت هەیە و چەمکی دەوڵەت و بەرێکخراوەیی کردنی سیاسی بە شێوەیەکی لۆژیکی و گونجاوی مێژووییەوە، دەبێ لە پێشتر بێت.

لە روانگەی کولتوورییەوە، سەرهەڵدانی نەتەوە پەیوەستە بە هۆکاری فەرهەنگی و زمان. لەم بابەتەوە فیختە و نوفالیس، نووسەرانی ئەڵمانی پێیان وایە کە مرۆ بەپێی سروشت لە نێوان نەتەوەکان دابەش کراوە نەك بەهۆی دەوڵەتەکان. زمان، تایبەتمەندی سەرەکی شوناسی نەتەوەیی لە ئەژماردێت کە هەڵگری نەریت و هێما و ئەفسانە و کولتوور و مێژووی هاوبەشی ئەتنیکییە. ئەزموونی مێژوویی گەلان پیشانی داوە کە پێوەندی راستەوخۆ لە نێوان پێکهاتنی زمانی ئەدەبی و دەرکەوتنی هۆشیاری نەتەوەیی و ناسیونالیزم هەیە. بێندیکت ئەندەرسۆن پێی وایە کە زمانی ئەدەبی لە هەندێ وڵاتی ئەورووپادا رێگەی بۆ دەرکەوتنی هۆشیاریی نەتەوەیی و ناسیونالیزم و پێکهێنانی دەوڵەتی نەتەوەیی خۆش کرد.

ئێرنێست رێنان، مێژوونووسی گەورەی فەرەنسی لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٨٨٢ لە زانکۆی سۆربۆن پێشکەشی دەکات بە تێروتەسەلی پێناسەی نەتەوە دەکات کە لێرەدا چەن دێرێکی دەهێنمەوە. «نەتەوە رۆحێکە. پرەنسیپێکی رۆحییە. دوو شت ـ کە لە راستیدا هەر یەکن ـ ئەو رۆحە یان ئەو پرەنسیپە رۆحیانەت پێکدەهێنن: یەکیان ریشەی لە رابردوودایە، یەکیان لە ئێستادا. یەکیان خاوەندارێتیکی هاوبەشە، خاوەنداریەتی میراتێکی دەوڵەمەندی بیرەوەرییەکان. ئەوی دیکەشیان رەزامەندی ئێستا و ئەمڕۆیە، ئاواتی پێکەوە ژیان، ویست و ئیرادەی بەزیندوو راگرتنی بایەخی ئەو میراتەی بە شێوەیەکی دابەش نەکراو بۆ مرۆ ماوەتەوە. نەتەوە، وەك تاکەکەس ترۆپکی رابردوویەکی دوور و درێژی کۆشش و هەوڵدانە، بەختکردن و لەخۆ بووردنە... نەتەوە نیشانەی رابردوویەکە، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئێستادا پوختە کراوە بە هۆی راستییەکی ئاشکرا و هەستپێکراوەوە واتە پێمل بوون بە ئاواتێکی راشکاوانە بۆ درێژەپێدان بە ژیانێکی هاوبەش». هەندێ لە بیرمەندان، رەگەزی ئایینیش بە پێکهاتەی نەتەوە زیاد ئەکەن بەڵام هەندێکی دیکە ئەمە رەت دەکەنەوە و دەڵێن پەیرەوانی ئایینێك دەتوانن لە چەندین نەتەوەی جۆراوجۆر پێك بێن. هاوسۆزی بۆ وڵات یا قەڵەمڕەوێکی جوگرافیاییش، بە فاکتەرێکی بەهێزی دروستبوونی نەتەوە و یەکگرتنی گەلانی جۆراوجۆری وڵاتێك دادەنرێت.

## نەتەوە یەکگرتووەکانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا

اتحادیەی ملتهای آسیای جنوب‌شرقی

(ASEAN) Assocition of South-East Asiatic Nations

لە ساڵی ١٩٦٧ لە لایەن وڵاتانی ئەندونیزیا و تایلەند و سەنگاپور و فیلیپین و مالیزیا لە بانکۆك بە ئامانجی کرژکردنەوەی پێشکەوتنی ئابووری و سەقامگیریی ناوچەکە دامەزرا.

PDF 4 KURD

**نەریتی نێودەوڵەتی** عرف بین الملل International Custom

نەریتی نێودەوڵەتی، دەرەنجامی رەفتار و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی وڵاتێك لە گەڵ وڵاتێکی دیکەیە. تایبەتمەندییەکانی ئەم نەریتە بریتین لە: ١ـ پاتەکردنەوەی کردارێکی یاسایی بەڵگەمەند کە لە نێوان هەمووان‌دا بوویێتە باو. ٢ـ شێوە رەفتارێکی ناچارییە. ٣ـ شێوە رەفتارێکی رووەو فراژووتنە.

**نەهیلیزم(پووچگەرایی)** نیهیلیسم(هیچ انگاری) Nihilismئەم

زاراوە لە وشەی لاتینی nihil بەواتای **هیچ و پووچ** وەرگیراوە. لایەنگرانی ئەم قوتابخانە هەر بابەتێکی داسەپاو بەسەر ئەندێشەی مرۆدا رەت دەکەنەوە و هەموو بیروباوەڕێك بە پووچ دەزانن و بە چاوێکی سووکەوە سەیری هەموو یاسا و رێسایەك دەکەن. فەلسەفەی نەهیلیزم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی یۆنانی کۆن و پێش سوکرات کە ئەویش بریتی بووە لە رەتکردنەوەی بوون و رۆح و موڵکداریێتی و یاسا و مافەکان و هەموو شتێك. بەڵام لەم سەدانەی دواییدا لە رووسیای تیزاریدا ناوی رێبازێکی کۆمەڵایەتی بوو کە دەسەڵاتی حکوومی و ناحکوومی بە هیچ دەزانی و دواتر گۆڕا بە مەرامێکی شۆڕشگێڕانە بە مەبەستی لەناوبردنی هەموو پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی.

زاراوەی نەهیلیزم، یەکەم جار لەگوێن شێوازێکی رەخنەگرانەی نیگەتیڤ دەربارەی گرێبەست و نەریتی کۆنی کۆمەڵایەتی لە لایەن نوسەری بەناوبانگی رووس، تورگنیف، لە کتێبی «باوکان و منداڵان»دا بە کار هاتووە. سەرکاروان و دامەزرێنەری رێبازی نەهیلیزم لە رووسیا، باکۆنین (١٨٧٦ـ ١٨١٤) بوو. پاش ساڵی ١٨٧٨ ئەم زاراوە لە رووسیا دەربارەی ئانارشیست و تیرۆریستەکان بە کار برا. هەندێ جاریش مانای خۆبەختکردن و دابڕان لەم دنیایەی لێ هەڵێنجراوە.

**نێتۆکراسی** **اینترنت سالاری** Netocracy

ئەم دۆخە پێناسەی سەردەمێکی تازە و کەشێکی نوێباوە لە مێژووی مرۆڤدا کە لەسەر بنەمای تۆڕی ئەنتەرنێت و بەرنامەی کۆمپیتەری و تەکنۆلۆژی زانیاری دامەزراوە. لەم قۆناغەدا لە سەرووی قوچەکی دەسەڵاتی کۆمەڵگادا کەسانێك دادەنیشن کە بەسەر ئەم تۆڕە کۆمپیتەریانەدا زاڵ بن و زانیاریی، رەگەزی سەرەکی دەسەڵات و جووڵەی کۆمەڵایەتی لە ئەژمار دێت.

**نیمچە دەوڵەت** شبە دولت Quasi-states

ئەم زاراوە بەو دەوڵەتانە دەگوترێ کە پێشتر ژێردەستە بووبێتن و لەجوملەی وڵاتانی کۆلۆنی لە ئەژمار دەهاتن بەڵام لە ئەنجامی پرۆسەی سڕینەوەی ئیستیعمار، نیمچە سەربەخۆییەکیان بەدەست هێناوە. ئەم دەوڵەتانە خاوەنی هەموو میکانیزمێکی فەرمانڕەوایی و حاکمییەت بوون بەڵام بێ بەهرە بوون لە ئیرادەی سیاسی و دەسەڵات و هێزی رێکخراوەیی بۆ پیادەکردنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی و داکۆکی کردن لە [illegible]

PDF 4 KURD

مرۆڤ. لە راستیدا نیمچە دەوڵەتەکان، تەنیا بەناو دەوڵەت لە ئەژماردێن. ئەم دەوڵەتانە ئەگەرچی بەپێی رێساکانی سیستەمی نێودەوڵەتی لە دوای ساڵی ١٩٤٥ دامەزراون بەڵام بێ توانا و نارەوا و لاوازن.

**نیمچە دیموکراسی** شبه دموکراسی Quasi-democracies

ئەم زاراوە بۆ پێناسە کردنی ئەو وڵاتانە بەکار براوە کە رووەو گەشەسەندنن. لە نیمچە دیموکراسیدا ژیانی سیاسی، نە بە تەواوی دیموکراتیە نە تۆتالیتەری. ئەم وڵاتانە هێشتا هەر لە گێرەوکێشەی پرۆسەی مۆدێرنە و هەنگاونان لە سوننەتەوە بۆ مۆدێرنیتەدا مۆنج دەخۆن و کێشمەکێشی ئەم هەلومەرجە، لە جێگیربوونی هەردوو سیستەمەی دیموکراسی و تۆتالیتاریزم بەرگری دەکات. هەروەها پێکهاتەی کۆمەڵایەتی کۆنباو و کەلتووری سوننەتی لێکترازاو بواری دامەزرانی سیستەمی سیاسی مۆدێرن نارەخسێنێت. سەرمەشقی رێکخستن لەم وڵاتانەدا بریتییەلە سێ شۆرشی مێژوویی فرەنسا و شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی سۆڤیەت. هەرکامێك لەم شۆڕشانە بە جۆرێك بوونەتە سەرمەشق بۆ پێکهاتەی سیاسی ئەم وڵاتانە. بۆ وێنە لە شۆڕشی فرەنسا، بیرۆکەی یاسا و حاکمییەتی نەتەوەیی و دیموکراسی وەرگیراوە، لە شۆڕشی پیشەسازیی بیرۆکەی گەشەسەندنی ئابووری و مۆدێرنە و لە شۆڕشی سۆڤیەتیش، دەوڵەتێکی بەزەبر و زاکوون و دەسەڵاتدار بۆتە سەرمەشق و ئایدیالی حوکمەت. هەموو ئەم بیرۆکە و سەرمەشقانە ئاوێتە بووە لەگەڵ پێکهاتەیەکی خۆماڵی بە قەبارەیەکی ئیستبدادی و یەزدان گەرا و باوك سالارەوە.

بە گشتی بۆ پیادەکردنی دیموکراسی لە وڵاتانی رووەوگەشەسەندن، چەندین کۆسپ و تەگەرە لە بەردەمدایە کە بریتینلە:

- دەسەڵات و شەوتی پیاوماقووڵان و گەورەپیاوان کە دیموکراسی بەدژی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەزانن.
- هەژمۆنی بەها و بایەخە موتڵەقەکان و بەهێزبوونی نەریتەکان.
- مانەوەی هێزە دەسەڵاتدارە کۆنەکان، بۆ وێنە دەرباری شا و سوڵتان.
- دەزگا بەهێزە ئایینیەکان و هێزی سەربازی.
- نەبوونی چینی مامناوەندی بازرگان و پیشەسازی.
- قووڵبوونی ئاریشە و لەمپەرە ئەتنیکی و ئایینی و کەلتوورییەکان.

سەرەنجامی کۆبوونەوەی ئەم هۆکارە گرنگانە لە وڵاتانی رووەو گەشەسەندن، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی نیمچە دیموکراسییەکی سەقام نەگرتوو کە هەمیشە دەوڵەتەکانیان لە بەینی ئۆتۆکراسی* و ئۆلیگارشی* و پۆپۆلیزم و تۆتالیتاریزم* و دیموکراسیدا لە هەلاجان دەهێڵێتەوە.

**نێپوتیزم:** بروانە خزم خوازی.

PDF 4 KURD

**نیۆنازیسم** نئو نازیسم Neo-Nazism

ئەم زاراوە بۆ ئەو گرووپ و حیزب و ڕێکخراوانەی هاوچەرخ بە کار دەبرێت کە هاوشێوەی حیزبی نازی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٣ هەڵسوکەوت دەکەن. نیۆنازیسم، بزاوتێکی ڕەگەزپەرستانە و نەتەوە پەرستی توندڕەوە کە پاش جەنگی جیهانی دووهەم سەری هەڵداوە و لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ٢٠ بەدواوە لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژاوا گەشەی کردووە. تایبەتمەندییەکانی نازیسمی نوێ بریتییە لە: حکومەتێکی ڕاستڕەو و دەسەڵات خواز، دژی دیموکراسی و لیبرالیزم و فرەدەنگی، دژی کەمینەکان بە تایبەت جوولەکە و ڕەش‌پێستەکان. سەرچاوەی جیهان‌بینی ئەم گرووپانە دەگەڕێتەوە بۆ باری نالەباری ئابووری و بەگومان بوون لە حوکمەت و هەندێ‌جاریش هەست وخوستی ئایینی(کڵێسا) بە چەشنێك کە پێوەندییەکی نزیك هەیە لە نێوان گرووپی نیۆنازی و ڕێکخراوە کڵێساییەکان.

PDF 4 KURD

# و

**ودم/ ماڤ تایبەتی/ زێدەماف** امتیاز Privilege

بە گشتی بەمانای بەهرەمەندی کەسێك یان گرووپێکی تایبەت لە ماف یان بەهرەیەك کە جەماوەر بەعام لێی بێبەهرە بن یان دەستیان پێی نەگات. لە زاراوەی سیاسیدا هەڵگری مانایەکی سووکایەتی ئامێزە چونکا وەبیرهێنەرەوەی ئەم راستییەیە کە ماڤ تایبەتی، سەمەرەی میرات و جێماوە و داراییە و خاوەن ماف، شیاوی ئەو ودمە نییە. بەڵام کاتی واش هەیە کە بەواتای ماف و ئازادی لێکدراوەتەوە چونکا کەسەکە بە هەوڵی خۆی بەدەستی هێناوە. لێرەدا واتایەکی بلیمەتانەی لێ ئەبێتەوە.

**وردە بۆرژوازی** خردە بورژوازی Petite bourgeoisie

بەشێکە لە بۆرژوازی* کە پێکهاتووە لەو خەڵکانەی چینی مامناوەندی لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کە ماڵ ودارایییەکی کەموکووڕیان هەیە. بۆ وێنە: دووکاندار، خاوەنماڵ، زەمیندار یان خاوەن کارگەی بچووك. وردەبۆرژوا بە هەمان شێوە کە لە فەرەنسەدا باو بووە مانایەکی سووکایەتیئامێزی هەیە و بەواتای خۆ سەرقاڵکردن بە سەروەت و سامانی بچووك و بەرژەوەندی خوێت و روانینێکی بەرچاوتەنگانەیە بۆ ژیان. لەم واتایەدا ئاوەڵناوی «وردە» بەمانای کردار و بایەخەکانی ئەم جۆرە کەسانەیە بەڵام لە کۆمەڵناسی مارکسیدا بە لەبەرچاوگرتنی مانا سووکایەتی ئامێزەکە، واتایەکیتریش لەخۆ دەگرێ. لەم دیدەوە وردەبۆرژوازی جگە لە موڵکدارانی کەم داهات، زۆربەی مووچەخۆر و کاسپکاری ئازاد و کارمەندانی بەشی خزمەتگوزاریش لە خۆ دەگرێ و بە گەشەسەندنی ئەم جۆرە کەسانە لە کۆمەڵگا پیشەسازییەکان، رۆژبەرۆژ لەباری سیاسیەوە گرنگتر دەبێت. لەم کۆمەڵگایانەدا وردە بۆرژوازی لە گەڵ چینی مامناوەندیدا هاوواتا دەبێت.

**وشیاری چینایەتی** آگاهی طبقاتی Class Consciousne

بەئاگا بوون لەو چینە کۆمەڵایەتییەی کە تاکەکەس بە ئاخێزگەی خۆی دەزانێ. وشیاری چینایەتی کاتێك خۆی نیشان ئەدات کە ئەندامانی چینێك بە شێوەیەکی هاوبەش هەست بە ناهومێدی و بەشخوراوی بکەن و لە بەرامبەر چینی سەردەست و شێوازی دەسەڵاتداریدا خەبات بکەن. وشیاری چینایەتی لە رێبازی مارکسیدا هەم وشیار بوونەوەیە لە بەرامبەر چەوساندنەوەی مرۆ لە لایەن مرۆڤ، هەم بڕیاردانە بۆ مەحفکردنەوەی ئەم چەوساندنەوە. هەروەها بریتییە لەو وشیارییەی کە چینێکی رەنجدەر بە ئاوەزی دەیفامێت و تێدەگات کە لە بازاڕدا وەك کاڵایەکی سادە مامەڵەی پێدەکرێت و دەبێتە قوربانی خنکانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری. ئەم وشیارییە، چینی رەنجدەران دەکاتە چینێکی تایبەت و هۆش...

PDF 4 KURD

ئینجا خەباتی خۆی بۆ سڕینەوە و مەحفکردنەوەی چینەکان دەست پێدەکات.

**وڵات/نیشتمان** کشـور Country

زێدێك لە چوارچێوەی سنوورێکی سیاسی دیاریکراو کە خەڵکانێکی تێدا نیشتەجێ بن و دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بەڕێوەی ببات. بەو خەڵکانەی کە لەو زێدەدا دەژین نەتەوە* دەگوترێ. دەسەڵاتێکیش کە لەو زێدە فەرمانڕەوایی دەکات، بە دەوڵەت*ناوبردە ئەکرێت. لە روانگەی یاسا نێودەوڵەتییەکاندا سێ چەمکی نیشتمان و نەتەوە و دەوڵەت، پێکەوە یەکەیێکی فراژووی سیاسی پێك دەهێنن کە بوونی یەکیان هەبوونی ئەو دووانەی دیکەی بەدواوە دەبێت. کەواتە هەرکام لەم سێ چەمکە دەکرێ لەجیاتی ئەو دووانەی دیکە بەکار ببرێت.

**وڵاتانی دواکەوتوو** کشورهای عقب افتاده Backward Countries

پێناسەیەکی ترە بۆ ئەو وڵاتانەی کە لە پەرەسەندن دواکەوتوون. نیشانەکانی ئەم جۆرە وڵاتانە بریتییە لە: ئاستی نزمی ساخڵەمی و خواردن و خۆراك، نەخوێندەواری، کەمبوونی سەرمایە و دارایی، جیاوازی چینایەتی، دووفاقی و چەند فاقی ئابووری، زاڵبوونی کشتوکاڵ بەسەر پیشەسازی، نالەباریی سیستەمی پارە و دراو، بێ‌متمانەیی بە سەرمایەدانان، نەبوونی شێوازی پێشکەوتووی تەکنۆلۆژی و بێ مەبالاتی بۆ پەرەسەندن. (بڕوانە جیهانی سێهەم و وڵاتانی کەمتر پێشکەوتوو).

**وڵاتانی کەمتر پێشکەوتوو** کشورهای کمتر توسعه یافته Less Developed Countries (LDCs)

ئەم زاراوە بۆ وڵاتانی هەژار و دەست کورتی جیهانی سێهەم(ئەفریقا، ئاسیا و ئەمریکای لاتین) بە کار دەبرێت. هەندێ لە زانایان، هەوڵیان داوە وڵاتانی هەژار بە وڵاتانی جیهانی چوارەم پێناسە بکەن. بۆ هەڵاواردنی وڵاتێکی دواکەوتوو لە بواری پەرەسەندوویی‌دا سەیری پێوانەگەلێکی ئابووری وەك بەرزبوونەوەی داهاتی سەرانە و وەبەرهێنانی ناڕاستەوخۆ دەکەن. ئەم وڵاتانە چاویان لە یارمەتی وڵاتانی دیکەیە و لە بازرگانی جیهانیدا دەورێکی زۆر بچووك دەبینن. (بڕوانە جیهانی سێهەم).

**وڵاتی تاکەحیزبی** کشور تک حزبی One-Party State

وڵاتێك کە تێیدا تەنها یەك حیزب ئیجازەی چالاکی سیاسی پێدرابێت و دەسەڵاتی بەدەستەوە بێت. ئەم وڵاتانە هاوشێوەی سیستەمە دیکتاتۆرییەکان لە ئەژمار دێن. لەبەرامبەر سیستەمی یەك حیزبیدا سیستەمی فرەحیزبی لە ئارادایە. نموونەی هەر دوو سیستەمەکە، وڵاتی عێراق لە سەردەمی سەدام حسەین و پاش رووخانی ئەم رژێمەیە لە ساڵی ٢٠٠٣.

PDF 4 KURD

**وەچەی سیاسی** نسل سیاسی Political Generation

**خەڵكانێك كە ئەزموون و رووداوە سیاسییەكانی زەمەنێكی دیاریكراویان بە چاوی خۆیان دیبێت، بە وەچەی سیاسی پێناسە دەكرێن.**

**ویگ** ویگ Whig

**ناوی حیزبێكی سیاسییە لە بریتانیا كە لە ساڵی ١٦٨٠ بەدواوە خوازیاری سنووردارکردنی دەسەڵاتی پادشا و فراوانكردنی دەسەڵاتی پەرلەمانی ئەم وڵاتە بووە. ویگەكان ئەو شۆڕشگێڕانە بوون كە پاش شكستی راپەڕینی ١٦٧٩ لە سكۆتلەندا هێدی هێدی گەیشتنە دەسەڵات و دژی یەكگرتنی ئایینی سكۆتلەندا و ئینگلتەرا بوون.**

PDF 4 KURD



## Agitation تحریک/شورانش هاندان/ هەڵخڕاندن

دنەدان و هەڵخڕاندنی جەماوەر بە مەبەستی بەشداری کردن لە چالاکییەکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی لە ڕێگای ئامرازەکانی پڕۆپاگەندە و ڕاگەیاندن وەك، ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب، ڕادیۆ و تەلەفزیۆن. لەم ئاکارەدا جەماوەر لە ڕێگای هەست و سۆزەوە هەڵئەژرنگێت. لە سەردەمی شۆڕشی فەرەنسەدا بە کەسێکیان دەگوت «هاندەر» کە بێ بەرپرسارییەتی خەڵکیان هەڵئەخڕاند و ئاژاوەیان دەناوە. بەڵام دوای شۆڕش، دەوڵەتە کۆنەپارێزەکان ئەم ناتۆرەیان بۆ بزاوتە چەپییەکان بەکار دەبرد. ئەم زاراوە لە لایەن زۆربەی بزاوتە ڕاست و چەپییەکان بە زاردا هاتووە بەڵام زۆرینەی ڕێبەرانی ئەم بزاڤانە، هاندان و هەڵخڕاندنی جەماوەر بەدژی دەوڵەتێکی ستەمکار، بە شتێکی ڕەوا دەزانن.

## Collectivism نظام اشتراکی/اصالت جمع هاوبەشێتی/شیوعی

ئەم زاراوە لە بەرامبەر زاراوەی«تاك خوازی»دا هاتووە کە بە هەموو ئەو تیۆرییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییانە دەگوترێ کە بەرژەوەندی و قازانجی کۆمەڵی ئینسانییان بۆ گرنگترە لە بەرژەوەندی تاکەکەسی. بە پێی ئەم تیۆرییە کەرەستەی بەرهەمهێنان و دابەشکردن ئەبێ بەدەست کۆمەڵ بێت نەك تاکەکەس، چونکا تاك هەر بەشوێن قازانجی خۆیەتی. گرینگترین قوتابخانەی شیوعی بریتیە لە سۆشیالیزم* و کۆمۆنیزم* کە خوازیاری چاودێری کۆمەڵایەتین لە ڕێی خاوەنداریەتی گشتی بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵ. خاڵێکی گرینگ کە ئەبێ سەرنجی بدرێتێ، ئەوەیە کە خاوەنداریەتی دەوڵەتی، خۆبەخۆ بە مانای چاودێری گشتی نییە، ئەم شتە پەیوەستە بەوەیکە هێزی دەوڵەت بە دەست چ کەسانێکەوە بێت. ئەم زاراوە لە کاتی دامەزرانی کۆنگرەی ئینتەرناسیۆنالی یەکەمی سۆشیالیستەکان لە ساڵی ١٨٦٩ لە شاری «بازڵ» ی وڵاتی سویسرا، ڕەواجی پەیا کرد.

## coalition ائتلاف/هم پیمانی هاوپەیمانی/هاوسوێندی

یەکگرتنی کاتیی چەن حیزب یا لایەنی سیاسی بۆ گەیشتن بە ئامانجی پەرلەمانی و هەڵبژاردنەکان. لە سیستەمێکی پەرلەمانی فرەحیزبی کە هیچکام لە حیزبەکان نەتوانن ڕێژەیەکی دەنگ بۆ دامەزرانی دەوڵەت بەدەس بێنن، چەن حیزبێك بۆ ئەم مەبەستە دەبنە هاوپەیمان. هاوپەیمانی پەرلەمانی بەزۆری بۆ هێشتنەوە یا هێنانە سەرکاری حوکمەتێکی تایبەت دێتە کایەوە بە شێوازێك کە حیزبە گەورەکە لەگەڵ یەك یان چەن

PDF 4 KURD

حیزبی بچوکتر دەبێتە هاوپەیمان و بە ڕێژەی دەسەڵاتیان بەشداری حوکمەت دەکەن.

ڕەنگە هاوپەیمانییەتی لایەنێکی نەرێیی (سەلبی) بێت واتە بە ئامانجی ڕووخانی حوکمەت بێت. بۆ وێنە لە فەرەنسە، پاش شەڕی جیهانی دووهەم کومۆنیستەکان و باڵی ڕاستی توندڕەو بوونە هاوپەیمان و حوکمەتی ئەو سەردەمەیان ڕووخاند.

هاوپەیمانییەتی لە هەڵبژاردندا بەم جۆرەیە کە حیزبە هاوپەیمانەکان، بە قازانجی یەکتر دەنگ ئەدەن بە لیستەیەکی هاوبەشی پاڵێوراوان و هەرێمەکان بە ڕێژەی خۆیان دەسەلات دابەش ئەکەن. ئەم شێوازە لە کۆماری چوارەمی فەرەنسەدا بە کارهات.

لە سیستەمی دووحیزبی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا ئەم زاراوە مانایەکی تری هەیە بەم واتایە کە چەن گرووپی ناو دوو حیزبە کە (دیموکرات و کۆماری خواز) بۆ نەیاریکردن لە گەڵ هەندێ سیاسەتی حوکمەت یەك دەکەون. وەك چۆن دیموکراتەکانی باشوور و کۆماریخوازەکانی باکوور بۆ نەیاریکردن لە گەڵ هەندێ بڕیاری ڕۆزڤێلت و ترۆمێن یەك کەوتن.

### هاوسەنگیی سیاسی — موازنـە سیاسـی — Political Balance

هاوسەنگیی سیاسی بریتییەلە بەرگری کردن لە دەستبەسەراگرتن و تەراتێنی زلهێزەکان لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا.

### هاوسەنگیی هێزەکان — موازنـەی قـوا — Balance of Power

تیۆری هاوسەنگیی هێزەکان لە سەر ئەم بنەمایە دارێژراوە کە دەسەڵاتی هەر گرووپێك لە وڵاتانی ئەورووپا دەبێ لە گەڵ هێز و دەسەڵاتی گرووپەکانی دیکە هاوسەنگ بێت تاکوو هیچکامیان نەتوانن بەسەر ئەویدی دا زاڵ بن و بەمجۆرە ئاشتی و ئاسایش مسۆگەر بکرێت. پاراستنی ئەم سیاسەتە بابەتی سەرەکی سیاسەتی دەرەوەی بریتانیا بوو لە میانەی ئاشتی درێژخایەن لە ١٨٧١ تا ١٩١٤ لە نێوان گرووپی وڵاتانی ئەڵمانیا، نەمسا و ئیتالیا و وڵاتانی بریتانیا، فرەنسا و سۆڤیەت. پاش جەنگی جیهانی یەکەم تیۆری هاوسەنگیی هێزەکان هاتە ناو مێژووی دیپلۆماسی و بریتانیا تا ساڵی ١٩٣٩ لە بەرامبەر بەهێزترین وڵاتی ئەورووپا واتە ئەڵمانیا، سیاسەتێکی نەرمڕەوانەی گرتەبەر. لە ساڵی ١٩٤٥ بەملاوە هیچ هەوڵێك لە لایەن ئەم وڵاتە بۆ پاراستنی هاوسەنگی هێزەکان بە ئەنجام نەگەیشتووە بەڵام دەسەڵاتی ڕۆژاوا لە بەرامبەر ڕۆژهەڵات ڕووی لە زیادبوون کردووە. ئێستا زاراوەی هاوسەنگیی هێزەکان لە پێوەندیی نێودەوڵەتیدا پتر بۆ دەسەڵاتی چەکداری و ئابووری زلهێزەکان لە ئاستی جیهانی یا ناوچەییدا دێتە ئاراوە. بۆ نموونە وڵاتی هیندستان لە نیمچەکیشوەر و میسر لە ڕۆژهەڵاتی ناویندا. لەم ڕووەوە مەبەستی لایەنگرانی *چەنداماڵین** گشتاندنی ئەم سیاسەتەیە لە هەموو جیهاندا بە چەشنێك کە هیچ دەوڵەتێك نەبێتە هەڕەشە بۆ وڵاتێکیتر.

PDF 4 KURD

## هاووڵاتی/شارۆمەند        شهروند        Citizen

هاووڵاتی، تاکێکە کە لە بەرامبەر دەوڵەتدا لە لایەکەوە خاوەنی هەندێ ماف سیاسی و مەدەنییە و لە لایەکی تریشەوە هەندێ ئەرك و تەکلیفی لەسەر شانە. چۆنیەتی پێوەندی هاووڵاتی بوون (ماف تاك و ئەرکەکانی لە بەرامبەر دەوڵەتدا) لە دەستووری بنچینەیی و یاسای مەدەنی ئەو وڵاتە دیاری ئەکرێت. هاووڵاتی بوون لە پێوەند لەگەڵ تاك پێگەیەك دروست ئەکات کە لە روانگەی ماف نێونەتەوەییشەوە رێزی بۆ دائەنرێت. ماف نێونەتەوەیی لەم بارەوە دەوڵەتەکان بۆ رەچاوکردنی ماف شارۆمەندان بەرپرسیار ئەکات.

چەمکی هاووڵاتی لە گەڵ چەمکی تاك و مافەکانی لە ئەوروپا هاتە ئاراوە. لە بنەڕەتدا بە کەسێك دەگوترێ هاووڵاتی کە تەنیا ملکەچی دەوڵەت نەبێ بەڵکوو لە «ماف زگماگی» و «سروشتی» بەهرەمەند بێت و دەوڵەت ئەم مافانە بپارێزێ.

ئەگەرچی نەتەوایەتیش، زیاتر بە هاووڵاتی بوون پێناسە کراوە بەڵام مانایەکی بەربڵاوتری هەیە. نەتەوایەتی بە مانای پێوەندایەتی لە گەڵ دەوڵەتە، بەڵام نەك بە واتای بەهرەمەندی لە ماف سیاسی لە ناوخۆ بەڵکوو بە مانای بەهرەمەندی لە پاراستنی دەوڵەت لە دەرەوەی وڵاتدایە. واتای «نەتەوایەتی» لە ماف نێونەتەوەییدا زامنی هەموو خەڵکێکە کە دەوڵەتێك ئەبێ پشتیوانی لێ بکات. نەتەوایەتی هەروەها بە مانای پێوەندی کۆمپانی و داراییەکان(پاپۆڕ و فڕۆکە) لە گەڵ دەوڵەتێکە، واتە ئەمانەش سەر بەو نەتەوەن بەڵام هاووڵاتی لە ئەژمار نایەن. هاووڵاتی بوون تایبەتی ئینسانەکانە.

رەنگە کەسێك هاووڵاتی وڵاتێك بێت بەڵام لەو وڵاتەدا نەژی یان لە وڵاتێك نیشتەجێ بێت کە شارۆمەندی ئەو وڵاتە نەبێت. هەندێ جار کەسێك بۆی هەیە لە رێی زەهاسە لە گەڵ شارۆمەندی وڵاتێکی ترەوە ببێتە هاووڵاتی وڵاتێکی‌تر بەڵام ئەم حاڵەتە ماف کار و پیشەی لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ دەستەبەر ناکات.

## هاووڵاتی جیهانی        جهان وطنی        Cosmopolitan

بڕواداری بەوەیکە خۆت بە کەسێکی جیهانی بزانی و مرۆڤ خۆی بە نەتەوە یان کیانێکی تایبەتەوە نەبەستێتەوە. بڕوا کردن بەوەیکە جیهان، نیشتمانی هەموو خەڵکانی سەرزەمینە. ئەو کەسانەی کە ئەم رێبازەیان پەسند کردووە دەخوازن هەرچی لەمپەر و تەگەرەی ئەم رێگە لابچێ و حوکمەتێکی جیهانی بێ رەچاوکردنی رەنگ و رەگەز و کەلتوور دامەزرێ و بە شێوەیەکی یەکسان بە سەریانا حوکمەت بکات.

کانت(١٨٠٤-١٧٢٤)فەیلەسووفی ئەڵمانی و گۆتە(١٨٣٢-١٧٤٦) نووسەر و شاعیری بەناوبانگی ئەڵمانی لەم رێبازە لایەنگرییان کردووە.

لەم چاخەدا وادیارە بە تیاچوونی سنووری نەتەوەیی لە نێوان وڵاتان و پێکهاتنی رێکخراوە و یەکیەتی ئابووری و سیاسی جیهانی و پەرەسەندنی میدیای گشتی، دنیا وەك دێهاتێکی جیهانی لێهاتبێت کە نەریتی نەتەوەیی و ئەتنیکی لە قەوارەی کەلتوورێکی جیهانیدا خۆی نیشان ئەدات.

PDF 4 KURD

**هۆلۆکۆست** هولوكاست Holocaust

ئەم زاراوە لە بنەڕەتدا لە لایەن مێژوونووسە جوولەکەکان، لەجیاتی دەستەواژەی final solution بە واتای «دوایین ڕێگاچارە» بەکار براوە. دوایین ڕێگاچارە، دەستەواژەیەکی دڵڕفێن بووە لە ئەڵمانیای سەردەمی نازیسم* کە لە جیاتی تیابردنی جەستەیی جوولەکەکانی ئەورووپا بە مەبەستی چارەسەرکردنی هەمیشەیی«کێشەی جوولەکان» بەکار براوە. پیادەکردنی ئەم سیاسەتە یەکەم جار لە کۆنفرانسێکی نوێنەرانی ئیداری ئەڵمانی نازی لە ژانڤییەی ١٩٤٢ باسی لێکرا.

زاراوەی هۆلۆکۆست، بەمانای سووتاندنی هەموو شتێکە و ئاماژە دەدات بە کۆمەڵکوژی جوولەکان لە لایەن دەستەی مەرگی ئس ئس SS ی ئەڵمانیا بە سەرکردایەتی هیملێر و جێگرەکەی، ئایشمێن لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا. بەپێی ڕاپۆرتە مێژووییەکان لەم ڕەشەکوژییانەدا ٤/٥ تا ٦ ملیۆن جوولەکە کوژران و سووتێندران. هۆلۆکۆست لەم دواییانەدا لەلایەن هەندێك ڕەخنەی لێ گیراوە و پێیان وایە کە ژمارەی سووتێندراوەکان هێندە نەبووە و بەڵکوو ئەو ڕادەیە کەمتر لەوە بووە کە مێژوونووسەکان ڕایانگەیاندووە وئەم ژمارە لە فرو فیشاڵ دەچێ.

**هەڵبژاردن** انتخابات election

پرۆسەیەك کە بەوپێیە خەڵکانێك، کەسێك یان چەن کەس ناوزەد ئەکەن بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارێکی دیاریکراو. لە زاراوەی سیاسیدا بە مانای هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمانە بۆ ناو ئەنجومەنی نوێنەران.

لەو وڵاتانەی کە خاوەن دەستووری بنچینەیین و لە بەینی سێ هێزەکەدا جیاوازی هەیە(*تفکیك قوا**) هێزی یاسادانەر، بەدەنگی ئازاد و نهێنی و ڕاستەوخۆی خەڵك هەڵدەبژێردرێ. لەم جۆرە هەڵبژاردنانەدا لەبەر ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە ماف دەنگدانیان هەیە، دەرفەتییان هەبێت لانیکەم ڕۆژێك بۆ ئەم کارە تەرخان دەکرێت. دەنگدەرانیش (ئەو کەسانەی کە بە پێی یاسا خاوەنی مەرجەکانی تەمەن و عەقڵ و مەدەنی بوون و سیاسی بوونن) وەرەقەی دەنگدان بەدەستەوە، لە ژێر چاودێری دەستەی چاودێران دەنگەکانی خۆیان دەخەنە ناو سندووقی لاك و مۆرکراوەوە. ئینجا لە مەراسیمێکدا سندووقەکان دەکرێنەوە و بە ئاگەداری پاڵێوراوان یا نوێنەرەکانیان دەنگەکان دەخوێندرێنەوە.

لە سیستەمە فرە حیزبییەکاندا دەنگدەران دەنگی خۆیان ئەدەنە پاڵێوراوی حیزبی. لەم ڕووەوە لە پێش هەڵبژاردنەکە گرووپێك لەناو حیزبەکەدا لیستی ناوزەدەکانی خۆی دیاری ئەکات. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا چونکە ناتەبایییەکی ئایدیۆلۆژیك لەنێوان دوو حیزبە گەورەکە لەمەڕ هەڵبژاردن نییە، زیاتر لە سەر پاڵێوراوەکان لەنگەر ئەگرن. بۆیە پێش هەڵبژاردنی گشتی بۆ دیاریکردنی سەرۆك کۆمار و جێگری یەکەمی، هەڵبژاردنێکی ناوخۆیی لەناو دوو حیزبەکە بەڕێوە دەچێت کە بایەخێکی زۆری پێ ئەدرێ.

بەو هەڵبژاردنانەی کە تێیدا دەنگدەرەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ نوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن یەك پلەیی و ئەوەش کە دەنگدەران کەسانێك هەڵدەبژێرن کە ئەوان نوێنەرە ڕاستەقینەکان هەڵبژێرن، پێی دەڵێ

PDF 4 KURD

هەڵبژاردنی دوو پلەیی.

**هەلپەرستی** فرصت طلبی/اپورتونیسم Opportunism

ئەم زاراوە لە وشەی opportunus)) بە واتای لەبار و شیاو وەرگیراوە. لە زاراوەی سیاسیدا بریتییە لە: خۆ لێگۆڕان بەپێی گۆڕینی هەلومەرج و ڕەوشی سیاسی بۆ بەدەست هێنانی قازانجێکی شەخسی، کورد وتەنی، بە هەموولایەك شەن کردن. هەلپەرست بە کەسێك دەگوترێ کە هەمیشە بەرەو ڕژێمی دەسەڵاتدار لایەنگری هەیە و پابەندی هیچ پرەنسیپێك نییە و پرەنسیپەکانی خۆشی لەو ڕێگا دائەنێت.

هەلپەرستی لە سیاسەتدا بە ڕەفتارێکی سازشکارانە لە قەڵەم ئەدرێت چونکا ئینسانی هەلپەرست بۆ گەیشتن بە قازانجەکانی خۆی، لە ئاست کەموکوڕییەکانی کۆمەڵگا بێدەنگ دەبێ و چاوپۆشی لێ ئەکات. تەنانەت ئەگەر ئەم هەڵوێستەشی لە گەڵ باوەڕ و پرەنسیپەکانی خۆی ناتەبا بێت.

**هەژموّنی** هژمونی / برتری Hegemony

ئەم زاراوە لە ڕیشەی یۆنانی hegemonia بە مانای سەرۆکایەتی یا فەرمانڕەوایی وەرگیراوە و بریتییە لە زاڵبوون و باڵادەستی وڵاتێك بەسەر وڵاتانی دیکە لە ڕێگای دیپلۆماسی یا پێملکردن بە هەڕەشە یا سەرکەوتنی چەکداری. ئەم زاراوە پتر بەو مانایەی کە ئانتۆنیۆ گرامشی(١٩٣٧ـ ١٨٩١) بیرمەندی مارکسی و نووسەری ئیتالیایی، ئاراستەی کردووە بەکاربراوە کە ئەویش بریتییە لە: زاڵبوون و سەروەریی چینێك، نەك هەر لەبواری ئابووری بەڵکوو لە هەموو بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژی بەسەر چینەکانی تردا. بە باوەڕی گرامشی هەژمۆنی سەرمایەداران تەنیا لە ڕێگای هۆکارە ئابوورییەکان دابین ناکرێت بەڵکوو پێویستی بە دەسەڵاتێکی سیاسی و سیستەمێکی ئایدیۆلۆجییە کە لە دووی پێملکردن و ڕازی هێشتنەوەی چینی ژێردەستەوەیە. دامودەزگاکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری بریتین لە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەك دەوڵەت، حیزب، دەزگا ئایینییەکان(کلێسا)، خێزان و یەکیەتییە کرێکارییەکان.

مانەوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری بە هۆی هەژمۆنی ئایدیۆلۆژیایی سیستەمی زاڵ بەسەر چینی کرێکاردایە. گرامشی پێی وایە کە ئەم هەژمۆنییە ناتوانێ بگۆڕێت چونکا عەقڵی سەلیم کە بەرهەمی ژیانە، وشیارییەك دەبەخشێ بە چینی کرێکار بە پێچەوانەی ئەو وشیارییە کە چینی سەرمایەدار بەسەریا دای ئەسەپێنێ. بەڕای ئەو ئەگەر بێتوو ئەم وشیارییە شۆڕشگێڕییە لە لایەن ڕۆشنبیرانەوە بەهێز بکرێت، دەبێتە هێزێکی کارامە و خەباتی چینایەتیش تا ڕادەیەکی زۆر ململانێی نێوان گرووپە ڕۆشنبیرییەکانە کە یەکیان لە خزمەت چینی سەرمایەدارە و ئەویدی لە خزمەت چینی کرێکاردایە.

**هێز/دەسەڵات** قدرت Power

هێز، یەکێك لە چەمکە سەرەکییەکانی زانستی سیاسەتە کە بە مانای وزە و توانایی کەسێکە بۆ پێملکردن و

PDF 4 KURD

تەسلیم راگرتنی جەماعەتێك لە بەرامبەر خواستەکانی ئەو کەسەدا بە هەر شێوازێك. بە واتایەکی‌تر هێز، کۆمەڵێ سەرچاوە و ئامرازی زۆرەملانە و ئارەزوومەندانەیە کە حوکمەتەکان بۆ بەڕێوەبەرایەتی دەسەلات بەکاری دەهێنن. پاراستنی سەرچاوەکانی هێز و چۆنییەتی دابەشکردنی و خەبات بۆ وەچنگ هێنانی، گرینگ‌ترین بابەتی توێژینەوەی زانستی سیاسییە. هەروا زۆرینەی زانایانی سیاسی پێوەندییەکانی هێز بە کاکڵی سیاسەت دەزانن و دەڵێن ئەو شتەی پێوەندی مرۆ لە گەڵ پێوەندییەکانی دیکە جیا دەکاتەوە، هێزە. خەباتی حیزب و حوکمەتەکان لە پێناو هێزدایە: بۆ وەدەست هێنانی هێز، پاراستن یا بۆ نواندن و نومایش کردنی هێز.

بیرمەندانی سیاسی، هەوڵیان داوە ئەم چەمکە لە گەڵ زاراوەی دەسەلات* authority لێك جیا بکەنەوە. بەڵام لە راستیدا نە لە زاری رەشۆکی و نە لە زانستی سیاسەت، رێککەوتنێك لەمەڕ ئەم زاراوە پێك نەهاتووە. چونکا هەندێ جار وشەی هێز لە گەڵ دەسەلات، دەسرۆیین، زۆرداریی، زۆرەملێ و... بە هاوواتا زانراوە. هێز خاوەنی چەند سەرچاوەیەکە کە بریتین لە:

١- زانیاری: ئەم سەرچاوە یارمەتیدەری فراژووتنی ئاوەز و رۆحی مرۆڤە. لە کۆمەڵگایەکی وشیاردا هیچ رێبەرێك ناتوانێ بێ زانیاری دەستی بە هێز بگات.

٢- رێکخستن: رێکخستن لە جەوهەردا هێز دەبەخشێ. لە سیستەمێکی سیاسی دیموکراتیدا حیزبە سیاسییەکان بۆ وەدەست هێنانی هێز، رێکخراوە سازدەکەن.

٣- هەلومەرج: هەلومەرجی ئابووری و کۆمەلایەتی بە خاوەنەکەی یارمەتی دەدات کە هێز و دەسەلاتی خۆی زیاتر بکات.

٤- دەسەلات: دەسەلات بە واتای هێزی رەوا و شەرعییەتدارە. ئەگەر کەسێك دەستی بگاتە پلە و پایەیەکی رەوا و یاسایی، هێزی رێبەرایەتییەکەی زیاتر دەبێ.

٥- لێهاتوویی: وەشاوەیی و شارەزایی، هێزی مرۆ زیاد دەکات و لە خەبات بۆ وەدەستهێنانی دەسەلات، سەرکەوتووی دەکات.

٦- ئیمان و بروا: مانەوەی رێبەرێك لە دەسەلاتدا پێویستی بە بروایەکی گشتی هەیە.

٧- میدیاکان: میدیاکان سەرچاوەیەکی گرینگی هێز و دەسەلات لە ئەژمار دێن. بەرپرسانی رۆژنامە و تەلەفیزیۆن و ... دەورێکی بالا دەگێڕن لەمەڕ زاڵبوون بەسەر رای گشتیدا.

ئەگەر هێز لەسەر بنەمای زۆر و سوڵتە دامەزرابێت، فەرمانبەران بە رەوای نازانن و هۆی فەرمانبردنیان، دەگەڕێتەوە بۆ ترس. بەڵام ئەگەر فەرمانبەرانیش خاوەنی هێزێکی کۆمەلایەتی بن و هێزی فەرمانڕەوا بە شەرعی و رەوا بزانن، ئینجا هێز دەبێتە پاڵپشتێکی رەوا. حوکمەتی خەڵکیی کاتێك پیادە ئەکرێت کە لە نێوان فەرمانڕەوا و فەرمانبەراندا هیچ لەمپەرێك نەبێت.

PDF 4 KURD

**هێزی ڕەش** قدرت سیاه Black Power

**بریتییە لەو بزاوتەی کە لە شەستەکانی سەدەی ٢٠ لە لایەن ڕەشپێستانی ئەمریکا بۆ دەربڕینی نارەزایەتی لە باری گوزەران لە کۆمەڵگایەکی سپیپێستدا هاتە کایەوە. ئەم بزاڤە لەسەر ماف یەکسانی ڕەش و سپی داکۆکی دەکرد و لەم سەردەمەدا چالاکییەکانی خۆی بەگوڕتر کرد. لەبەر ئەوەی بزاوتەکە بووە هۆی ترسی کۆمەڵگای سپیپێستی ئەمریکا لەمەڕ بەرپابوونی ململانێی نەژادی بەم بۆنەوە هەوڵ دراوە تا رادەیەك خواستەکانیان جێبەجێ بکرێت. هێزی ڕەش، پاش چالاکییەکانی مارتین لوتەر کینگ، ڕێبەری ڕەش پێستەکانی ئەمریکا توانی بە خواستە مەدەنی و سیاسییەکانی خۆی بگا و وڵاتی ئەمریکا، زیاتر لە جاران بەرەو پرۆسەی دیموکراسی ببات. دوایین بەرهەمی ئەم خەبات و بزاوتە گەیشتن بە دەسەڵاتی ڕەش پێستێکی ئەمریکی – ئەفریقایی بە ناوی بارك ئۆباما یە لە باڵاترین پۆستی سیاسی واتە سەرۆك کۆماری لە ساڵی ٢٠٠٩.**

PDF 4 KURD

## ی

**یاداشت نامە** یادداشــت Note

نامەیەکی دیپلۆماسییە کە پردی پێوەندی دەوڵەتەکان لە گەڵ یەکتر ئەکاتەوە. یاداشت نامە، بە چەند شێوە لە نێوان دەوڵەتەکاندا ئاڵووگۆڕ دەکرێت کە بریتین لە:

یاداشت نامەی زارەکی، یاداشت نامەی رەسمی، یاداشت نامەی هاوشێوە (کە هاوکات بۆ چەند وڵاتی جیاواز دەنێردرێت).

**یاسا** قانوون Law

١- کۆمەڵێك رێسای پێویست و ناچاریی کە لە سەردەمێکی دیاریکراودا بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆ حوکم دەکات و پیادەکردنەکەی لە لایەن دەوڵەتەوە مسۆگەر دەکرێت. ٢ـ ویست و ئیرادەی تاقمی دەسەڵاتدار کە لە قەبارەی یاسادا ئەگونجێت. ٣ـ کۆمەڵێك بریار کە بەسەر پێوەندییەکانی کۆمەڵگایەکی سیاسیدا حوکم دەکات. ٤ـ رێوشوێنێك کە لە لایەن دەسەڵاتێکی گشتی دیاری ئەکرێت کە دەبێ هەمووان پەیرەوی لێ بکەن و ملکەچی بن.

یاسا، بەرهەمی قەبارە و سیمای ژیانی مرۆڤە. لەبەرئەوەی ژیانی مرۆ هەمیشە ئامادەی گۆڕان و وەرچەرخانە، یاساش هەمیشە تووشی گۆڕان دەبێت بەڵام هەر چەشنە گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر یاسادا لە پاش روودانی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی دەگاتە ئەنجام. هەرکەس وەك مرۆڤێك و بە پێوانەی ویژدانی خۆی مافی ئەوەی هەیە یاساکان هەڵسەنگێنێ و لێیان وەکۆڵێت. هەرکاتێك ویژدانی، یاساکەی پەسند کرد، ئینجا پەیرەوی لێ بکات و ئەگەریش پەسندی نەکرد نابێ بۆ پیادەکردنەکەی هەنگاو بنێت.

**یاسا پەروەریی** لگالیسم/قانون باوری Legalism

ئەم زاراوە بە واتای باوەڕ بە سەروەری و رەسەنایەتی یاسا و شەرعییەتی دادوەری و مافەکانە. ئەم جۆرە لە دنیابینی و بیرکردنەوە لە پێوەندی نێوان دەوڵەت و خەڵك و پێوەندی جەماوەر لەگەڵ یەکتر کە دەبێ بەپێی یاسا و قانوون بێت، هەر لە سەردەمی دەوڵەتی رۆمای کۆنەوە باو بووە و بەشێك بووە لە فەلسەفەی سیاسی. یاساپەروەری هەموو جۆرە پێوەندییەکی مرۆڤ دەخاتە تەرازووی یاسا و دادوەری و دەوڵەت بە بەرهەمی قانوون دەزانێت. ئەم رێبازە پێی وایە کە لە بابەت دەوڵەتەوە ناکرێ بە پێوانەی ئەخلاق و کۆمەڵناسی سەیر بکرێت بەڵکوو دەبێ لە شەرعییەت و رەسەنایەتی یاسایی بکۆڵدرێتەوە و روون بکرێ

PDF 4 KURD

کە ئایا دەوڵەت، ڕەوایە یا ناڕەوا ؟

**یاسای بنەڕەتی: بڕوانە دەستووری بنچینەیی.**

**یانزەی سێپتەمبەر ۲۰۰۱** یازده سپتامبر ۲۰۰۱ 11/9

بەو ڕوداوە تیرۆریستییە دەگوترێ کە بووە هۆی لەناوچوونی نزیکەی ۳هەزار کەس لە دانیشتوانی دوو تاوەرە ئەفسانەییەکانی ڕێکخراوەی بازرگانی جیهانی و وەزارەتی بەرگری ئەمریکا بەهۆی خۆپێکادانی سێ فڕۆکەی نەفەرهەڵگر بەم بینایانەدا. پاش ئەم ڕوداوە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕایگەیاند کە جیهان «یا دۆستی ئێمەن یا دوژمن»! ئەم کارەساتە بڕگەیەکی زۆر گرنگی مێژووی ئەمریکا لە ئەژمار دێت.

**یەك جەمسەریی** تك قطبی Unipolarity

جۆرە سیستەمێکی سیاسی کە تێیدا تەنیا یەك جەمسەر چالاك بێت. یەك جەمسەری زیاتر لە حوکمەتێکی جیهانگیردا لە ئارادایە. دوای کۆتایی پێهاتنی شەڕی سارد هەندێ گومان دروست بووە لەسەر ئەوەیکە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئێستا یەکەم *زلهێز**ی جیهانە و ئەمە دەرفەتێکی وای بۆ دەرەخسێنێ کە جیهان بەرەو یەك جەمسەری ببات. لیبرالیزمی ئابووری و کەم تاکورتێکیش دیموکراسی هاوبەشی، ڕەنگە تا ڕادەیەك ببنە یارمەتیدەری سیستەمی یەك جەمسەری.

**یەکسانی خوازی** برابـری خـواهی Egalitarianism

بڕواهێنان بە بایەخی بەرزی یەکسانی و لایەنگری لە پیادەکردنی ئەم بڕوایە. لە سەردەمی ئێستادا ئەم بیرۆکە بۆتە پاڵنەر و هاندەری زۆربەی جووڵانەوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان. سێ دروشمی بەناوبانگی شۆڕشی فەرەنسە کە بریتیبوون لە ئازادی و یەکسانی و برایەتی لە «پیلانی یەکسانەکان»(بڕوانە بابۆفیزم)، دەنگدانەوەی خێرای داوە کە پاش سەرکوتکردنی ئەو جووڵانەوە ڕێبازەکانی بۆ ڕێکخراوە نهێنییەکانی سەدەی نۆزدە بەجێما کە ئەوانیش خوازیاری یەکسانی مووچە بوون. بابۆفیزم بەم ڕێبازەوە زەمینەی بۆ ئەندێشە سۆشیالیستی و کۆمۆنیستییەکان خۆش کرد.

لە سەدەی بیستەم دابەشکردنی یەکسانخوازانەی بەرهەمهێنان و دارایی لە کۆمەڵگادا ڕەهەندێکی تازەی بەخۆوە بینی و چەن مەسەلەیەکی تازەشی چێکردووە چونکا ئەزموونی مێژوویی نیشانی داوە کە سڕینەوەی جۆرێك لە نایەکسانی ئەتوانێ نایەکسانیتر بەرهەم بهێنێت. وەك چۆن لە زۆربەی سیستەمە توتالیتەرەکان بە بیانووی یەکسانی ئابووری، سەرجەم مافی سیاسی و مافی بەشداری تاك لە بڕیارە سیاسییەکاندا لە ناو دەچێ.

یەکێك لە دروشمە سەرەکییەکانی یەکسانخوازەکان «یەکسانی دەرفەتەکان»ە کە سۆشیالیستەکا...

PDF 4 KURD

ئاراستەیان کردووە. یەکسانی دەرفەتەکان بەمانای سڕینەوەی تەواوی ئەو زێدەمافانەیە کە بۆ گرووپێکی تایبەت، هەر لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە زەمینەی نابەرابەری بۆ گەشە سەندن خۆش دەکەن.

**یەکیەتی** صنف Guild

ئەنجومەنێکی ئارەزومەندانەیە بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی هاوبەشی ئەندامەکانی. یەکیەتییەکان لە سەرەتای سەدەی یازدەوە، لە گوێن ڕێکخراوەی کرێکاری و پیشەسازی بە مەبەستی پێشڤەبردنی قازانج و بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی، پیشەیی، پەروەردەیی و ئایینی ئەندامەکانی سەریان هەڵداوە. ئەم ئەنجومەنانە توانست و زانیارییە پیشەییەکانی خۆیان، وەچە بە وەچە ڕاگواستووە و نەیانهێشتووە کەسانی بەدەر لە خۆیان ببنە ئەندامی یەکیەتی.

**یەکیەتی ئەورووپا** اتحادیەی اروپا European Union (EU)

«ئەنجومەنی ئەورووپا» لە ساڵی ١٩٩٢ بەملاوە بە «یەکیەتی ئەورووپا» ناوبانگی دەرکردوە کە ئەویش پێکهاتێکە لە: کۆمەڵەی ئابووری ئەورووپا(بازاری هاوبەش)، کۆمەڵەی خەڵووز و پۆڵای ئەورووپا و کۆمیتەی وزەی ئەتۆمی ئەورووپا کە لە یەکەمی ژوئییەی ١٩٦٧ یەکیان گرت. ئەم ڕێکخراوە بریتییە لە ئەنجومەنی وەزیرانی وڵاتانی ئەندام و پەرلەمانی ئەورووپا و دادگای ئەورووپی. ئامانجی یەکیەتی ئەورووپا بریتییەلە:

بەدیهێنانی یەکییەتی ئابووری و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی، لابردنی سنوورەکان، ڕێکخستنی بازاڕ و دراوی هاوبەش، دەرکردنی پلان و سیاسەتێکی یەکگرتوو لە بابەتە جۆراوجۆرەکان و سەرەنجام یەکگرتنی سیاسی لە نێوان وڵاتانی دیموکراتیی ئەورووپا. یاسا و ڕێساکانی ئەم ڕێکخراوە لە ٣١ی دێسەمبەری ١٩٩٢ پیادە کراوە. بەم پێیە هیچ بەربەستێك بۆ دانوستانی شمەك و خزمەتگوزاری و دارایی و کرێکار و گەڕۆك لە ناو وڵاتانی ئەندامی یەکیەتی لە ئارادا نییە. لە سەر یەکگرتوویی سیاسی و گەیشتن بە دانەی دراقی هاوبەش، پەیماننامەی زۆر لە نێوانیان مۆر کراوە کە بریتین لە:

- یەکلاکردنەوەی دراقی ئەورووپا(ئەم دراقە لە ژانوییەی ٢٠٠٢ بە ناوی «یۆرۆ» هاتە گەڕیان لە بازاڕدا و ئێستا مامەڵە و دانوستانی پێ ئەکرێ).
- داڕشتنی سیاسەتێکی یەکلایەن بۆ ئەندامانی یەکیەتی.
- داڕشتنی ڕێبازێکی بەرگریی هاوبەش لەژێر چاودێری یەکیەتی ئەورووپا.
- ئەم یەکیەتییە پێشەنگاوی ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی یەکگرتوو ئەبێت.
- زیاکردنی یارمەتی بۆ ئەندامانی هەژار و لاواز لە یەکیەتیدا.
- زیاکردنی دەسەڵاتی پەرلەمانی ئەورووپا.

یەکیەتی ئەورووپا تاکوو ئاڤریلی ٢٠٠٢ لە پانزە ئەندام پێکهاتبوو کە بریتی بوون لە:

فەرەنسە، ئەڵمانیا، ئیتالیا، بەلجیکا، هۆلەندا و لوکزامبۆرك (لە ساڵی ١٩٥٧ بە پێی ڕێکەوتنامەی

PDF 4 KURD

